# ڕوونکردنەوەی

# بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی

# کۆمەڵی ئیسلامیی

نووسینی: عەلی باپیر

چاپی یەکەم

١٤٣٢ کۆچی ٢٧١١ی کوردی ٢٠١١ی زایینی

## ناسنامەی کتێب:

ناوی کتێب : ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی

نووسینی : عەلی باپیر.

بابەت : فیکری ئیسلامیی.

پیت چنین : کامەران ئەحمەد.

نەخشەسازی بەرگ : عزالدین محمد.

نەخشەسازی ناوەوە: کامەران ئەحمەد.

نۆرەوساڵی چاپ : یەکەم – ٢٠١٢

تیراژ : ١٠٠٠ دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٣٣٠) ساڵی (٢٠١٢)ی پێی دراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية.

﴿ ... لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ... ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

## پێشـكەشـە:

بـە یەكـە یەكـەی ئەنـدامو دۆسـتو لایـەنگرە دڵـسۆزو چـالاكو بـە پەرۆشەكـانی كۆمـەڵی ئیـسلامیی، بـە هیـوای بەرچـاوڕوونیی زیـاترو گەشەكردنو كاملّ بوونی باشتـریان .

## دوو ڕوونکردنەوەی پێویست:

١- بۆیە بۆ ناوونیشانی گشتیی ئەم بیست‌و پێنج خاڵە هەرکام لە وشەی (بنەما شەرعییەکان)و (هێڵە گشتییەکان)مان بەکارهێناون، چونکە هەرچەندە بۆ سەرجەم لەو بیست‌و پێنج خاڵە پشت بە (قورئان)و (سوننەت) بەستراوەو، (ئایەتەکانی قورئان)و (دەقەکانی سوننەت) بە بەڵگە هێنراونەوە، بەڵام ئەگەر زۆربەی خاڵەکان ڕاستەوخۆ لە (قورئان)و (سوننەت) وەرگیراون، هەندێکیان ناڕاستەوخۆ وەرگیراون، بۆیە ئەگەر وشەی: (بنەما شەرعییەکان) بۆ جۆری یەکەمیان گونجاوو پڕ بە پێست بێ، بۆ جۆری دووەمیان وا نیەو وشەی (هێڵە گشتییەکان) گونجاوترە.

ئاشکراشە کە مەبەست لە هەرکام لەو دوو جۆرە خاڵانەی کە کۆی بیست‌و پێنج خاڵەکە پێکدێنن: چوارچێوەی گشتیی فیکرو بۆچوون‌و سیاسەتی (کۆمەڵی ئیسلامیی)یەو، ئەو بنچینانەن کە کردوونی بە بناغەی کارو پڕۆژەی ئیسلامییانەی خۆی.

٢- تێبینی دەکرێ کە ئێمە لە کۆی ئەو بیست‌و پێنج خاڵە، لە هیچ کامێکیاندا بەتایبەت باسی ئافرەتانمان نەکردوە، هۆکارەکەیشی تەنیا ئەوەیە کە سەرجەم ئەرک‌و کارەکانی (شەریعەت)، پەیوەستن بە هەردووك ڕەگەزی نێرومێوەو، ئافرەتان‌و پیاوان وەك یەك دوێنراو (مخاطب)ی (دەقەکانی شەریعەت)ن‌و، دروست نیە بەبێ بەڵگەیەکی ڕوون‌و بێ چەندوچوون، هیچ ئەرك‌و کارێك تایبەت بکرێ بە یەکێك لە دوو ڕەگەزەکەوە، زاناو شارەزایانی (أصول الفقه)یش گوتوویانە: هەموو شێوە (صیغة) گشتییەکانی وەك: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، واتە:

(ئەی خەڵكینە)، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ﴾، واتە: (ئەی ئادەمیزاد)، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە)، ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾، واتە: (ئەی وەچەی ئادەم)، هەردووك ڕەگەزەكە بەبێ جیاوازیی دەگرنەوە.

كەواتە: سەرجەم ئەو بیست و پێنج خاڵە برایان و خوشكان دەگرنەوە بەبێ جیاوازیی.

## ئەم كتێبەو چەند قسەیەكی پێویست

بەڕێزان!

بەپێویستی دەزانم لەبارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانو پەیدابوونی ئەم كتێبەوە چەند شتێك روون بكەمەوە:

**یەكەم**: بێگومان هیچ (كۆمەڵ)و (رێكخراو)ێكی سیاسیی جیددیی، بەبێ هەبوونی بەرنامەو نەخشەیەكی فیكریی و سیاسیی، كە بناغەی فیكریی و ئامانجەكانی و شێوازو رێبازو ئامرازەكانی كاری روون بكاتەوە، ناگونجێ هەبێ و، ئەگەر هەشبێ درەنگ یان زوو بەهۆی بێ بەرنامەیی یەوە، پەكی دەكەوێ و دووچاری شكستو هەڵوەشان دەبێ.

هەربۆیەش ئێمە كاتی خۆی دوای ئەوەی لەنێو (بزووتنەوەی یەكبوونی ئیسلامیی)دا سەبارەت بە چاككردنو راستكردنەوەی (بزووتنەوەكە)وە، دووچاری نائومێدیی بووینو بە بنبەست گەیشتینو، سەرەنجام بڕیاری راگەیاندنی (كۆمەڵی ئیسلامیی)مان دا، یەكەمین كارێك كە پێی هەڵساین ئەوەبوو كە بەندە پاش بیركردنەوەو چاو بە رابردوودا گێڕانەوەو تێوەڕامانی ئەزموونی خۆمان بەتایبەتو (لایەنە ئیسلامییەكانی جیهان) بەگشتی و، پاشان پاڕانەوەو ئیستیخارە، بیستو پێنج خاڵم نووسین بە ناوونیشانی: (**بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵێكی ئیسلامیی رەسەن**) كە دیارە مەبەستم لە: (كۆمەڵێكی ئیسلامیی رەسەن)، ئەو (كۆمەڵی ئیسلامیی)یە بوو، كە عەزممان لەسەر راگەیاندنی جەزم كردبوو.

**دووەم**: ئینجا بە ماوەیەكی كەم پێش راگەیەنرانی (كۆمەڵی ئیسلامیی)، ئەو بیستو پێنج (بنەما شەرعیی و هێڵە گشتیی)یانە، لەشێوەی نامیلكەیەكدا چاپو

بڵاوکرانــەوە، ئــەویش دوای ئــەوەی لەلایــەن بەنــدەوە بەســەر ئەنــدامانی ســەرکردایەتی ئەوســای (کۆمــەڵی ئیــسلامیی)دا خوێندرایــەوەو وتووێــژی تێروتەسەلی لەسەر کراو تێبینیو پێشنیاری ئامادەبووانی لەسەر خرایەڕووو بە یەکدەنگیی، یان زۆربەی هەرەزۆری ئامادەبووان پەسندکراو وەك بناغەی فیکریيو سیاسیی (کۆمەڵی ئیسلامیی) تەبەننیی کرا.

**سێیەم:** لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو بیستو پێنج خاڵە زۆر بە کورتییو گوشراویی نووسرابوون، پێویستییان بە ڕوونکرانەوەو شیکرانەوە هەبوو، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بۆ هەلو دەرفەتێکی گونجاو دەگەڕام، کە شەرحو شیکردنەوەیەکیان لەسەر بنووسم، جا ئەوەبوو لە ساڵی (٢٠٠٣)دا دەستم کرد بە نووسینی (ڕوونکردنەوە)یەك لەسەر ئەو (بنەما شەرعییو هێڵە گشتیی)یانەو، حەوت بنەمام لێ تەواوکردن، کە ئەوکاتە بە نۆزدە (١٩) ئالقە لە ڕۆژنامەی (کۆمەڵ)[1]دا بڵاوکرانەوە، بەڵام بەهۆی دەستگیرکرانم لەلایەن ئەمریکاوە، لە ڕۆژی پێنجشەممە، بەرواری (١٠/ ٧/ ٢٠٠٣)دا، ئەو پڕۆژەیە نیوەچڵ ماو پەکی خرا.

بەڵام پاش ئازادکرانم لە ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممە بەرواری (٢٨/ ٤/ ٢٠٠٥) لە زیندانو گەڕانەوەم، چەند جارێك لەلایەن برایانێکی دڵسۆزەوە داوام لێکرا،

---

١) لە ژمارە (٧٩)ی بەرواری (٥/ ٧/ ٢٠٠٣) تا ژمارە (٩٩)ی بەرواری (٢٢/ ١١/ ٢٠٠٣) جگە لە هەردوو ژمارەی (٨٢، ٩٨)ی ڕۆژنامەی (کۆمەڵ) دا بڵاوکرانەوە.

شایانی باسە لە هەردوو ژمارەی (٨٧، ٨٨) نووسراوە (ئالقەی هەشتەم)، وە لە هەردوو ژمارەی (٩٠، ٩١) نووسراوە (ئالقەی دەیەم)، دواتر لە (ئالقەی شازدەیەم)ەوە کە لە ژمارە (٩٧) بڵاوکراوەتەوە، ڕاستەوخۆ چۆتە سەر (ئالقەی نۆزدەیەم) کە لە ژمارە (٩٩) بڵاوکراوەتەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ڕۆژنامەنووسانی ڕۆژنامەی (کۆمەڵ) لە چ بارودۆخێکی سەختو دژواردا کاریان کردوە، هەر کەسێکیش ئاشنای بارودۆخی سیاسیی ئەوکاتەی (کۆمەڵی ئیسلامیی) بێت، دەزانێ لەو ماوەیەدا چەندە کێشەو گیروگرفتی سیاسییو ئەمنیی بۆ (کۆمەڵ)و ئەندامو کادیرانی دروستکراون!!

كە ئەو كارو پڕۆژەیە تەواوبكەم و، منیش لەبەر دستگیراویی و سەرقاڵیی نەمدەپەرژاو كاتی گونجاوم دەست نەدەكەوت و، نەشمدەویست لەبەر كەم كاتیی بە ناتەواویی ئەنجامی بدەم و هەڵیپرووزێنم.

**چوارەم**: هەتا سەرەنجام و دوای داكۆكیی كردنی زۆری برایەكی دڵسۆزو بەڵێن دانی كە ئەگەر بێت و من ئامادەبم بە چەند دەرس و موحازەرەیەك ئەو بنەماو هێڵە گشتییانە شەرح و شیبكەمەوە، هەم بەردەوام ژمارەیەك لە ئەندامان كۆبكاتەوە بۆ گوتنەوەی دەرسەكەو، هەم دوایش خۆی دەرسەكان بنووسێتەوەو تایپ بكات، ئیدی ئەوەبوو كە لە شەوی: (یەكشەممە لەسەر دووشەممە) بەرامبەر: (١٦ لەسەر ١٧/ ٥/ ٢٠١٠) ناوی خوامان لێهێناو سەرلەنوێ لە بنەمای یەكەمەوە تێهەڵچوومەوە بە راڤەكردن و روونكردنەوەی (بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی)، لە شازدە (١٦) دەرسی هەفتانەدا كۆی بیست و پێنج بنەمایەكەم راڤەكرد.

پاش تەواوبوونی دەرسەكان لە شەوی: (سێشەممە لەسەر چوارشەممە) بەرامبەر: (٢٤ لەسەر ٢٥/ ٨/ ٢٠١٠) و، نووسرانەوەو تایپكرانیان لەلایەن ئەو برا دڵسۆزەوە، بە بەردەوامیی لە رۆژنامەی (كۆمەڵ)[١]دا بڵاودەكرانەوە، سەرەنجام هەمووی لە سی و شەش (٣٦) ئاڵقەدا بڵاوكرایەوە.

دیارە لەو كاتەوەش ئەو برا دڵسۆزەم راسپارد كە ئەوجار خەریكی ئامادەكردنی خودی بیست و پێنج بنەماو هێڵە گشتییەكان بێ، كە لە دووتوێی نامیلكەیەكدا جارێكی دیكە چاپ و بڵاوی بكەینەوە، هەروەها (روونكردنەوە)كەش ئامادەبكات كە لە دووتوێی كتێبێكدا، ئەویش چاپ و بڵاوبكەینەوە.

---

١) كۆی هەر سی و شەش (٣٦) ئاڵقەكە لە ژمارە (٤٤٣)ی بەرواری (١٢/ ١٠/ ٢٠١٠) تا ژمارە (٤٧٩)ی بەرواری (٢٨/ ٦/ ٢٠١١) جگە لە ژمارە (٤٧١)ی رۆژنامەی (كۆمەڵ)دا بڵاوكرانەوە.

**پێنجەم**: شایانی باسیشە كە من لە میانەی ڕوونكردنەوەو شیكردنەوەی ئەو بیستو پێنج بنەماو هێڵە گشتییانەدا، جارێكی دیكە چاوم بە دەقی (بنەما شەرعییەكانو هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی)دا گێڕاوەتەوەو سووكە دەستكارییەكی ژمارەیەكیانم كردوە، بەڵام بەبێ گۆڕینی جەوهەرو نێوەڕۆكی یەكەمجاریان، وە زۆربەشیانم بە بەڵگە شەرعییەكان (دەقەكانی قورئانو سوننەت) دەوڵەمەندترو بەهێزتر كردوە و، هەوڵیشمان داوە كە هیچ دەقێكی سوننەت ئەگەر ڕاست (صحيح) یان لانی كەم باش (حسن) نەبێ، پشتی پێ نەبەستینو بە بەڵگەی نەهێنینەوە، هەرچەندە من وەك عادەتی خۆم بە پلەی یەكەم هەر پشتم بە ئایەتە بەهێزو پیرۆزەكانی (قورئان)ی بەرزو مەزن بەستوە، كە هیچ مسوڵمانێك ناتوانێ مشتومڕی لەبارەی هیچ ئایەتێكەوە هەبێت، لەڕووی پاڵپشت (سَنَدْ)ەوە، چونكە (قورئان) هەمووی بەشێوەی (تَوَاتُرْ) بە ئێمە گەیشتوە.

**شەشەم**: هیواداریشم كە ئەمجارە (بنەما شەرعییەكانو هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی) دوای ئەوەی كە بەم: (ڕوونكردنەوە)یە ڕوونو شیكراونەوە و، ڕاڤەیەكی تاڕادەیەك تێروتەسەلیان لەبارەوە كراوە، لە جاران زیاترو چاكتر جێگای سوودو بەهرەی خوشكو برایانمان بن و، لە هەموو ئاستەكاندا بە گرنگیی و بایەخ پێدانێكی شایستەوە مامەڵەیان لەگەڵ بكرێ، چونكە پێم وایە ئەوەی كە لەم بیستو پێنج (بنەما شەرعیی و هێڵە گشتیی)یانەو (ڕوونكردنەوە)كەیاندایە، لەڕووی: ڕاستو دروست تێگەیشتنی (ئیسلام) و، ڕێكو ڕەوانو بەرچاوڕوونانە ئەنجامدانی كارو چالاكی ئیسلامییەوە، لە كەم شوێن چنگ دەكەوێ، چونكە ئەمە زادەو بەرهەمی زیاتر لە سی (٣٠) ساڵ تێفكرینو لێكۆڵینەوە لەبارەی (قورئان)و (سوننەت) و، ئەزموونی تێكۆشانو هەوڵدانە لەپێناوی (ئیسلام)دا!

**حەوتەم**: بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ: {لاَ يَشْكُرُ اللَّهَ مَنْ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ} رواه أبو داود: (٤٨١١) واللفظ له، والترمذي: (١٩٥٤)، وقال الألباني وشعيب الأرنؤط: صحيح. واته: (هەر کەسێك سوپاسی خەڵك نەکات، سوپاسی خواشی نەکردوە)، بە پێویستی دەزانم پڕ بەدڵ سوپاسی ئەو برا بەڕێزو دڵسۆزە بکەم، کە ئەرکی نووسینەوەو تایپکردنو ڕێکخستنی ئەم زنجیرە دەرسەی وەئەستۆگرتو، زەحمەتێکی زۆریشی بە دەرخستن (تخريج)ی (فەرمایشت)ەکانو زیاتر ڕێكو پێك کردنی هەرکام لە نامیلکەو کتێبەکەشەوە کێشا، بەڵام حەزی نەکرد ناوی بێنم، خوا ﷻ بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو بیکاتە توێشووی سەفەری قیامەتی و، وێنەشی زۆر بێ، چونکە بەڕاستی ئەگەر لێبڕانو ماندووبوونی ئەو نەبووایە، زۆر زەحمەت بوو ئەم پڕۆژەیە وا بە زوویی ئەنجام درابایە.

شایانی باسیشە کە ئەم (**ڕوونکردنەوەی** بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی) هەرچەندە بەناوی (کۆمەڵی ئیسلامیی)یەوە نووسراوە، بەڵام پێم وایە بەگشتی بۆ (تەووژمی ئیسلامیی) مایەی کەڵكو سوودەو، تەنیا تایبەت نیە بە (کۆمەڵی ئیسلامیی)یەوە.

هیواداریشم کە براو خوشکانمان بە خستنەڕووی تێبینیو سەرنجو ڕەخنەکانیان ئەم بەرهەمە بە مەتنو شەرحەوە دەوڵەمەندو بەهێزوپێزتر بکەن، پێشەکیش سوپاسیان دەکەم.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

١٩ی شەعبانی ١٤٣٢ك
٢٠ی تەممووزی ٢٠١١ز
هەولێر

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له.

وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾[1] آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾[2] النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾[3] الأحزاب.

---

١) واته: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی، وە بە مسوڵمانیی نەبێ مەمرن).

٢) واتە: {ئەی خەڵکینە! لەو پەروەردگارەتان بترسن کە لە تاکە کەسێك (ئادەم) دروستیکردوون، هەر لەویش هاوسەرەکەیشی (حەوا)ی دروستکرد، وە لەو دووانەیش (ئادەمو حەوا) پیاوانو ئافرەتانێکی زۆری بە دنیادا بلاوکردەوە، وە پارێز لەو خوایە بکەن کە بە ناوی وی شت لە یەکدی داوادەکەن، هەروەها خزمایەتی بپارێزن، بێگومان خوا چاودێرە بەسەرتانەوە}.

٣) واتە: {ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو قسەی ڕاستو ڕێکوپێك بکەن، ئەوسا (خوا) کارەکانتان بۆ چاك دەکاتو، گوناهەکانتان بۆ دەپۆشێ، وە هەر کەسێك گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بێگومان سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە}.

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلُّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ[1].

خوای پاكو بەرز ﷻ لە كتێبی باڵادەستی خۆیدا كە لە هیچ لایەكەوە هەڵەو پەڵە رووی تێناكا، بە پێغەمبەری خۆی ﷺ فەرمووە: ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ یوسف. واتە: {بڵێ: ئەمەیە رێبازی من كە لەبەر رۆشناییدا بانگەوازی خەڵك دەكەم بۆ لای خوا، خۆمو ئەوانەش كە شوێنم كەوتوون، پاكیی بۆ خوا (كە خەڵكی بۆ لای غەیری ئەو یان بە نەشارەزایی بانگ بكەم) وە من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم}.

ئەم ئایەتە بەهێزو پێزە، پێنج راستیی گەورەی تێدا دەدرەوشێنەوە، لە بواری بانگەوازو كارو جموجۆڵی ئیسلامییدا، كە بەكورتی ئاماژەیان بۆ دەكەین:

**یەكەم: بانگكردنو هێنانی خەڵك بۆ لای خوا ﷻ و بەرنامەكەی، جەوهەرو كاكڵی كاری ئیسلامییەو ئامانجی بەرزی رێبازو رێوشوێنی پێغەمبەری خوایە ﷺ:**

ئەم راستییەش چەندان دەقی كتێبی خوا ﷻو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەلالەتی لەسەر دەكەن، وێڕای رستەی: ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ ...﴾.

دیارە مادام حیكمەتی خوڵقێنرانو وجوودی (ئینسان)یش لەم سەر زەوییە، بریتی بێ لە بەندایەتی بۆ خوا كردن (العبودیة لله)، وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ الذاریات، واتە: (وە جنۆكەو ئادەمزادم

---

١) ئەمە (خطبة الحاجة)ی پێدەڵێن كە واباشە پێش هەر وتارو لێدوانێكی گرنگ بگوترێ. رواها إبن ماجه: ٤٥، وأحمد: (١٤٣٣٤)، (١٤٣٨٦)، ومسلم بعضها: (٤٣)، (٤٤)، (٨٦٧).

تەنها بۆ ئەوە دروستكردوون كە بـمپەرستن)، دیارە دەبێ هێنانەدیی ئەو حیكمەتو ئامانجەش، لوتكەی هەرە بەرزی كارو جموجۆڵی ئیسلامیی بـێ، هەربۆیـەش هـەم پێغەمبەری كۆتایی (خاتم النبیین) ﷺو هـەم سـەرجەم پێغەمبـەرانی خـواش علـیهم الصلاة والسلام، لەكاتی دواندنی گەلو میللەتەكانیاندا، پەیامو بەرنامەی خۆیانیـان بۆیان لەوەدا كورت هەڵێناوە، كە بۆیە هـاتوون تـاكو بیانخەنەسـەر ڕاستە شـەقامی بەندایەتیی بۆ خوا كردن!

ئەوەتا خوای زاناو توانا ﷻ بە پێغەمبەری سەروەرمان موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ﴿... قُلۡ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓۚ إِلَيۡهِ أَدۡعُواْ وَإِلَيۡهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾﴾ الرعد، واتە: {... بفەرموو: من تەنها بەوە فەرمانم پێ كراوە، كە خـوا بپەرسـتمو هاوبەشی بۆ دانەنێم، تەنها (خەڵكی) بـەرەولای وی بـانگ دەكـەمو، گەڕانـەوەش بەس بۆلای ویە}.

هەروەها هەر كام لە (نووحو هوودو ساڵحو شـوعەیب) علـیهم الـصلاة والـسلام لەكـاتی دواندنی گەلـەكانیـاندا، یەكەمـین قسەیان ئـەوە بـووە كـە فەرموویانـە: ﴿... يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ... ﴿٥٩﴾﴾ الأعـــراف، هـــەروەها ئایەتەكانی (٦٥، ٧٣، ٨٥) لە هەمان سوورەت، واتە: (ئەی گەلەكەم! بەندایەتیی بۆ خوا بكەن، جگە لەو هیچ پەرستراوی دیكەتان نین).

بەڵێ خەڵك بانگكردن بۆ لای خواو دەستگرتنیان بـەرەو بەرنامـەی خـواو، ڕێ پێشاندانیان بەرەو كانیاوی سازگاری خواناسییو خواپەرستیی، ئامانجو مەبەسـتی هەرە گەورەو بەرزی ڕەوانەكرانی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلامو ڕێبازی بـەرزو پیرۆزیانەو، هەوڵـدانیش بـۆ پەیـداكردنی هۆكارەكـانی هێـزو توانـاو باڵادەسـتیی مسوڵمانانو، بنیاتنانی كیانو قەوارەو (دەوڵـەتی ئیـسلامیی)یـش، كـە بـە دوایـین

ئاڵقەی زنجیرەی کارو چالاکی ئیسلامیی دادەنرێ، هەر ئامرازو هۆکارێکە لەو پێناوەداو، بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستو ئامانجە بەرزو مەزنەیە، چونکە لە ئەنجامی بالادەست بوونی مسوڵمانانو بەرپاکردنی ئایین (إقامة الدين)و پیادەکردنی شەریعەت (تطبيق الشريعة)دا، ئینسانەکان ژینگەو هەلو مەرجێکی لەبارو گونجاویان بۆ دەڕەخسێ، کە بتوانن ئازادانە تاقیکردنەوەی خۆیان لەم ژیانە دنیایی یەدا بدەن و، بە ویستی ئازادی خۆیان بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، یان نەیکەن، بەڵام بڕیار بدەن دەست لە دژایەتی پەیامو ڕێبازی خوا هەڵبگرن، هەربۆیەش خوای کاربەجێ ﷻ ئازادکردنی شاری مەککەو بە کۆمەڵ هاتنە نێو (ئیسلام)ەوەی خەڵکی، پێکەوە پەیوەست کردوونو فەرموویەتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾ النصر، واتە: (هەرکات یارمەتی خوا هاتو -شاری مەککە- ئازادکراو، خەڵکت بینی کۆمەڵ کۆمەڵ هاتنە نێو ئایینی خواوە، پەروەردگارت بە پاك بگرەو ستایشی بکەو داوای لێبوردنی لێ بکە، بێگومان ئەو زۆر تۆبە وەرگرە).

ئاشکراشە کە زانینو دەرککردنی ئەم ڕاستییە مەزنە، وا لە ڕێبوارانی ڕێی کارو جیهادی ئیسلامیی دەکات، کە هیچ شتێك تیغی ئیرادەیان کول نەکات و، لە هیچ بارودۆخێکی سەختو ناهەمواردا کۆڵ نەدەن و، هەمیشەو لە هەموو حاڵانیشدا سەرگەرمی کارە بنەڕەتییەکەی خۆیان بن، جا چ وەك یوسف ؈ بە ناهەق خزێنرابنە کونجی تاریکی زیندانەوەو، چ وەك سولەیمان ؈ بەپێی هەق، لەسەر تەختو کورسی حوکمڕانیی دانیشتبن!

ئەوەتا یوسف ؈ لە تاریکاییەکانی زیندانی میسریشدا، هەر سەرگەرمی کاری خۆیەتیو هاوەڵە زیندانییەکانی بۆ لای خوا ﷻ بانگ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩﴾ یوسف، واتە: (ئەی دوو هاوەڵەكانی زیندانم! ئایا چەند پەروەردگارێكی پەرتەوازە چاكترن، یان خوای تاكی مل پێكەچكەر)؟!

هەروەها (سولەیمان)یش ﷺ بەهەمان شێوە عیززەت و هەیبەت و نازو نیعمەتی حوكمڕانی و پادشایەتی، نەك هەر ئەو كارو ئەركە گەورەو گرنگەی لەبیر نەبردۆتەوە، بەڵكو ئەو حاڵەتەی وەك ئامرازێك بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە بەرزو مەزنە بەكارهێناوە و، بەسەرهاتی شاژنی سەبەء (ملكة سبأ)یش كە مێژوونووسان ناوی بە (بەلقیس) دەهێنن، نموونەیەكە لەو بوارەدا، كە خوای پەروەردگار ﷻ ئەو بەسەرهاتەی بەدرێژی لە سووڕەتی (النمل)دا هێناوەو لە ئایەتی ژمارە (٢٣) تا (٤٤)ی گرتۆتەوە، كە سەرەنجام شاژنە ژیرەكە دەڵێ: ﴿... رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٤٤﴾ النمل واتە: {... پەروەردگارم! من ستەمم لە خۆم كردووە -ئێستاش- لەگەڵ (سولەیمان)دا گەردنكەچ بووم (مسوڵمان بووم) بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەكان}.

**دووەم: بانگكردنی خەڵك و بەرەولای خوا هێنانیشیان، تەنها بریتی نیە لە بانگەوازكردنیان بە زمان و قسە بۆكردن و وتار بۆدانیان، بەڵكو چەمك و واتایەكی زۆر فراوانی هەیەو، هەموو ئەو شێوازو هۆكارانەی كە دەبنە مایەی ئەوەی خەڵكی بەرەو دینداریی و خواپەرستیی بێ و، بەندایەتیی بۆ خوا ئەنجامبدا دەیانگرێتەوە:**

هەر لە وتاردان و بابەت نووسینەوە بگرە، هەتا دەرس و دەور گوتنەوەو تەزكیەی نەفس و پەروەردەكردن و فەرمان بە چاكە كردن و خراپە قەدەغەكردن و جەنگ و جیهادو ... سەرەنجام، بنیاتنانی كۆمەڵگاو دامەزراندنی كیان و دەوڵەت.

گرنگیی و ئەهمیەتی زانین و دەرككردنی ئەم راستییەش، لەوەدایە كە بزانرێ پڕۆسەی بانگەوازو بانگكردنی خەڵك بۆ لای خوا ﷻ و بەرنامەكەی، شتێك نیە تەنها كاری زمان و قەڵەم بێ و، بەس ئەركی زانایانی ئیسلام بێ، بەڵكو پڕۆسەی ناوبراو كارێكی گەورەو گشتگیرەو، پێویستە تێكڕای وزەو توانایەكان و سەرجەم چین و توێژەكانی كۆمەڵ و كۆمەڵگای مسوڵمانی بۆ سازو ئامادە بكرێن، وەك خوای كاربەجێ ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾ آل عمران، واتە: (وە با ئێوە كۆمەڵێك بن كە بانگەواز بكەن بۆلای چاكەو، فەرمان بە هەرچی پەسندە بكەن و، قەدەغەی هەرچی خراپە بكەن، وە تەنها ئەوانەش سەرفرازن).

ئاشكراشە كە گەلێك جاران ئینسانی مسوڵمان بە رەوشتی بەرزو جوان و هەڵوێست و ئاكارێكی جوامێرانەی، هێندەی دەیان وتاری دڵگەرمانەو دەرس و دەوری حەكیمانە، كاردەكاتە سەر خەڵكی بۆ هیدایەتدان و بەرەو خوا هێنانیان.

هەروەها پێشتریش باسمانكرد، كە سازكردن و هێنانەدی هەل و مەرج و بارودۆخێكی دیندارانە، بۆ نموونە: كۆمەڵگاو كیان و قەوارەیەكی شەرعیی، كاریگەرترین دەوری هەیە، لە بەرچاو ڕوونكردنەوەی خەڵك و هیدایەتدان و دەست راكێشانیان بەرەو هەواری خواپەرستیی و دینداریكردندا.

**سێیەم: بانگەوازكردنی خەڵك و بەرەو خواو ئایین هێنانیان، بەبێ بەرچاوڕوونیی و شارەزایی مەیسەرنابێ: ﴿أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ﴾:**

بەڵێ بانگەوازكردنی خەڵك بەرەو خوا ﷻ و ڕێڕوونییكردنیان بەرەو (ئایین)و (شەریعەت)ەكەی، بەبێ شارەزایی و سەر راستیی سەرو بەر ناگرێ، ئینجا مەبەستیش لە بەرچاوڕۆشنی و شارەزایی زۆر شتە، بەڵام لە دوو خاڵدا كۆدەبنەوە:

أ/ شارەزایی لەبارەی ئایین‌و شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە ﷻ :

وەك لە سوورەتی (هود)دا خوای زاناو توانا لەسەر زمانی هەركام لـە (نـووح‌و ساڵح‌و شوعەیب) سەڵات‌و سەلامی خوایان لەسەربێ، فەرموویـەتی: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ... ﴿٢٨﴾ ﴾ هود، هەروەها لـە ئایەتـەكانی (٦٣، ٨٨)ی هەمان سوورەت، واتە: (فەرمووی: ئەی گەلەكەم! ئایـا دەبیـنن ئەگەر لەلایەن پەروەردگارمـەوە بەڵگـەم بەدەسـتەوە بـێ -ئایـا هـەر بـڕوام پـێ ناهێنن؟!-)

ب/ شارەزایی‌و بەرچاوڕوونیی لەبارەی ئەو واقیع‌و هەل‌و مەرجـەوە، كـە كـارو خەباتی ئیسلامیی تێدا ئەنجام دەدرێ.

چونكە وەك زانایان گوتوویانە: بابای (موفتی) هەتا دوو جۆرە زانیـاری نـەبن بۆی نیە فەتوا بدا:

١) ئاشنایی بەو واقیع‌و بارودۆخە كە دەیەوێ قسەی لەبارەوە بكات.

٢) شـارەزایی بـە حـوكمی شـەرعیی ئـەو رووداوە، تـاكو بەسـەریدا بیچەسپێنێ[1].

دیارە ئەم راستییەش شتێكی زۆر روونە، چونكە بێگومـان نـەك تـەنیا كـارو ئـەركی گـەورەی خـەڵك بـەرەو خـوا هێنـان، بگـرە هـیچ كـارێكی دیكـەش هەرچەندە بچووك بێ، بەبێ شارەزایی‌و بەرچـاوڕوونیی، ناگونجـێ جێبـەجێ بكرێ.

١) (إبن القيم) لـە كتێبـی (إعـلام الـموقعين عـن رب العالـمين)، ج: (١)، ص: (٩٤)دا، ئـەو مەسەلەیەی جوان باسكردوە، لەژێر ناوونیشانی: (بِمَ يَتَمَكَّنُ الحَاكِمُ عَنِ الفَتْوَى والحُكْم؟)دا.

**چوارەم: شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خواش ﷺ، وەك سەرمەشقەکەیان، ئەو شارەزاییو بەرچاوڕوونییەیان پێویستە** ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ﴾ :

بەڵێ هەمان بەرچاوڕوونی (بصيرة)ی بە مەرج گیراو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ شوێنکەوتووانیشی هەر مەرجە، ئەگەر بیانەوێ بە پەیڕەوانی وی دابنرێن، بەلاّم دیارە هەرکەسە بەپێی خۆیو لە قەدەر خۆی.

کەواتە: هەرکەسێك دەیەوێ بە شێوەیەك کارو چالاکی ئیسلامیی ئەنجام بدا، کە مایەی ڕەزامەندیی خوا بێو بۆ دنیاش بەرهەمدار بێ، با بەرلەوەی بیر لە کاری ئیسلامیی و خەڵك بۆ لای خوا بانگکردن بکاتەوە و، هیچ هەنگاوێك لەوبارەوە بنێ، خەمو مشووری شارەزاییو تێگەیشتن (التَبَصُّر والتَّفقُّه) لەبارەی دینو ژینەوە بخوا، ئەگەرنا با دڵنیابێ کە نەك هەر هیچ بەهیچ ناکا، بگرە خۆیو خەڵکیش گیرۆدەی زەرەرو زیانی زل زل دەکات، وەك لە مێژووی دوورو نزیکی ئیسلامو مسوڵماناندا زۆر نموونەی کاری کرچو کاڵو بێ سەروبەرەی ئەو پیڕو تاقمە نەزانو هەڵەشەو پەلەشانەمان هەن، کە بوونەتە مایەی عەیبدارییو گوناهباریی خۆیانو، زیان گەیاندن بە ئیسلام و، سەغڵەتو ناڕەحەتکردنی مسوڵمانانو، پێخۆشکردنی ناحەزو دوژمنانیان[1].

---

١) تاقمی (أنصار الإسلام) نموونەیەکی زەقو نزیکی ئەو حاڵەتە زیانبەخشانە بوون، کە لە (کوردستانی عێراق)دا مایەی زیانو سەرئێشەی زۆربوون بۆ ئیسلامو مسوڵمانانو، هەتا بڵێی ئەزموونێکی فاشیلو بێ خێریان بە ناهەق بەناوی ئیسلامو جیهادەوە تۆمارکردو، هەرچەندە مسوڵمانان بەگشتیو بەتایبەت سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامیی زۆری ئامۆژگاریی کردنو، ئەو سەرەنجامە شوومو پەشیمانییەی ئێستا پێی گەیشتوون خستە بەرچاویان، بەلاّم گوێیان نەگرت!

بەڕاستی (عارەب)یش لەوبارەوە جوانیان گوتوە: (قَدْ يَبْلُغُ الْجَاهِلُ مِنْ نَفْسِهِ مَا لا يَبْلُغُ مِنْهُ عَدُوُّهُ)، واتە: (جاری وا هەیە بابای نەفام شتی وا بەخۆی دەكات و خۆی تووشی چۆرتمی وا دەكات، كە دوژمنی ئەوەی پێ لەگەڵ ناكرێ).

**پێنجەم: بەپێچەوانەوە، خەڵك بۆلای غەیری خوا بانگكردنو، بە نەشارەزایی دەست بۆ كاری ئیسلامیی بردن، دوو خەسڵەتی پیسو خراپن، كە بە هیچ شێوەیەك لە خوا ﷻو ئایینەكەی ناوەشێنەوەو، خەسڵەتو نیشانەی هاوبەش بۆ خوا دانەرانن:** ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾:

بەڵێ لەڕاستیدا ئەم دوو رستە قورئانییە كە كراون بە (مِسْكُ الْخِتَام)ی ئەم ئایەتە بەهێزو پێزەی خوای كاربەجێ ﷻ، مادام لە دوای ئەو راستییە گەورانە هاتوون كە باسمانكردن، بە روونیی ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە كە هەركام لە:

أ/ خەڵك بۆ لای غەیری خوا بانگكردن.

ب/ بە نەشارەزایی خەڵك بۆلای خوا بانگكردن.

كە یەكەمیان پێچەوانەی خەڵك بۆلای خوا بانگكردن ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ە و، دووەمیان پێچەوانەی لەبەر رۆشنایی و شارەزاییدا خەڵك بانگكردن ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ﴾ە.

بەڵێ هەركام لەو دووانە، خەسڵەتی پیسو بەدنو شایستەی خوا ﷻو ئایینەكەی نین و، ئەو جۆرە سیفەتانە هەر لە ئەهلی كوفرو شیرك دەوەشێنەوە.

شایانی باسیشە كە خەڵك بانگكردن بۆ لای غەیری خوا، پێچەوانەی خوا بەیەكگرتن (توحيد)ە و، جۆرێكە لە هاوبەش دانانی گەورە (الشرك الأكبر) و، بە نەشارەزایی و نەزانانە خەڵك بانگكردنو كار بۆ ئیسلام كردنیش، پێچەوانەی شوێن

پێی پێغەمبەر هەڵگرتن (إتباع الرسول)ە ﷺ، كـە لـە شـەرع لادانو (بیدعـەت)ە، ئاشكراشە كە بناغـەی دینـداریی‌و مـسوڵمانەتی، تـەنها خـوا پـێ مەبەسـت بـوون (الإخـلاص لله)و بەپێی شەرع بەڕێوەچوونو شوێن پێغەمبەر كەوتن (إتباع الرسول)ە ﷺ، بـە پێـچەوانەشـەوە مـاكو میكـرۆبی لادانو سـەرلێـشـێوانیش، لـە شـەرع لادانو هاوبەش بۆ خـوا دانـان (البدعـة والـشرك)ە، كـە راسـت دژو پێـچەوانەی (الإخلاص)و (الإتباع)ن.

ئینجا لەبەر تیشكی ئەو پێنج راستییەدا كـە رابـردن، دەڵـێین: بێگومـان مـەرجی یەكەمو هەرە گرنگی سەرو بەر گرتنی هەر كارو جموجۆڵێكی ئیـسلامیی، لـە هـەر كاتو شوێنێكدا، ئەوەیە كە لەسەر بناغەی بەرنامەیەكی رۆشن بنیاتنرابێ، كە هیچ تێكەڵیی‌و تەمو مژێكی تێدا بەدی نەكرێ.

هەربۆیەش بەندە بە ماوەیەك پێش راگەیانـدنی كۆمـەڵی ئیـسلامیی، هەڵـسام بـە نووسینو رێكخستنی كۆمەڵێك بنەمای شەرعیی‌و هێڵی گشتی فیكریی‌و سیاسـیی، كە سەرجەم بیستو پێنج (٢٥) خاڵنو، پێم وایـە بـۆ هـەر كۆمـەڵێكی ئیـسلامیی پێویستن، ئەگەر بویسترێ ئـامرازو هۆكـارێكی كاریگـەرو سـەركەوتوو بـێ، بـۆ گۆڕانكاریی‌و چاكسازیی چاوەڕوانكراو.

دیارە ئەو بنەماو هێڵە گشتییانە لە بیستو پێنج خاڵ دا نووسـراون، بـەڵام كـاتی خۆی زۆر بە كورتیی‌و پوختیی نووسراون وەك مەتنێك و، پێویستییان بە لێكدانـەوە هەیە، بەندەش خوا پشتیوان بێ بۆئەوەی رێی هەر جۆرە لێكدانەوەو تەئویلێكی ئەو بنەماو هێڵانە لە ئەمو ئەو بگرم، كە خۆم مەبەستم نەبوونو نین، بە باشم زانـی كـە شـەرحو لێكـدانەوەیەكی پوخـتو روون، لەسـەر ئـەو بنـەما شـەرعیی‌و هێڵـە گشـتییانە بكەم.

لە خوای بەرزو مەزنیش داواکارم کە بە کـەرەمو لـوتفی بـێ سـنووری خـۆی، رێگام پێشان بداتو سەرکەوتووم بکات بۆ هەقو راستیی، وە لە هەڵەو پەڵەو لادان بـمپارێزێ، بێگومان خوا چاکترین سەرپەرشتیکەرو یاریدەدەرەو، هەر ئەو لەسـەر هەموو شتێك بەتوانایەو شایستەی بەدەنگەوە هاتنە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

هەولێـر
٢٩ شەووال ١٤٣١ کۆچی
٧ تشرینی یەکەم ٢٠١٠ زایینی

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

# بنەمـای یەکـەم

## تێگەیشـتنی راسـت و دروســت

## لە ئیســلام

# بنەمای یەكـەم

## تێگەیشـتنی راسـت و دروسـت لە ئیسـلام

تێگەیـشتنێكی راسـتو دروسـت (فهـم صـحیح وسـلیم)ی ئیـسلام –كـە لـە قورئـانو سـوننەتدا بەرجەسـتەیە-، لەبـەر رۆشـنایی تێگەیـشتنو زانـستو ئەزموونی زانایـانی پێـشینی چاكمانو زانایـانی متمانەپێكراوماندا بەگـشتیو، بەتایبەت هی سێ سەدە شایەدیی بۆ دراوەكان، وەك:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرموێ: (خَيْـرُ النَّـاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِيـنَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ...) رواه البخـاري: (٣٦٥١) واللفـظ لـه، ومسلم: (٢٥٣٣)، عن عبدالله ابن مسعود ﵁. واتە: (باشتـرین خەڵك ئەو سەدەیەن كە من لەنێویاندام، دوایی ئەوانی دوای وان، پاشان ئەوانی دوای وان ...).

ئەو تێگەیشتنەش بریتیە لە: (تەنها ئیسلام بە بەرنامە -دیـن-ی راسـتو تێـرو تـەواو زانینـی ژیـانی ئینـسان، بـە تـاكو كۆمـەڵو كۆمەڵگـاو دەوڵەتـەوە)، وەك:

٢- خـوای كاربـەجێ ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ...﴿٣﴾﴾ المائدة، واتـە: (ئـەمڕۆ بەرنامەكەتانم بۆ تەواوكردن، وە چاكەی خۆم بەتـەواویی لەگەڵـداكردن، وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسندكردن ...).

**٣- هـەروەها خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي ٱلْأٓخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾** آل عمران، **واتـە: (وە هـەر كەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەكی دیكە بخوازێ، بە تەئكید لێی وەرناگیرێ، وە لە دوارۆژدا لە زیانبارانە).**

## ڕوونكـردنەوە:

بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم بنەمایە كە بنەمای یەكەمە لەو بیستو پێنج بنەماو هێڵە گشتییەی كە كۆمەڵی ئیسلامیی لەسەریان بەڕێوەدەچێ، ئەم پێنج خاڵە دەخەینەڕوو:

### یەكەم: زانیاری لە پێش كردەوەوەیە (الْعِلْمُ قَبْلَ الْعَمَل):

ئەم حەقیقەتە كە (زانیاری لە پێش كردەوەوەیە) زۆر لە ئایەتەكانو فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ رایدەگەیەنن، بەلاَم ئێمە وەك بنچینەیەك گوتوومانەو زانایانیش هەموویان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە بەبێ زانیاریو تێگەیشتنو بەبێ بەرچاوڕوونیی، بەهیچ جۆرێك هیچ جۆرە كارو چالاكییەكی ئیسلامییو غەیری ئیسلامییش، بەشێوەیەكی راستو دروست ئەنجام نادرێ (دیارە ئێمە لێرەدا باسی كارو چالاكی ئیسلامیی دەكەین)، وە هەر كارێك لەسەر زانستو تێگەیشتن بنیاتنەنرابێ، نە سەردەگرێو نە بەردەگرێ، وە نە بە كەڵكی دنیا دێو نە بە كەڵكی دواڕۆژ دێ، بەڵكو هەر كردەوەیەك بناغەی نەزانین بێو لەسەر بناغەی نەشارەزایی بنیاتبنرێ، نەك هەر بەهرەی لێ وەرناگیرێو بەرهەمی نابێو هیچی لێهەڵناوەرێ، بگرە خاوەنەكەی زۆریشی لەسەر قەرزدار دەبێتەوە.

خوای كاربەجێش ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ ...﴿١٩﴾﴾ محمد، واتە: (بزانە كە جگە لە خوا پەرستراوی دیكە نین، وە داوای لێبوردن ـلە خواـ بكە بۆ گوناهت).

وەك دەبینین خوای زاناو توانا ﷻ، دوو فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی ﷺ كردوون:

١/ ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾، واتە: (بزانە كە جگە لە خوا پەرستراوی دیكە نین)، كە ئەمە زانیاریی و هەقناسینە.

٢/ ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾، واتە: (وە داوای لێبوردن – لە خوا ـ بكە بۆ گوناهت)، ئەمەش كردەوەیە.

كەواتە: كردەوە دەبێ بەدوای زانیارییدا بێ.

هەروەها خوای بەرزو مەزن دەربارەی هۆكاری شكستی هەزار لە كافران، لە بەرانبەر سەد لە ئەهلی ئیماندا، فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ٦٥﴾ الأنفال. واتە: (ئەی پێغەمبەر! بڕواداران هانبدە لەسەر جەنگ، ئەگەر لە ئێوە بیست كەسی خۆڕاگر هەبن، بەسەر دوو سەد كەسدا زاڵ دەبن، وە ئەگەر لە ئێوە سەد كەس هەبن، بەسەر هەزار كەسدا لەوانەی بێبڕوان زاڵ دەبن، چونكە ئەوان خەڵكانێكن نافامن)، كەواتە: هۆی شكستی دە كافر لە بەرانبەر مسوڵمانێكدا، ئەوەیە كە كافرەكە بەپێچەوانەی مسوڵمانەكەوە، خاوەنی شارەزایی و تێگەیشتن نیەو نافامیی و نازانیێ.

بڕوانە، بڕواداران بەهۆی تێگەیشتنێكەوە كە لە دینی خوادا هەیانە، ئەو تێگەیشتن و فیقهە، وایان لێ دەكات خۆڕاگر بن، خوای بەرزو مەزن دەفەرمویێ: ﴿ قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ

ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾﴾ التوبة، واتە: (بڵێ: ئایا ئێوە جگە لە یەكێ لە دوو موژدە هەرە چاكەكان ـ سەركەوتن یان شەهیدبوون ـ چیدیكەمان بۆ چاوەڕێ دەكەن؟ وە ئێمەش چاوەڕێتانین كە خوا بە سزایەكی تایبەتی خۆی، یان بە دەستی ئێمە، دووچارتان بكات، جا چاوەڕوان بن، ئێمەش لەگەڵتان چاوەڕوانین).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی گرنگیی تێگەیشتن ـ بەتایبەت لە دیندا ـ دەفەرمویێ: {رَأْسُ الْحِكْمَةِ مَخَافَةُ اللهِ}، رواه البيهقي في شعب الإيمان: (٧٤٢ – ٧٤٣ – ٧٤٤)، وضعفه، واتە: (سەری هەموو دانایییەك لە خوا ترسانە)، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ} رواه البخاري: ٧١، ومسلم: ١٠٣٧، والترمذي: (٢٦٤٥)، وابن ماجه: (٢٢٠)، واتە: (هەركەسێك خوا خێرو چاكەی پێ ڕەوابیبنێ، لە دیندا شارەزای دەكات)، ئێمە دوو وشەی (فهم)و (فقه)مان هەن، ئینجا وشەی (فقه) (تێگەیشتنێكی قووڵ‌و ورد) دەگەیەنێ، كەواتە: مەسەلە ئەوە نیە مسوڵمان چەند ئایەتی خوا ﷻ و چەند فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەردەكات؟ مەسەلە ئەوەیە چەند تێدەگات؟ خوا ﷻ باسی جوولەكەكان دەكات، دەفەرمویێ: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥﴾﴾ الجمعة، واتە: {حاڵی ئەوانەی (تەورات)یان بۆ نێردرا كاری پێ بكەن‌و پاشان هەڵیان نەگرت، وەك وێنەی ئەو كەرە وایە، كە بارێك كتێبی لەپشتێ نراون –لێیان بەهرەمەند نیە-، خراپترین نموونە هی كەسانێكە كە ئایەتەكانی خوایان بە درۆ دەزانن، خواش ڕێنوێنیی گەلی ستەمكاران ناكات}.

دیارە پێشتریش لە پێشەكی ئەم ڕوونكردنەوەیەدا تاڕاددەیەك تیشكمان خستە سەر ئەم مەسەلەیە .

**دووەم: بۆیە لەبارەی ئیسلامەوە گوتوومانە: ئەو ئیسلامە (كە خۆی لە قورئانو سوننەتدا دەبینێتەوە):**

چونكە بێگومان ئاینو بەرنامەی خوا ﷻ تەنها ئەو دەقانەن كە لەڕێی سروش (وَحِي)یەوە هاتوون، جا چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ كە (قورئان)ە، وە چ بەشێوەی ناڕاستەوخۆ كە (سوننەت)ە، بەڵێ (ئیسلام)ێك كە دەبێ پێیەوە پابەند بین، ئەو (ئیسلام)ەیە كە لە (قورئان)و (سوننەتی پێغەمبەر)دا ﷺ بەرجەستەیە .

پێشەوا (شافیعی)یش لەوبارەیەوە شیعرێكی جوانی گوتوە :

كُـلُّ العُلُـومِ سِوَى القُـرْآنِ مَشْغَلَـةٌ
وَسِوَى الحَدِيثِ وَالفِقْهِ فِي الدِّينِ
العِلْمُ مَاكَانَ فِيهِ: قَالَ حَدَّثَنَا
سِوَى ذلِكَ وَسْوَاسُ الشَّيَاطِينِ

واتە: {هەموو زانستەكان بێجگە لە زانستەكانی قورئانو فەرموودەو زانستی لە دین شارەزابوون، خۆ سەرقاڵكردنە، زانست ئەوەیە كە تێیدا: (گوتی، بۆی باسكردین) هەبێ، جگە لەوە، ئەویدیكە هەمووی خوتخوتەی شەیتانانە} .

ئاشكراشە كە مەبەستی (شافیعی) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لە وشەی (العلم) لە ڕستەی: (العِلْمُ مَاكَانَ فِيهِ قَالَ حَدَّثَنَا ...)دا، زانیاری شەرعییە، واتە ئەو زانیارییەی كە بە دین دادەنرێ، ئەگەرنا شتێكی ئاشكرایە كە زانیاری دنیایی (العلم

الدنيوي) نە لە قورئانو سوننەتدا كورت هەڵاتووە، نە بە (خوتخوتەی شەیتانان)یش دادەنرێ، بەڵام بەتەئكید هەر قسەیەك لە وەحییەوە نەهاتبێو بەناوی (ئایین)ەوە بكرێو، بە بەشێك لە ئایین دابنرێ، ئەوە شتێكی ڕاست نیەو (خوتخوتەی شەیتان)ە.

كەواتە: هەرچی بەرهەمو لێكدانەوەو شەرحو تەفسیری زاناو پێشەوایانە، هەرچەندە پایەدارو بەڕێز بن، هەر بە تێگەیشتن (فهم)ی ئەوان دەربارەی دین دادەنرێ و، دەبێ هەر بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، نەك وەك دەق (نص)ێكی دینیو خودی دین.

**سێیەم: بێگومان پێشینەی چاك (السلف الصالح)مان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ، بەگشتی سەرمەشقو پێشڕەومانن‌و، شەرعو عەقڵ لەسەرمان پێویست دەكەن، كە بە چاكترین شێوە لە تێگەیشتنو بیروبۆچوونو ئەزموونەكانیان بەهرەمەندبین، بۆ چاكو ڕاستو دروست تێگەیشتنمان لە كتێبی خوا ﷻو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ:**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ...} رواه البخاري: (**٣٦٥١**) واللفظ له، ومسلم: (**٢٥٣٣**)، عن عبدالله ابن مسعود رضي الله عنه، واتە: (باشترین خەڵك ئەو سەدەیەن كە من لەنێویاندام، دوایی ئەوانی دوای وان، پاشان ئەوانی دوای وان ...).

لێرەدا وەك بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوە كە خەڵكی سێ سەدەكان بەگشتیو، بەتایبەت هی سەدەی یەكەم كە (هاوەڵان)ی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوان –

خوا لێیان رازی بێ- تێگەیشتن و پێگەیشتنیان لە ئایین و بەرنامەی خوادا، لە هی دوای خۆیان چاکترو تەواوتر بووە، بە پەسندی دەزانم ئەم رووداوە بە نموونە بهێنمەوە:

(عَنْ أَسْلَمَ أَبِي عِمْرَانَ التُّجِيبِيِّ قَالَ كُنَّا بِمَدِينَةِ الرُّومِ فَأَخْرَجُوا إِلَيْنَا صَفًّا عَظِيمًا مِنْ الرُّومِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ مِنْ الْمُسْلِمِينَ مِثْلُهُمْ أَوْ أَكْثَرُ، وَعَلَى أَهْلِ مِصْرَ، عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ، وَعَلَى الْجَمَاعَةِ فُضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ عَلَى صَفِّ الرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ، فَصَاحَ النَّاسُ وَقَالُوا: سُبْحَانَ اللَّهِ يُلْقِي بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ، فَقَامَ أَبُو أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ لَتُـأَوِّلُونَ هَـذِهِ الْآيَـةَ هَـذَا التَّأْوِيلَ، وَإِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ فِينَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ لَمَّا أَعَزَّ اللَّهُ الْإِسْلَامَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ سِرًّا دُونَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَمْوَالَنَا قَدْ ضَاعَتْ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعَزَّ الْإِسْلَامَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَلَوْ أَقَمْنَا فِي أَمْوَالِنَا فَأَصْلَحْنَا مَا ضَاعَ مِنْهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ يَرُدُّ عَلَيْنَا مَا قُلْنَا: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ... ﴿١٩٥﴾﴾ فَكَانَتْ التَّهْلُكَةُ الْإِقَامَةَ عَلَى الْأَمْوَالِ وَإِصْلَاحِهَا وَتَرْكَنَا الْغَزْوَ، فَمَا زَالَ أَبُو أَيُّوبَ شَاخِصًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى دُفِنَ بِأَرْضِ الرُّومِ) رواه الترمذي: ٢٩٧٢، وقال: حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، وقال الألباني: صحيح، واته: {(أَسْلَمْ أَبِي عِمْرَانُ التُّجِيبِيِّ) دەڵێ: ئێمە لە شاری رۆمەکان بووین ـ مەبەستی (قوستەنتینیە)یە کە دەکاتە (ئەستەمبووڵ)ی ئێستا، ریزێکی گەورەی لەشکریان بۆمان دەرکرد، لە (مسوڵمانان)یش ریزێکی وەك ئەویان گەورەتر بۆیان دەرچوو، فەرماندەی خەڵکی میسر، عوقبەی کوڕی عامر بوو، وە فەرماندەی لەشکرمان فوزاڵەی کوڕی عوبێد بوو، پیاوێك لە ئێمە خۆی بە ریزی رۆمەکان دادا، تا چووە نێویان، خەڵکەکە هاواریان کردو گوتیان: (سُبْحَانَ اللَّهُ)، بەدەستی خۆی خۆی فەوتاند، ئەبو ئەییوبی ئەنساریی هەڵسایەوەو گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە بەو شێوەیە لێکدەدەنەوە؟ ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمەی ئەنسارییەکان دابەزێنرا، دوای ئەوەی خوا ﷻ (ئیسلام)ی بەهێزو شکۆدار

كردو پشتگیرانی زۆربوون، هەندێكمان بە نهێنیی و بەبێ ئاگاداری پێغەمبەر ﷺ بە هەندێكی دیكەمانی گوت: ماڵمان بەزایەچوو، ئەوە خواش (ئیسلام)ی بەهێز كردو شوێنكەوتووانی زۆربوون، با لێرە بەدوا لەنێو ماڵو منداڵەكانمان نیشتەجێ بینو، گرنگییان پێ بدەینو ئەوەی بەزایەمان داوە قەرەبووی بكەینەوە، خواش ﷻ ئەم ئایەتەی لە وەڵامدانەوەی ئێمە دابەزاندە سەر پێغەمبەرەكەی ﷺ: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ...﴿١٩٥﴾﴾ البقرة، واتە: (لەرێی خوادا ببەخشنو خۆتان مەفەوتێنن ...)، كەواتە خۆ فەوتاندن ئەوەیە خۆ بە ماڵ كۆكردنەوەوە خەریك بكەینو واز لە جیهاد بهێنین.

جا ئەبو ئەییوب بەردەوام لەسەرێ بوو لەپێناوی خوادا ﷻ، تا لە خاكی رۆمەكان بەخاك سپێردرا}.

هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾ التوبة، واتە: (وە پێشكەوتوە یەكەمەكان لە كۆچكەرانو پشتیوانان وە ئەوانەی كە باش بەدوایان كەوتن، خوا لێیان رازی بووو ئەوانیش لە خوا رازی بوون، وە خوا چەندان باخو بێستانی بۆ ئامادەكردوون كە رووبارگەلێك بەژێریاندا دەڕۆن، بە نەمریی و تا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە، هەر ئەوەش بردنەوەی گەورەیە).

هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ...﴿٢٩﴾﴾ الفتح.

واتە: (موحەممەد ﷺ رەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لەگەڵیدان، بەرانبەر بێبڕوایان جەربەزەو توندن، وە لەنێوان خۆیاندا بەسۆزو دڵنەرمن، دەیانبینی هەردەم خەریکی رکووعو سەجدەن، مەبەستیان بەدەستهێنانی چاکەو رەزامەندیی خوایە ...).

حیکمەتی ئەو جەختکردنەش لەسەر بەهرە وەرگرتنی مسوڵمانان لە پێشینەی چاکیان، ئەوەیە کە ئەوان رەحمەتی خوایان لێبێ، بەگشتی بەهۆی زیاتر نزیکییان لە چاخو سەردەمی زێرینی ئیسلامەتییەوە، کە رۆژگاری پێغەمبەری خوایە ﷺ، تێگەیشتنیان بۆ قورئانو سوننەت راسترو، ئاشناییان بە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاترو، ئیمانیان قووڵترو، عیبادەتیان چاکترو، تەقواو تەزکیەیان پترو، بۆ خوا یەکلابوونەوەو ساغییان زیاتر و، فیداکارییان لەرێی خوا باشتر و، پابەندییان بە شەریعەتەوە زیاتر و، لە بیدعەتو داهێنان دوورتر بوونە، وەك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ـ خوا لێی رازی بێ ـ لەوبارەوەو لە وەسفی (هاوەڵان)ی بەرێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوادا ـ خوا لێیان رازیبێ ـ، گوتوویەتی: (مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُتَأَسِّيًا فَلْيَتَأَسَّ بِأَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، فَإِنَّهُمْ أَبَرَّ هَذِهِ الأُمَّةِ قُلُوبًا وَأَعْمَقَهَا عِلْمًا وَأَقَلُّهَا تَكَلُّفًا وَأَقْوَمَهَا هَدْيًا وَأَحْسَنَهَا حَالاً، قَوْمٌ إِخْتَارَهُمُ اللهُ تَعَالَى لِصُحْبَةِ نَبِيِّهِ ﷺ وَإِقَامَةِ دِينِهِ، فَاعْرِفُوا لَهُمْ فَضْلَهُمْ وَاتَّبِعُوهُمْ فِي آثَارِهِمْ، فَإِنَّهُمْ كانُوا عَلَى الْهُدَى الْمُسْتَقِيمِ) جامع بيان العلم وفضله، ج: (٢)، ص: (١٣٤)، واتە: {ئەوەی لە ئێوە دەیەوێ کەسێك بکاتە سەرمەشقی خۆی، با هاوەڵانی موحەممەد ﷺ بکاتە سەرمەشقی خۆی، چونکە ئەوان لە هەموو خەڵکی ئەم ئۆممەتە دڵیان چاکترەو، لە هەموویان زانیارییان قووڵترەو، لە هەموویان تەکەللوفو خۆ ئەزیەتدانیان کەمترەو، لە هەموویان رێبازیان راسترەو، حاڵیان لە هەموویان باشترە، کۆمەڵێکن خوا

هەڵبیژاردن بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرەكەیو ڕاگرتنی دینەكەی، چاكەیان پێ بزانن و بەدوای شوێنەواریان بكەون، چونكە ئەوانە لە سەر ڕێبازی ڕاست بوون} .

بەڵام پێویستە وریاش بین و وانەزانین كە تێگەیشتن و بەرهەم و كەلەپووری زانایانی پێشینی چاكمان، جێگرەوە (بدیل)ی تێفكرین و تێگەیشتن و كۆشش (إجتهاد)ی خۆمانە، چونكە ئەوان بۆ مەسەلەو پێشهات و ڕووداوەكانی ڕۆژگاری خۆیان كۆشش (إجتهاد)یان لە قورئان و سوننەتدا كردووە، ئێمەش پێویستە بۆ هی ڕۆژگاری خۆمان بیرێكی تازە بكەینەوەو كۆشش (إجتهاد)ی تایبەتی خۆمان بكەین، بەڵگەشمان بۆ ئەم قسەیەمان ئەوەیە كە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، واتە: (... وە زیكرمان بۆ تۆ ناردۆتە خوارێ تا ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە بۆیانی ڕوون بكەیەوە، وە بۆ ئەوەی بۆخۆشیان بیربكەنەوە). ئەم فەرموودەیەش لەوبارەوە بەڵگەیەكی بەهێزە: (عَنْ أُنَاسٍ مِنْ أَهْلِ حِمْصَ مِنْ أَصْحَابِ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا أَرَادَ أَنْ يَبْعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ قَالَ: «كَيْفَ تَقْضِي إِذا عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ»؟ قَالَ: أَقْضِي بِكِتَابِ اللَّهِ، قَالَ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي كِتَابِ اللَّهِ»؟ قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلاَ فِي كِتَابِ اللَّهِ»؟ قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي وَلاَ آلُو، فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدْرَهُ وَقَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ لِمَا يُرْضِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ) رواه أبوداود: (٣٥٩٢)، والترمذي: (١٣٢٧)، وقال الألباني: ضعيف. واتە: {موعازی كوڕی جەبەل گێڕاویەتەوە كە كاتێك پێغەمبەر ﷺ بۆ (یەمەن)ی دەنارد، پێی فەرموو: ئەگەر كێشەیەكت هاتە پێش چی دەكەی؟ گوتی: لە كتێبی خوادا بۆی دەگەڕێم (واتە: بۆ حوكمەكەی)، فەرمووی: ئەگەر لە كتێبی خوادا نەتدۆزییەوە چی دەكەی؟ گوتی:

لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆی دەگەڕێم، فەرمووی: ئەگەر لەوێشدا نەتدۆزییەوە چی دەكەی؟ گوتی: بە رای خۆم كۆشش دەكەمو كەمتەرخەمیی تێدا ناكەم، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لە سینگی داو فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە نێردراوی پێغەمبەری خوای سەركەوتوو كرد بۆ ئەو شتەی كە پێغەمبەری خوا پیێ رازییە).

ڕەحمەتی خواش لە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز خەلیفەی راشیدی ئیسلام بیێ، كە لەوبارەوە گوتوویەتی: (تَجِدُّ لِلنَّاسِ مِنَ الأَقْضِيَةِ بِقَدْرِ مَا تَجِدُّ لَهُمْ مِنَ القَضَايَا)، واتە: (خەڵك بڕیارو یاسای تازەیان بۆ پەیدادەبن، بە ئەندازەی ئەوەی كە كێشەی تازەیان بۆ پەیدادەبن).

**چوارەم: لەنێو پێشینەی چاكیشماندا خەڵكی سێ وەچەكان (الأجيال الثلاثة) كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە (القرون الثلاثة) ناوی بردوون، لە هەموو پێشینەی چاكمان (سلفنا الصالح) چاكترو متمانەپێكراوترن:**

چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ تەزكیەی كردوونو شایەدیی بۆ داون، فەرموویەتی: {خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ...} رواه البخاري: (٣٦٥١) واللفظ له، ومسلم: (٢٥٣٣)، عن عبدالله ابن مسعود رضي الله عنه.

دیارە ئەو سێ وەچەو سەدەیەش بریتین لە: هاوەڵانو شوێنكەوتووانیانو شوێنكەوتووانی شوێنكەوتووانیان (الأصحاب وتابعوهم وتابعو تابعيهم)، جا دیارە ئەمانیش لەڕووی زەمانەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا وە ﷺ هەتا ساڵی

(٢١٠)ی كۆچی، یان ئەوپەڕەكەی (٢٣٠)ی كۆچی دەخایەنێ، چونكە وەچەیەك (جیلێك) بە (٧٠) ساڵ دانراوە، (٣ × ٧٠ = ٢١٠).

حیكمەتی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواش ﷺ كە دەفەرموێ: خەڵكی (مسوڵمان)ی ئەو سێ سەدەیە چاكترینی خەڵكی (مسوڵمان)ن، ئەوەیە كە مسوڵمانان بە درێژایی مێژوو، زاناو پێشەوایانی ئەو سێ وەچە هەڵبژاردەیە بكەنە سەرمەشقی خۆیانو سەنگی مەحەكی دینداریی‌و مسوڵمانەتییان، هەم لەڕووی تێگەیشتن‌و هەم كردەوەشەوە، چونكە مادام پێغەمبەری خوا ﷺ شایەدیی چاكتربوون (خیرية)ی بۆ (مسوڵمانان)ی ئەو سێ سەدەیە داوە، دیارە هەم زانیاریی‌و تێگەیشتنیان‌و هەم پابەندیی‌و كردەوەشیان، بەگشتی لە هی سەرجەم (مسوڵمانان)ی سەدەو وەچەكانی‌دیكە چاكترە، بۆیە پەیڕەویی لێكردنیان پێویستە.

بەڵام لێرەدا پێویستە حەوت ڕاستییمان لەبەرچاو بن:

**١/ پێشینی چاك تەنیا ئەوانەن كە چاك بوون، نەك هەموو ئەوانەی لەو مێژووەدا ژیاون:**

واتە ئەوانەی كە لەو ماوە زەمەنییەدا ژیاون، هەموویان بە پێشینی چاك لە قەڵەم نادرێن، هەتاكو ـ بۆ وێنە ـ یەزیدی كوڕی موعاویەش بگرێتەوە، یان حەججاجی كوڕی یوسف بگرێتەوە، كە دەڵێن: سەد هەزار كەسی هەر لەسەر چەرم كوشتوە، چەرمیان بۆ ڕاخستوەو ئەویش شمشێری لە ملی داون، پیاوی وەك سەعیدی كوڕی جوبەیری كوشتوە ـخوا لێی خۆشبێـ، ئەوە خاڵێكی گرنگە، چونكە هەندێك جار هەندێك لە حوكمڕانانی ساختەچیی‌و دەست‌و پێوەندەكانیان بۆ مەبەستی سیاسی، دەڵێن: ئەوەی لەو ماوە زەمەنییەدا ژیابێ، هەمووی پێشینی چاك (سەلەفی ساڵح)ن! بۆ نموونە: موعاویە كە دەسەڵاتی كردۆتە میراتیی، وەك پادشاكانی ڕۆم‌و فارس‌و، یەزیدی كوڕی كردۆتە

میراتگری خۆیو، هەر لە ژیانی خۆیدا (بەیعەت)ی بۆ وەرگرتوە، دەڵێن: مادام ئەوانە (سەلەفی ساڵح)ن، دیارە ئەوەش شتێکی باشە، بۆیە کردوویانە!

بەڵێ سەلەفی ساڵح هەر ئەوانەن کە چاك بوونو ئەوانەی خراپ بوون، یان گریمان باشیش بووبن، بەلاّم هەڵەو ناشەرعیان بووبێ، ئەوە لە هەڵەو ناشەرعییەکانیاندا بۆ ئێمە سەرمەشق نینو، لەلای خوای پەروەردگاریش چاك نین، تاکو ئێمە بیانکەینە سەرمەشقو پێشڕەوی خۆمان.

**٢/ شوێنکەوتنی پێشینی چاك، ئێمە بێ نیاز ناکات لە بەکارهێنانی عەقڵی خۆمان، بەڵکو عەقڵی خۆ بەکارنەهێنان (جمود)، لادانە لە ڕێبازی سەلەفی ساڵح:**

لەڕاستییدا ئەوە یەکێکە لە بەڵگەنەویستەکان، چونکە ئەوەندەی سەلەفی ساڵح عەقڵی خۆیان بەکارهێناوە، خەڵکی دیکە هێندە عەقڵی خۆیان بەکارنەهێناوە! بێگومان ئەگەر چاك عەقڵی خۆت بەکارنەهێنی، دینت بۆ تێکەڵ ناکرێ لەگەڵ (ژین)داو تەفاعولت بۆ لەگەڵ دین ناکرێ، وە لە ڕاستیدا (جمود)و وشکیی و پابەندیی بە دەقەکانەوە، بەبێ لێ تێگەیشتنو هەڵهێنجانی یاساکان لێیان، پێچەوانەی ڕێبازو ڕێو شوێنی (پێشینی چاك)مانە.

**٣/ شوێنکەوتنی پێشینی چاك، واتە: شوێنکەوتنی بەرنامەو ڕێبازی فیکرییان، نەك تەنیا دەمارگیر بوون بۆ قسەو بیروڕایەکانیان، کە ڕەنگە هەڵەش بن:**

بەڵێ بەدوای پێشینی چاك کەوتن، واتە: شوێنکەوتنی ئەو بەرنامەو ڕێبازەی کە ئەوان لەسەری بوون، نەك قسەو فەتواکانی ئەوان لەخۆت بکەی بە دین، چونکە ئەوان فەتوایەکیان داوە بۆ کاتێكو بۆ شوێنێك جیا لەوەی ئێستای تۆ، چونکە زانایان گوتوویانە: (لا يُنْكَرُ تَغَيُّرُ الْأَحْكَامِ بِتَغَيُّرِ الْأَزْمَانِ)، واتە: (نکوولّیی ناکرێ لە گۆڕینی حوکمەکان، لە ئەنجامی گۆڕانی کاتو

شوێنەكاندا)، وە زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە: (الفَتْوى تَتَغَيَّرُ شَخْصًا وَزَمَانًا وَمَكَانًا وَعُرْفًا وَحَالاً). واتە: (فەتوا دەگۆڕێت لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی دی، لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی‌دی، لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی‌دی، لە عورفێكەوە بۆ عورفێكی‌دی)، ئەوە یەكێكە لە شتە ئاشكراكان كە شەرعزانەكان دەیزانن.

كەواتە: ناكرێ هەر قسەیەك كە (پێشینی چاك)مان گوتوویانە، لە خۆمانی بكەینە دین، پێشتر گوتمان دین تەنها (قورئان)و (سوننەت)ە، چونكە ئەگەر وابكەین {هەر قسەیەك كە (پێشینی چاك)مان گوتوویانە لە خۆمانی بكەینە دین} ، دەبێ عەقڵی خۆمان دابخەین، ئەوان دەبینی بۆ سەردەمی خۆیان پێكاویانە، بەڵام رایەكەیان بە كەڵكی ئێستا نایەت، شتێك جاری وا هەیە بۆ كاتێك باشە، بەڵام بۆ كاتی دوای ئەوە بە كەڵك نایەت، بۆ كاتی خۆی راست بووە، بەڵام بۆ ئێستا هەڵە دەردەچێ.

## ٤/ شوێنكەوتنی سەلەفی ساڵح، خاڵی هاوبەشی نێوان (مسوڵمانان)ە و، هیچ كەس بۆی نیە تاپۆو قۆرخی بكات لەسەرخۆی:

هەندێك كەس وادەزانن كە تۆ ناوت لەخۆ نەنا سەلەفیی، كەواتە: تۆ مەحرووم بووی لە شوێنكەوتنی سەلەفی ساڵحو دەڵێن ئەوە سەلەفیی نیە! بەڵام بێگومان ئەوە راست نیە، چونكە: پێشینی چاك كێیە؟ وە شوێنكەوتنی پێشینی چاك چییە؟ دیارە پێش هەموو كەس پێشینی چاك پێغەمبەری خوایە ﷺ، دوایی (هاوەڵان)ن رەزای خوایان لەسەربێ، ئینجا زانایانو پێشەوایانی دیكەمانن، كە دوای پێغەمبەر ﷺو هاوەڵان كەوتوون، ئاشكراشە كە ئەمە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو (مسوڵمانان)ەو، هەموو مسوڵمانێك دەبێ بەدوای ئەو رێبازە بكەوێ و، بەو رێیەدا بڕوا كە پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانو ئەوانەی كە شوێن

پێی وانیان هەڵگرتوەو پێیدا ڕۆیشتوون، وە ئەوە نە لەسەر کەس تاپۆکراوەو نەکەس دەتوانێ قۆرخی بکات، بەهۆی ناو لەخۆنانەوە.

**٥/ بە ناوی (سەلەفیی) لەخۆنان مرۆڤـ هیچی پێ نابڕێ، هەروەها وشەکانی: سۆفی، موجاهید، شێخ، مەلا، زانا، ئیسلامیی ... ئەوانە هیچ لە حەقیقەت واقیعی هیچ کەسێك ناگۆڕن:**

زۆرجار گوتوومە پاکەتێك خوێ لەسەری بنووسە هەنگوین، ئایا نێوەڕۆکەکەی دەگۆڕێ؟ بێگومان هەر سوێرە! وە هەروەها مرۆڤێکی فاسق ناوی لێبنێ سالْح، بەوەندە سالْح دەبێ؟ لەڕاستییدا ناو هیچ لە نێوەڕۆك ناگۆڕێ، ئایا کابرایەکی سۆفی کە پڕبێ لە خڵتە، هەر بەوەندە ناوی لەخۆناوە (سۆفی) ساف دەبێتەوە؟ نەخێر، وە کەسێك کە لەڕێی خوادا تێناکۆشێت، پێی بگوترێ موجاهید، دەبێتە موجاهید؟ نەخێر، وە کەسێك کە نەزان بێ ناوی (زانا)یە، یاخود بەرگی زانایەتی لەبەرە، دەبێتە زانا؟ نەخێر، لەبەرئەوە، تەعەسسوب و دەمارگیریی بۆ ناو، بەڕاستی شتێکی نا مەنتیقی و ناشەرعییشە.

**٦/ لەبیرمان نەچێ کە تەنیا قورئان و سوننەت پابەندکەر (مُلْزِمْ)ن بۆ دینداریی، نەك هیچ ناوونیشان و قسەو باسێکی دیکە:**

ئەوەش زۆر گرنگە، پێشینی چاك (سەلەفی سالْح) بۆچی چاکن؟ چونکە باش شوێن قورئان و سوننەت کەوتوون.

بەڵێ لە بواری عەقیدەو عیبادەتدا کە لە چەسپاوەکان (پوابت)ن، ئەوەی گوتوویانە، بەگشتی پێوەی پابەندین، چونکە قورئان و سوننەت لەو بوارانەدا

نوختەیان خستۆتە سەر پیت، بەڵام لەو بوارانەدا كە لە گۆڕاوەكان (متغيرات)ن، دەبێ سەرلەنوێ خوێندنەوەمان بۆیان هەبێ.

بۆ وێنە: كتێبێكی بەناوبانگ هەیە لە بواری سیاسەتی شەرعیی دا، كە (ماوەردیی) دایناوە بە ناوی: (الأحكام السلطانية)، هەروەها (ئەبو یەعلا)ش كتێبێكی هەر بەو ناوەوە داناوە، جا ئەو كتێبە بۆ سەردەمی خۆی باش بووە، بەڵام بۆ ئێستا بە گشتی بە كەڵك نایە، بۆ واقیعی ئەوكاتی گونجاو بووە، بەڵام بۆ واقیعی ئێستامان پێویستە قسەی دیكەمان هەبێ[(١)].

**٧/ ئێمە ڕێزمان بۆ هەموو (مسوڵمان)ێك هەیەو، هیچ كەس لەبەر ناوونیشان نابوغزێنین، هەرچەندە تێبینیشمان لەسەری هەبێ:**

لە ڕاستیدا وەك زانایان دەڵێن: (العِبْرَةُ بِالْمُحْتَوَيَاتِ وَالْمَضَامِينِ وَلَيْسَتْ بِالأَسْمَاءِ وَالْعَنَاوِينِ)، واتە: (جێی پەندو سەرنج كاكڵو نێوەڕۆكەكانن، نەك ناوو ناوونیشانەكان)، بۆیە هەوڵدەدەین هەركەسە بەپێی كردەوەو هەڵوێستەكانی هەڵسەنگێنین.

**پێنجەم: مەبەست لەو قسەیەمان: (تەنها ئیسلام بە بەرنامە –دین-ی ڕاستو تەواو زانینی ژیانی ئینسان بە تاكو كۆمەڵو كۆمەڵگاو دەوڵەتەوە)، ئەوەیە كە ئیسلام تاكە بەرنامەو ئایینی لەلایەن خواوە**

---

١) زنجیرە وتارێكم هەیە لە كەناڵی ئاسمانیی پەیام بە ناوونیشانی: (ئیسلامو دەوڵەتدارییو حوكمڕانیی)، كە تێیاندا هەوڵدەدەم تێكەیشتنێكی هاوچەرخ لە بازنەی فراوانی دەقەكانی (قورئانو سوننەت)دا، لەبارەی دەوڵەتداریی و حوكمڕانییەوە بخەمەڕوو، وە سوپاس بۆ خوای بەخشەر ﷻ ئێستا برایانێكی دڵسۆز سەرگەرمی نووسینەوەو پیت چنینیاننو، خوا ﷻ پشتیوان بێ لە داهاتوویەكی نێزیكدا دەبن بە كتێب.

**دیاریکراوو بۆ ئینسان بە شایستەو ڕەوا دانراوەو، هەرکەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، بۆی نیە جگە لە ئیسلام هیچ دینو بەرنامەیەکی دیکە بکاتە پەیڕەوو ڕێبازی ژیانو گوزەرانی خۆی، لە هەموو بوارو لایەنەکانی تاکییو خێزانییو کۆمەلایەتییو سیاسییدا:**

مەبەست لەو قسەیە ئەوەیە کە ئیسلام تاکە بەرنامەی تێرو تەواوی ژیانەو، جگە لە ئیسلام هیچ بەرنامەو ڕێبازێکی دی بۆ ئەوە ناشێ بکرێتە بەرنامەی ژیانی تاكو کۆمەڵ، بۆچی؟ چونکە مادام خوای کاربەجێ ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ...﴿٣﴾﴾ المائدة، واتە: (وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسندکردوون ...)، وە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾ آل عمران، واتە: (وە هەرکەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ، ئەوە لێی وەرناگیرێو، لە دوارۆژیشدا لە زیانبارانە).

بەڵێ مادام خوا ﷻ وای فەرمووە، کەواتە: خوا بۆ بەندەکانی تەنها ئیسلام بە (دین) دەزانێو، هەرکەسێك بێجگە لە ئیسلام بەدوای (دین)ێکی دیکە بکەوێ، خوا لێی وەرناگرێو، لە زیانبارانیش دەبێ، دیارە مەبەستیش لە (دین)، بەرنامەو ڕێبازی ژیانو گوزەرانە، جا چ لەلایەن خواوە هاتبێ، چ زادەی بیروهۆشی مرۆڤ بێ، چ ڕاست بێ چ هەڵە، وە لە قورئاندا وشەی (دین) بەو چەمكو واتایەی کە گوتم بەکارهێنراوەو، ئەوەی لەلای زۆربەی خەڵکی باوە، کە پێیانوایە وشەی (دین) تەنها بە ئایینی خوا دەگوترێ، هەڵەیە، بەڵکو وشەی (دین) هەم لە ئەسڵی زمانی عارەبیو هەم لە بەکارهێنانی قورئانیشدا، بە مانای بەرنامەو ڕێبازی ژیان دێ بەگشتی.

كەواتــە : وەك چــۆن ئیــسلام ئــایین (دیــن)ە، {لیبرالیــزم و، ســیكۆلاریزمو گلۆبالیزەیشن (العولـمة)و ماركسیزمو سۆشیالیزم} یش، بە هەمان شێوە (ئایین)ن، ئەوەندە هەیە —وەك گوتمان- ئیسلام ئایینی هەقە و، ئەو بەرنامەو ڕێبازانەی دیكـەش ئایینی بەتاڵو ناهەقن، وەك خـوای بالادەســت فەرموویـەتی : ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾﴾ الفتح، واتە : {ـ خـوا ـ ئـەو زاتەیـە كـە پێغەمبـەری خـۆی نـاردوە بـە ڕێڕوونیـیو (ئایین)ێكی ڕاستەوە، تاكو بەسەر هەموو ئایینو بەرنامەكانیدیكەدا سەری بخـات، وە خواش بەسە كە شایەد بێ لەسەر ئەوە} .

هەربۆیەش هەرجارێك خوای كاربەجێ وشەی (دیـن)ی بـۆ بەرنامـەی ڕێـكو ڕاستو بێ وێنەی خۆی كە (ئیسـلام)ە، بەكارهێنابێ، بۆئەوەی جیای بكاتـەوە لـە بەرنامە (دین)ەكانی دیكە، وەسفێك یان نیشانەیەكی خستۆتەسەر كە بزانرێ مەبەست لە (دین) لەو شـوێنەدا، (ئیسـلام)ە، نەك بەرنامەو ڕێبازەكانی دیكە، بۆ وێنـە :

أ/ ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ ...﴿٢٨﴾﴾ الفتح،واتە: (ـ خـوا ـ ئەو زاتەیە كە پێغەمبەری خۆی ناردوە بە ڕێنماییو بەرنامـەی ڕاسـتەوە ...) .
دیارە لە بەرانبەر (دين الحـق)یشدا، (دين الباطل)و (دين الطاغوت) هەیە .

ب/ ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجًا ﴿٢﴾﴾ النصر، واتە : (ئەگەر سەركەوتنی خوا هـاتو دەرگـای زاڵ بـوون كرایـەوە، وە خـەڵكت بینـی پـۆل پـۆل دێنـە نێـو ئاییـنی خـواوە)، ئاشكراشـە كە دين الله (ئیسـلام)ەو، سەرجەم بەرنامەو ڕێبازەكانی دیكەش بـە (دين غیـر الله) دادەنرێن .

ج/ ﴿... أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ...﴿١٣﴾﴾ الشورى، واتە: {... ئەم (ئایین)ە بە ڕێكوپێكی ڕاگیر بكەنو تێیدا پەرتەوازە مەبن ...} . دیارە لێرەشدا وشەی (ٱلدِّينَ ) كە ئەلیفو لام (أل)ی (التعریف) یان (العهد)ی لەسەرە، دیسان لە سەرجەم (دین)ەكانی دیكە جیاكراوەتەوە، چونكە (دین)ی ناسراو (معروف)و زانراو (معهود)، لەلای مسوڵمانان تەنها ئیسلامە.

جا ئێستا لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە ئەوەی ئێستا سیكۆلاریستەكان (العلمانیون) كردوویانەتە بنێشتە خۆشەی سەر زاریان، كە گوایە لە ئیسلامدا دینو دەوڵەت لە یەك جیاوازن و، سیاسەتو عیبادەت نابێ تێكەڵ بكرێن!! بەڵێ ڕوون دەبێتەوە كە ئەو جۆرە قسانە پووچو بێ بناغەن و، هیچ پاڵپشتو پاساوێكی (شەرعییو عەقڵیی)یان نیە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئیسلام بەرنامەو ڕێبازی پەسندكراوی خوای زاناو تواناية ﷻ بۆ ژیانو گوزەرانی ئینسان، بە تاكو كۆمەڵو ڕۆحو جەستەو سیاسەتو عیبادەتو تاعەتو كەسابەتو مزگەوتو بازاڕو دوانگە (المنبر)و فەرمانگە (الدائرة)وە و، گشتگیرە بۆ هەموو بوارەكانی ژیانو لایەنەكانی ئینسان.

دیارە (ئایین)ێكیش خوای كاربەجێ ﷻ بۆ ژیانی ئینسانانی دانابێ: ﴿... وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا ...﴿٣﴾﴾ المائدة، واتە: {... وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسند كردن ...} ، وە بە بەرنامەیەكی تێرو تەواوو تەواوكردنی نیعمەتی خۆی ناوی هێنابێ: ﴿... ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى ...﴿٣﴾﴾ المائدة، واتە: (... ئەمڕۆ بەرنامەكەتانم بۆ تەواوكردن، وە چاكەی خۆم بە تەواویی لەگەڵدا كردن ...). هەركەسێك تۆزقاڵێك (عەقڵو ئیمان)ی هەبێ، ڕێ

بە خۆی نادا هەر بیریش لەوە بكاتــەوە كــە بــۆ پڕكردنــەوەی كــەلێنو بۆشــاییەكانی (ئایــن)ی تەواوی خواو، چاككردنی كەمو كورتییەكانی، ـ كە تەنیا لە بیرو زەینــی بێبــڕواياندا هەنو لە واقیعدا بوونیــان نیــە ـ، لــە بەرنامــەو ڕێبــازەكانی دیكــە پینــەو پەڕۆی بۆ بكات!

دیسان مادام زانیمان كە سەرجەم بەرنامەو ڕێبازەكانی دیكەی مرۆڤكــردی وەك: (سۆشیالیزم، كاپیتالیزم، لیبڕالیــزم، ســیكۆلاریزم، جیهــانگیریی) هــەركامیان بــە ئایین (دین) دادەنرێ، بەڵام دیارە (ئایین)ێكی پووچو بــەتاڵ، كەواتــە: وەك چــۆن بابایەكی مسوڵمان كاتێك لە (ئیــسلامەتی)یــەوە دەگوازێتــەوە بــۆ نێــو (ئــایین)ێكــی دیكــەی، وەك: جووایــەتی (الیهودیــة)و دیانایــەتی (النــصرانیة)، ئەوكاتــە نــاوی مــسوڵمان (مــسلم)ی لێ دەســڕێتەوەو، بــە جوولەكــە (یهــودي)و گــاور (نــصراني) ناودەبرێ، بە هەمان شێوەو بگرە چاكتریش، هەركاتێك بابایەكی مــسوڵمان چــووە نێو جوغزی ئایینو ڕێبازێكی دیكەی وەك: (كۆمۆنیزم، لیبڕالیزم، ســیكۆلاریزم، جیهانگیریی[1])یەوە، ئەوە پێویستــە دڵنیاو مسۆگەربێ كە بــە هــیچ جۆرێــك فــڕی بەسەر ئیسلامەتییەوە نەماوە و، چەندە هــەردووك نــاوی: (مــسوڵمانو جوولەكــە) دژو پێچەوانەی یەكدین و، شتێكی سەیرە كە بگوترێ: فلان كەس (مــسوڵمانێكی جوولەكە)یە، یان (مسوڵمانێكی گاورو دیان)ە، هێندەو بگرە زیــاتریش ســەیرە كــە بگــوترێ: فــلان كــەس (مــسوڵمانێكی كۆمۆنیــست)ە، یــان (مــسوڵمانێكی لیبڕالیــست)ە، یــان (مــسوڵمانێكی سیكۆلاریــست)ە . . . هتــد، چــونكە بابــای جوولەكەو دیان، هەر چۆن بێ بڕوایان بە بەشێك لــە كتێبــەكانی خــوا هەیــە و، بــە شتێكەوە پابەندن كە لەلایەن خواوە هاتوە، بەڵام دەســتكاریی كــراوە، بــەڵام بابــای

---

١) هەركام لە مەسەلەی: (سیكۆلاریزمو جیهانگیریی)مان لە كتێبی: (**چەند مەسەلەیەكی بـاوی سەردەم**)داو، مەسەلەی (ناسیۆنالیزم)یشمان لە كتێبی: (**سۆزی نەتەوایەتی**)دا توێژیونەوە

کۆمۆنیستو لیبڕالیستو سیکۆلاریستو چیو چی، ئەگەر ناوو نێوەڕۆکیان یەك بێ و، بەڕاستی ئەو ڕێبازو بەرنامانەیان قبووڵ کردبێ، نابێ هیچ حیسابێك بۆ خوا ﷻ و پێغەمبەر ﷺ و ئایینو بەرنامەکەیان بکات، ئەگەرنا دیارە لەگەڵ ناوە تازەکەیو بەرنامەو ڕێبازە نوێیەکەیدا درۆدەکات!!

شایانی باسیشە کە مەسەلەی لەیەك جیایی دینو دەوڵەت (الفصل بین الدین والدولة)، یان لەیەك جیاکردنەوەی سیاسەتو عیبادەت، هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامو مسوڵمانانەوە نیە و، وەك گەلێك دەردو نەخۆشیو کێشەو گرفتی دیکە، لە جیهانی ڕۆژئاوادا سەری هەڵداوە و، بەرهەمی شەڕو هەرای نێوان ئەفسانەکانی بەناو ئایینی کڵێساو ڕەوتی زانستیو بووژانەوەی عەقڵ لەلایەك و، کێشمەکێشی نێوان قەشەو پاپاو پادشاو ئیمپراتۆرەکان، وە جەماوەرو جوتیارو کرێکارو ڕەشوڕووتو چەوساوەکان لەلایەکی دیکەوە بوو. کە لە کتێبی (**چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم**)و لە کتێبی (**تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان**)دا، تاڕادەیەکی باش تیشکمان خستۆتە سەری، هەروەها لە نامیلکەی: (**سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك**)یشدا تیشکێکی باشمان خستۆتەسەر بابەتی: پێکەوە پەیوەستبوونی ئیسلامو سیاسەتو نەگونجانی لەیەك دابڕینیان، بەڵام شوێنی تەرخانکراو بۆ تویژینەوەی تێروتەسەل لەوبارەوە زنجیرە وتاری: (**ئیسلامو دەوڵەتدارییو حوکمڕانیی**)یە، کە لە بەرنامەی (سەرنج) لە کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)دا پێشکەش دەکرێنو، خوا یاربێ دواتریش لەدوو توێی کتێبێکیشدا کۆدەکرێنەوەو چاپو بڵاودەکرێنەوە.

# بنەمـای دووەم

## فێرکـردن و پەروەردەکردنی ئەندامـان لەسـەر بنـاغــەی:

## تێگـەیشـتنی تەواو و، ئیمـان و عەقیدەی راست و، خوا پەرستیی ساغ و، ئاکاری پەسندو زانست و ئەزموونی پێشکەوتووی بەشەر لە بوارە جیاجیاکاندا.

# بنەمـای دووەم

## فێركردن و پەروەردەكردنی ئەندامان لەسەر بناغەی:

## تێگەیشـتنی تەواوو، ئیمـان و عەقیـدەی ڕاسـتو، خوا پەرسـتیی سـاغو، ئاكـاری پەسـندو، زانسـت و ئـەزموونی پێـشكەوتووی بەشـەر لـە بـواره جیاجیاكاندا.

(فێركـردن و پـەروەردە و تەزكیـەكردن)ی سـەرجەم ئەنـدامان، بـە وردو درشـتو خـوارو سـەرەوە، لەسـەر بناغـەی: تێگەیـشتنی قـووڵ و گـشتگیر بـۆ ئیـسلامو ئیمـان و عەقیـدەی ڕاسـت (العقیـدة الـصحیحة) و دامـەزراوو، خواپەرستیی ساغو پاكو، ڕەوشتو ئاكاری بەرزو پەسند، وە بەهرە وەرگـرتنو سوودمەند بوون لەو زانستو ئەزموونە پێشكەوتووە جۆراوجۆرەی كـە بەشـەر لـە بـوارە جیاجیاكـانی ژیـان و گوزەرانیـدا وەدەسـتی هێنـاوەو كۆمـەڵگای مرۆڤایەتی پێ بەرەوپێش چووە. چونكە:

١- خـوای بـەرز و مـەزن فەرموویـەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِی بَعَثَ فِی ٱلۡأُمِّیِّـۧنَ رَسُولࣰا مِّنۡهُمۡ یَتۡلُوا۟ عَلَیۡهِمۡ ءَایَـٰتِهِۦ وَیُزَكِّیهِمۡ وَیُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبۡلُ لَفِی ضَلَـٰلࣲ مُّبِینࣲ ۝٢﴾ الجمعـة، واتـە: (خـوا ئـەو كەسـەیە كـە لـە نەشـارەزایەكان ڕەوانـەكراوێكی لـەنێو خۆیانـدا نـاردووە، ئایەتـەكانی خوایـان بەسـەردا

دەخوێنێتـەوە، وە تەزكیـەیان دەكـات، وە كتێـب و حیكمـەتیان فێردەكـات، هەرچەند بەتەئكید پێشتر لە گومڕاییەكی ڕوون دابوون).

٢- وە فەرموویـــەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾﴾ الزمـر، واتـە: (دەجـا مـوژدە بـدە بـە بەنـدەكانم، ئەوانـەی كـە گـوێ بـۆ هـەموو قـسەیەك دەگـرن پاشـان شـوێن باشترین دەكەون، ئا ئەوانە كەسانێكن خـوا ڕێنمـایی كـردوون، وە ئـا ئەوانـە خاوەن عەقڵانن).

٣- پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرموویـەتی: (الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْثُمَا وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا) رواه الترمذي: (٢٦٨٥)، وقال: غريب، وابن ماجه: (٤١٦٩)، وقال الألباني: ضعيف جدا. واتە: (حیكمـەت "زانـست و ڕەفتـاری ڕاست و بەجێ" بزربووی بابای ئیمانداره، لە هەر كوێیـەك بیدۆزێتـەوە لـە هەموو كەس پێی شـایستـەترە).

## ڕوونکـردنـەوە:

ئەم بنەمای دووەمە لە سێ خاڵی سەرەکیدا ڕوون دەکەینەوە:

**یەکـەم: هـەر ڕێکخـراوو کۆمەڵـێکی ئیـسلامیی، حیکمـەتو ئامـانجی دروستبوونی ئەوەیە کە هۆکاری گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی بێ لە کۆمەڵگاو دەوروبەریدا:**

ڕێکخراوێکی ئیسلامیی، کۆمەڵو لایەنێکی ئیسلامیی، بۆچی دروست دەبـێ؟ ئامانجەکەی و حیکمەتی دروستبوونەکەی ئەوەیە کـە هەڵـسێ بـە گۆڕانکـاریی لـە کۆمـەڵگای خۆیـدا، گۆڕانکارییەکـەش بـریتی دەبـێ لـە پاکـسازیی تێـداکردنو چاکسازیی تێـداکردنی، پـاکی بکاتـەوە لـەوەی کـە خـوا ﷻ پـێی ناخۆشـە، وە بیڕازێنێتەوە بەوەی کە خوا ﷻ پێی خۆشە، لە هەموو بوارەکاندا: لە بواری فیکرو عەقیدە، لـە بـواری عیبـادەت، لـە بـواری هەڵـسوکەوتی شەخـسیی، خێزانیـی، کۆمەلایەتیی و سیاسیی دا، لە ڕووی ژیـانی مەعنـەویی و ژیـانی مـاددیی یـەوە، لـە هـەموو بوارەکانـداو لـە هـەموو ڕووەکانـەوە، هەڵـسێ بـە پاکـسازیی تێـداکردنو چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگای خۆی.

ئینجا ڕاستییەکی نکوولیی لێنەکراوە، کـە خـۆ گـۆڕین بناغـەی واقیـع گۆڕینـە (تَغْيِيـرُ النَّفْسِ أَسَاسُ تَغْيِيـرِ الوَاقِـعِ) و، کەسـێك خـۆی شـتێك شـك نـەبا، پێـی نابەخشرێ، وەك عەرەب دەڵێن: (فَاقِدُ الشَّـيْءِ لايُعْطِيهِ)، واتە: (کەسێك شـتێکی نەبێ، ناتوانێ بیدا بە غەیری خۆی). بۆیە ئێمە دووەمین (بنەمای شـەرعیی و هێڵـی گشتی)ی فیکرو سیاسەتی (کۆمەڵی ئیسلامیی)مان بە پـەروەردەکردنو پێگەیانـدنی تاکەکانی داناوە.

دیارە ئەو تێگەیاندنو پێگەیاندنەش دەبێ گشتگیر بێ بۆ قیادەو قاعیدە، بۆ سەرێو بۆ خوارێ، چونکە تەنیاو تەنیا کەسانێکی تێگەیشتوون کە خەڵکیان بۆ تێدەگەیەنرێ و، کەسێکیش خۆی لە دینداریی و خواپەرستییدا پەروەردە نەبووبێو پێنەگەیشتبێ، مەحاڵە بتوانێ خەڵکی دیکە پەروەردە بکاتو پێبگەیەنێ، تێگەیاندن بە تێگەیشتووان دەکرێ، وە پێگەیاندن بە پێگەیشتووان دەکرێ، وە راستکردنەوە بە راستان دەکرێ، وە پاکسازیی بە پاکانو، چاکسازیی بە چاکان . . . هتد، ئەوانە شتی روونو ئاشکران، ئینجا هەموو ئەوەی کە گوتمانو زۆر زیاتریش، لەم رستە قورئانییەدا کۆبووەتەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ...﴿١١﴾﴾ الرعد. واتە: (... بێگومان خوا حاڵی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ تاکو خۆیان نەگۆڕن ...)، بەڵێ، هەمیشە گۆڕینی حاڵو واقیع لە گۆڕینی خودەوە دەستپێدەکات.

**دووەم: یەکێك لە یاسایەکانی خوای کاربەجێ ﷻ لە ژیانی ئینساندا، ئەوەیە کە هەمیشە کەمینەیەك دەبنە مایەی گۆڕانکاریی و وەرچەرخان لە ژیانی میللەتانداو، زۆربەو جەماوەری خەڵکی، مەگەر بە دەگمەن ئەگەرنا هەر شوێنکەوتوو (تابع)ی ئەو کەمینەیەن کە رووەو هەق، یان رووەو ناهەق (باطل) پێشیان دەکەونو، بۆیان دەبنە پێشەنگو سەرقافڵە:**

ئەوەی کە گوتمان راستییەکی درەوشاوەیە لە مێژووی گەلانی دنیادا، تەماشای مێژووی هەموو بەشەر بکەن، هەمیشە کەمینەیەك دەستدەکەن بە گۆڕینو وەرچەرخان دروستکردن لە ژیانی کۆمەڵگادا، جا ئەو کەمینەیە چ ئەهلی هەق بن،

چ ئـەهلی ناهـەق، فـەرق ناکـا، بـەس ئـەوەی گرنگـە ئەوەیـە دروسـتکردنی گۆڕانکاریی و وەرچەرخان لە کەمینەوە دەست پێدەکات، ئەوە نیە خەڵك لەخـۆڕا هەمووی چاك بێ، یان خەڵك لەخۆڕا هەمووی خراپ بێ! بەڵکو کەمینەیەك چاك دەبن و خەڵکی دیکەش چـاك دەکـەن و دەیگـۆڕن، وە کەمینەیـەك خـراپ دەبـن و، خەڵکی دەوروبەریشیان خراپ دەکەن و دەیگـۆڕن، وە ئـەم دوو ئایەتــە بـەپێزە زۆر بـەجوانیی ئـەو راســتییە دەگەیـەنن، خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلۡ أَنتُم مُّجۡتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾﴾ الـــــشعراء. لـــــە بەسەرهاتی مووسا ؈ لەگەڵ فیرعەون، لە درێژەی ئەو بەسەرهاتەدا دەفـەرموێ: (وە بە خەڵك ـواتە: بە جەماوەرـ گوترا: ئایا ئێوە کۆبوونەتەوە؟ بۆئەوەی بـە دوای جادووگەرەکان بکەوین ئەگەر ئەوان زاڵ بن).

ئەوە مەنتیقی جەماوەرە، جەماوەر هەمیـشە تەماشـا دەکـات کـێ لەسـەرەوەیە، رەگەڵی دەکەوێ، بە زۆری وایە، مـەنتیقی خـەڵك و جـەماوەر بەگـشتی بریتیـە لـە کەوتنە ژێر کاریگەریی و رکێفی زاڵبووان (الغالبین)، کێ لەسەرەوە بـێ، خـەڵك بـە زۆریی لەگەڵ ئەودایە، جا چ لەسەر هەق بن، چ لەسەر ناهەق و، تەنانـەت ئەگـەر ئەو زاڵبووانە جادووگەریش بن!

بـەلام بێگومـان خـەڵك و میللـەت پـاش هۆشـیاربوونەوەو پـەروەردەبوون و هەقناسین، بە ئەندازەی گۆڕانکاریی بەسەردا هـاتنیان، هەڵوێستیـشیان دەگـۆڕێ، بەلام بەگـشتی خـەڵك و جـەماوەر پـێش ئـەوەی وریابێتـەوەو هـەق بناسـێ، ئـەوە هەڵوێـستیەتی، بـەس دوای ئـەوەی هـەق دەناسـێ و پـەروەردە دەبـێ و تێدەگــاو پێدەگـا، بە تەئکید ئەوکاتە لەگـەڵ ئەو هەقـەدا دەبێ کە لە عەقـڵ و دڵیــدا جێگــیر بووە.

ئەم راستییەشم بۆیە خستەڕوو، تاكو هەموو لایەك دڵنیاو مسۆگەر بین، كە گۆڕانكاریی كردن لەنێو میللەتو كۆمەڵگادا، هەردەبێ بە كۆمەڵێكی دانسقەی پێشەنگ دەستپێبكاو، حیكمەتی هەبوونی كۆمەڵو جموجۆڵە ئیسلامییەكانی ئەم رۆژگارەش – وەك پێشتر ئاماژەم بۆ كرد ـ هەر ئەوەیە و، كۆمەڵی ئیسلامیی دەبێ بزانێ كە ئەركی سەرشانی بریتییە لەوە كە بۆ وەرچەرخانی كۆمەڵگاو دەوروبەرەكەی ببێتە داینەمۆ (مُحَرِّك)و هاندەرو رێ نیشاندەر. بۆیە پێویستە بە مانای وشە، ئەندامانی كۆمەڵی ئیسلامیی لە خۆدا بەرجەستەكەری ئیسلامەتیی بن، بە هەموو لایەنەكانی زانستیی و ئیمانو عیبادەتو تەزكیەو رەوشتو ئەدەبی بەرزو ... هتدەوە و، دەبێ وەك ئاوێنەیەك هەرچی راستییەكانی ئیسلام (حقائق الإسلام)ن، لە خۆیاندا بە جوانترین شێوە بیاندرەوشێننەوەو، خەڵكو دەوروبەر بە بینینی ئەوان – ئیسلامو ئیمانو ئیحسان ـ یان بكەوێتە بەرچاوو، بەرجەستەكەری دین بن، بە هەرسێ بەشی: ئیسلامو ئیمانو ئیحسانەوە، وە بەر لە قسەی زار، بە كردەوەو ئاكار بە ئاینو بەرنامەی خوای بێ هاوتایان ئاشنا بكەن.

**سێیەم: پەروەردەو تەزكیەبوونو تێگەیشتنو پێگەیشتنی ئەندامانو تاكەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی بە سەرو خوارەوە بەگشتی، چوار بواری سەرەكی هەن:**

یەكێك بۆی هەیە بڵێ: باشە ئێمە چۆن خۆمانو خەڵك تێبگەیەنینو پێبگەیەنینو پەروەردە بكەین؟ وایان لێ بكەین كە شوێنكەوتووی راستەقینەی ئیسلام بن؟

لە وەڵامدا دەڵێین: چوار بواری سەرەكی هەن بۆ پەروەردەو تەزكیە بوونو تێگەیشتنو پێگەیشتن:

## بواری یەكـەم: زانیاری و تێگەیشتنی ڕاست و تەواو:

كە مەبەستمان پێی ئەوەیە هەركەسە لەو ئەندامانە بە ئەندازەی توانـاو بڕسـتیو بەپێی پێویستی ئەركو كارێك كە پێی سپێردراوە، لـە ئـایینو بەرنامـەی خـوادا، شارەزاو سەرڕاست بێو، هێنـدە لە قورئانو سونەت حاڵی بوو بێ، كە بتوانێ دیندارییەكەی ڕاستو ڕێك ئەنجام بداتو، ئـەركی سەرشـانی خـۆی جێبـەجێ بكات، دیـارە بێ حیكمەتیش نیـە كە یەكەمین ئایـەتی قورئـان كە بۆ پێغەمبـەری خوا ﷺ دابەزیوە، بریتی بووە لە: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝١﴾ العلق، واتە: (بخوێنـە بەناوی ئەو پەروەردگارەت كە دروستی كردوە).

جا بێگومان زانیـاریی و تێگەیـشتنی ڕاسـتو تـەواو دەربـارەی ئـایینی خـوا، بازنەیەكی یـەكجار فراوانـە و، زۆر شـت دەگرێتـەوە، بـەڵام ئـەوەی كـە ئێمـە گوتوومانە: (هێندە لە قورئانو سونەت حاڵی بووبـێ كـە بتوانـێ دیندارییـەكی ڕاستو ڕێك ئەنجام بداتو ئەركی سەرشـانی جێبـەجێ بكـات)، هـەموو ئـەو شتانە دەگرێتەوە كە بۆ ئەنـدامێكی سـەروو یـان خـوارووی كۆمـەڵی ئیـسلامیی پێویستن، چونكە ئاشكرایە كە ئەركو كارەكانی بەرنامەی خوا ﷻ بەگـشتی دوو بەشن، ئەوەی كە خوا ﷻ لە قورئان داو پێغەمبـەر ﷺ لـە سـوننەتی خۆیـدا بـۆ مسوڵمانان باسیانكردوون، دوو بەشن:

* بەشـێكیان پەیوەستن بە خودی ئینسانەوە وەك تاكێكو، لە خودی خۆیدا دەبێ جێبەجێیان بكات، بۆ وێنـە: ئیمانو عەقیـدەو، تێگەیـشتن لـە دیـنو، پێـنج پایـەكانی ئیـسلامو، خـۆ ڕازاندنـەوە بـە ڕەوشـتە بـەرزو جوانـەكانو، خـۆ دوورخستن لە خـووو خـدە خراپـەكانو، ئەنجامـدانی فـەڕزە شـەرعییەكانو دوورەپەرێزیی لە گوناەو سەرپێچییەكان.

* بەشـی دووەمیـان پەیوەسـتن بـە كۆمـەڵ (جماعـة)ەوەو، بـە حاڵـەتی گـشتیی خەڵكەوەو، بە هەرەوەزیی و هاوكـاریی هـەموویان جێبـەجێ دەكـرێن، واتـە پەیوەستن بە خەڵكەوە بەگشتیی و، بە تاك تاكیش جێبەجێ ناكرێن، بەڵكو دەبێ كـاری هـەرەوەزیی و كـاری دەسـتەجەمعییان بـۆ بكـرێ، ئـەوانیش وەك: بانگەواز، فەرمان كردن بە چـاكە، ڕێگـرتن لـە خراپـە، جـەنگ‌و جیهـادو، چەسپاندنی دادگەریی و، لابردنی زوڵم‌و ستەم‌و، بنیاتنانی قـەوارەو دەوڵـەتی ئیسلامیی و ... هتـد.

وە زاناو پێشەوایانی ئیسلام سەرجەم لەسەر ئەوە كـۆكن، كـە زانـین‌و پـێ شارەزابوونی هەر ڕاستییەك‌و یاساو دەستوورێكی شەرعیی، كـە ئەنجامـدانی ئەركێكی شەرعیی، پەكی لەسـەری كـەوتوە، لەسـەر خاوەنەكـەی فـەرزە، واتە: هەموو زانایان لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون كە تێگەیشتن لـە وردو درشـتی ئیسلام لەسەر هەموو كـەس فـەرز نیـە، بـەڵێ لەسـەر مـسوڵمانان بەگـشتیی فەرزی كیفایەیە، بەڵام لەسەر تاك تاكی مسوڵمانان فەرز نیە لە هەموو قورئان تێبگەن‌و، لە هەموو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ تێبگـەن، چـونكە ئـەوە قورسـەو نایەتەدی، بەڵام هەموو لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە هەر مسوڵمانێك لە خـودی خۆیدا دەبێ هەر فەرزێكی شەرعیی كە دەكەوێتە سەرشانی، بایی ئەوەنـدە لـە شەریعەت حاڵی بووبێ كە ئەو فەرزەی پێ جێبەجێ بكات، بۆوێنە: كەسێك نوێژی لەسەر فەرز دەبێ، لەسەری پێویستە لە نوێـژ حـاڵی بـێ، ڕوكنـەكانی نوێژ، واجبەكانی، سوننەتەكانی، چۆن دەكرێن؟ چـۆن نـاكرێن؟ هـەروەها ڕۆژووو زەكات‌و حەج‌و جـەنگ‌و جیهـادو فـەرمان بـە چـاكەو ڕێگـرتن لـە خراپەو ... هتد. هـەر كەسـێك كـە یـەكێك یـان زیـاتر لـەم ئەركانـە ڕووی تێدەكات، دەبێ بایی ئەوەندە زانیاری شەرعیی پێبـێ، كـە بزانـێ چـۆن ئـەو

ئەرکە بە شێوەیەکی ڕاستو دروست جێبەجێ دەکات، زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، جا ئەو فەرزە کە دەکەوێتە سەرشانی ئینسان، چ بکەوێتەسەری وەك تاك، یان وەك یەکێك لەنێو کۆمەڵێکدا، کە دەبێ هەموویان پێی هەڵسن، چونکە بێگومان بەبێ شارەزاییو زانیاری، هیچ ئەرکو کارێك جێبەجێ ناکرێ – وەك پێشتریش گوتوومانە ـ بە شێوەیەك کە جێگای پەسندیی خوای پەروەردگار بێ.

هەروەها زانایانی (أصول الفقه)یش دوو بنچینەی گرنگی شەرعییان لەوبارەوە داناون و، لەسەریشیان یەکدەنگو تەبان:

١/ (لِلْوَسَائِلِ حُكْمُ الْمَقَاصِدِ)، واتە: (حوکمی ئامرازو هۆکارەکانیش، هەمان حوکمی ئامانجەکانە)، واتە: هەر ئامانجێکی شەرعیی کە دەکەوێتە سەر شانت بیهێنیەدی، هەر هۆکارو ئامرازێك کە پێویستە بۆ جێبەجێ کردنو هێنانەدی ئەو ئامانجە شەرعییە، ئەو هۆکارو ئامرازەش وەك ئامانجە شەرعییەکە، فەرزو پێویست دەبێ لەسەرت. بۆ وێنە: نوێژ فەرزە، بەلاّم نوێژکردن بەبێ دەستنوێژگرتن نابێ، کەواتە دەستنوێژیش فەرزە، دەستنوێژیش بەبێ پاكو خاوێنیی نابێ، کەواتە پاكو خاوێنییش فەرزە، کەواتە: حوکمی ئامانجو مەبەستێکی شەرعیی وەك نوێژکردنی فەرز، مادام فەرزبوون (الوُجُوب)ە، دیارە ئامرازو پێشەکییەکانیشی، وەك: دەستنوێژو تارەت گرتنو پۆشاکی پاكو قیبلە دۆزینەوەو ... هتد، هەمان حوکمیان هەیە، وە هەروەها ...

٢/ (مَا لاَيَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، واتە: (هەر شتێك فەرزێك بەبێ ئەو جێبەجێ نەکرێ، ئەویش فەرزە)، کە بێگومان لە نێوەڕۆکدا لەگەڵ بنچینەی پێشوو هەریەکن.

دیارە لەسەر کۆمەڵو لایەنێکی ئیسلامییش پێویستە، کە وێڕای ئەوەی رابرد، لە واقیعو ژینگەو رۆژگاری خۆیاندا جەخت لەسەر خستنەڕووی ئەو لایەنانەی ئیسلام زیاتر بکەن، کە لەو هەلو مەرجەیاندا ئیشکالو مشتومڕیان لەسەر دروستکراوە، یان پڕۆسەی گۆڕانکاریی ئیسلامیی زیاتر دەیانخوازێ، ئینجا دیارە ئێمە مەبەستمان لە زانیاریو شارەزایی، زانیاریو شارەزایی شەرعییە، بەلاّم بەتەئکید جێبەجێ کردنی ئەرکێکی شەرعیی وێڕای شارەزایی لە شەریعەت، لە قورئانو سوننەت، لە یاساکانی شەرع، پێویستیشی بە شارەزایی لە واقیعو دەوروبەریش دەکات، چونکە ئەو واقیعەش کە تۆ حوکمە شەرعییەکەی تێدا جێبەجێ دەکەیو ئەنجام دەدەی، ئەگەر تێیدا شارەزانەبی، تێیدا چاوکراوە نەبی، بەرچاوڕوون نەبی، لەوانەیە تۆ ئەو ئەرکو حوکمە شەرعییە بە هەڵە جێبەجێ بکەی، یاخود بەشێوەیەك جێبەجێی بکەی کە لەجیاتی ئەوەی بەرهەمێکت بێتە دەست، لەسەری قەرزدار ببیەوە! ئینجا دەبێ ئێمە لە واقیعی خۆماندا (ئەو واقیعە کە تۆ کارە ئیسلامییەکەی تێدا ئەنجام دەدەی) چ شتێك زیاتر بۆتە جێگەی مشتو مڕ، چ شتێك زیاتر بۆتە مایەی ئەوە کە چاوی خەڵکی پێ پێچراوە، بۆ خەڵك بۆتە مایەی چەواشەکاریی، یان خەڵك زیاتر پێویستی پێیەتی، یاخود کارە ئیسلامییەکەت زیاتر پێویستی پێیەتی، بۆئەوەی زەمینە بڕەخسێ لەو واقیعەی تۆدا، تاکو کاری ئیسلامیی تێدا ئەنجام بدەی، تۆ دەبێ جەخت لەسەر ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییانە بکەیەوە بۆ خەڵك.

بۆ وێنە: لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ـ وەك پێشتریش ئاماژەم بۆ کرد ـ مەسەلەی لەیەك ترازاندنی دینو سیاسەت، یان ئایینو دەوڵەت، لەلایەن عەلمانییەکانو نەیارانی تەوژمی کارو چالاکیی ئیسلامییەوە، زۆر دەوروووژێنرێ، بۆیە پێویستە

كە (تەوژمی ئیسلامیی)ش جەختی لەسەر بكات و، زیاتری تیشك بخاتەسەر، ئینجا لەڕاستیدا وەك لە باسی (سیكۆلاریسم)[(١)]دا گوتوومانە: ئەوەی كە نەیارو ناحەزانی ئیسلامو تەوژمی ئیسلامیی دەیانەوێ لەژێر پەردەی لەیەك جیایی دینو دەوڵەتدا بیكەن، بریتیە لە دابڕینی ئیسلام لە سەرتاپای ژیانو گوزەرانی خەڵكو میللەتو، ناوی پڕ بە پێستی ئەو پیلانە گڵاوەیان (لەیەك دابڕینی دینو ژین)ە، نەك تەنها دینو سیاسەت.

كەواتە: پێویستە ئێمە لە ڕۆژگاری خۆماندا زۆر ئەو مەسەلەیە بۆ خەڵك ڕوون بكەینەوە، چونكە ئەگەر خەڵك پێی وابێ، دین سیاسەتی تێدانیە و، دین دەوڵەتی ناوێ و، دین دەسەڵاتی ناوێ و، دین پێویستیی بە ئەمرو نەهی نیە، مانای وایە لەگەڵت هاوكار نابێ ئەو واقیعە بگۆڕێو بە نوێژەكەی خۆی ئیكتیفا دەكاتو پێی وایە زۆریشی زیادە!! ئەگەر حەجو عومرەیەكیشی كردن ئەوە دەڵێ: حەتمەن لەوانەیە تێشمپەڕاندبێ!!

بۆیەش گوتوومانە: (زانیاریو تێگەیشتنی ڕاستو تەواو)، چونكە كەسێك بیەوێ ئایینی خوا ﷻو ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو خەڵكو میللەتدا ببووژێنێتەوە، پێویستە خاڵی دەستپێكردنی پەروەردەبوونو پێگەیشتنی خودی خۆی بێ و، خۆیشی لە زانیاری شەرعییو لە دین تێگەیشتنو لە ڕێ شارەزابوونەوە دەستبەكاربێ، دەبێ خۆی بە ڕێگا بزانێ، ئەوجار بیەوێ خەڵكی لەگەڵ خۆ بەرێ، ئەهلی سۆفیگەریی (أهل التصوف) دەربارەی ڕێنماكاری تەواو (المرشد الكامل) ـ ئەو كەسەی كە ڕێنمایی خەڵك دەكات ـ دەڵێن:

---

١) بڕوانە كتێبی (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم) لاپەڕە (٥٩) تا (١٠٣) چاپی پێنجەم.

وَإِنَّمَا القَوْمُ مُسَافِرُونَ    لِحَضْرَةِ الْحَقِّ وَظَاعِنُونَ
فَافْتَقَرُوا فِيهِ إِلَى دَلِيلِ    ذِي بَصَرٍ بالسَّيْرِ وَالْمَقِيلِ
قَدْ سَلَكَ الطَّرِيقَ ثُمَّ عَادَ    لِيُخْبِرَ الْقَوْمَ بِمَا اسْتَفَادَ

واته: (ئنجا چونکه ئەو کۆمەڵە بەرەو خوا ڕێبوارنو جاروباریش پشوو دەدەن، پێویستییان بە ڕێنیشاندەرێك هەیە کە شارەزای شوێنی ڕۆیشتنو پشوودان بێ، ڕێگاکەی بڕیوە پاشان گەڕاوەتەوە تاکو ئەوەی وەریگرتوە هەواڵی پێ بە خەڵکەکە بدات)، واتە دەبێ ڕێگاکەی بڕیبێو دوایی گەڕابێتەوە، گەڕابێتەوە بۆئەوەی خەڵکی دیکە لەگەڵ خۆی بەرێ! بەلاَم کەسێ بە ڕێگا نەزانیو بڵێ: وەرن من پێشتان دەکەوم، لەوانەیە تووشی هەڵدێرێکیان بکات، ملی خۆیو ئەوانیش بشکێنێ.

چۆنیەتی زانیاریو تێگەیشتنەکەیشی، پێویستە هەردوو مەرجی (ڕاست بوون)و (تەواو بوون)ی تێدابن، کە پێچەوانەکەیان، هەڵەبوون (خطأ)و ناتەواوبوون (نُقْصَان)ن، مەبەستیش لە ڕاست (صَحِيح) بوون، ئەوەیە کە خوا ﷻو پێغەمبەرەکەی ﷺ چۆنیان فەرمووەو مەبەست بووە -بەو جۆرە کە زاناو شارەزایان دیارییان کردوە-، ئاوابێ، مەبەستیش لە تەواو (کامل) بوون، ئەوەیە کە بەشێكو هەندێك لە ئایینو بەرنامەی خوا ﷻ نەگیرێو، بەشو لایەنەکانیدیکەی لێ فەرامۆش بکرێن، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتگیرانە (شمولي)و تێروتەواو بێو، هیچ بەشو لایەنێکی لێ نەبوێردرێ، بۆئەوەی بەر ئەم هەڕەشەیەی خوای بالاَدەستو دادگەر ﷻ نەکەوین، کە ئاراستەی ئەو جۆرە کەسانەی کردوە، کە گیرۆدەی ئەو هەڵە کوشندەیەی ئایین بەش بەش کردنە بوونە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ

أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿١٥٩﴾﴾ الأنعام. واتە: (بێگومان ئەو كەسانەی كە دینەكەیانیان بەش بەش كردووەو بوونە دەستە دەستە، تۆ هیچ پەیوەندییەكت پێیانەوە نیە، بەڵكو -سەرەنجامی- كاری ئەوان بۆلای خوایەو، پاشان هەواڵی -سزای- ئەوەیان پێدەدا كە دەیانكرد)، كە چەند كارێكی خراپو دزێویان كردوە كە دینی خوایان بەش بەش كردوە، یەكێك دەڵێ: ئیسلام تەنیا بریتیە لە لایەنی ئیمانو عەقیدە، ئەوی‌دیكە دەڵێ: ئیسلام تەنیا عیبادەتە، ئەوی‌دی دەڵێ: نەخێر ئیسلام هەر پەروەردەیە، ئەویدیكە دەڵێ: ئیسلام تەنیا سیاسەتو حوكمە، ئەوی‌دی دەڵێ: نەخێر تەنیا لایەنی فیكرییە، ئەوی‌دی دەڵێ: تەنیا لایەنی جەنگو جیهادە! جا لەڕاستیدا هەموو ئەو جۆرە بیروبۆچوونانە، لە حاڵێكدا كە هەركامێكیان دەمارگیریی دەبێ بۆ بەشەكەی خۆی‌و، بەشەكانی دیكە ڕەفز دەكات، ئەوە تێگەیشتنی هەڵەو كەمو كورتن بۆ دینو، دەبنەهۆی بەش بەشكردنی دین، كە ئەوەش عادەتی هاوبەش بۆ خوا پەیداكەرەكانە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾﴾ الروم. شایانی باسیشە كە هەندێ وشكە سەلەفیی ناحاڵیی، ئەم ئایەتە بۆ حیزبو لایەنە ئیسلامییەكانی ئەم ڕۆژگارە دێننەوە، كە خوای بەرز ﷻ بە مسوڵمانان دەفەرموێ: (... وە وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان مەبن، لەوانەی دینەكەی خۆیان بەش بەش كرد و، هەر كامێكیان بەوەی كە لەسەریەتی دڵخۆشە)، لەم ئایەتەوە دەردەكەوێ، كە دینی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان هەرچی بووە هەر (دین)ە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ

﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾﴾ الكافرون. واتە: (بڵێ: ئەی كافرەكان، ئەوە ناپەرستم كە ئێوە دەیپەرستن، وە ئێوەش ئەو خوایە ناپەرستن كە من دەیپەرستم، وە من ئەوە ناپەرستم كە ئێوە پەرستووتانە، وە ئێوەش ئەوەتان نەپەرستوە كە من پەرستوومە، دینی خۆتان بۆ خۆتانو دینی خۆم بۆ خۆم). (دین) واتە بەرنامەی ژیان، جا دینی موشریكەكان هەرچییەك بووبێ، بەش بەشیان كردوە، خواش ﷻ دەفەرموێ: وەك موشریكەكان مەبن! كەواتە: ئەو كەسەی كە دین بەش بەش دەكات، ئەوەیە كە عادەتی موشریكەكانی گرتوە، ئەوەی كە دەڵێ: دین هەر ئەوەیە كە من لەسەریمیو پێوەی سەرگەرمم! جا با بزانین كێ وادەكات؟ ئەگەر كۆمەڵی ئیسلامیی وای كرد بەردەكەوێ، یەكگرتووی ئیسلامیی وای كرد بەردەكەوێ، وشكە سەلەفییەك وای كرد ئەویش بەردەكەوێ، سۆفیو ئەهلی تەریقەت وایان كرد، بڵێن: نەخێر ڕێ هەر ڕێی ئێمەیەو شێخیش هەر شێخی ئێمەیە و، بەوێدا نەبێ كەس ناچێتە بەهەشتێ، یان سەلەفیی بڵێ: دەبێ بەس فلان كتێب بخوێنیەوەو بەدوای فلان شێخ بكەوی و، هەر خەریكی فلان ئیشە بی، ئەویدیكە هەمووی بەلاشە، ئا ئەوە عادەتی موشریكانە، ئەمما ئەگەر بڵێی: ئێمە دەمانەوێ بەرنامەو ڕێبازی خوا زیندوو بكەینەوە و، خۆمانو براو خوشكەكانیدیكەمان هەركەس دەیەوێ قورئانو سوننەت ببووژێنێتەوە و، شەریعەتی خوا لە خەڵك بگەیەنێتەوە، هەمووی إن شاء الله هەر لەسەر خێرە، ئەوە هەڵبەت ناكرێ ئایەتی: ﴿كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ﴾، واتە: (هەر دەستەو تاقمە بەوە كە بۆ خۆی لەسەریەتی هەر دڵی بەوە خۆشە)، بە بەڵگە لەسەری بهێنرێتەوە! بەڵێ ئەگەر تۆ دڵت بە ئیشی هەموو مسوڵمانان خۆشبێو هەموویشی بە هی خۆت بزانی و، پێتوانەبێ كە خەڵكی

دیکه (سەپانی پووشێیه)، ئەم ئایەته ناتگرێتەوه، ئێستا من –سوپاس بۆ خوا- دڵم به ئیشی هەمووڵایەك خۆشه، به هی هەر نوێژکەرێك و مسوڵمانێك ئەگەر هەر دوو رکات نوێژی راست بۆ خوای تاك بکات، دڵم پێی خۆشه، زیکرێك بکات دڵم پێی خۆشه، دیاره دڵم به هەڵەکانیشی ناخۆشه، بەڵام دڵم به چاکەکانیشی خۆشەو ناچم لەبەر دوو هەڵه، زەڕب بەسەر هەموو چاکەکانی دابێنم، هەروەها دڵم به چاکەکانی ئەو کەسەش خۆشه که مەشڕەب سەلەفیی‌یەو خەریکی ئیمان‌و عەقیدەیەو دژایەتی بیدعەت دەکات، دڵم به ئیشەکەی خۆشه، ئەوەندەی که چاکەو سوودی هەیه بۆ مسوڵمانان، وه دڵم به ئەویدیکەش خۆشه که ئامۆژگاری مسوڵمانان دەکات، وه ئەویدیکه که بۆخۆی عیبادەتێکی باش دەکات، هەرچەنده هەر لهماڵی خۆشیەتی، بەڵام دڵم بەویش هەر خۆشه.

بەکورتی: دەبێ دڵت به خێری هەموو خاوەن خێرێك خۆشبێ، وه تەنیا خۆشت لەسەر حەق نەبینی، حەق لەهەر شوێنێك هەیه تۆ عەودالّ‌و شەیدای بی‌و پشتگیریی بکەی، ئەوکاته تۆ وەبەر ئەم ئایەته ناکەوی، با لایەنێکی ئیسلامییشت هەبێ‌و با ناوونیشانێکی سیاسییشت هەبێ، بەڵام ئەگەر ناوونیشانی سیاسییشت نەبێ، بەس تەنیا خۆت پێ لەسەر حەق بێ و، ئەگەر خەڵکی دیکه دەوڵەتی ئیسلامییش دابمەزرێنێ، بڵێی: نامەوێ مادام لەڕێی منەوه نیه! وه ئەگەر یەکێکی دیکه هەزاران کەس ڕێنمایی بکات‌و فێری ئیمان‌و تەقواو عیبادەت‌و تاعەت‌و چاکەیان بکات و، له خراپەو گوناهانیان دووربخاتەوه، پێت هیچ بێ، چونکه لەڕێی تۆوه نیەو مۆری تۆی لەسەر نیه!! ئا ئەوه تەعەسسوب‌و دەمارگیرییەو، ئا ئەوه ئەوەیه که: ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ بەسەریدا دەچەسپێ.

گومانیشی تێدا نیه که ماك‌و میکرۆب‌و هۆکاری بنەڕەتیی سەرهەڵدانی سەرجەم پێڕو تاقمه لادەرو داهێنەرەکان (الفرق المبتدعة)، به درێژایی مێژووی

ئیسلام، یـان بـە هەڵـە تێگەیـشتنی دیـن، یـان بـەش بـەش كردنـی دیـن، یـان هەردووكیان پێكەوە بووە، وە بە زۆری وایە كە كابرا بە هەڵە لە دین تێگەیـشت، دینیش بەش بەش دەكات، بەشێكی دەگریو بەشەكانی دیكە بـە نـامۆو غـەریب دەزانیَ! بۆ نموونە: ئەوەی كە دەڵـیَ: دیـن تـەنیا تەزكیـەی نەفـسە، ئـەوەی كـە خەریكی كاری سیاسی بیَ، پێـی وایـە تووشـی دڵ رەق بـوون (قَـسْوَةُ القَلْـب) دەبیَ! وە ئەوەی كە پێیوایە دین تەنها عیبادەتی شەخسییە، ئەویدیكە كە خـەریكی جموجۆڵو چالاكیی كۆمەڵایەتییە، پێی وایە بە خۆڕایی سەری خـۆی دێـشێنیَ! وە ئەوەی كە پێی وایە ئیسلام تـەنها بـە بـەكارهێنانی هێـزو چـەك دەبووژێتـەوە، ئەوەی دیكە كە خەریكی پـەروەردەو كـاری فیكریـیو سیاسـیی دەبـیَ، پێیوایـە ئاسنی سارد دەكوتیَ!! بەڵام مرۆڤ ئەگەر لە دین تێگەیشتبیَو بە وردیی تەماشـای سیرەو ژیانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بكـات، كـە لـە هـەر قۆناغـەدا شـێوازێكو ئامرازێكی بەكارهێناوە، كە بۆ ئـەو قۆناغـە چـاك بـووە، ئەوكاتـە دەمـارگیریی (تَعَصُّب)ی نابیَ بۆ هیچ شتێكو هیچ شێوازێكو هیچ رێبازێكو هـیچ كارێـكو هیچ بەشێك لە بەشەكانی ئیسلام، بەڵكو هەموویان بە یەك چاو تەماشا دەكـات، وەك خوا ﷻ دەفەرمویَ: ﴿... وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ ...﴿٧﴾﴾ آل عمـران، واتـە: (... ئەوانـەی رۆچـوون لـە زانـستداو قـووڵ بوونەتەوە، دەڵێن: بڕوامان پێی هەیە هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە ...)، چونكە هەم لایەنی ئیمانو عەقیـدە، هەم لایەنی عیبادەتو تەقواو تەزكیـە، هەم لایـەنی فیكریـیو بانگـەواز، هـەم لایـەنی حـوكمو سیاسـەت، هـەم چـالاكی كۆمەڵایەتیو ... هتـد، هەمووی مادام دەچێتەوە سەر شەریعەت، دەچێتەوە سەر قوڕئانو سوننەت و، هەمووی لەلایەن خواوەیەو بڕوامان پێی هەیـەو دڵمـان بـە هەمووی هەر خۆشە.

كەواتە: ئەندامانی كۆمەڵی ئیسلامیی بە وردو درشتەوە، دەبێ هەمیشە:

١/ وریاو چوار چاو بن‌و بە هەڵە لە ئایەتەكانی قورئان‌و فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ حاڵی نەبن، كە بە تەئكید بەرهەم‌و كەلەپووری زاناو پێشەوایانی ڕەسەنمان، چاكترین یاریدەدەریانە بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام لەمەشیاندا دیسان دەبێ وریابن، چونكە قسەو بیروڕاو بەرهەمی زاناو پێشەوایانی ئیسلام، هەر كێیەك بن، هەر تێگەیشتنی ئەوانە دەربارەی ئایین و، بە خودی ئایین دانانرێ‌و، وەك دەقێكی ئایینی مامەڵەی لەگەڵدا ناكرێ -وەك پێشتریش لەوبارەوە باسمانكرد-، زانایانیش لەوبارەوە جوانیان گوتوە: (أَقْوَالُ الْعُلَمَاءِ يُسْتَدَلُّ لَهَا وَلاَ يُسْتَدَلُّ بِهَا)، واتە: (قسەی زانایان بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوە، بە بەڵگە ناهێنرێتەوە)، ناكرێ بڵێی: فلان شتە حەرامە، چونكە شافیعی وای گوتوە! شافیعی - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- ئیمامێكە، زانایەكی گەورەیە، جێی ڕێزو حورمەتە، بەڵام ئەو كە ئەو قسەیەی كردوە، بەڵگەكەی چییە؟ ئەهلی عیلم ئاوا پرسیار دەكەن، ئەویدیكە كە هیچی لێ نازانێ، ئەوە شتێكی دیكەیە، ئەگەرنا لە ڕاستیدا قسەی زانایان (دین) نیە، ئەگەرنا تۆ بڵێی: ئەبو حەنیفە وایگوت، مالیك وایگوت، ئەحمەد وای گوت، زەید وایگوت، جەعفەری صادق وایگوت، ئەبو داودی زاهیریی وایگوت، ئیبن حەزم وایگوت، ئیبن تەیمیە وایگوت، كە ئەو شتە حەڵاڵە یان حەرامە، نا، بەڵگەی چییە؟ ئەو وایگوت بەڵێ، بەڵام بەڵگەی چییە؟ پشتی بە چی بەستوە؟ چونكە: قسەی زانایان بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوە، بە بەڵگە ناهێنرێتەوە! وە ئەگەر تەماشابكەن زۆر لەوانەی كە ئیددیعای شوێنكەوتنی قورئان‌و سوننەت‌و سەلەفی ساڵح دەكەن، كەم وایە لە قورئان‌و سوننەت شارەزابن، بەزۆریی قسەی فلان پێشەوا، یان فلان زانا دێنن، وەك دینیش دەیهێنن! بەڵام نەخێر ئەو

قسانەی كە لە فلانو فیسار پێشەواو زانا نەقڵ دەكرێن، ناگونجێ وەك دەقەكانی شەریعەتو دین مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێ، ئەگەرنا كە ئێستا خوا، یەك (دین)ی بۆ داناوین، ئەو كاتە (دین)مان زۆردەبن!

بەڵكو هەرچی زانایان گوتوویانە لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتداو لە بازنەی ئیجتیهاددا، بەس بە تێگەیشتنی ئەوان دەربارەی (دین) دادەنرێو بە فەتواو بۆچوونی ئەوان دادەنرێ، ئینجا هەركامێكیشیان لەو تێگەیشتنو فەتوایەیدا، یان پێكاویێتی یان نەیپێكاوە، گرنگ ئەوەیە قسەی بەشەرە و، قسەی بەشەریش لە فەرمایشتی خوا جیایەو ئێمە لەسەرمانە بەدوای وەحی خوا بكەوین، ئەمما قسەی بەشەر هەر بایی ئەوەندە ڕێزی لێ دەگیرێ، كە وەحی خوا پشتگیریی دەكاتو تەعبیر لە وەحی خوا دەكات.

٢/ دەبێ هۆشیارو بێداربنو دڵنیابن، كە ئایینو بەرنامەی خوای كاربەجێ ﷻ، نە ئیمانو عەقیدەی بە تەنهایەو، نە تەنها تەزكیەو تەسەوفو زیكرو تەقوایەو، نە بەس حوكمو سیاسەتەو، نە تەنها پەندو ئامۆژگارییو حیكمەتە، بەڵكو چەندە پێویستی بە بانگەوازو فێركردنو پەروەردەیە، هێندەش حەوجێی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەو، كارو چالاكی سیاسیو ـ لەكاتی خۆیشیدا ـ جەنگو جیهادو ڕووبەڕووبوونەوەیە.

ئینجا ئەگەر (مسوڵمان)ێكیش یان كۆمەڵە (مسوڵمان)ێك، نەیانپەرژایە سەر هەموو یان زۆربەی ئەو لایەنو بوارانە، دەبێ لە بەرانبەر ئایینی خوادا، خۆیان بە كەمتەرخەم بزاننو، دانیش بە فەزڵو چاكەی (مسوڵمانان)ی دیكەدا بێنن، (مسوڵمان)ێك دەڵێ: من دەتوانم تەنها خەریكی ئەو لایەنە بم، ئێ باشە، بەڵام مەڵێ ئیسلام تەنها هەر ئەوەندەیە، دان بە فەزڵو چاكەی خەڵكی دیكەدا بنێ، كە هەندێك كارو چالاكی دیكەی ئیسلامیی دەكات تۆ پێت ناكرێ،

یان نایكەی! نەك بۆ پینەو پەڕۆی كەمتەرخەمیی خۆیانو، بیانووو پاساو هێنانەوە بۆ خۆیان، ئیسلامو دینداریی لەو بەشەی خۆیاندا كورت هەڵبێننو، بێ ویژدانانە زەڕب بەسەر كارو چالاكی خەڵكی دیكەدا بێنن! ئەوە نابێ.

## بواری دووەم: ئیمانو عەقیدەی ڕاستو دامەزراو:

دووەمین بواری هەرە گرنگی تێدا پەروەردەبوونی ئەندامانی وردو درشتی كۆمەڵی ئیسلامیی، پاش (زانیاریو تێگەیشتنی ڕاستو تەواو)، بریتیە لە: (ئیمانو عەقیدەی ڕاستو دامەزراو)، چونكە ئەگەر زانستو تێگەیشتن، چراو ڕووناكیی ڕێگا پێبینرانە، ئیمانو عەقیدەش بناغەی دینداریی و مسوڵمانەتی لەسەر بنیاتنانە، جا هەرچەندە توێژینەوەی بابەتێكی گرنگو گەورەی وەك ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لە قەرەی ئێرەدا نیەو، پێویستی بە شوێنێكی تەرخانو سەربەخۆیە(١)، بەڵام خستنەڕووی چەند مەسەلەیەكیش هەر بە پێویست دەزانم:

١/ **پایەكانی ئیمان (أَرْكَانُ الإِيمان)**: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو فەرموودەیەدا كە (موسلیم) لە عومەری كوڕی خەتتاب ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ گێڕاویەتەوە، دەربارەی پایەكانی ئیمان فەرموویەتی: {... أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ ...} رواه مسلم: (٨)، واتە: (... ئیمان بێنی بە خواو بە فریشتەكانیو بە كتێبەكانیو بە پێغەمبەرانیو بە

---

١) سوپاس بۆ خوا لە زنجیرە دەرسی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر تیشكی قورئانو سوننەتدا) كە پەنجا (٥٠) دەرسی یەك سەعاتیین، سەرجەم بابەتو مەسەلەكانی ئیمانو عەقیدەمان بە وردیی توێژیونەوەو، ئێستاش سوپاس بۆ خوا لە شەش بەرگدا چاپكراون، لە نووسینگەی تەفسیر.

ڕۆژی دوایی، وە بڕوا بێنی بە قەزاو قەدەر بە چاكو خراپییەوە –بە نسبەت تۆوە- ).

کەواتە: ئیمان هێنان بە خوا ﷻو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانی علیهم الصلاة والسلامو ڕۆژی دواییو قەزاو قەدەر، شەش پایە بنەڕەتییەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیین بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ و، لە قورئانیشدا لە چەند شوێنێکدا باسی پێنج پایەکانی ئیمان کراوە، بۆ وێنە کە خوای گەورە ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ...﴿١٧٧﴾﴾ البقرة، واتە: (کرداری چاكو کاری باش تەنها بریتی نیە لە ڕووکردنتان بەرەو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا – چونکە جوولەکەکان زۆر لەسەر گۆڕانی قیبلە دوانو پڕوپاگەندەی زۆریان کرد-، بەڵکو کرداری چاكو کاری باش بریتیە لەوە کە مرۆڤ بڕوای هێنابێت بە خواو بە ڕۆژی دواییو بە فریشتەکانو بە کتێبەکانو بە پێغەمبەران ...)، لێرەدا تەنیا پێنج پایە باسکراون، بۆچی؟ چونکە ئیمان بە قەدەری خوا – وەك پێشتریش باسمانکردوە- هەر دەچێتەوە نێو ئیمان بە خوا، ئیمان بە قەدەر، واتە: ئیمانت بەوە هەبێ کە خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێو هەموو شتێك دەتوانێ، خوای بەرزو مەزن کاربەجێیە، ئیرادەو ویستی خوا ﷻ بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە، کەواتە ئیمان بە قەدەریش هەر دەچێتە نێو ئیمان بە خوا ﷻ، بۆیە لە (قورئان)دا ئیمان بە قەدەر بەتایبەت باس نەکراوە.

٢/ **پێکهێنەرەکانی ئیمان (مُكَوِّنَاتُ الإِيمان)**: بە سەرنجدانو تێڕامانی دەقەکانی قورئانو سوننەت، پاشان شەرحو تەفسیری زاناو پێشەوایانمان،

وەك ڕۆژی ڕوون دەردەكەوێ، كە ڕاستترین قسە لەبارەی ماهیەتو پێكهێنەرەكانی ئیمانەوە ئەوەیە كە زانایانی (أَهْلُ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَة) گوتوویانە، كە دەڵێن: (الإِيـمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ، وَهُوَ: قَوْلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ، وَعَمَلُ الْقَلْبِ وَالْجَوَارِحِ)، واتە: (ئیمان قسەو كردەوەیەو، زیادو كەم دەكات، قسەی دڵو زمانو، كردەوەی دڵو ئەندامەكانە).

كەواتە: ئیمان سەرجەم چوار پێكهێنەری هەن، كە بە هەر چواریان پێكدێو دروستدەبێو، بەبێ هیچ كامیان پێی ناگوترێ ئیمان:

**یەكەم**: قسەی دڵ (قَوْلُ الْقَلْبِ): كە مەبەست پێی: زانینو بە ڕاست زانینی عەقڵو دڵە: (مَعْرِفَةُ وَتَصْدِيقُ الْعَقْلِ وَالْقَلْبِ)، زانینو بە ڕاست زانینی عەقڵو دڵ، بۆچی؟ چی بە ڕاست بزانێ؟ خوا ﷻ بە ڕاست بزانێ، پێغەمبەر ﷺ بە ڕاست بزانێ، وە هەرچی پێغەمبەر ﷺ لە خواوە ﷻ هێناویێتی بە ڕاستی بزانێ.

**دووەم**: كردەوەی دڵ (عَمَلُ الْقَلْبِ): كە مەبەست پێی خۆشویستنو قبووڵكردنو پێ ڕازیبوونو تەسلیم بوونی دڵو دەروونە: (مَحَبَّةُ الْقَلْبِ وَقَبُولِهِ وَرِضَاهُ وَإِذْعَانُهُ)، بۆكێ؟ بۆ خوا ﷻ، وە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە بۆ هەرچی پێغەمبەر ﷺ لە خواوە ﷻ هێناویێتی.

**سێیەم**: قسەی زمان (قَوْلُ اللِّسَانِ): كە مەبەست پێی دانپێداهێنانی زمانە (إِقْرَارُ اللِّسَانِ)، دانپێداهێنانی زمان بە چی؟ بە بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگاریێتیو پەرستراوێتی خوادا ﷻ، وە بە پێغەمبەرایەتی موحەممەددا ﷺ، وە بەوەدا كە هەرچی موحەممەد ﷺ لە خوا وە هێناویەتی، ڕاستو دروستە.

**چوارەم**: کردەوەی ئەندامەکان (عَمَلُ الْجَوَارِحِ): کە مەبەست پێی کردەوەی ئەندامە رواڵەتییەکانو راپەڕاندنی ئەرکو کارەکانە: (عَمَلُ الْأَعْضَاءِ الظَّاهِرَةِ وَتَنْفِيذُ الْوَظَائِفِ).

کەواتە: دەتوانین بڵێین: ئیمانو عەقیدە سەرتاپای بوون (وُجُود)ی ئینسانی مسوڵمان دەگرێتەوە، چونکە: ئینسان بەگشتی لە چوار بەش پێکهاتوە:

أ/ عەقڵێك کە پێی لە شت تێدەگاتو، شتەکانی پێ دەزانێو دەناسێو، خوا ﷻ لە سەری سەرێ دایناوە.

ب/ دڵێك کە هەڵوێستی لە بەرانبەر شتاندا پێ وەردەگرێ، وەك: خۆشویستنو بوغزاندنو قبووڵکردنو نەویستن و، خوا ﷻ لە نێو قەفەزەی سینگدا دایناوە.

جـ/ زمانێك کە هەستو نەستی خۆی پێ دەردەبڕێو دەدرکێنێ و، خوا ﷻ لە نێوان عەقڵو دڵ دا دایناوە، تا بە عەقڵ بیربکەیەوەو بە دڵ دانی پێدا بێنی، ئینجا بە زمان دەری ببڕی.

د/ جەستەو لاشەیەکی رواڵەتی کە لە چەند ئەندامێك دروست بووە و، کارو چالاکییە دیارو بەرچاوەکانی پێ ئەنجام دەدا.

دەبێ بە عەقڵ بزانیو، بە دڵ قبووڵی بکەیو، بە زمان دەریببڕی، ئینجا دەبێ بە کردەوەو بە جەستە ئەنجامی بدەی، ئەگەر بە جەستە ئەنجامی نەدەی، ئەوە دووڕوویی و ئیزدیواجیەتە.

ئینجا هەرکام لەو چوار بەشو پێکهاتانەی ئینسان، جێگای پەیوەندی یەکێك لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمانە بەڕیز (تَرْتِيب): عەقڵ جێگای پێکهێنەری یەکەمە (کە زانینو بە راست زانینی عەقڵو دڵە)و، دڵ جێگای پێکهێنەری دووەمە (کە خۆشویستنو قبووڵکردنو پێ رازیبوونو تەسلیم بوونی دڵو دەروونە)و، زمان

جێگای پێکهێنەری سێیەمە (کە دانپێداهێنانە) و، جەستەش جێگای پێکهێنەری چوارەمە[١] (کە مەبەست پێی کردەوەی ئەندامە رواڵەتییەکانو راپەڕاندنی ئەرکو کارەکانە).

لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە لەبارەی پەیوەندی کردەوەی ئەندامەکان بە ئیمانەوە، ئەم روونکردنەوە کورتە بخەمەڕوو:

کاتی خۆی لە مێژوودا (خَوَارِج)و (مُعْتَزِلَة) هەبوون[٢]، کە هەردووکیان لەو خاڵەدا پێك دەگەنەوە کە لەبارەی بە بەشێك لە ئیمان دانانی کردەوەکانەوە، دووچاری زێدەڕۆیی (إِفْرَاط) بوون، بۆچی؟ چونکە تێکڕای کردەوانیان بە پێکهێنەری ئیمان داناوە و، بەو پێیەش هەر کەسێك کردەوەیەکی فەرزی چواندبێ، یان گوناهێکی گەورەی کردبێ، (خَوَارِج) بە بێ ئیمانو (مُعْتَزِلَة)ش بە نە کافر نە مسوڵمانیان لە قەڵەم داوە! دیارە ئەوەش تێپەڕاندنە، چونکە هەر کەسێك فەرزێك بچوێنێ پێی کافربێ و، گوناهێکیش بکات هەر کافربێ، ئەوە بە تەئکید پێچەوانەی زۆر لە ئایەتەکانی قورئانو فەرمایشتەکانی پێغەمبەرە ﷺ، کە خوای پەروەردگار ﷻ باسی مسوڵمانان دەکات، قەتڵ دەکەن، زینا دەکەن، شەڕاب دەخۆنەوە، گوناه دەکەن، بەڵام لە ئیمان ناچنە دەرێ.

بەڵام (مُرْجِئَة)کان راست پێچەوانەی (خَوَارِج)و (مُعْتَزِلَة)ن، بۆچی؟! چونکە ئەوان لەوبارەوە گیرۆدەی بەزایەدان (تَفْرِيطْ) بوونە و، پێیانوابووە

---

١) دوازدە دەرسی سەرەتای زنجیرەی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)مان بۆ توێژینەوەی ئیمانو مەسەلە پەیوەندیدارەکانی تەرخان کردوون، بڕوانە: بەرگی یەکەمی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی).

٢) وەك لە بەرگی یەکەمی کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا بە دوورو درێژی باسمکردوە.

کردەوەی ئەندامەکان کەموزۆر پەیوەندی بە ئیمانەوە نیەو، دەگونجێ کابرا کامڵترین ئیمانی هەبێ، بەبێ هیچ کردەوەیەکی چاکو، بە سەدان جۆرە گوناەو تاوانیشەوە!

خەواریج گوتوویانە: یەك گوناهی بکەی کافردەبی! کەچی مورجیئە گوتوویانە: هەرچی بکەی قەیدێ ناکا! هەر بۆ ئیمانەکەشت زەرەری نیە، (هەڵبەتە گوناە دوو جۆرە: یان چواندنی فەڕزە، یان کردنی قەدەغەیە) چ فەڕزێك بچوێنی، چ قەدەغەیەك بشکێنی، هەردووکی گوناهە، وە موعتەزیلە گوتوویانە: نالێین کافر بووە، بەس ناشلێین: مسوڵمانە. ئەدی چییە؟ گوتوویانە: (مَنْزِلَةٌ بَيْنَ الْمَنْزِلَتَيْنِ) هەڵواسراوە، نە مسوڵمانە و، نە کافرە، دیارە شتی واش لە (قورئانو سوننەت)دا نیە، مرۆڤ یان کافرە یان (مسوڵمان)ە، یان فەترى (فَتْرِي)یە[1]، کە بێگومان (فَتْرِي) جیایە لە (مَنْزِلَةٌ بَيْنَ الْمَنْزِلَتَيْنِ).

دیارە رای راستیش لەوبارەوە ئەوەیە کە زانایانی (أهل السنة والجماعة) هەڵیانبژاردوە، کە دەڵێن: جینسی کردەوە ـ نەك هەموو کردەوەیەك ـ پێکهێنەری ئیمانە و، ئیمان بە تاعەت زیادو بە گوناەو تاوانو سەرپێچیی کەم دەکات.

وە هەر لە باسی ئیمانو عەقیدەدا، پێویستە باسی خوا بەیەکگرتن بکەین:

---

١) (فَتْرِي)، واتە: (أَهْلُ الفَتْرَة)، کە بریتین لەوانەی پەیامو بەرنامەی خوایان پێنەگەیشتوەو، ئەوانە بە دەربازبوو (نَاجِي) لە قەڵەم دەدرێن، (أَهْلُ الفَتْـرَة)ش لەم ئایەتەدا ئاماژەیان بۆ کراوە: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ...﴿١٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: (ئەی خاوەن کتێبەکان! بەتەئکید پێغەمبەرمان – موحەممەد ـ هاتە لاتان، پاش ماوەیەك لە پچڕانی هاتنی پێغەمبەران، ئەو پێغەمبەرە دێتە لاتانو ئەوەی پێویستە بۆتان بۆ روون دەکاتەوە ...).

## خـوا بەیەكگرتن (التوحـید) كاكڵی ئیمان و چەقی عەقیدەیە:

ئەگـەر ئیمـانو عەقیـدە بناغـەو بنـەڕەتی مـسوڵمانەتیو دینداریيـە، خـوا بەیەكگرتنیش كـاكڵو جەوهـەرو چـەقی ئیمـانو عەقیدەیـە، چـونكە تێكـڕای ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی پەیوەستە بە خوا بەیەكگرتن (توحیـد الله)ەوە و، لـەو سەرچاوە روونو زوڵاڵەوە هەڵدەقوڵێ! چۆن؟ ئیمان بە خوا ﷻ یـانی: ئیمـان بە یەكتایی خوا، واتە: هەر خوا ﷻ بەدیهێنەرەو، هەر خوا ﷻ پەروەردگارەو، هـەر خـوا ﷻ خاوەنـەو، هـەر خـوا ﷻ سەرپەرشـتیكارەو، هـەر خـوا ﷻ پەرستراوە، وە بەس خوا ﷻ خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێكی بەرزو پەسندە، وە ئەو خوا تاكە ﷻ پەیامو بەرنامەكانی خـۆی لـەڕێی فریـشتەكانییەوە نـاردوە بـۆ پێغەمبەرانی خۆی علیهم الصلاة والسلام، بۆ هیدایەتدانی بەندەكانی، تاكو لەو رۆژەدا كە پێی دەگەنەوە –كە رۆژی دواییە- سەربەرزو سەرفراز بن، كەواتە: هەر پێنج پایە سەرەكییەكەی ئیمانو عەقیدە، دەچنەوە نێو ئیمـان بـە خـوا ﷻو ئیمان بە یەكتایی خوا ﷻ.

جا بێگومـان: خـوا بەیەكگـرتن (التوحیـد) بابەتێكـی یـەكجار گـەورەو گـرنگو فراوانـەو، لـە حەوسـەڵەی ئێـرەدا نیـە[1]، بـەڵام دەرفـەتی چـەند رستەیەكمان هەر هەیـە، لەبـارەی سێ پێكـهێنـەرە بنـەڕەتییەكـەی (خـوا بەیەكگرتن)ەوە:

---

١) لە زنجیرە دەرسی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) بیستو چوار دەرسمان بـۆ توێژینـەوەی خـوا بەیەكگرتن (توحیـد الله) تەرخان كردوە، بە هەرسێك بەشـەكانییەوە، لە دەرسی سێزدەیەمەوە، هـەتا دەرسـی سـیو شـەش (٣٦)، بڕوانـە: بەرگـەكانی: دووەمو سـێیەمی كتێبـی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی).

**<u>پێكهێنەری یەكەم</u>: خوا بەیەكگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا (تَوْحِيدُ اللهِ فِي خَالِقِيَّتِهِ وَرُبُوبِيَّتِهِ):**

مەبەست پێی تەنها خوا ﷻ بە پەیداكەر (مُوجِد)و خاوەنو سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەرو هەمەكارەی بوون (وُجُود) زانینە[1]، وەك خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ ... ﴿٦٣﴾﴾ الزمر. واتە: (خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكەو، مشوورخۆرو سەرپەرشتیاری هەموو شتێكە، خەزێنەكانی ئاسمانو زەوی هی وین ...).

هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ قُلِ ٱللَّهُۚ ... ﴿١٦﴾﴾ الرعد، واتە: (... بڵێ: كێ خاوەنو مشوورخۆری ئاسمانەكانو زەوییە؟ بڵێ: خوا ...).

---

١) وشەی (بوونەوەر) ناتوانین بڵێین تەعبیر دەكات لەوەی خوا ﷻ پەیدای كردوە (بوون)، بەڵكو لەوە باشتر ئەو تەعبیرەی قورئانە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ ... ﴿٢٣﴾﴾ الذاريات، وە چەندین ئایەتیدیكە، واتە: (...ئاسمانو زەوی ...)، یان ﴿...ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ... ﴿١١٦﴾﴾ البقرة، وە چەندین ئایەتیدیكە، واتە: (... ئاسمانەكانو زەوی ...). ئاسمان، واتە: هەرچی لەسەرێیە، وە زەوی، واتە: هەرچی لە خوارێیە، لە هەندێك ئایەتدا هاتوە دەڵێ: ﴿... وَمَا بَيۡنَهُمَآ ... ﴿٨٥﴾﴾ الحجر، وە چەندین ئایەتیدیكە، واتە: (... وە ئەوەی دەكەوێتە نێوان ـ ئاسمانو زەویشەوە ...)، بۆچی؟ چونكە: بوونەوەر واتە: ئەوەی كە تا ئێستا بە دووربینەكان بینراوە، كە ئەوە گۆشەیەكە لە ئاسمانی یەكەم، ئینجا نازانین داخۆ ئاسمانی یەكەمیش لە كوێ كۆتایی دێ، وە لە سەرووی ئەوەوە، شەش ئاسمانی دیكە هەن، وە بارەگا (عرش)ی خواش هەیە، وە بەهەشتو دۆزەخیش هەن.

**<u>پێكهێنەری دووەم</u>**: خوا بەیەككگرتن لە پەرستراوێتییدا (تَوْحِيدُ اللهِ فِي أُلُوهِيَّتِهِ):

ئەمیش مەبەست پێی ئەوەیە كە وەك چۆن خوا ﷻ بە تەنها پەیداكەرو خاوەنو بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیاری بوون (وُجُود)ە، دەبێ بە تەنیاش بەندایەتی بۆ وی بكرێو، هەر خۆی بپەرسترێو، وەك چۆن لە وەدیهێنانی شتانو خاوەندارێتیو سەرپەرشتیو مشوورخواردنیاندا، بێ وێنەو هاوەڵو هاوتاو هاوبەشە، پێویستە لە بەندایەتیو پەرستن (العُبُودِيَّة وَالْعِبَادَة)یشدا، هاوبەشی بۆ دانەنرێو، هیچ شتێكو هیچ كەسی لەگەڵ نەپەرسترێ، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَـٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾ الزمر. واتە: (بڵێ: ئایا فەرمانم پێدەكەن كە بێجگە لە خوا – شتێكی دیكە ـ بپەرستم ئەی نەفامەكان؟! خۆ بەتەئكید بە تۆشو بەوانەی پێش تۆش ڕاگەیەنراوە، كە ئەگەر هاوبەش پەیدابكەی، كردەوەكانت هەڵدەوەشێنەوەو، لە زیانباران دەبی، بەڵكو هەر خوا بپەرستەو، لە سوپاسگوزاران بە).

بەڵام ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگە ئەوەیە كە لە زانینی چەمكو واتای پەرستن (عِبَادَة)دا بەهەڵەدا نەچین، كە دەتوانین بەكورتی بڵێین:

پەرستن (عِبَادَة) بریتیە لەوپەڕی بەگەورەگرتنو خۆشویستنو مل بۆ كەچكردن (أَقْصَى التَّعْظِيمِ وَالْحُبِّ وَالْخُضُوعِ)، بۆ كێ؟ بۆ خوا ﷻ، جا ئەگەر بۆ خوا ﷻ بێ، ئەوە پەرستنی بە هەقە، بەڵام ئەگەر هەر كامێك لەمانە یان هەرسێكیان، بۆ غەیری خوا ﷻ بێ، ئەوە مانای وایە غەیری خوا ﷻ

پەرستراوە، ئەمە وەك ماهیەتی پەرستن (عِبَـادَة)، وە وەك پانتایی (مَسَاحَة)یش، ئەوە وشـەی خواپەرسـتیی (عِبَـادَةُ اللهِ) تێكـڕای ئـەو نیـازو مەبەسـتو قـسەو دەربڕینو كردەوەو ئاكارانـە دەگرێتـەوە، كـە لـەلای خـوا ﷻ خۆشەویـستو پەسندن.

لەبارەی خوا بەیەكگرتنیـشەوە لـەڕووی پەرسـتنەوە، خـستنەڕووی ئـەم دوو ڕاستییە بە پێویست دەزانم:

**ڕاستیی یەكـەم**: بە درێژایی مێژوو كێشـەو گرفتی نێوان پێغەمبەرانی خوا علـیهم الصلاة والسلامو نـەیارو ناحـەزانیان، بـەزۆریو بـە پلـەی یەكـەم، لەسـەر مەسەلەی پەرستن (عِبَـادَة) بووە، نەك لەسەر دانهێنـان بـە بـوونی خـوا ﷻو پەروەردگارێتی خوادا، بەڵێ مشتومڕی پێغەمبـەران علـیهم الـصلاة والـسلام لەگەڵ نەیارەكانیاندا، لەسەر ئەوە نەبووە، ئەوان بڵێن: خوا ﷻ ناناسینو دان بە بوونی خوا ﷻدا نەهێننو، دان بە بەدیهێنەرایەتی خوا ﷻدا نـەهێننو، دان بە پەروەردگارێتی خوا ﷻدا نەهێنن! بەڵكو لەسەر ئەوە بووە: كـە ئایـا تـەنیا خوا ﷻ بپەرسترێ، یاخود هاوبەش (شَرِيك)ی بۆ پەیدابكرێ؟ وەك خـوای زاناو توانا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾ الزخـرف، واتـە: (وە ئەگـەر لێیـان بپرسی: كێ ئاسمانەكانو زەوی دروستكردوون؟ بە جەختكردنـەوە دەڵـێن: خوای زاڵی زانا دروستی كردوون).

كەواتە: كێشە لەسەر خواناسیی نیە، كێشە لەسـەر خواپەرسـتییە، كێـشە لەسەر ئەوە نیـە دان بـە بـوونی خـوا ﷻدا ناهێنـدرێ، كێـشە لەسـەر ئەوەیـە بەندایەتی بۆ ناكرێ، دیارە ئێستاش هەروایە، هەرچی ملی دەگری خـۆی لـە

تۆ بە مسوڵمانتر دەزانیێ، دەڵێ: کاکە ئێمەش مسوڵمانین، کەچی خۆی بە فیرعەون دەزانیێو، پێشی خۆشە خەڵك بەندایەتی بۆ بکات! وە ئەگەر بەندایەتیی و کۆیلایەتیی بۆ نەکەن، لێیان ڕازی نابێ، کەچی دەشڵێ: مسوڵمانم!! بەڵێ کێشەی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئەوە نەبووە، خەڵك بڵێ: خوا ﷻ نیەو ئەم دنیایە شاری بێ ساحێبەو کەس دروستی نەکردوە! لە مێژووی کۆندا هیچ بەشەرێکی کەریش واینەگوتووە! ئەوەتا فیرعەون نەیگوتوە: من بەدیهێنەری بوونەوەرم، بەڵکو گوتوویەتی: من پەروەردگارتانم: ﴿... أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾﴾ النازعات، یانی: دەبێ بڕیاری کۆتایی بەدەست من بێ، وە گوتوویەتی: من پەرستراوتانم: ﴿... لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الشعراء، واتە: (... – فیرعەون بە مووسای گوت ـ: ئەگەر جگە لە من کەسێکی دیکە بکەیتە پەرستراوی خۆت، دەتخەمە ڕیزی بەندکراوەکانەوەو زیندانییت دەکەم)، بەڵێ فیرعەون زانیویەتی پێش ئەویش ئەو بوونەوەرە بووەو دوای ویش دەمێنیێو، هێندە ئەحمەق نەبووە بڵێ: من ئەو کەونو کائیناتەم دروستکردوە! بەلام گوتوویەتی: قسەی کۆتایی دەبێ بەدەست من بێ، من دەبێ حەلاڵو حەرامتان بۆ دیاری بکەم، من شێوەی ژیانتان بۆ دیاری بکەم، وە دەبێ من بە بەرزو پیرۆز دابنرێمو کۆیلەی من بنو بەندایەتیی بۆ من بکەنو ... هتد.

بەڵێ کێشەی نێوان پێغەمبەرانی خوا علیهم الصلاة والسلامو نەیارو ناحەزانیان بە سەرقافڵەیی تاغووتەکان، لەسەر ئەوە بووە کە: کێ فەرمانبەریی و گەردنکەچیی بۆ بکریێو کێ لە هەموو کەس زیاتر بە گەورە بگیریێ؟ کێ لە هەموو کەس زیاتر خۆش بویستریێ؟ کێ لە هەموو کەس زیاتر گەردنی بۆ کەچ

بكریێ؟ كێ .. كێ ...؟ خوا ﷻ یان نـەمروودو فیرعـەونو قـارِوونو هامـانو ئەبو جەهلو باقی ئەو تاغووتانەی كە هەمیشە دژی خوا بەیەكگرتن بـوون، بـۆ ئەوەی دەرفەت بكرێتەوە تاكو ئەوان جێی خوا ﷻ بگرنەوە، لە كۆیلایـەتیی بـۆ كران و، بەندایەتیی بۆ كران و، پەرستران و، بە گەورە سەیركراندا؟!

هەربۆیەش ویردی سەر زمانو یەكەمین پەیامی پێغەمبەرانی خوا علیهم الصلاة والسلام بریتی بووە لە: ﴿... يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ...﴿٥٩﴾﴾ الأعراف. هەروەها لە ئایەتەكانی (٦٥)و (٧٣)و (٨٥)ی هەمان سوورِەتدا، هەر ئەم تەعبیرە دووبارە بۆتەوە، واتە: (... ئەی گەلەكەم: بەندایەتی بۆ خوا بكـەن، خوا بپەرستن، بێجگە لەوی هیچ پەرستراوی دیكە ـی شایستەی پەرسـتنـ تـان نین)! ئەو قەیدەی دەبێ رەگەڵ بخەی كە دەڵـێ: ﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ واتـە پەرستراوێك كە شایستەی پەرستن بێ، ئەمما ئەگـەر شایـستەی پەرسـتن نـەبێ، سەد بتو سەنەمو فیرعەونو تاغووتو دارو بەردیان پەرستوە، بـەڵام هیـچیان شایستەی پەرستن نەبوون.

دیارە ئێستاش لەم رۆژگارەمانـدا هـەر بـە هـەمان شـێوەیە، كێـشەو گرفتـی گەورەو سەرەكی نێوان تەوژمی ئیسلامییو دیكتاتۆرو تاغووتەكان، هەر هەمان مەسەلەی گۆرینەو، جەوهەری تێكگیرانەكە هەروەك خۆیەتیو، هیچ گـۆڕانی بەسەردا نەهاتوە، تەوژمی ئیسلامیی دەڵێ: دەبێ تـەنیا خـوای پـەروەردگار ﷻ بپەرستریێو، بەندایەتیی بۆ بكریێو، بێجگە لەوی هیچ كەسو هیچ شتێك لەوە ناوەشێتەوە، كە ئینسانەكان بیپەرستنو، بەندایەتیی بۆ بكەن، بەڵام تاغووتەكان كە لە (شەخسو حیزبو رژێم)ەكاندا بەرجەستەن، دەڵێن: دەبێ لەجیاتی خوا ﷻ، یان وێڕای خوا ﷻ ئێمەش بپەرسترێینو بەندایەتییمان بۆ بكریێ!

چۆنیەتی ئەو پەرسترانەش لە راستیی دووەمدا دەخەینەڕوو.

**راستیی دووەم**: پەرستنی خوای پەروەردگار ﷻ ـ كە پێشتر باسی ماهیەتیو پانتاییەكەیمان كرد ـ، دەتوانین بڵێین لە ژیانی ئینساندا بۆ سێ تەوەرەی سەرەكی دابەش دەبێ:

**یەكەم**: تەنها لە خوا ﷻ وەرگرتنی بووناسیی (ئۆنتۆلۆژیی: Ontology)و ئیمانو عەقیدە، واتە: چۆنیەتی تەماشاكردنو ناسینی بوون (وُجُود)و مامەڵە لەگەڵدا كردنیو هەڵوێست لە بەرانبەردا نواندنی، بە هەر چوار بەشی سەرەكییەوە: خوا ﷻ، بوونەوەر، ژیان، ئینسان. لە كتێبی ﴿تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەكانیاندا باسی (بووناسیی ئیسلامیی)مان كردوە﴾.

**دووەم**: تەنها لە خوا ﷻ وەرگرتنی یاساكان (الشرائع)و سیستەمی ژیان (نظام الحیاة)، بە ئەمرو نەهیو حەڵاڵو حەرامو چاكەو خراپە دیاریكردنەوەوەش، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف. واتە: (... ئاگاداربن! دروستكردنو فەرمان، تەنیا هی خوایە، بەرزو بێ وێنەیە خوای پەروەردگاری جیهانەكان).

**سێیەم**: تەنیا بۆ خوا ﷻ پێشكەشكردنی دروشمەكانی بەندایەتی (شعائِرُ التَّعَبُّدْ)، وەك: لێپاڕانەوەو، ئەوپەڕی خۆشویستنو، ئەوپەڕی لێ ترسانو، پشت پێ بەستنو، قوربانی بۆ سەربڕین و، سوێند پێ خواردن و، سەجدەو ركووعو ...هتد، چونكە ئەو شتانە نیشانەو دروشمی پەرستنو بەندایەتی بۆ

كرانن‌و، دیاره ئه‌وه‌ش ته‌نها شایسته‌ی خوایه ﷻ، خوای بێ وێنه ﷻ له‌باره‌ی ئه‌و شتانه‌وه فه‌رموویه‌تی:

١) ده‌رباره‌ی ته‌نیا له خوا ﷻ پاڕانه‌وه ده‌فه‌رموێ: ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾﴾ الجن، واته: (مزگه‌وته‌كان هی خوان، جگه له‌و له كه‌سی‌دی مه‌پاڕێنه‌وه)، یاخود ئه‌و ئه‌ندامانه‌ی سه‌جده‌یان له‌سه‌ر ده‌برێ، ـ مساجد به‌و مانایه‌ش هاتوه ـ ته‌نیا هی خوان ﷻ، جا له غه‌یری خوا ﷻ مه‌پاڕێنه‌وه.

٢) وه ده‌رباره‌ی له هه‌موو كه‌سێك‌و له هه‌موو شتێك زیاتر خۆشویستنی خوا ﷻ ده‌فه‌رموێ: ﴿... وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ... ﴿١٦٥﴾﴾ البقرة، واته: (... وه ئه‌وانه‌ی بڕوایان هێناوه، خۆشه‌ویستییان بۆ خوا زیاتره له خۆشه‌ویستی ئه‌وانی دیكه بۆ په‌رستراوه‌كانیان ...).

٣) ده‌رباره‌ی لێترسانی خوا ﷻ ده‌فه‌رموێ: ﴿... فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ آل عمران، واته: (... ئینجا له‌وان مه‌ترسن، هه‌ر له من بترسن ئه‌گه‌ر ئیماندارن)، ئه‌و كه‌سه‌ی ئیمانی هه‌بێ ئه‌و ترسه‌ی به‌رانبه‌ر خوا ﷻ هه‌یه‌تی، ئه‌و سام‌و هه‌یبه‌ته‌ی به‌رانبه‌ر به خوا ﷻ هه‌یه‌تی، نابێ به‌رانبه‌ر شتێكی دیكه هه‌یبێ.

٤) ده‌رباره‌ی پشت پێ به‌ستن، خوا ﷻ ده‌فه‌رموێ: ﴿... وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾ آل عمران، واته: (... با ئیمانداران ته‌نیا پشت به خوا ببه‌ستن).

٥) وە دەربارەی قوربانی سەربڕین، خـوا ﷻ دەفـەرمویَ: ﴿... فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ۝٢﴾ الكوثر، واتـە: (... ئینجـا نوێـژ بـۆ پـەروەردگارت بكـەو، قوربانی بۆ وی سـەربڕە).

٦) وە لەبارەی سوێند پێ خواردنـەوە، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (... فَمَـنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْـلِفْ بِاللَّهِ ...) رواه البخاري: (٦١٠٨) ومسلم: (١٦٤٦)، واتە: (...ئینجا هەر كەسێك سوێند دەخوا، با تەنها سوێند بە خوا بخوا ...).

شایانی باسیشە كە خـەڵكی بەگـشتی لـەم ڕۆژگـارەدا گـیرۆدەی هەرسـێك جۆرەكـانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان (الإِشْـرَاكُ بِـالله) بوونـە، لـە هەرسـێك بوارەكانی: بوونناسییو ئیمان (معرفة الوجـود والإیــمان)و، یاسـاكانی ژیـان (شرائع الحیاة)و، دروشمەكانی پەرستن (شعائر التعبد)دا، كە بێگومان هـەركام لەو سێ جۆرە (شرك)ەش، بە هاوبەش بۆ خوا دانانی گـەورە (الـشرك الأكـبر) دادەنرێنو، ئینسانیان پـێ لـە بازنـەی دیـن دەردەچـێ، وە پێویـستە لێـرەدا دوو مەسەلەی گرنگ جەختیان لەسەر بكرێ:

أ/ ئەو سێ جۆرە هاوبەش بۆ خوا پەیداكردنە: وەرگرتنی تێڕوانینو بوونناسیی لە غەیری خوا ﷻو خەلەل لە ئیماندا، یاخود خەلەل لە وەرگرتنی یاسـاكانی ژیانو لە غەیری خوا ﷻ وەرگرتنی حەڵاڵو حەڕام، یاخود پێشكەش كردنی خواپەرستییە تایبەتییەكان (شعائر التعبـد) بـە غـەیری خـوا ﷻ، هەرسـێكیان پێكەوە پەیوەستن، كاتێك ئینسان تێڕوانینی تێكدەچێ بەرانبـەر بـە خـوا ﷻ، بوونناسییەكەی تێكدەچێو، ئیمانو عەقیدەشـی تێكدەچـێ، وە كـە ئـەوەی تێكـچوو عیبادەتیـشی تێكدەچـێ، عیبـادەت بـە هـەردوو بەشـی وەرگرتنـی یاساكانی ژیانو، پێشكەشكردنی دروشمەكانی خواپەرستییەوە.

**ب/** ئەوەی كە بەڕاستی لە ڕۆژگاری ئێمەدا خەڵكی گەورەی دروستكردوە، بریتیە لە خلیسكانی مسوڵمانان لە بواری وەرگرتنی یاساكانی ژیاندا، لە بواری مەسەلەی حەڵاڵو حەرامو ئەمرو نەهی دا، لێرەدا مسوڵمانان زیاتر تووشی شیرك بوون! وە ئەو شیركە زەرەرو زیانی گەورەو شوێنەواری زۆر خراپی بەجێهێشتوە، لە ژیانی مسوڵماناندا، وەك لە شیركەكەی دیكە، كە ئەویش هەر شیركی گەورەیە، كەسێك سەجدە بۆ غەیری خوا ﷻ دەبا، سوێند بە غەیری خوا ﷻ دەخوا، قوربانی بۆ غەیری خوا ﷻ سەردەبڕێ، غەیری خوا ﷻی وەك خوا ﷻ خۆشدەوێ، یان لە خوا ﷻ خۆشتردەوێ، ئەوەش هەر شیركە، شیركی دروشمەكان (شرك الشعائر)، بەڵام بەڕاستی شیركی بەرنامەكان (شرك الشرائع) زەرەری زۆر گەورەی داوە، بۆیە ئێمە وێڕای دژ وەستانمان بەرانبەر بە شیركی (أصحاب القبور)، بەڕاستی نابێ شیركی (أصحاب القصور)یش فەرامۆش بكەین، بەڵكو شیركی خاوەن قەسرەكان مەترسیدارترەو پێویستیشی بە دژایەتی كردنی زیاتر هەیە، چونكە كاتێك خاوەن قەسرێك دەكرێتە پەرستراو لەجیاتی خوا ﷻ، بە ملیۆنان خەڵك بەرەو بێ دینیی دەچن و، هەموو بوارەكانی ژیان تێكدەچن، بەڵام كاتێك خاوەن قەبرێك دەپەرسترێ، تەنیا زەرەری بۆ چەند كەسێكی دیاریكراو هەیە!

هەڵبەتە ئێمە دژی هەموو جۆرەكانی شیركین، بەڵام بەڕاستی زۆرجار هەستدەكرێ كە شیركی خاوەن قەبرێك، خاوەن قەبرێك كە دەبرێتە ریزی خوا ﷻو بەندایەتیی بۆ دەكرێو دەپەرسترێو خەڵك لێی دەپاڕێتەوە، ئەوە زۆر زەق دەكرێتەوە، بەڵام ئەوەی كە بەرانبەر بە خاوەن قەسرێك دەكرێ، ئەوانەی كە بە ناهەق ئەمرو نەهی دەكەن بەسەر خەڵكدا، خۆ لە خەڵكی دەكەنە

پەرستراوو وەك فیرعەون دەكەن، كەمتر باس دەكریٚو جەختی لەسەر دەكریٚ! كە بێگومان ئەوەش مەسەلەی سیاسەت زۆر كاریگەریی لەسەری هەیە و، حوكمڕانەكان پێیان خۆشە ئێمە زۆر دژی ئەو شیركە بین كە پەیوەندیی بە قەبرەوە هەیە، بەڵام هیچ باسی ئەو شیركە نەكەین كە پەیوەندیی بە قەسرەوە هەیە! بۆچی؟ چونكە بەرژەوەندیی وان بەوە تێكدەچیٚ كە خەڵك هۆشیاربێتەوەو بزانیٚ كە چۆن قەبر پەرستیی شیركە، قەسر پەرستییش شیركە، وەك چۆن خاوەن قەبرێك كە دەپەرستی شیركە، خاوەن قەسرێكیش بە هەمان شێوە كە دەپەرستی هەر شیركە!

ئەمەش چەند دەقێكی قورئان، لەبارەی خراپیی‌و ترسناكیی هاوبەش بۆ خوا دانان، لە بواری یاساكانی ژیاندا:

١ـ خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ...﴿٢١﴾﴾ الشورى، واتە: (یان ئایا چەند هاوبەشێكیان هەن، كە دینێكیان بۆ داناون خوا مۆڵەتی نەداوە؟! ...).

كەواتە: ئەو كەسەی كە دین بۆ خەڵك دادەنیٚ، بەرنامە بۆ خەڵك دادەنیٚ، ئەوە كراوە بە هاوبەشی خوا ﷻ! واتە: تەنیا ئەو كەسەی كە سەجدەی بۆ دەبردریٚ، نەكراوە بە هاوبەشی خوا ﷻ، بەڵكو ئەو كەسەش كە حەلاڵ‌و حەرامی لیٚ وەردەگیریٚ، ئەویش هەر هاوبەشی خوایە ﷻ، بەلیٚ حەلاڵ‌و حەرام بۆ خەڵك دیاریكردن‌و، ئەمرو نەهی‌و ئاراستەكردنیان، بەدەر لە شەریعەتی خوا ﷻ و، بەبیٚ ئیجازەی ئایینی خوا ﷻ، بە شیرك دادەنریٚ‌و، هەر كەسێكیش ئەو هەقەی بدریٚتیٚ، مانای وایە كراوەتە هاوەڵ‌و هاوبەشی خوا ﷻ لە پەرستراوێتیدا!

٢ـ خـــوا ﷻ دەفـــەرموێ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١ ﴾ التوبـــة.

واتە: (ـ جوولەكەو دیانەكانـ زاناو ڕاهیبەكانی خۆیانیان‌و مەسیحی كوڕی مەریەمیان لەجیاتی خوا كردنە پەرستراو، هەرچەند فەرمانیشیان پێكرابوو كە تەنها یەك پەرستراو بپەرستن، بێجگە لەوی هیچ پەرستراو نین، پاكی بۆوی لەو شتانەی كە دەیانكەنە هاوبەش لە پەرستراندا).

(عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ: فَقَالَ: يَا عَدِيُّ اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الْوَثَنَ وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةٌ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، قَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ) رواه الترمذي: (٣٠٩٥)، وقال الألباني: حسن،

واتە: (عەدیی كوڕی حاتەمی تائیی دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ خاچێكی زێڕم لە ملدابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عەدیی ئەو بتە لە ملت فڕێدە، لەو كاتەدا ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، فەرمووی: دیارە ئەوان ـجوولەكەو دیانەكانـ زاناو ڕاهیبەكانی خۆیان نەدەپەرست، بەڵام ئەگەر شتێكیان بۆ حەڵاڵ كردبان ئەوانیش بە حەڵاڵیان دەزانی، وە ئەگەر شتێكیان لێ حەرام كردبان ئەوانیش بە حەرامیان دەزانی‌و شوێنیان دەكەوتن)، وە لە ڕیوایەتێكی دیكە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَتِلْكَ عِبَادَتُهُمْ لَهُمْ) رواه البيهقي في السنن

الكبرى ج: (١٠)، ص: (١٩٨)، واتە: (ئەوە پەرستنیانە بۆیان – بۆ زاناو راهیبەكانیانـ)، لە پەرلەمان دەڵێن نابێ چەند ژنیی هەبێ! چەند ژنی خوا ﷻ حەڵاڵی كردوە، ئەو دەڵێ نابێ هەبێ! جا هەر كەسێ بەدوای ئەو خاوەن بڕیارە بكەوێ، ئەوە لە راستیدا پەرستوویەتی، خوا ﷻ دەفەرموێ: ریبا حەرامە، حیزبێك دەڵێ نەخێر ئەمە ناكرێ، دەبێ بە حەلاڵی دابنێین، دیارە ئەوەی بەدوای بكەوێ پێی كافر دەبێ، دەگونجێ كابرا مامەڵە بكات بە ڕیباو گوناهبارە، بەڵام پێی كافر نابێ، بەس كە بە حەلاڵی زانی، پێی كافر دەبێ، وە هەروەها هەر شتێكی دی لەو بابەتانە ...

٣ـ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ یوسف، واتە: (... حوكم – بەرنامەدانانـ تەنها هی خوایە، فەرمانی كردوە كە جگە لەوی نەپەرستن، ئا ئەوەیە ئایینی راستو دروست، بەڵام زۆربەی خەڵكی نایزانن)، ئەم قسەیە قسەی (یوسف)ە عليه السلام كە لەگەڵ دوو هاوەڵە زیندانییەكەیدا وتووێژی دەكرد.

لەم دەقانەوە زۆر بەڕوونیی دەزانرێ كە هەركەسێك بۆ وەرگرتنی یاساو دەستوورەكانی ژیانو گوزەرانی تاكو كۆمەڵ، لە هەموو بوارەكانی: كۆمەڵایەتییو ئابووریو سیاسییو فەرهەنگییو ئەخلاقییو ...هتددا، روو لە غەیری خوا ﷻ بكاتو، پرس بە غەیری ئیسلام بكات، ئەوە هاوبەشی بۆ خوای بێ هاوەڵو تاك ﷻ بڕیارداوەو، خۆی لە جوغزی ئیمانو ئیسلام وەدەرناوە!

**<u>پێکهێنەری سێیەم:</u>** خوا بەیەککگرتن لە ناوو سیفەتەکانیدا (توحيد الله في أسمائه وصفاته):

مەبەستیش لەم جۆرە خوا بەیەکگرتنە، ئەوەیە کە لەم چەند خاڵەدا زۆر بەکورتیی و گوشراویی دەیخەینەڕوو:

١) خوای بێ وێنەو هاوەڵ ﷻ خاوەنی ناوە هەرە چاكو سیفەتە هەرە بەرزەکانە، کە تایبەتن بە زاتی بێ وێنەیەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ...﴿١٨٠﴾﴾ الأعراف، واتە: (وە خوا ناوی هەرە چاکی هەن، دەجا هەر بەوان لێی بپاڕێنەوە ...).

٢) ناوو سیفەتە هەرە چاكو بەرزەکانی خوا ﷻ وەك زاتی بێ وێنەن‌و، نە وەك ناوو سیفەتی هیچ کەس‌و هیچ شتێك دەچن‌و، نە ناوو سیفەتی هیچ کەس‌و شتێك دەشوبهێنە ناوو سیفەتەکانی وی، لە هیچ ڕوویێکەوە، خوای بێ وێنە ﷻ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى. واتە: (ـ خوا ـ پەیداکەری ئاسمانەکان‌و زەوییە، لە خۆتان هاوسەری بۆ گێڕاون، وە لە ئاژەڵانیش نێرو مێی گێڕاون، بەهۆی ئەوەوە وەچەتان لێدەخاتەوە، هیچ شتێك وەك وێنەی وی نیە، وە ئەو بیسەری بینایە).

٣) بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنیش لەگەڵ ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوای بێ هاوەڵ‌و هاوتادا ﷻ، هەڵوێستی ڕاست‌و دروست کە تێکڕای زاناو پێشەوایانی پێشینمان – ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ ـ لەسەری

ڕێككەوتوون، هەر ئەوەیە كە: هەر ناوو سیفەتێك خوا ﷻ بۆ خۆی، یاخود پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خوای بەرزو مەزنی بەكارهێنابێ، ئێمەش بەبێ هیچ دەستكارییەك ئەو ناوو سیفەتە بۆ خوا ﷻ بەكاربێنین‌و، هەر شتێك خوا ﷻ لە خۆی، وە پێغەمبەرەكەی ﷺ لە خوای بێ هاوتا ﷻی دوورخستبێتەوە، ئێمەش ئەو ناوو سیفەتە لە خوا ﷻ دووربخەینەوە، جا زاناو پێشەوایانمان ئەو واتایەیان بە چەندان شێوە دەربڕیوە كە لە نێوەڕۆكدا هەر یەكن.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەكی گرنگ هەیە دەبێ زۆر لێی وریابین، ئەویش ئەوەیە لە سۆنگەی ئەوەوە كە خوای بەرزو مەزن بە زات‌و سیفەتییەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ...﴿١١﴾﴾ الشورى. واتە: (... هیچ شتێك وێنەی وی نیە ...)، وە فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾﴾ طه، واتە: (ـ خوا ـ داهاتووو رابردوویان دەزانێ، بەڵام زانیاری ئەوان دەورەی خوا نادا)، نافەرموێ: خوا ﷻ نازانن، دەفەرموێ دەورەی خوا ﷻ نادا، بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە، نابێ هیچ كەس بەتەمای ئەوەبێ كە لە حەقیقەت‌و چۆنیەتی ناوو سیفەتەكانی خوا ﷻ تێبگا، هەر بۆیەش كاتێك لەبارەی ماناو چۆنیەتی: ﴿... ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ...﴿٥٤﴾﴾ الأعراف، پرسیار لە ئیمام مالیك كراوە – ڕەحمەتی خوای لێبێـ، گوتوویەتی: (الإِسْتِوَاءُ مَعْلُوم وَالْكَيْفُ مَجْهُول وَالإِيمَانُ بِهِ وَاجِب وَالسُّؤَالُ عَنْهُ بِدْعَة) شرح العقيدة الطحاوية، ص: (٧٦)، واتە: (بەرزبوونەوەی خوا –بۆ سەر عەرش–

زانراوە، بەڵام چۆنیەتییەكەی نەزانراوە[١]و، بـڕوا پـێ هێنانیـشی فـەڕزەو، پرسیار لەبارەوە كردنیشی داهێنراوە)! دیارە ئیمام مالیـك وایگوتـوە، بـەڵام كەسیش بەو قسـەیەوە پابەند نەبووە، یانی: ئـەو گوتوویـەتی: نابـێ پرسـیار بكرێ، بەڵام بەهەرحـاڵ پرسیاریش كراوە، وە دەشـتوانین بڵێین ئەو قسـەیە بەو شێوەیەش نیــە، چـونكە دەربـارەی خـوا ﷻو دەربـارەی سـیفەتەكانی پرسیار هەر دەكرێ، خەڵك هەر لێدەكۆڵێتـەوە.

جا بۆیە زاناو پێشـەوایانـمان – ڕەزاو ڕەحمەتی خوایـان لێبـێ ـ لـە بـارەی ناوو سیفەتەكانی خواوە ﷻ، ئەم بنچیـنەیەیان داناوەو، گوتوویانە: (إِثْبَـاتٌ مِنْ غَيْرِ تَشْبِيه، تَنْزِيـهٌ مِنْ غَيْرِ تَعْطِيـل وَلا تَأْوِيـل)، واتە: (ناوو سـیفەتەكان بۆ خوا دەچەسپێنین، بەبێ پێچواندن بە ناوو سـیفەتی دروسـتكراوەكان، وە خواو سیفەتەكانی بە پاك دەگرین لە پێچواندن بە دروستكراوەكان، بەڵام بـە بیانووی بەپاكگرتنی خواوە، ناوو سیفەتەكانی لێدانارنین‌و، بە تـەئویلی بـێ جێش لە ماناو حەقیقەتیان خاڵییان ناكەینەوە)، خـوا ﷻ چ نـاوو سـیفەتێكی بۆخۆی بەكارهێناوە، ئێمەش ئەو نـاوو سـیفەتانەی بـۆ بـەكاردێنین، بـەڵام ناچین چۆنیەتییـەكەیان بڕیاربدەین، یاخود بەجۆرێك تەئویلیان بكەین، كـە لە نێوەڕۆكی خۆیان خاڵییان بكەینـەوە.

---

١) بۆچی؟ چونكە چۆنیەتی سیفەتەكانی خوا ﷻ بۆ ئێمە زانراو نیە، ئێمە نـازانین قـودرەتی خـوا ﷻ چۆنە؟ نازانین بینینی خوا ﷻ چۆنە؟ نازانین فەرمایـشت كردنـی خـوای پـەروەردگار ﷻ چۆنە؟ سیفەتەكانی خوا ﷻ هیچیان بۆ ئێمە زانراو نین، بـەو شـێوەیەی كـە ئێمـە بـۆ خۆمـان بەكاری دێنین.

مەسەلەی ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریش ﷻ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی تەرخانو تایبەت دەکاتو، بەم ئەندازەیە مەدار سازنابێ، بەڵام ئەوەی لەو سێ خاڵەدا گوتمان، کاکڵو جەوهەری زۆر گوشراوی ئەو بابەتەیە[1].

## بواری سێیەم: خواپەرستیی ساغو پاك:

ئەمیش سێیەمین بواری تێدا پەروەردەو تەزکیەبوونو، پێگەیشتنی تاکەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی یە.

کە دەڵێین تاکەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، واتە بە سەریو خوارێوە، بە سەرکردایەتیو ئەندامانی دیکەوە.

لەڕاستیدا خواپەرستیی (العبادة)و بەندایەتی بۆ خوا کردن (العبودیة لله)، ئەنجامو بەرهەمی سروشتیو راستەوخۆی ئیمانو عەقیدەی راستو دامەزراوە، بۆیەش گوتوومانە: خواپەرستیی ساغو پاك (العبادة السلیمة والخالصة)، چونکە تاعەتو کردەوەی باش بەگشتیو، خواپەرستیی بەتایبەتی، بەبێ ئەو دوو مەرجو سیفەتە وەرناگیرێنو قبووڵ ناکرێنو، خاوەنەکەیان رەنج بە خەسارە، دیارە مەبەستیشمان لە (ساغبوون) ئەوەیە کە عیبادەتەکە ساغو سەلامەت بێ لەوەی کە پێچەوانەی شەرعی تێدابێ، یان بە پێچەوانەی شەرعەوە ئەنجام درابێ، چونکە هەر کارو کردەوەیەکی بە رواڵەت باش، مادام بەپێی شەرع نەبێ، بە نەخۆشو بێ کەڵك لە قەڵەم دەدرێ، وە مەبەستیشمان لە (پاکبوون) ئەوەیە کە

---

[1] لە زنجیرە دەرسی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا، دوازدە دەرسمان تەرخانکردوون بۆ توێژینەوە دەربارەی ناوو سیفەتەکانی خوا ﷻ، کە بەرگی سێیەمی کتێبەکەیە، بە ناوونیشانی: (خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتەکانی دا)، کە دەرسەکانی: (٢٥ تا ٣٦)ن.

عیبـادەتەکە پـاكو چاك بێو، خڵتـەو خاڵی شــیركو ریــای تێکـەڵ نـەبووبێ، دیـارە هەر کارو چالاکییەکی شەرعییش، مادام بەتەواویی بۆ خوا ﷻ نـەبێو لـە خڵتـەی ریـاو شیرك دوورنەبێ، لـە تـەرازووی خـوا ﷻدا وەك پــارەی قـەڵب بەسەر خاوەنیدا دەدرێتــەوە.

رەحمــەتی خواش لە (فُضَيْلُ بْنُ عِيَـاضْ) بێ کە لە تەفـسیری وشـەی: (أَحْـسَنُ عَمَـلاً)دا کە لـە ئایـەتی: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢﴾[1] الـملك. هـاتوە، گوتوويـەتی: (أي أخلـصـه وأصـوبه)، واتە: (بە مانای کردەوەکە پاکترینو راستترین بێ)! پـاك، واتـە: شـیركو ریـای تێکەڵ نەبووبێ، وە راستیش، واتــە: بـەپێی شــــەرع بــێ، بـۆ خــوا ﷻ بــێو، بەپـێی شەرعی خوا ﷻ بێ.

وە لەبارەی خواپەرستییەوە، پێویستە ئاگاداری دوو شتی گرنگ بین:

<u>**یەکـەم**</u>: وشەی خواپەرســتیی (**العبــادة**) بە دوو چەمكو واتـا بەکاردێ:

١/ مانــای زمانــەوانییو حــەقیقیی وشــەی (**العبـــادة**) بریتیــە لــە: ئەوپــەڕی بەگەورەگرتنو، ئەوپـەڕی خۆشویـستنو، ئەوپـەڕی سـام لێکـردنو شــەرم لێکردنو لێترسانو، ئەوپەڕی گەردنکەچیی بۆ خوای بێ وێنـەو پـاكو تـاك، کە دیارە بەپێی ئەم پێناسەیە وشەی خواپەرستیی، وەك وشەی مـسوڵمانەتییو دینداریی هەرچی جموجۆڵو چالاکیو کردەوەی چـاکی ئینـسانی مـسوڵمانو کۆمەڵی مسوڵمانە، بە پەنهانو ئاشـکراوە، هـەمووی دەگرێتــەوەو، هیـچی

---

١) واتە: (ـ خوا ﷻ ـ ئەو کەسەیە کە مردنو ژیانی گێڕاون، تاکو تاقیتان بکاتـەوە داخـۆ کامـەتان کردەوەی چاکترە. وە خوا زاڵی لێبوردەیە).

لـێ نـابوێرێ، بۆچـی؟ چونكــه ئەوپــەڕی بـه گەورەگرتــنی خــوا ﷻ و، ئەوپــەڕی خۆشویــستنی خــوا ﷻ و، ئەوپــەڕی لێترســانی خــوا ﷻ و، ئەوپــەڕی گەردنكــەچیی بـۆ خــوا ﷻ، كاتێــك دێتــەدی كـه بـه هـەموو شەریعەتی خوا ﷻوه پـابەند بی، چونكه ئەوپـەڕی بەگەورەگرتنـی خـوا ﷻ ئەوەیـه كه تـۆ بـه كردەوە بیسەلـمێنی كـه خـوا ﷻت لـه هـــەموو كـەس و هەموو شـتێك لا گـەورەتره، هـەروەها ئەوپـەڕی خۆشـویـستنی خـوا ﷻو لێترسانی به هەمان شـێوه، كاتێـك خـوا ﷻت لـه هـەموو كـەس و هـــەموو شـتێك لەلا خۆشەویـستترو سـام لێكــراوتره، كـه فـەرمانی خــوا ﷻ پـێش هەموو شتێك بخەی، وه كاتێك دەیسەلمێنی كـه ئەوپـەڕی گەردنكــەچییت بـۆ خوا ﷻ هەیه، كه هەرچی فەرمانەكانی خوان ﷻ بـەپێی توانـا جێبەجێیــان بكەی، ئەمەش مانـای وایـه خواپەرســتیی هـەموو جموجـۆڵ و چـالاكیەكان دەگرێتــەوە.

٢/ مانای تایبەتی و زاراوەیی و عورفیی[1] وشەی (العبـادة)، بریتیه لەو دروشم و كردەوانەی كه زیاتر پەیوەنـدییان بـه نێـوانی خــوا ﷻو بەنـدەوە هەیـه و، لـه زاراوی شەرعدا به خواپەرسـتییه رووتەكان (العبادات الـمحـضة) ناسـراون، وەك: نوێژ و ڕۆژووو زەكـات و حـەج و عـومرەو پاڕانـەوەو زیكـر و قوربـانیی سەربڕین و نەزرو ... هتد.

بەڵام پێویسـته بزانرێ كه له قورئانێدا وشـەی (عبـادة) تـەنها بـه یـەك مانـا بـەكارهاتوه، ئـەویش هـەر مانـا گـشتی و حەقیقییەكەیـەتی، كـه بریتیـه لـه:

---

١) واتــه: زانایــان دوایــی ئــەو مانایــەی دووەمیــان بــۆ وشــەی (العبــادة) دانــاوه، وەك زاراوه (مصطلح)ێكی خۆیان.

ئەوپەڕی بەگەورەگرتن، ئەوپەڕی خۆشویستن، ئەوپەڕی سامو شەرم لێكردنو لێترسان، ئەوپەڕی گەردنكەچیی بۆ خوا ﷻ، بەڵام لە كتێبە شەرعییەكان (كتب الفقه)دا، زانایانی شەرعزان وشەی (عبادة)یان زیاتر بە مانای دووەمی بەكارهێناوە، كە بریتیە لە دروشمەكانی عیبادەت[1].

**دووەم**: زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە لە بواری عیبادەتەكاندا ـبە چەمكو واتای تایبەتیو تەسكی عیبادەت[2]ـ هیچ كەس بۆی نیە بەدەر لەو جۆرو چۆنیەتییەی كە شەریعەت دیاریكردوە، خواپەرستیی ئەنجام بدا، بە پێچەوانەی بابەتی هەڵسوكەوتەكان (موضوع المعاملات)ەوە، كە گرنگ لەواندا نێوەرۆكو هێنانەدیی بەرژەوەندیی شەرعییە و، ئینسان ناچار نەكراوە لە یەك جوغزو چوارچێوەی دیاریكراودا مامەڵەیان لەگەڵدا بكات، واتە: هیچ عیبادەتێك دروست نیە ئەنجامی بدەی، مەگەر ئەوەی خوا ﷻو پێغەمبەر ﷺ فەرموویانە، بەڵام بواری هەڵسوكەوتەكان بە پێچەوانەوەیە، هەموو هەڵسوكەوتێكت بۆ هەیە، مادام شەریعەت قەدەغەی نەكردبێ، واتە: لە بواری هەڵسوكەوتەكاندا بازنە فراوانە، بۆ هاتنو چوونی ئینسانەكانو مامەڵەكردنیان دەستیان كراوەیە، بەڵام لە بواری عیبادەتدا ـبە مانای تەسكی عیبادەتـ بازنەكە تەسكەو، ئینسان بۆی نیە لەخۆوە بڵێ: ئەوە دوو ركات نوێژ دەكەم، یان ئەوە فڵان جۆرە دوعایە دەكەم، یان فڵان جۆرە زیكرە دەكەم.

---

١) لە بەرگی یەكەمی (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا، بە درێژی باسی چەمكو واتای وشەی خواپەرستیی (العبادة)مان كردوە، بڕوانە چاپی دووەم.

٢) چونكە بە چەمكو واتای گشتی، عیبادەت سیاسەتیشو معامەلاتیشو هەموو شتێك دەگرێتەوە.

زانای ناودار إبن تيمية -ڕەحمەتی خوای لێبێ- لەوبارەوە گوتوویەتی[١]: (إنَّ الأَصْلَ فِي العِبَادَاتِ التَّوْقِيف، فَلا يُشْرَعُ مِنْهَا إلاَّ مَا شَرَّعَهُ الله ... وَالعَادَاتُ الأَصْلُ فِيهَا العَفْو، فَلا يُحْظَرُ مِنْهَا إلاَّ مَا حَرَّمَهُ)، واتە: (بناغە لە خواپەرستییەکاندا وەستێنرانە و، هیچ کەس بۆی نیە لەخۆوە جۆرە خواپەرستییەك دابهێنێ ... بەڵام ئەسڵ لە مامەڵەو هەڵسوکەوتەکاندا ڕێگاپێدرانە، مەگەر شتێك دەقێکی شەریعەت قەدەغەی کردبێ)، واتە: لەو شوێنەی کە شەرع وەستاوە تۆش بوەستە، دروست نیە هیچ عیبادەتێك ئەنجام بدرێ مەگەر ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ دایانابێ، بەڵام عادەت و هەڵسوکەوتەکان ڕاست بە پێچەوانەی عیبادەتەوەن.

هەربۆیەش مەسەلەی شت داهێنان لە ئاییندا (الإبتداع في الدين) بە رای زۆربەی هەرەزۆری زانایان -ئەگەر نەڵێین هەموویان- تایبەتە بە هەردووك بواری عەقیدەو عیبادەتەوە، کە دەگوترێ فلان شتە بیدعەتە، وەختێك دەبێتە بیدعەت، کە یان لە بواری عەقیدەدابێ، یان لە بواری عیبادەتدابێ، چونکە ئەو دوو بوارە لە سۆنگەی ئەوەوە کە عەقڵ لە قەرەیان نایەت و، لە سەرووی توانا و بڕستییەوەن، خوای کاربەجێ بەتەواویی نوختەی تێدا خستوونەتە سەر پیتان و، هیچی تێدا بەجێنەهێشتوون بۆ عەقڵ و (إجتهاد)ی ئینسان، عەقیدە خوا ﷻ خۆی هەمووی دیاریکردوە لە قورئاندا، وە پێغەمبەر ﷺ لە سوننەتی خۆیدا بە درێژیی دیاریکردوەو تەفسیلاتی داوەتێ، وە عیبادەتیش بە هەمان شێوە قورئان و سوننەت نوختەیان تێدا خستۆتە سەر پیتان، لەبەرئەوە هەر شتێك زیاد بکەی لەو دوو بوارەدا، زیادەیە، چونکە هیچ نەماوە خوا ﷻ و پێغەمبەری خوا ﷺ لە

---

[١] القواعد النورانية الفقهية، ص: (١١٢)، دیارە زانایانی دیکەش هەر لەوبارەوە قسەیان کردوە، بەڵام قسەکەی ئەومان بە نموونە هێناوەتەوە.

بواری عەقیدەو عیبادەتدا نەیانفەرمووبێ، بۆیە هەموو داهێنانێك لەوێدا ئەو پەیداکردنەیە کە بە زیادەو خراپ لە قەڵەم دەدرێ، وە لە ڕاستیدا عەقیدە بریتیە لە هەڵسوکەوتی عەقڵ و دڵ لەگەڵ خوادا ﷻ، زاتی خوا ﷻ، سیفەتەکانی خوا ﷻ، ناوەکانی خوا ﷻ، فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا علیهم الصلاة والسلام، دیداری خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا، سزاو پاداشتی خوا ﷻ، بەهەشت و دۆزەخی خوا ﷻ، کە دەبێ ئیمانت پێیان بێ، دیارە ئەوانەش ڕاستییان (حقائق)ی نەگۆڕن: خوا ﷻ چۆنە هەروایەو، فریشتەکان چۆنن هەر وانو، پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و کتێبەکانو ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ، خۆ ناگۆڕێن! لەبەرئەوە عەقیدە بریتیە لە هەڵوێستی ڕۆحیی وعەقڵیی، لە بەرانبەر کۆمەڵێك ڕاستیی (حقائق)دا کە گۆڕانیان بەسەردا نایەت، کەواتە: چۆن شت دادێنی لەوێدا؟ ئەدی عیبادەت بریتیە لە چی؟ عیبادەت بریتیە لە هەڵسوکەوتی کردەیی لەگەڵ خوا ﷻ، ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوا ﷻ چۆن هەڵسوکەوت دەکەی؟ یادی دەکەی، لێی دەپاڕێیەوە، پشتی پێ دەبەستی، خۆشتدەوێ، لێی دەترسێی، شەرمی لێ دەکەی، سەجدەی بۆ دەبەی، ڕکووعی بۆ دەبەی، قوربانیی بۆ سەردەبڕی، سوێندی پێ دەخۆی، نوێژی بۆ دەکەی، ڕۆژووی بۆ دەگری، زەکاتی بۆ دەدەی، حەجی بۆ دەکەی ... هتد، کەواتە: خواپەرستیی هەمووی هەڵسوکەوتە لەگەڵ خوادا ﷻ، ئینجا دیارە هەڵسوکەوتیش لەگەڵ خوادا ﷻ، بەس خوا ﷻ دەزانێ دەبێ چۆن بێ؟ تۆ لەخۆتەوە بۆت نیە بڵێی: من بۆخۆم بە شێوەیەکی تایبەت هەڵسوکەوت لەگەڵ خوادا ﷻ دەکەم!

وە عەقیدەو عیبادەت لە ڕاستیدا بواری (إجتهاد)یان تێدانیە، مەگەر لە چۆنیەتی خستنەڕوویاندا، بە پێچەوانەی بوارەکانی سیاسەت و ئابووریی و

کۆمەڵایەتیی و جەنگ‌و ئاشتیی و پەیوەندییەکان‌و چی‌و چییەوە، کە خوای کاربەجێ بۆشایی زۆری تێدا بەجێهێشتوون‌و، بوارو دەرفەتێکی زۆری بۆ ئیجتیهادی عەقڵ فەراهەم هێناوە، چونکە عەقیدەو عیبادەت گۆڕانیان بەسەردا نایە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە پەیوەندییان هەیە بە خوای پەروەردگارەوە ﷻ، بە ڕاستییەکان (حقائق)ی بوون (وجود)ەوە، وە بە چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خوادا ﷻ، بەڵام بواری هەڵسوکەوتەکان‌و عادەتەکان پەیوەندییان هەیە بە لایەنە گۆڕاوەکانی ژیانەوە، لایەنی سیاسیی، لایەنی ئابووریی، لایەنی کۆمەڵایەتیی، لایەنی جەنگ‌و ئاشتیی ...هتد، ئەوانەش گۆڕانیان بەسەردا دێ‌و، پێویستە کۆشش (إجتهاد)ی تازەشیان بۆ بکرێ.

کەواتە: هیچ بیانووو پاساوێك نیە بۆ دەستکارییکردنی چەمك‌و واتای فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: (... فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ تَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ) رواه أبوداود: (٤٦٠٧) واللفظ له، والترمذي: (٢٦٧٦)، وابن ماجه: (٤٢)، عن العرباض بن سارية، قال الترمذي: حسن صحيح، وقال الألباني: صحيح. واتە: (... دەجا ڕێبازی من‌و ڕێبازی جێنشینە سەرڕاستە ڕێنماییکراوەکانم بگرن، خرێنان[1]ی لەسەر ڕۆبگرن، وە خۆتان لە شتە پەیداکراوەکان –لە ئاییندا- بپارێزن، چونکە بێگومان هەموو پەیداکراوێك داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێك گومراییە).

بەڵێ، هیچ پاساوێك نیە کە بڵێین: بیدعەت دوو بەشە، چاك‌و خراپ (البدعة بدعتان: حسنة وسيئة)، مادام پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاشکاویی

١) خرێنان: کە کۆی (خرێنە)یە، ددانەکانی پشتەوەن.

مەسەلەكەی بڕیوەتەوەو، فەرموویەتی: (هەموو پەیداكراوێك داهێنراوە، هەموو داهێنراو ـ بدعة ـ یێكیش خراپەو گومڕاییـیە)! ئێمە بۆمان نیە بڵێین: نا، بیدعەت چاكی هەیەو خراپی هەیە!

ئینجا لەڕاستیدا سەرجەم ئەو نموونانەی كە هەندێك لە زانایانی پایەبەرزی ئیسلام، وەك: (النووي، العز بن عبدالسلام، إبن حجر الهیتمي، إبن حجر العسقلاني ... هتد) – خوا لێیان خۆش بێ ـ بە بەڵگەی ئەوە دەیانهێننەوە، كە گوایە بیدعەت چاكو خراپی هەیە، یان پێنج حوكمە شەرعییەكان (الأحكام الشرعیة الخمسة)یان بەسەردا دەچەسپێن، بەڵێ سەرجەم ئەو نموونانە، ئەگەر باش سەرنج بدرێن، ئەوە دەردەكەوێ كە:

أ/ یان وەك نوێژی تەڕاویحی بە كۆمەڵ كاتێك عومەری كوڕی خەتتاب –خوا لێی ڕازی بێ ـ وشەی (نِعْمَ الْبِدْعَةُ هذِهِ)[1] بۆ بەكارهێناوە، وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتوە، مەبەستی بیدعەتی زمانەوانیی (البدعة اللغویة)یە، وەك لێكۆڵەرەوانی ڕۆچوو گوتوویانە، واتە: ئەو لە ڕووی زمانەوانییەوە نوێژی تەڕاویحی بە بیدعەت داناوە، نەك لە ڕووی شەرعییەوە، چونكە پێغەمبەر ﷺ سێ شەوان لەسەریەك نوێژی تەڕاویحی بە كۆمەڵ كرد، شەوی چوارەم نەهاتەدەرێ، بۆ ئەوەی مسوڵمانان نوێژەكەی بە كۆمەڵ لەگەڵدا بكەن، دوایی فەرمووی: (ترسی ئەوەم هەبوو كە لەسەرتان فەڕز بكرێ)، مانای وایە

---

١) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَبْدِ القَارِيِّ أَنَّهُ قَالَ: (خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخطّابِ رضي الله عنه لَيْلَةً فِي رَمَضَانَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَإِذَا النَّاسُ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ فَيُصَلِّي بِصَلاتِهِ الرَّهْطُ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي أَرَى لَوْ جَمَعْتُ هؤلاءِ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ لَكَانَ أَمْثَلَ، ثُمَّ عَزَمَ فَجَمَعَهُمْ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ لَيْلَةً أُخْرَى وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاةِ قَارِئِهِمْ. قَالَ عُمَرُ: نِعْمَ البِدْعَةُ هذِهِ، وَالَّتِي يَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنَ الَّتِي يَقُومُونَ –يُرِيدُ آخِرَ اللَّيْلِ– وَكَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ أَوَّلَهُ) رواه البخاري: (٢٠١٠).

ئەسڵەكەی سوننەت بووە، دوایی لە سەردەمی ئیمام عومەردا – خوا لـێی ڕازی بێ- خۆ لە دوای پێغەمبەر ﷺ وەحی نایەتـەخوار، تـا بڵـێ: نوێـژی تـەڕاویح ڕەنگە لەسەر ئەو خەڵكە فەرزبكرێ! لەبەرئەوە گوتی: بۆچـی ئـەو خەڵكـە بـە پەڕاگەندەیی نوێژی تەڕاویح بكەن؟ با لەسەر ئیمامێك كۆیان بكەمەوە، كەواتـە: ئەسڵەكەی سوننەت بووە، بەڵام ماوەیەك وازی لێهێنراوە لە ترسی فەرزكرانو دوایی عومەر – خوا لـێـی ڕازی بێ - بردوویەتیەوە سەر ئەسڵەكەی خۆی، وە كە دوایـی گوتوویـەتی: (نِعْـمَ الْبِدْعَـةُ هـذِهِ)، واتـە شـتێكی تازەمـان ئێسـتا داهێناوە، واتە ئێستا پەیدامانكردۆتەوە، ئەگەرنا لـە ئەسـڵدا خـۆی هـەبووە، كەواتە: ئەوە پێی دەگوترێ: بیدعەتی زمانەوانیی (البدعـة اللغوية).

ب/ یان هیچ پەیوەندییان بە هیچ كام لە عەقیدەو عیبادەتەوە نیەو، هەر لە جوغزو بازنـەی هەڵـسوكەوتەكان (الـمعاملات)دانو، یـەكێك لـە بنەمـایەكانی (الإجمـاع)و (القيـاس)و (الـمـصالح الـمرسلة)و (الإستـصحاب) پـشتگیرییان دەكەنو دەیانگرنە خۆیان، بۆ وێنـە: كۆكردنەوەی قورئـان لەنێو دوو بەرگی (مـصحف)ێكـدا و، نووسـینەوەی دەقـەكانی سـوننەتو، داهێنـانی زانیارییـە شەرعییەكان (علوم القـرآن، علوم الحـديث، علـم التجويـد، علـم أصـول الفقه، الفقه، التأريخ ...)[1]و، ... هتد.

وە ئەسـڵیش لە بواری هەڵسوكەوتەكـاندا، دەست كراوەیيـەو، چ شـتێك مسـوڵمانان بۆ خۆیانی بە باش دەزانن، دەتوانن دایبهێننو پەیدای بكـەن.

---

١) ئەو زانیارییانە هەموویان پەیداكراون، ئایا ئەوانە دەچنە خانەی (بیدعەت)ەوە؟ نەخێر، چونكە هەمووی یان بە كۆدەنگیی زانایان بووە، یـان ئـەوەتا لـە بازنـەی بەرژەوەندییـە بەرهەڵدایـەكان (المصالح المرسلة)دان، ئەو بەرژەوەندییانەی كە نەخراونەتە بازنەیەكی داخراوەوە.

**بواری چوارەم: ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند:**

ئەمیش چوارەمین بواری گرنگی تێدا پەروەردەبوونی ئەندامانی وردو درشتی کۆمەڵی ئیسلامیی یە.

وە لەڕاستیدا وەك چۆن خواپەرستیی بەرهەم و ئەنجامی سروشتی و چاوەڕوانکراوی ئیمان و عەقیدە بوو، ڕەوشت و خووی بەرزو جوان و، ئاکارو ڕەفتاری دڵگیرو پەسندیش، بەرهەم و ئەنجامی سروشتیی خواپەرستیی و بەندایەتی بۆ خوا کردنە، واتە: عیبادەت بەرهەمی عەقیدەیە و، ڕەوشتی جوانیش بەرهەمی عیبادەتە.

کەواتە: ئینسانی مسوڵمان بە ئەندازەی ڕاستیی و دامەزراویی ئیمانەکەی، خوا ﷻ دەپەرستیی و بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خوا ﷻ ئەنجام دەدات، هەروەها لە قەدەر خواپەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوا کردنەکەی و، ساغیی و پاکیی خواپەرستیی و دینداریەکەیشی، ڕوو لە ڕەوشت و خووی بەرزو جوان و ئەدەب و ئاکاری پەسند دەکات و، خووو خدەو نەریتە دزێوو بەد و، سیفەت و ڕەفتارە نزم و پەستەکانیش لەخۆی دادەڕنیی و تووڕ دەدا!

خوای بەخشەرو دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾﴾ إبراهيم، واتە: (ئایا سەرنج نادەی! چۆن خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە: وشەیەکی چاك و پاك وەك درەختێکی چاك و پاك وایە، بنکەکەی چەسپاوەو، لق و پۆپی بەرز هەڵچوون، هەمیشە بە مۆڵەتی خاوەنەکەی بەرو میوە دەردەکات، وە خوا وێنان بۆ خەڵکی دەهێنێتەوە، بەڵکو پەند وەربگرن).

وەك ئیبنو عەبباس گوتوویەتی[1]: مەبەست لە وشەی پاكو چاك (كلمة طيبة) وشەی خوا بەیەككرتن (كلمة التوحيد)ە، كە (لا إله إلا الله)یە، ئینجا وەك چۆن درەختە بەپیتو پێزو بەرهەمدارەكە، لە سێ بەشان پێكدێ: بنكو ڕەگو ڕیشە، قەدو لقو پۆپو گەڵا، بەرو میوە، ئیمانو خوا بەیەككرتنیش بە هەمان شێوە، عەقیدەو هەستو نەستێكی نێو عەقڵو دڵە، كە ئەمە دەوری بناغەو ڕەگو ڕیشە بۆ دینداریی دەبینێ، پاشان خواپەرستییو تاعەتو كردەوەی باشە، كە ئەویش دەوری قەدو لقو پۆپو گەڵا دەبینێ، وە لە كۆتاییدا بەرو میوەو بەرهەمی سیفەتە پەسندەكان (الفضائل)و ئاكارو ڕەوشتە بەرزو جوانەكانە.

لە كۆتاییدا دەڵێین:

سەنگی مەحەكو پێوەرو تەرازووی ئیمانو عەقیدە، خواپەرستییو تاعەتو تەقوای خاوەنەكەیەتی، واتە: ئەگەر بمانەوێ لە ئیمانو عەقیدەی كەسێك حاڵی بین، تەماشای خواپەرستییو تاعەتەكەی دەكەین، تەماشای تەقوایەكەی دەكەین، كە دیارە تەقواش تەنیا شوێنەواری دەردەكەوێ. ئەگەرنا خۆی پەنهانە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جاران ئاماژەی بۆ سینەی موبارەكی كردووەو فەرموویەتی: (... التَّقْوَى هَهُنَا ...) رواه مسلم: (٢٥٦٤)، وە هەتا ئیمان تەواوترو دامەزراوتر بێ، مسۆگەر عیبادەتو تاعەتی ئینسان زیاترو باشتر دەبێ.

هەروەها سەنگی مەحەكو تەرازووی هەڵسەنگاندنی عیبادەتو تاعەتو تەقوای ئینسانی مسوڵمان، بریتییە لە ئەخلاقو ئەدەبو ئاكاری بەرزو پەسندیو، هەتا ئینسانی مسوڵمان خواپەرستییو تاعەتو تەقوای چاكتر بێ، ڕەوشتو خووی بەرزترو جوانتر دەبێو، خەسڵەتە بەرزەكان (الفضائل)ی تێدا

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير)، ص: (٧٠١)، كە دەقی دەستەواژەكە بەم شێوەیە: (شهادة أن لا إله إلا الله).

دیارتر دەبن و، لە سیفەتە ناپەسندەکان (الرذائل)یش دوورتر دەبێ، چونکە بێگومان ئیمان سەرچاوەو کانگای خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانەو، کوفرو شیرك و نیفاقیش، زبڵدانی تروکانی گەراو تۆرەمەی پیسی سەرجەم خووو خدە نزم و پەستەکانە: (الإِيمانُ يَنْبُوعُ الفَضَائِلِ وَالْكُفْرُ مَزْبَلَةُ الرَّذَائِلِ).

هەربۆیەش پێغەمبەری خاتەم ﷺ حیکمەت و ئامانجی رەوانەکرانی خۆی، لە تێرو تەواوکردن و لەخۆدا بەرجەستەکردنی رەوشت و ئەدەبە بەرزو پەسندەکاندا کورت هەڵێناوە و، فەرموویەتی: (إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاقِ) رواه البيهقي في السنن الكبرى، ج: (١٠)، ص: (٣٢٣)، واتە: (هەر بۆئەوە رەوانەکراوم، کە رەوشتە جوانەکان تەواو بکەم)، چۆنیان تەواو بکا؟ هەموویان لەخۆیدا بەرجەستە بکات.

لە کۆتایی شەرح و ڕوونکردنەوەی ئەم بنەمایەی دووەمدا دەڵێم:

وەك چۆن هیچ کۆمەڵ و لایەنێك بەبێ هەبوون و لەبەردەستدابوونی بەرنامەو ڕێبازێکی ڕاست و روون، ناگاتە هیچ ئەنجامێك، بەهەمان شێوەش هەر کۆمەڵێك ـ کە مەبەستمان کۆمەڵێکی ئیسلامییە ـ تاکەکانی خۆی چاك چاك پەروەردە نەکردبێ و پێنەگەیاندبێ، دیسان ناتوانێ لە مەیدانی گۆڕانکاریی و چاکسازیی و پاکسازیی کۆمەڵگاو وەرچەرخاندنیدا هیچ بە هیچ بکات.

بوارو لایەنە بنەڕەتیی و سەرەکییەکانی پەروەردەبوون و پێگەیشتنی هەر کۆمەڵە مسوڵمانێکیش، ئەو چوارەن کە ئێمە لەم بنەمایەدا خستمانەڕووو تیشکمان خستە سەریان، بۆیە لەسەر هەر کۆمەڵێکی ئیسلامیی پێویستە کە بە جیددیی و ئەهمیەت پێدانەوە، بڕوانێتە پەروەردەکردن و تەزکیەی ئەندامەکانی لەو چوار مەیدان و بوارەدا، ئەگەر بیەوێ ئەندام و دۆست و لایەنگرانی هەم لە دنیادا هێزو

پێزو بەرهەمێكیان هەبێ‌و، هەم بۆ قیامەتێ شتێكیان بۆ لای خوا ﷻو گۆڕەپانی حیساب‌و كیتاب پێبێ، چونكە بێگومان بەبێ هیچ كام لەو چوارە، ئینسان نابێتە ئەو مسوڵمانەی كە خوا ﷻو پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرمانیان پێ كردوەو دەیانەوێ!

ئایا دەگونجێ مسوڵمانانێك: زانیاری‌و تێگەیشتن، یان ئیمان‌و عەقیدە، یان خواپەرستیی‌و تاعەت، یان ئەخلاق‌و ئەدەبی بەرزیان نەبێ، كەچی بشیانەوێ بۆ دنیاو مەیدانی كارو چالاكی ئیسلامیشیان پەرێزو بەرهەمێكیان هەبێ‌و، كارو جموجۆڵەكەیان هێزو پێزو شوێنەوارێكی باش‌و دڵخۆشكەری لێ وەدی بێ، وە لە ڕۆژی دواییشدا چاوەڕێی پاداشت بن؟! بەتەئكید نەخێر.

بۆیەش ئەم ڕستە قورئانییەمان كردوە بە بەڵگەو پاڵپشتی بنەمای دووەم:

﴿... يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ...﴿٢﴾﴾ الجمعة، چونكە ئەم ڕستە قورئانییە -كە بێجگە لە ئێرە، لە سێ شوێنی دیكەشدا هاتوە[1] - ئەركی سەرشانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرانبەر بە شوێنكەوتووانی ڕادەگەیەنێ، كە بریتیە لە: بەسەردا خوێندنەوەی ئایەتەكانی قورئان‌و،

---

١) كە لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتەكانی (١٢٩)و (١٥١) و، سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٦٤)دایە، كەواتە حەقیقەتێك خوا ﷻ لە چوار شوێنان لە قورئاندا بە یەك شێوە (لەگەڵ پاش‌و پێش كردنی هەندێك وشە) بیهێنێ، دیارە حەقیقەتێكی زۆر گەورەو گرنگە! لە یەك شوێندا حەقیقەتێك باسبكرێ گەورەیە، ئەدی ئەگەر لە چوار شوێنان باسبكرێ‌و دووبارەبكرێتەوە؟ بەتەئكید دیارە ئەو حەقیقەتە زۆر جێی ئەوەیە كە ئەمیەتی پێ بدرێ، حەقیقەتەكەش چییە؟ خوای تاك‌و پاك باسی ئەوە دەكات كە پێغەمبەر ﷺ ئایەتەكانی خوای گەورە ﷻ بەسەر ئوممەتدا دەخوێنێتەوە و، تەزكیەیان دەكاو، كتێب‌و حیكمەتیان فێردەكا.

تەزكیەكردنیان و[١]، كتێبو حیكمەت فێركردنیان، كە بێگومان هەركام لەو چوار بوارەی ئێمە دیاریمانكردوون، بە زیادەوەش لەم ڕستە قورئانییەدا كۆبوونەتەوە.



١) وشەی (التزكية) كە لە (زكى يزكو زكاة وتزكية)ەوە هاتوە، مانای: پاكیی و چاكیی و گەشەكردن دەگەیەنێ، بۆیە وشەی (تەزكیە) ماناو چەمكی فراوانی پەروەردە (التربية) بە زیادەوە دەگەیەنێ، چونكە ئینسان هەتا لە: (جهل)و (شرك)و (معصية) پاك نەبێتەوەو، بە (علم و فهم)و (توحيد)و (طاعة و تقوى) نەڕازێتەوە، بێگومان تەزكیە (پاكو چاكو گەشەكردوو) نەبووە.

# بنەمای سێیەم

## پابەندیی هەموو لایەك

## بە شەرعەوە و، گێڕانەوەی راجیاییەكان

## بۆ تەرازووی شەریعەت.

# بنەمـای سـێیەم

## پابەنـدیی هەموولایـەك بــە شــەرعەوە و،گێڕانــەوەی ڕاجیاییــەكان بــۆ تەرازووی شـەریعـەت:

پابەندیی (إلـتـزام)ی هەموو لایەك، قیـادە پێش قاعیدە، بە شەرعەوە، كـە مەبەسـتمان پێـی دەقـەكانی قوڕئـانو سـوننەتو ئـەو بنـچینە (قاعدة)و یاسـا (حكم) شەرعییانەیە كە لەلایەن زاناو پێـشەوایانی ڕەسـەنەوە هـەڵهێنجراون و هەڵدەهێنجرێن، وە گێڕانەوەی هەر مەسـەلەو بابـەتێكی مـشتومڕ هەڵـگر بـۆ تـەرازووی قوڕئـانو سـوننەتو سـاغكردنەوەو لێكۆڵینــەوەی زانـستییانە، وەك خوای دادگـەر ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩ ﴾ النسـاء، واتە: (ئەی ئەو كەسـانەی كـە ئیمانتـان هەیە! فەرمانبەریی خوا بكەن، وە فەرمانبـەریی پێغەمبـەر ﷺ بكـەن، وە هـی كاربەدەستانێك كە لەخۆتانن، جا هەركات لەسەر شتێك كەوتنە ناكۆكیـیـەوەو مـشتومڕتان بـوو، بیگێڕنـەوە بـۆ لای خـوا ﷻ و پێغەمبـەر ﷺ، ئەگـەر ئێـوە بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، ئا ئەوە بۆ ئێوە چاكتـرەو، سەرەنجامیـشی خێرتـرە).

هەڵبەتە مەرجیش نیە کە هەمیشە مەسەلەو بابەتە ڕاجیایی هەڵگرەکان، بە شێوەیەك یەکلایی بکرێنەوە کە یەکدەنگیی (إجماع)یان لەسەر دروست بێ. بەڵام بێگومان کەمینە وێڕای ڕێز لێگیرانی ڕایە جیاوازەکەی، پابەندی ڕای زۆرینە دەبێ، لە بواری کردارو جێبەجێ کردندا.

## ڕوونكــردنەوە:

لەبەرئەوەی ئـەم بنەمایـەی سـێیەم ئایـەتی ژمـارە (٥٩)ی سـوورەتی (النـساء)ی كراوەتە بەڵگەو پاڵپشت، بە چاكی دەزانم لە چەند خاڵێكدا چەند سـەرنجێكی خێـرا لەم ئایەتە بەپێزە بدەین، بەرلەوەی بچینەسەر ڕوونكردنەوەی ئەم بنەمایەی سێیەم:

**یـەك**: خوای كاربەجێ ﷻ بۆ هـەركام لـە خـۆی (الله)و پێغەمبـەر ﷺ (الرسـول) وشەی (أَطِيعُـوا)ی هێنـاوە، بـەڵام بـۆ (أولـي الأمـر) نـەیهێناوە، ئـەوەش لێـی دەفامرێتەوە كە فەرمانبەریی كردنی مسوڵمانان بۆ خوا ﷻو پێغەمبەرەكەی ﷺ، كە لە پابەندییان بۆ قورئانو سوننەتدا خۆی دەنوێنێ، بە موتڵەقی فەرزەو، هیچ مەرجی تێدانیـە، هەردووكیـشیان وەك یـەك پابەندكـەر (ملـزم)ن[1]، بـۆ هـەر كەسێك كە خۆی بە بڕوادار (مؤمن) بزانێ! بـەڵام فەرمانبـەریی مـسوڵمانان بـۆ حوكمڕانو كاربەدەستانیان موتڵەق نیە و، مەرجدار (مشروط)ەو مەرجەكەیشی ئەوەیە كە نابێ ئەو ئەركو فەرمانەیان لەگەڵ قورئانو سوننەتدا ناكۆكو نەگونجاو بـێ، واتـە كـە وشـەی (أَطِيعُـوا)ی بـۆ كاربەدەسـتان (أولـي الأمـر) دووبـارە نەكردۆتـەوە، ئـەوەی لـێ وەردەگـیرێ، كـە كاربەدەسـتانو حكومڕانـانی مسوڵمانان بەقسەكردنو فەرمانبەریی بۆ كردنیان ڕەها (مطلـق)و بێ مەرج نیـە، بەڵكو بەستراو (مُقَيَّـد)ە بەوە كە دەبێ لە سنووری شەریعەتدا بێ، وە مەرجیـشی

---

١) بەڵام بێگومان هی سوننەت بە مەرجی ڕاست (صحیح) بوونو تێك نەگیرانی لەگەڵ قورئـانو عەقڵی سەلیمو زانیاری ڕاستەقینەدا، هەر دەقێكی سوننەتیش لەگەڵ یەكێك لەم سـێیانەدا تێـك بگیرێو دژ بوەستێ، ئەوە مـسۆگەر هـی پێغەمبـەر ﷺ نییـەو ڕاسـت نییـە، چـونكە مەحاڵـە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێك بكات، یان بفـەرموێ، یـان دانـی پێـدابێنێ، كـە پێـچەوانەو دژی قورئانو عەقڵو زانیاری بێ.

هەیە، ئەویش ئەوەیە کە فەرمان بە ناشەرعیی نەکا، واتە: دەبێ بەپێی شەرع چووبنە سەر کورسی حوکم‌و، فەرمانەکانیشیان بە پێچەوانەی شەرع نەبێ، بۆچی وایە؟ چونکە خوا ﷻ بێجگە لە چاکە فەرمان بە هیچی دیکە ناکات! ﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ... ﴿٢٩﴾﴾ الكهف، واتە: (وە بڵێ: لەلایەن پەروەدگارتانەوە هەق هەیە ...). پێغەمبەر ﷺ دەمێنێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ قەت نەیویستوە شتێکی خراپ بە خەڵکی بڵێ، ئەگەر لە جارێکیشدا نەیپێکاپێ، خوا ﷻ بۆی ڕاستکردۆتەوە، ئەگەر کۆشش (إجتهاد)ێکی کردبێ‌و نەیپێکابێ، کە مەبەستی ئەوە بووە بیپێکێ، بەڵام ئەگەر نەیپێکابێ، خوا ﷻ بۆی ڕاستکردۆتەوە، کەواتە هی پێغەمبەریش ﷺ دیسان خاڵی‌یە لە هەڵە، بەڵام هی غەیری خوا ﷻ‌و پێغەمبەری خوا ﷺ، نازانین، دەبینی نەیانپێکاوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {... إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ} رواه البخاري: (٧١٤٥)، ومسلم: (١٨٤٠)، واتە: (بێگومان گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی مسوڵمانان تەنها لە سنووری بە چاك زانراودایە -کە ئەویش شەریعەت دیاریکردوە-)، جا ئەم ڕستەیە: (... إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ)، بەسەرهاتێکی هەیە، کە لە (صحيح البخاري)و (صحيح مسلم)، وە لە هەندێك کتێبی دیکەی فەرمووەدەشدا هاتوە[1]، بەسەرهاتەکەشی ئەوەیە: ((ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ دەستە - سرية - یەك لە مسوڵمانان دەنێرێت بۆ شوێنێك بۆ چالاکییەك، یەکێك لە ئەنسارییەکان دەکاتە فەرماندەیان کە ناوی (عبدالله) دەبێ، لەسەر شتێك ئەو برا گەورەیەیان لێیان تووڕەدەبێ، هەق دەبێ ناهەق دەبێ، گرنگ ئەوەیە تووڕەی

---

١) وە لە پەراوێزی بنەمای بیست‌و پێنجەمدا دەقی بەسەرهاتەکە لە هەردووك (صحيح)ی (بوخاری)و (موسلیم) وەوە دێنین.

دەکەن، پێیان دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی نەگوتن کە لە قسەم دەرنەچن؟ دەڵێن: با، دەڵێ: دەی باشە دار کۆبکەنەوە، ئەوانیش کۆمەڵە دارێکی زۆر کۆدەکەنەوە، دەڵێ: ئاگری تێبەردەن، ئەوانیش ئاگر لە دارەکان بەردەدەن و مەشخەڵی بەرزدەبێتەوە، دەڵێ: بچنەنێو ئاگرەکە، (پێغەمبەر ﷺ نەیوتوە لە قسەی دەرمەچن؟ دەی بچنە نێوی! بچین نەچین)، هێندێك دەڵێن با بچین هێندێکی دیکەیان دەڵێن با نەچین، گەنجێکیان –واتە ئەوەیان کە وا دیارە تەمەنی لە هەموویان کەمتر بووە[1]ـ دەڵێ: ڕاوەستن مەچنە نێوی! چونکە ئێمە بۆ ئەوە کە تووشی ئاگر نەبین، بەدوای پێغەمبەر ﷺ کەوتووین، دەچینەوە خزمەتی پێیدەڵێین و پرسی پێدەکەین، ئەگەر فەرمووی بچنە نێو ئاگر، با جارێکی دیکە ئاگرێکی دیکەمان بۆ هەڵبکا، ئێمەش دەچینە نێوی، ئیدی کە چوونەوە بە پێغەمبەر ﷺیان گوت و بۆیان گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ دَخَلْتُمُوهَا مَا خَرَجْتُمْ مِنْهَا أَبَدًا}، واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر چووبانە نێوی قەت لێی نەدەهاتنە دەرەوە، لە قیامەتێش))، حاشای هاوەڵانی بەڕێزو هەموو مسوڵمانێکی عاقڵ، ئینسان ئەوەندە نەفام بێ، بەپێی خۆی بچێتە نێو ئاگر، هەر بۆ ئەوە چاکە بسووتێ، هەتا لە قیامەتێش هەر بسووتێ، جا لێرەدا بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {... إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ}، فەرمانبەریی کردن تەنها لە شتی چاکەدایە.

---

١) کەواتە: مەرج نییە ئینسان کە تەمەنی کەم بوو، لە خەڵکی دیکە کەمتر بزانێ، جاری وا هەیە ئینسانی گەنج توانای دەرك کردنی هەندێك ڕاستی (حقیقة)ی زیاترە لە هی دیکە، یان جورئەتی زیاترە.

بەڵێ ئێمە هۆشیارانەو بێدارانە بە قسەی بەرپرسەكانی خۆمان دەكەین، بنچینەیەك هەیە لەنێوەندی خەڵكی نەزان (جاهل)دا دەڵێن: (إِغْمِضْ عَيْنَكَ وَاتَّبِعْنِي)، واتە: (چاوت بنووقێنەو بەدوام بكەوە)، بەڵام ئیسلام دەڵێ: نا، چاوێكت هەیە بیكە چوار چاو، بۆئەوەی ئەگەر بەرپرسەكەشت نەیپێكاو هەڵەی كرد، بۆی ڕاست بكەیەوە، تاعەتی كوێرانە لە ئیسلامدا نیە.

**دوو**: بۆ وشەی (أولي الأمر)[1] بەند (قيد)ی لە خۆتان (منكم)ی زیادكردوە، تاكو بزانرێ كە هەر حوكمڕان‌و كاربەدەستێك، یەكەم: مسوڵمان[2] نەبێ، دووەم: مسوڵمانان خۆیان دایاننەنابێ‌و ئەو كارەیان پێ نەسپاردبێ، ئەوە شەرعییەتی نیەو، فەرمانبەریی بۆ كرانیشی شەرعیی‌و ڕەوا نیە، ئێستا هەندێك خەڵك هەیە هەر بەناوی دینەوە دەڵێن: هەر كەسێك دەسەڵاتی هەبوو، دەبێ بە قسەی بكەین، جا ئایا خوا ﷻ وایفەرمووە؟! نەخێر، بەڵكو فەرموویەتی: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ﴾، كاربەدەستانێك كە بەخۆتان داتاننناون، وە لە خۆشتانن، لەسەر ڕێبازی دینی خۆتانن، ئەمما كەسێك مسوڵمانان دایاننەنابێ‌و پێی ڕازی نەبن و، بەپێی شەریعەتی خوا ﷻو پێغەمبەری خوا ﷺو دینی مسوڵمانان ڕەفتار نەكا، ئەوە (أولي الأمر)ی ئێمە نیە، وە فەرمانبەریی بۆ كردنیشی نەك هەر پێویست نیە، بەڵكو هەر ڕەواش نیە!

---

١) وشەی (أولي) واتە: (أصحاب) – خاوەنەكان ـ كە كۆی وشەی (صاحب) – خاوەن ـ ە، أولي الأمر: واتە خاوەن فەرمانەكان، فەرمانڕەواكان، حوكمڕانەكان، كاربەدەستەكان.

٢) بۆ ئەو ئەرك‌و كارانەی كە دەقێكی شەریعەت تایبەتی كردوون بە ئیمانداران‌ەوە، كە كەسی یەكەمی دەوڵەتی ئیسلامیی لەو جۆرەیە، بەڵام ئەگەر بە دەقی شەریعەت تایبەت نەكرابن، بوار هەیە كە بە سەرجەم هاوڵاتیانی دەوڵەتی ئیسلامیی بسپێررێن.

**سێ**: بێگومان مەبەست لە ڕستەی: ﴿فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ گێڕانـەوەی مەسـەلە خیلافیی‌و مشتومڕ هەڵگرەكانە بۆلای قورئان‌و سوننەت، ئەگەرنا ئەگەر گریـمان لە ڕۆژگاری پێغەمبەریشدا ﷺ گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ مەیسەر بووبـێ، خۆ نە ئەوساو نە ئێستاش گەڕانەوە بۆلای خوا جل جلاله هەر گونجاو نـەبووە! واتـە: خۆ كەس نەیتوانیوە بچێتەوە بۆ لای خوا سبحانه وتعالى، بڵێ: ئەرێ خوایە! مەبەستت لەوە چییە؟ كەواتە مەبەست گەڕانەوەیە بۆلای قورئان‌و بۆ لای سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

**چوار**: ڕستەی: ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾یش ئەوە دەگەیـەنێ كـە هـەر كەسێك ئیمانی بە خوا سبحانه وتعالى‌و بە ڕۆژی دوایی هەبێ، دەبێ فەرمانبەری خـوا سبحانه وتعالى‌و پێغەمبـەر ﷺ بـێ‌و، لـەكاتی كێـشمەكێش‌و مشتومڕیـشدا ملكەچـی حـوكمی شەریعەت بێ، وە هەركەسێك وانەبێ، بە بڕوادار دانانرێ! ئەو ڕسـتە لـە دوای چی هاتوە؟ لە دوای: ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ هاتوە.

كەواتـە: ئـەوەی بەقـسەی خـوا سبحانه وتعالى‌و پێغەمبـەر ﷺ نـەكا، وە بەقـسەی كاربەدەستانی مسوڵمانی خۆی نەكا، وە لـە كـاتی كەوتنـە كێـشەو مـشتومڕدا، كێشەو مشتومڕەكەی نەگێڕێتەوە بۆ تەرازووی شەریعەت، مانای وایە بڕوای بـە خوا سبحانه وتعالى‌و بە ڕۆژی دوایی نیە.

**پێنج**: ڕسـتەی ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾یـش ئـەوە دەگەیـەنێ كـە ملكەچـیی مسوڵمانان بۆ خوا سبحانه وتعالى و پێغەمبەرەكەی ﷺ و، پابەندییان بە شـەریعەتەكەیەوە، مایەی هەر خێرو خۆشـی‌و بەختەوەرییـەكی دنیایانـەو، تاكـە ڕێـی سـەرەنجام‌و عاقیبـەت خێـری دواڕۆژو قیامەتیشیانە! وە لەو ڕێیـەوە نەبـێ، نە بەختەوەریی‌و سەرفرازیی دواڕۆژو، نە خێرو خۆشیی‌و سەربەرزیی دنیاشیان دەستگیر نابێ.

* ئێستاش نۆرەی ڕوونكردنەوەی ئەو بنەمایەیە لە چەند خاڵێكی كورتـدا :

**یەكـەم: ئێمـە كـە گوتوومانـە پێویـستە هـەموو لایـەك بـە شـەرعەوە پابەنـدبن، دەبـێ بـزانین كـە وشـەی (الـشـرع) لـە زاراوەی زانایـانی ئیسلامدا، بۆ سێ مانا بەكاردێ:**

أ/ بە مانای (فقـه) دێ، واتە: ئەو بیروڕاو تێگەیشتنانەی كـە زانایـانی ئیـسلام وەك بۆچوون (إجتهاد)ێك لەبارەی قورئانو سوننەتەوە دەیانخەنەڕوو.

ب/ بە مانای (شریعة) دێ، واتە: ئەو وەحیو پەیامو بەرنامەیـەی خـوا ﷻ كـە لـە قورئانو سوننەتدا خۆی دەنوێنێ.

ج/ بە مانای كۆی (الشریعة والفقه) پێكـەوە دێ، واتـە: كـە دەگـوترێ: شـەرعی ئیسلام، هەم دەقەكانی قورئانو سوننەت و، هەم بیروڕاو بەرهەمو (إجتهـاد)ی زانایانیش دەگرێتەوە، جا ئێمە لێرەدا وشەی (شرع)مـان بـەم مانایـەی سـێیەمی بەكارهێناوە، بۆچی وامان بەكارهێناوە؟ چونكە كۆمەڵێكی مـسوڵمان، یـاخود كۆمەڵگایەكی مسوڵمان، دەوڵەتێكی ئیـسلامیی، ناگونجـێ تـەنیا بـە دەقـەكانی قورئانو سوننەت بەڕێوەبچێ، بەڵكو دەبێ زانایان (إجتهـاد) بكـەن و یاسـا لـە قورئانو سوننەت هەڵبهێنجن، بۆ وێنە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾﴾ الشورى. واتە: (...وە كاروباریان لەنێو خۆیاندا بە ڕاوێژە ...)، جـا ئەگـەر زانایـان نەیـەن لـەو ﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾﴾ە، یاسـا هەڵنەهێنجن، نازانین چـۆنی جێبـەجێ بكـەین، چـۆن ئـەو مەشـوەرەتە لـەنێو خۆماندا جێبەجێ بكەین، میكانیزمو شێوازی سەردەمیانەی چۆنە؟ دەبێ زانایان تەفسیلی پێ بدەن.

شایانی باسیشە کە ئەوەی بە خودی دین دادەنرێ‌و پابەندکەر (مُلْـزِم)ە بۆ هەموو کەس‌و هەموو لایەك، تەنها (شريعة)ە، کە خۆی لـە ئایەتـەکانی قورئـان‌و دەقـەکانی سـوننەتدا دەنوێنێ، بـەلاّم تێگەیـشتنەکانی زانایـان‌وئـەوەی هەڵیـدەهێنجن، دیـارە کەلەپوورێك‌و بەرهەمێك‌و ئەزموونێك‌و بەرچاوڕوونییەکە بۆ ئێمە، بەلاّم پابەندکەر نیە بۆ ئێمە، چونکە بەشێك نیە لە دین.

**دووەم: سەرکردایەتی هەر کۆمـەڵێکی ئیـسلامیی، بـە ئەنـدازەی پابەنـدیی بــە شــەرعەوە، شــەرعییەتی هەیــەو، بــە ئەنــدازەو بارتــەقای فەرمانبەریشی بـۆ خـوا ﷻو پێغەمبـەر ﷺ، مـافی فەرمانبـەریی بـۆ کرانی بەسەر ئەندامان‌و پەیڕەوان‌و شـوێنکەوتووانیەوە هەیە[1]:**

بێگومــان دەبــێ قیــادەو چاوســاغی هــەر کۆمــەڵێکی ئیــسلامیی هەوڵبــدا بەرجەستەکەری سەرجەم ئەو بەها بەرزانە (القيـم العليـا)و دروشم‌و شـیعارانە بـێ کە خەڵکیان بۆ بانگ دەکات، بۆیە بابایەکی بەرپرس‌و سەرکردە لە کارو کۆمەڵێکی ئیسلامییدا، دەبێ نموونەی زانیاریی‌و تێگەیشتنی قووڵ‌و فراوان دەربارەی ئیسلام‌و، ئیمان‌و عەقیدەی پتەوو راست‌و، عیبـادەتی راسـت‌و سـاغ‌و، رەوشـت‌و ئاکـاری بەرزو پەسندو، فیداکاریی‌و ئازایەتی‌و کەرەم‌و بەخـشندەیی‌و، خـۆ بەکەمگــرتن‌و

---

١) وەك خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەر ﷺ (أبوبكر الصديق) – خوا لێی رازی بێ ـ لە یەکەمین وتـەی پاش هەڵبژێردرانیدا چەند قسەیەکی بە مسوڵمانان فەرموو، ئینجا گوتی: (أَطِيعُونِي مَا أَطَعْـتُ اللهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنْ عَصَيْتُ اللهَ وَرَسُولَهُ فَلا طَاعَةَ لِي عَلَيْكُمْ) بڕوانە (السيرة النبوية لإبـن هـشام)، ج: (٤)، ص: (٣٩٣)، واتە: (بەقسەم بکەن تـاکو مـن بەقـسەی خـواو پێغەمبـەری خـوا بکـەم، ئەگـەر سەرپێچییم لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا کرد، مافی فەرمانبەرییم لەسـەر ئێـوە نیـە)، واتـە بەقسەم مەکەن.

ژیانی سادەو دادگەریی‌و ڕاستگۆیی‌و ئەمینـداریی‌و وەفـاو ... هتـد بـێ، وە بـە تەئكید هەر كاتێك قیادە لەپێش قاعیدەكەیەوە نەبوو بۆ هەموو شتێكی باش‌و پەسند، ئەوە كەم‌و زۆر پلە پلە ڕێزو متمانەی خـۆی لـەلای قاعیدەكـەی لەدەسـتدەدا. وەك گوتراوە: (جَعَلْتُكَ إِمَامِي كَيْ تَكُونَ أَمَامِي)، واتە: (بۆیە تۆم كردۆتە پێشەوام كە لە پێشمەوە بی). یانی بۆ چاكە لە پێشمەوە بی.

هەربۆیەش پێغەمبـەری خوا ﷺ لـە هـەموو بوارێكـداو لـە هـەموو ڕوویێكـەوە چاكترین‌و نموونەییترین سەرمەشقی هاوەڵە بەڕێزەكانی بووە و، بۆ هەموو چاكەیەك لە پێشیانەوە بووە، وەك خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ...﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: (لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەكی باش هەیە بۆ ئێوە ...). واتە لە هەموو شتێكی باشدا لەپێشتانەوەیە، تۆ هەر شـتێكی چـاك بـە زەینتدا دێ، لە ژیانی پێغەمبـەر ﷺ بكۆڵـەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە لوتكەیـدا بووەو لەپێش هاوەڵە بەڕێزەكانی بووە، خوا ﷻ كـە پـێی دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ الأنعام، واتە: (بـڵـێ بێگومـان نوێـژم‌و خواپەرسـتییم‌و ژیـانم‌و مردنم بۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانەكانـە، هـیچ هـاوەڵی نـین، وە هەربـەوەش فەرمانم پێكراوەو من لە یەكەمینی مسوڵمانانم)، بـەڵێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ چ لـە ڕووی زەمەنییـەوەو، چ لەهەر ڕوویێكیدیكەشـەوە، لەپێش ئۆممەتەكـەیـەوە بووە لـە هەموو بوارەكاندا.

جا هەرچەندە ئەوە ئەركی قیادەو بەرپرسـانە، بـەڵام دروسـت نیـەو نابـێ هـیچ كەسێكیش كەمتەرخەمیی‌و كـەم‌و كوڕییـەكانی بابایـەكی بـەرپرس بكاتـە بیـانووو

پاساوی كەمتەرخەمیی و خۆ بواردن، تۆ ئەگەر بەرسێكت هەبوو كەم و كوڕییەكی هەبوو لە عیبادەت، لە تاعەت، لە ڕەوشتێك ... هتددا، بڵێی جا بۆ ئەو وایە؟ منیش لەو خراپتر دەبم! ئایا خۆ تێك بەستن لە شتی خراپدا دروستە؟ نەخێر، چونكە ئەهلی ئیمان دەبێ هەمیشە لە مەیدانی چاكەكاریی و چاكتركردندا پێشبڕكە (مسابقة) بكەن و، هیچ كاتێك لە خراپەو كەم و كوڕییدا تەماشای یەكدی نەكەن، بەڵكو دەبێ هەوڵی یەكدی ڕاستكردنەوەو چاكسازیی بدەن، بەلام بۆ خراپە یەكدی نەكەنە سەرمەشق.

شتێكی مسۆگەرو ڕوونیشە كە كۆمەڵێكی ئیسلامیی، هەتا خۆیان بە شەرعەوە پابەند نەكەن و، شەریعەت بەسەر خۆیاندا پیادە نەكەن، هەرگیز ناتوانن ئەو خێرو بەرەكەتەی كە خۆیان لێی بێبەش (محروم)ن، خەڵكی دیكەی لێ بەهرەمەند بكەن! ئەگەر تۆ بەپێی شەریعەت بەڕێوە نەچی، دەتوانی خەڵكی دیكەی پێوە پابەندبكەی؟ نەخێر.

ئینجا لەڕاستیدا ڕەوانترین و پاراوترین زمانی خەڵك بۆلای خوا بانگكردن، زمانی كردەوەو حاڵەو، هەر گەل و كۆمەڵێك لە خودی خۆیاندا چاك لەسەر شەرع پەروەردە بووبن و پێیەوە پابەند بووبن، هەر ئەو پەروەردەو تەزكیە بوون و ملكەچ بوونەیان بۆ شەرع، چاكترین شێوازی بانگەوازی خەڵكە بۆ مسوڵمانەتی و دینداریی، پێشینانیش جوانیان گوتوە: (عَمَلُ رَجُلٍ فِي أَلْفِ رَجُلٍ، أَبْلَغُ مِنْ قَوْلِ أَلْفِ رَجُلٍ فِي رَجُلٍ)، واتە: (كردەوەی پیاوێك لە هەزار پیاودا، كاریگەریی زیاترە لە قسەی هەزار پیاو لە پیاوێكدا).

**سـێیەم: ئەوە کە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویـەتی:** ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ **لێی دەفامرێتەوە، کـە کێشـەو تێکگیـران لـەنێو مسولْمـانانـدا هـەردەبـێ:**

واتە: نابێ ئێمە خەیاڵییانە (ئایدیالییانە، مثالییـانە) بیربکەینەوەو بڵێین: جا چـۆن دەبێ مسولْمانان غەیبەتی یەکدی بکەن؟ چـۆن دەبـێ مـسولْمانان کێشەیان هـەبێو تێکبگیرێن؟ چۆن دەبێ قسەی بەرزو نزم لەگەڵ یەکدیـدا بکـەنو ...هتـد؟! ئەوانـە هیچ نین، ئێمـە بەشـەرین، بەشـەر کـەمو کوڕییـان هـەر دەبـێ، چ لـەنێو خـودی قیادەداو، چ لەنێوان قیادەو خەڵکداو، چ لەنێوخۆی خەڵکدا، تـێکگیرانو مـشتومڕ دەبـێ، بـەلاْم خـوای کاربـەجێ ﷻ ڕێبـازو شـێوازی چارەسـەرکردنی کێـشەو گرفتەکانیشی پیـشانداوین، کـە بریتیـە لـە گەڕانـەوەی مـسولْمانانو، گێڕانـەوەی گرفتو کێشەکانیان بۆ تەرازووی شەریعەت: ﴿فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾، یان وەك فەرموویـەتی: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ١٠﴾ الشورى، واتە: (وە هەر شتێك تێیدا کەوتنە ڕاجیـایی ـ **إختلاف** ـ یەوە، ئەوە حوکمو بڕیار لەبارەیەوە بۆلای خوایـە، ئـا ئـەو خوایـەتان پەروەردگارمە، پشت بەوی دەبەستمو، بۆلای ویش دەگەڕێمەوە).

بەڵێ تەنها دادوەر (حَكَمْ)و بۆ لا گەڕاوە (مَرْجِعْ) بـۆ یەکلاییکردنـەوەی کێـشەو گیروگرفتو دەمەقاڵێیەکانی نێـوان مـسولْمانان، تـەرازووی شـەریعەتو بەڵگـەی بەهێزە (قوة الـمنطق)، نەك وەك هی نامسولْمانان تـەرازووو دادوەرییـان ئـارەزووو مەنتیقی هێز بێ!! واتە لای ئەوان مەنتیقی هێز دەخوا، لای ئێمە هێزی مەنتیق، لای ئێمە کێ بەڵگەی بەهێزتربێ قسەکەی دەچێتەسەر، لای ئەوان کێ دەسەلاْتی زیاتربێ

قسەی وی سەردەگرێ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەر حەقە لەژێر ناحەقییدا جیرە جیڕی دێ). بەو پێیە لەکاتی تێکگیران و کێشەو مشتومڕەکانی نێوان مسوڵمانان‌دا –لە هەر ئاستو پلەوپایەیەکدا بن-، ئەوەیان قازانج دەکات و براوەیەو قسەی سوارە، کە لەسەر هەقەو بەڵگەی بەدەستە، نەك ئەوەیان کە زیاتر باڵادەست یان فێڵباز یان پارەدارە! من جاری وا هەبووە ئەندامێکی سەرکردایەتی یان مەکتەبی سیاسی لەگەڵ ئەندامێك مشتومڕیان بووە پێکەوە دامناون، جاری وا هەبووە برا مەکتەب سیاسییەکە یان سەرکردایەتییەکە گوتوویەتی: مامۆستا جا چۆن من لەگەڵی دادەنێی؟ پێمگوتوە: بۆ لەبیرت چۆتەوە کە هەردووکتان وەك یەك بەشەرن و، هەردووکیشتان مسوڵمانن؟ لە تەرازووی خوا ﷻدا بەرزیی و نزمیی نیە، بەهۆی بەرپرسیارێتییەوە، لە مەسەلەی هەقو ناهەقو لە بواری دادوەرییدا.

عومەری کوڕی خەتتاب –خوا لێی رازی بێ- لەگەڵ کابرایەکی عەرەبی خێڵەکیی (أعرابـي)دا بوو بە کێشەیان، ئەسپێکی لێ کڕیبوو، یەك دوو ڕۆژان ئەسپەکە لای ئیمام عومەر بوو، دوایی کەم و کووڕییەکی لێ پەیدابوو، ئیمام عومەر (ئەو کاتە خەلیفە بوو) گوتی: وڵاغەکەت ببەوە کەمو کوڕیی هەیە، کابرا گوتی: من بە سەلامەتیی تەسلیمی تۆم کردوە، بوو بە کێشەیان، چوونە لای شورەیحی قازی، گوتیان تۆ ببە دادوەر لەنێوانماندا، شورەیح وتی: هەریەکەتان قسەی خۆی بکات، ئەوانیش قسەی خۆیان کردو، شورەیح گوتی: ئەی فەرمانڕەوای مسوڵمانان! یان چۆنت بردوە وای تەسلیم بکەوە، یان پارەی بۆ ببژێرەو بیدەیە، عومەر گوتی: حوکمەکەت دادگەرانەیە[1].

---

١) أن عمر بن الخطاب أخذ من رجل فرساً على سوم يحمل عليه رجلاً، فعطب الفرس فَقَالَ عُمَرُ: اجعل بيني وبينك رجلاً فَقَالَ الرجل: إجْعَلْ بيني وبينك شريحاً العراقي، فأتيا شريحاً، فقال: يا أمير المؤمنين أخذته صحيحاً سليماً على سوم، فعليك أن ترده سليماً كما أخذته، قال: فأعجبه ما قَالَ، ثم بعثه قاضياً، ثم قال: ما وجدت في كتاب الله فالزم السنة فإن لم يك في السنة فاجتهد رأيك. (أخبار القضاة، ج: (٢)، ص: (١٨٩)).

ئینجا لە بنەماكانی دادوەریی ئیسلامییدا باس دەكات لەبارەی هەردوولا (داواكارو داوا لەسەر تۆماركراو)ەوەو دەڵێ: (أَنْ يُسَوِّيَ بَيْنَ الْخُصُومِ فِي لَحْظِهِ وَلَفْظِهِ وَمَجْلِسِهِ)، واتە: (دەبێ – دادوەر ـ جیاوازیی نەكات لەنێوان بەرانبەرەكاندا، لە تەماشاكردنی و قسەكردنی و شوێنی دانیشتنیدا).

دیارە مسوڵمانانیش – بەتایبەت كۆمەڵێك كە دەیانەوێ ئیسلامەتیی ببووژێننەوە ـ دەبێ لەكاتی وتووێژو مشتومڕیاندا، بۆ ساغكردنەوەو یەكلاییكردنەوەی بابەتە ڕاجیایی (إختلاف) هەڵگرەكان، خۆیان بەوپەڕی سینگ فراوانیی و لێبوردەیی و ئەدەب بەرزیی و هەقخوازیی بڕازێننەوەو، بێجگە لە گەیشتن بە هەق (الوصول للحق) ئامانجێكی دیكەیان نەبێ، ڕەحمەتی خواش لە ئیمام شافیعی، كە لەوبارەوە گوتوویەتی: (مَا نَاظَرْتُ أَحَدًا إِلاَّ وَدِدْتُ لَوْ أَنَّ الْحَقَّ يَظْهَرُ عَلَى يَدَيْهِ)، واتە: (وتووێژم لەگەڵ هیچ كەسدا نەكردوە، مەگەر حەزم كردوە كە هەق لەسەر دەستی وی ئاشكرابێ).

هەروەها لەبارەی سەماحەت و تەنها بیروڕای خۆ لەلا ڕاست و هەق نەبوونەوە، هەر ئیمام شافیعی – ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ گوتوویەتی: (رَأْيِي صَوَابٌ يَحْتَمِلُ الْخَطَأَ، وَرَأْيُ غَيْرِي خَطَأٌ يَحْتَمِلُ الصَّوَابَ)، واتە: (ڕای خۆمم پێ ڕاستە، بەلاَم ئەگەری هەڵەشی هەیە، وە ڕای بەرانبەرمم پێ هەڵەیە، بەلاَم دەگونجێ ڕاستیش بێ)، جێی خۆیەتی ئەم قسەیە بە ئاوی زێڕ بنووسرێتەوە و، ئەوەیە كە لێبوردەیی پەیدادەكات، ئەدی چ شتێك دەمارگیریی (تَعَصُّب) پەیدادەكات؟ ئەوە كە بڵێی: ڕای خۆمم پێ ڕاستەو ئەگەری نیە هەڵە بێ، ڕای بەرانبەریشم پێ هەڵەیەو ئەگەریشی نیە ڕاست بێ! مانای وایە حەق هەمووی لەسەر تۆ تاپۆكراوەو، ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ، كە لەڕاستیدا هیچ كەسێك بۆی نیە ئەو ئیددیعایە بكات،

چـونکه خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ ...﴿٢٩﴾﴾ الكهـف، واتـه: (بڵێ حەق لـه پەروەردگاتانەوەیـه ...)، غـەیری خـوا ﷻ، دەبینـی حــەق دەڵـێ و غەیری حەقیش دەڵێ، بەس نیه کـه پێغەمبــەری خـوا ﷺ جـاری وا بـووە قـسەی فەرمووە، دوایی که نـەیپێکاوە، خـوا ﷻ بـۆی راسـتکردۆتەوە؟! ئیـدی لـه دوای پێغەمبـەر ﷺ نابێ هیچ کەس وا بیربکاتەوە که هەرچی بیڵێ حەقەو، ئـەو رایانـەی که لەگەڵ رایەکەی ئەو تێکدەگیرێن ناحـەقن، بـەڵکو ئینـسان دەبـێ بڵـێ: وای بـۆ دەچم رایەکەم راست بێ، بەڵام دەشـگونجێ هەڵـه بـێ، رای جەنابیـشت بـه هەڵـه دەزانم، بەڵام دەشگونجێ راست بێ، ئەوە لـه را (رَأْي)دا، بـەڵام کاتێـك ئایـەتێك تەفسیر دەکەین دەڵێین: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾ الإخـلاص، واتـه: (بڵـێ خـوا یەکە)، لێرەدا نابێ بڵێی: وای تێدەگەم دەگونجێ وابێ، دەشگونجێ وانـەبێ! ئـەوە نابێ، چونکه ئەوەی (قَطْعِيُّ الدِّلالَة)یه له قورئانو سوننەتو ماناکەی روونه، ئـەوە بواری راجیایی تێدا نیه، بۆ نـموونه: خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿... وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ ...﴿٢٧٥﴾﴾ البقرة، واته: (... خوا کـڕینو فرۆشـتنی حـەڵاڵ کـردووەو ریبای قەدەغه کردوە ...) ئەوە مەجالی راجیایی تێدانیه، بەڵکو ئەوە ئایەتـەو تـەواو، ماناکەی ئاشکراو روونه، بەڵام ئەوەی که ماناکەی ئاشکراو روون نیه، بۆ نـموونه خــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿... أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ...﴿٤٣﴾﴾ النــساء، مەبەســت لــه (لَٰمَسۡتُمُ) دەست لێدانه، یان جیماعه، ئەوە دوو واتایـان هەڵـدەگرێ، کەواتـه تـۆ بۆت نیه بڵێی هەر ئەو مانایەی هەیه و، ئەویدیکه حەتمەن هەڵەیه، وە هەروەها ئـەو شـتانەی دیکـه کـه تەفـسیری ئایەتـه یـان لێکدانـەوەی فەرموودەیـه، یـاخود هـیچ پەیوەندیی به ئایەتو فەرموودەوە نیه، راو بۆچوونێکی دنیاییه، بـۆ وێنـه: (یاسـای

هاتوچۆ) لەو بوارانەدا دەبێ تەماشا بکەی بەرژەوەندی چۆنەو کێ زیاتر بەڵگەی بەدەستەوەیە .

بێگومان پێشینەی چاکیشمان –ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەربێ ـ چاکترین پێشڕەوو سەرمەشقمانن بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەو گرفتو مەسەلە خیلافییەکانداو، چارەسەرکردنیان لە کەشو هەوایەکی برایانەو دڵسۆزانەو، دوور لە گیانی گرژبوون (تَشَنُّجْ)و دەمارگیریی (تَعَصُّبْ)و خۆپەسندیی (عُجْبْ)، بەڵێ، پێویستە خۆمان لەم سێ شتە بپارێزین :

١/ **<u>گرژبوون (تشنج)</u>**: جاری وا هەیە کابرا بە هەر رایەك کە پێچەوانەی رای ئەو بێ، گرژدەبێ! بەڵام نا، تۆ بۆت هەیە قسەی خۆت بکەی، ئەویش بۆی هەیە قسەی خۆی بکات، گرژ مەبە .

٢/ **<u>دەمارگیریی (تعصب)</u>**: کابرا وادەزانێ رایەکەی خۆی وەحییە بۆی هاتوە! نەخێر نە هی تۆ وەحییەو نە هی خەڵکیش وەسوەسەی شەیتانە .

٣/ **<u>خۆپەسندیی (عُجب)</u>**: ئینسان نابێ بە رای خۆی زۆر موعجەبو سەرسام بێ، بەڵکو پێویستە وەك بیروڕایەك تەماشای بکات، کە ئەگەری راستیی‌و هەڵەی هەیە .

ئەو دوو قسەیەی کە لە (شافیعی)شمان بە نموونە هێنانەوە –ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ، چاکترین بەڵگەی سەلماندنی ئەم قسەیەمانن، خوا ﷻ پاداشتی شافیعی‌و سەرجەم پێشەواو زانایانمان بداتەوە و، پلەوپایەیان زیاترو زیاتر بەرزبکاتەوە، راستە لەو بوارانەدا کە مشتومڕ هەڵدەگرن‌و راجیایی (إختلاف)یان تێدا هەیە، زۆر پێکەوە لێبوردەو بە ئەدەبو دڵفراوان‌و زمان شیرین بوون، هەندێ جار ئەگەر بێ‌و شەڕە قسە (مُنَاظَرَة)و وتووێژی زانایان کە لە کتێبەکانیاندا هاتوون تەماشا بکەین، بۆ

وێنە: یەکێکیان بەویدیکە دەڵێ: بەڵێ جەنابت وات فەرموو، ڕاستە ئەوە وایە، بەڵام ئەها لەو لاشەوە شتێکی دیکەی ئاوا هەیە، ناڵێ ئەوەی تۆ هەمووی هەڵەیە، بەڵام دەڵێ: وەك چۆن ئەو ڕایە هەیە، ئەوەیدیکەش هەیە، من نامیلکەیەکم لەوبارەوە هەیە کە باسێکە لە بەرگی یەکەمی کتێبی (**خواپەرستیی ئیسلامیی**)دا بەناوونیشانی: (**بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی ژیرانەو شەرعییانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا**)[1]، سەرنجی بدەن تاکو بۆتان دەربکەوێ، چۆن زانایان بە سینگ فراوانیی و سەماحەتەوە لەگەڵ ئەو مەسەلانەدا کە ڕاجیایی و مشتومڕ هەڵدەگرن، لەگەڵ یەکدیدا مامەڵەیان کردوە، بەبێ دەمارگیریی و گرژبوونو خۆپەسندیی.



١) ئەو نامیلکەیە بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕدراوەو، لەلایەن مەکتەبی زانایانەوە چاپو بڵاوکراوەتەوە.

# بنەمـای چـوارەم

## کاروبـار بەڕێوەبردن لەسـەر بنـاغـەی ڕاوێـژو بە دادگـەرانـەو، دەرنـەچـوون لە بـازنەی مەرجەکانی کارپێکـەوەکردن

# بنەمای چوارەم

## كاروبار بەڕێوەبردن لەسەر بناغەی ڕاوێژو بە دادگەرانەو، دەرنەچوون لە بازنەی مەرجەكانی كارپێكەوەكردن:

توندوتۆڵیی قیادە و سەرپەرشتیكردنو مشوورخواردنی بۆ تێكڕای ئۆرگانو ئەندامەكانی كۆمەڵو، دادگەریی چەسپاندنو بە پەرۆشو بە تەنگەوە بوونی، بۆ چارەسەری كێشەو گرفتەكانیانو دابینكردنی بەرژەوەندییە مەعنەوییو مادديیەكانیانو، پابەندبوونی هەرچی زیاترو چاكتری بە بنچینەی ڕاوێژكردن (قاعدة المشورة)ەوە بە هەردووك جۆری ڕاوێژكردن (الشورى) كە مەبەست پێی ڕاوێژكردنی قیادەیە بە قاعیدە لە مەسەلە و بابەتە گشتییەكاندا، كە ڕای زۆربە هەڵیاندەبڕێ و (حَسْمْ)یان دەكات، وە دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن لە جەنگی (ئوحود)دا، لەسەر ڕای زۆربەی هاوەڵان، لەم جۆرەیە، وە ڕاوێژپێكردن (الإستشارة) كە یەكلایی كردنەوەی مەسەلە هونەریی و (إجتهادي)یەكانە لەبەر ڕۆشنایی بیروڕای پسپۆڕان (مُتَخَصِّصِين)دا، وە مەنزڵگا گواستنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی (بەدر)دا و لەسەر پێشنیاری (أَلْحَبَّابُ بنُ الْمُنذِر)یش رضي الله عنه نموونەیەكە لەم جۆرە ڕاوێژكردنە، وە بە پابەندكەر (مُلْزِمْ) دانانی ئەنجامەكانیان، مەگەر ئەو مەسەلەیە كە بەرپرس ڕاوێژی تێدا بە ئەندامان كردوە لە سنووری صەلاحیەتی خۆیدا بێ، ئەو كاتە سەرپشكە لەنێوان پابەندبوونو پابەند نەبووندا بە ڕای زۆرینەوە.

وە كەڵكی خراپ وەرنەگرتن (عدم إستغلال)ی هیچ بەرپرسێك لە پلەو پایەو كارەكەی بۆ بەرژەوەندییە شەخسییو بنەماڵەییو خزمایەتیو ... هتدەكانیو، بە سینەی فراوانو ڕەوشتی جوانەوە، گوێگرتن بۆ پێشنیارو ڕەخنەو قسەی هەر كەسێكو، بە ئەمیەتو بایەخ پێدانەوە وەرگرتنیانو هەڵسەنگاندنیان.

وە دەرنەچوون لە بازنەی ئەو مەرجانە (شروط)ی كە ئەو كۆمەڵە لەسەریان پێكهاتوە، واتە: بەرنامەو پەیڕەوی نێوخۆ (المنهج والنظام الداخلي)ی ئەو كۆمەڵە.

وە لێپرسینەوەو سزادانی سەرپێچیكەرانو لادەرانو، تەقدیركردنو پاداشتدانەوەی چاكەكاران، چونكە:

١- خوای بالادەستو دادگەر ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێو دەفەرمویٚ: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران. واتە: (تۆ - ئەی موحەممەد ! - بەهۆی بەزەیی خواوە بۆیان – بۆ هاوەڵەكانت- نەرمو نیان بووی، وە ئەگەر قسە ڕەق و دڵڕەق بووایەی، لە دەورت دەپەڕژان، جا لێیان ببوورەو داوای لێبوردنیان بۆ – لە خوا - بكەو، لە كاروباردا ڕاوێژیان پیٚ بكەو، هەركات دڵت چەسپی لەسەر بڕیارێك، پشت بە خوا ببەستە – واتە: ئەنجامی بدە-، بێگومان خوا پشت پیٚ بەستووانی خۆشدەویٚ).

٢- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ ...﴿٤٨﴾﴾ المائدة. واتە: (... ئینجا بەوە كە خوا ناردوویەتە خوار،

دادوەرییان لەنێواندا بکە و، مەکەوە شوێنی ئارەزووەکانیان، لەجیاتی هەقێك کە بۆت هاتوە، بۆ هەر کامێك لە ئێوە -ئەی ئۆممەتان!- ڕێباز و بەرنامەیەکمان داناوە ...).

٣- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ... ﴿١٥﴾﴾ الشورى. واتە: (جا بۆئەوەی ڕابرد بانگەواز بکە -یانی: خەڵك بۆ ئەوە بانگ بکە کە لەم سووڕەتەدا باسکرا-، وەك فەرمانت پێ کراوەو، ڕاوەستاو بەو مەکەوە دوای ئارەزووەکانیان، وە بڵێ بڕوام بە هەر کتێبێك هەیە کە خوا ناردوویەتە خوارێ - واتە: بڕوام بە ئەسڵەکەیان هەیە نەك بەو حاڵەی ئێستایانەوە کە گۆڕدراون-، وە فەرمانم پێکراوە کە دادگەرییتان لەنێواندا بکەم...).

٤- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {...الْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ ...} رواه أبوداود: ٣٥٩٤، والترمذي: ١٣٥٢ وقال الترمذي والألباني: حسن صحيح، واتە: (مسوڵمانان بەگوێرەی مەرجەکانیان پێکەوە مامەڵە دەکەن ...). هەر کۆمەڵە مسوڵمانێك ئەو مەرجانەی کە لەسەریان ڕێك کەوتوون، پێویستە پێیانەوە پابەند بن و، بەپێی ئەو مەرجانە بەیەکەوە مامەڵە بکەن، واتە: هەر کەسێك مەرجەکانی کەسێکی قەبووڵکرد، دەبێ پێیانەوە پابەند بێ و، بەپێی ئەوە ڕەفتار بکات و، لێیان لانەدات.

٥- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّكُمْ راعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤولٌ عَنْ رعِيَّتِهِ ...) رواه البخاري: ٨٩٣ و ٥٢٠٠ ومسلم: ١٨٢٩، عن ابن عمر رضي الله عنه. واتە: (هەر کامێك لە ئێوە -ئەی مسوڵمانان- چاودێرەو، هەر کامێکیشتان بەرپرسیارە بەرانبەر بەوانەی کە لەژێر چاودێرییدان ...).

## ڕوونكـردنەوە:

ئەم بنەمای چوارەمە باسی بناغەو چۆنیەتی كاروبار بەڕێوەبردنی قیـادە دەكـات، لـە بازنـەی ئـەو كۆمەڵـەدا كـە هەڵیانبـژاردووەو، ئـەركی سـەركردایەتییان پێـی راسپاردوە، جا ئێمە لە دوازدە خاڵ دا ئەم بنەمایە روون دەكەینەوەو دەتوێژینەوە:

### یەكـەم: تۆكـمەیی‌و توندوتۆڵـیی قیـادە لە خودی خۆیدا:

بێگومان قیادەی هەر كۆمەڵێكی ئیسلامیی (دیارە ئێمە لێرەدا قسە لەسەر كۆمەڵی ئیسلامیی دەكەین)، مادام لە خودی خۆیدا رێكوپێك‌و توندوتۆڵ نەبێ، مەحاڵە كـە بتوانـێ ئـەركی سەرشـانی خـۆی بەرانبـەر بـە قاعیدەكـەی جێبـەجێ بكـات، مەبەستیشمان لە رێكوپێك بوون‌و توندوتۆڵیی قیادە، رەچاوكردن‌و لە خـۆدا هێنانـە دی، هەموو ئەو سیفەت‌و پێكهێنـەرانەیە كە بۆ قیادەیـەكی رەشـیدی ئیـسلامیی بـە مەرج گیراون‌و، لە دەقەكانی (قورئان‌و سوننەت)دا ئاماژەیان بۆ كراوە، بۆوێنـە:

أ) خوا ﷻ باسی بەنی ئیسرائیل دەكـات، دەفـەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الـسجدة، واتـە: (لەنێویاندا پێشەوایانێكمان بۆ گێڕابـوون، كـە بـە فـەرمانی ئێمـە رێنمـاییـان دەكردن، بەهۆی ئەوەوە كە خۆڕاگربوون‌و بڕوای پتـەوو دامـەزراویان هـەبوو بەرانبـەر بـە ئایەتـەكانی ئێمـە)، زانایانمـان لەبـەر تیـشكی ئـەم ئایەتـەدا، وەك بنچینەیەكی شەرعیی گوتوویانە: (بِالصَّبْرِ وَالْـيَقِينِ تُنَـالُ الإِمَامَـةُ فِـي الـدِّينِ)، واتە: (بەهۆی ئارامگریی‌و بڕوای پتەوو دامـەزراوەوە، پێـشەوایەتیی لـە دینـدا

فەراهەم دێ). کە ئارامگریی (صبر)یش پەیوەندی بە لایەنی کردەیییەوە هەیەو، بڕوای پتەوو دامەزراو (یقین)یش، پەیوەندی بە لایەنی (نظري)و تیۆرییەوە هەیە، دەبێ ئینسان لەڕووی زانیارییەوە بڕوایەکی دامەزراوو پتەو (یقین)ی هەبێو خۆی لەبەر ڕۆشناییدا ببینێ، نابێ لەرەلەرو دڵ لەدڵ دانو گومانی هەبێ، وە دەبێ لەڕووی کردەییشەوە خۆڕاگرو پشوودرێژ بێ و، چەسپاوو دامەزراو بێ، ئینجا بەکەڵکی بەرپرسیارێتی دێ.

ب) دوو کچەکەی پیاوە ساڵحەکە کە زۆربەی توێژەرەوەکانی قورئان دەڵێن شوعەیب عليه السلام بووە، ماڵاتێك[1] ئاودەدەنو مووسا عليه السلام دەچێ هاوکارییان دەکاتو ماڵاتەکەیان بۆ ئاودەدا، دوایی کچەکان دەچنەوە بۆ بابیان دەگێڕنەوە، پاشان یەکێکیان بەدوایدا دێ، دیارە ئەو پیاوە چاکە کە هەندێك دەڵێن: (شوعەیب)ە، یەکێك لە کچەکانی بەدوای مووسا عليه السلامدا دەنێرێ، کە لەژێر سێبەری درەختێك پشوویداوە، تا بچێتە ماڵیان پشووبداو نانێك بخوا، ڕێبوارە، مادام ئەو چاکەو پیاوەتییەی لەگەڵدا کردوون، جا دوای ئەوەی دەچێو بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە، یەکێك لە دوو کچەکان ئەو پێشنیارە دەکات:

﴿ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ ﴾ القصص، واتە: (یەکێك لە دوو کچەکان گوتی: ئەی بابە! بەکرێی بگرە ـ بۆ شوانیی ـ، باشترین کەسێك کە تۆ بەکرێی بگری، بەهێزی ئەمیندارە). واتە کەسێك بەکەڵکی ئەوە دێ تۆ کاری پێ بسپێری، هێزی هەبێو ئەمانەتیشی هەبێ، هێزی هەبێ بۆ ئەنجامدانی کارەکە، ئەمینداریش بێ بۆ پارێزگارییکردنیو ناپاکیی تێدا نەکردنی.

---

١) ماڵات: ئاژەڵ.

كەواتە دوو مەرجی دیكەی بەرپرسێتی، بریتین لە هێزو ئەمینداریێتی (القوة والأمانة)، ئەوە چوار.

جـ) دوای ئەوەی كە پادشای میسر (یوسف) ﷺ بانگ دەكات‌و دەیدوێنیٚ‌و پیٚی دەڵێ: ﴿... إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ٥٤﴾ یوسف، واتە: (... تۆ ئەمڕۆ لای ئێمە بەڕێزو ئەمینداری)، یوسف ﷺ بۆی پێشنیار دەكات: ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥﴾ یوسف، واتە: (ـ مادام تۆ متمانەت بە من هەیەو تێمڕادەبینی ـ من لەسەر خەزێنەكانی زەوی دابنیٚ، چونكە من پارێزەرمو زانام)، واتە بە زاراوەی ئەمڕۆ: بمكە بە وەزیری ئابووریی یان وەزیری دارایی، بەڵێ (یوسف) ئەو دوو سیفەتە لەخۆیدا هەڵدەداو، دەیانكاتە پاساوی ئەوەی سەرپەرشتی عەمبارو خەزێنەكان بكات، واتە وەزیری دارایی‌و ئابووریی بێ، كە بریتین لەوەی: پارێزەرەو زانایە، كەواتە ئەم دوو سیفەتەش هەردووكیان پێویستن.

كەواتە: ئێمە لێرەدا گەیشتینە شەش سیفەت، هەڵبەتە دەگونجێ سیفەتی دیكەش هەبن: (الصبر واليقين، القوة والأمانة، الحفظ والعلم).

كەواتە: هەركام لە خەسڵەتەكانی: خۆڕاگریی (الصبر)و ئیمان پتەویی (اليقين)و توانایی (القوة)و ئەمینداریی (الأمانة)و پارێزەریی (الحفظ)و زانایی (العلم)، بۆ ئینسانی قیادیی پێویستن.

پێغەمبەری خواش ﷺ كە فەرموویەتی: (إِذا ضُـيِّعَتِ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ، قِيْلَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: إِذَا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ) رواه البخاري: (٥٩) واللفظ له، وأحمد: (٨٧٢٩) (٨٧١٤)، واتە: (هەركاتێك سپاردە

زایە بوو چاوەڕێی کاتی کۆتاییپێهاتن بکەن، گوترا: سپاردە بەزایەچوون چۆنە؟ فەرمووی: هەرکاتێك کار بە غەیری کەسانی شایستەی خۆی سپێردرا، چاوەڕێی کۆتایی ئەو کارە بکەن)، جا هەندێك وادەزانن مەبەستی پێی قیامەتە، بەلآم وانیەو، ئەگەر قیامەتیش بێ، مەبەستی پێی قیامەتو کۆتاییپێهاتنی ئەو کارەیە. پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی چی دەفەرموێ، چونکە هەر کاروبارێك بە خەڵکی ناشایستە سپێردرا، تێکچوونو نەمانو قیامەتی نزیکە! یەعنی شارێك، فەرمانگەیەك، شوێنێك، بەکەسێك بسپێرە کە ئەهل نەبێ، ئەوە بەرەو کۆتایی دەچێ و زایە دەبێ، ئیدی مەرج نیە ئەوە قیامەتی گەورەبێ، فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبێ وەك خۆی لێی تێبگەین.

جارێك وەفدێك هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ، یەکێك لێی پرسی: (يَا رَسُولَ اللهِ! مَتَى السَّاعَةُ)؟ واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا! کەی قیامەت دادێ)؟ ـ کە دیارە مەبەستی پێی قیامەتی گەورە بووە ـ، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کردن یەکێك لە هەموویان گچکەترو گەنجتر بوو، فەرمووی: {إِنْ يَعِشْ هَذَا فَلا يَبْلُغَ الْهَرَمَ حَتَّى تَقُومَ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ}[1] رواه البخاري: (٦٥١١)، واتە: (ئەگەر ئەمە بژیێو تەمەن بکات، ناگاتە تەمەنی زۆر پیریی کە قیامەتی ئێوە دێ)، یانی ئەوەی گەنجە تا پیردەبێ، ئەوانی پیرن وەفات دەکەنو قیامەتیان دێ، مانای وانیە کە قیامەتی گەورە دادێ، ئینجا ئەگەر یەکێك بڵێ: ئەوانە هەموو ڕۆیشتنو پیریش بوونو مردیشنو قیامەتیش هەر نەهات، ئایا چۆن پێغەمبەر ﷺ وایفەرمووە؟! وەڵامەکەی ئەوەیە کە ڕوونمان کردەوە کە مەبەست لە قیامەت، کۆتایی پێهاتنی ئەو کارەیە، بۆیەش

١) عن هشام عن أبيه عن عائشة قالت: (كان رجال من الأعراب جفاة يأتون النبي ﷺ فيسألونه: متى الساعة؟ فكان ينظر إلى أصغرهم فيقول: إن يعش هذا لا يدركه الهرم حتى تقوم عليكم ساعتكم)، قال هشام: يعني موتهم، رواه البخاري: (٦٥١١).

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكدا دەفەرمویٚ: (رُبَّ مبلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ)[١]، واتە: (زۆركەس فەرموودەی پێڕادەگەیەنرێ، لەو كەسەی كە بیستوویەتی شارەزاترەو چاكتری تێدەگا)، واتە: هەی وا هەیە فەرموودەی لەبەرە، بەڵام تێینەگەیشتوە، یەكێكی دیكە كە لەبەری نیە، دوایی كە فەرموودەكەی بۆ دەخوێندرێتەوە، ئینجا ئەو بابای فەرموودە لەبەر حاڵی دەكات!

دەڵێن: جارێك ئەعمەش لە مەجلیسی ئەبو حەنیفە دەبێ، (ئەعمەش)یش فەرموودەناس (مُحَدِّثْ) بووە، پرسیارێكی شەرعیی لە ئەبو حەنیفە دەكات، ئەویش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: وەڵامەكەی ئاوایە، ئەویش دەڵێ: باشە ئەو فەتوایەت لەكوێ هێنا؟ دەڵێ: لەو فەرموودەیەی كە دوێنێ جەنابت بۆت خوێندمەوە، دەڵێ: جا چۆنت لێ وەرگرت؟ دەڵێ: فەرموودەكە بڵێوە، ئەویش فەرموودەكە دەڵێتەوە، ئەویش بۆی روون دەكاتەوەو دەڵێ: ئەو فەرموودەیە دەلالەت لەسەر ئەوەو ئەوە دەكات، ئینجا ئەعمەش دەڵێ: (أَيُّهَا الْفُقَهَاءُ، أَنْتُمُ الْأَطِبَّاءُ وَنَحْنُ الصَّيَادِلَة)[٢]، واتە: (ئەی زانایانی شەرعزان! ئێوە پزیشكن‌و ئێمەش دەرمانسازین)، رەحمەتی خوا ﷻ لە ئەبو حەنیفەو ئەعمەش‌و سەرجەم زانایان بێ، جا ئایا دەرمانساز (صیدلاني) چی دەكات؟ دەرمانەكانی لەلان، بەڵام دەبێ دكتۆر راچێتە بۆ نەخۆش بنووسێ، داخۆ كام دەرمانەی پێبداو بە رێژەی چەندو چۆن؟ دەرمانساز لەخۆڕا ناتوانێ بەكەیفی خۆی دەرمان بە نەخۆش بدا،

---

١) (عن عبد الله بن مسعود: أن النبي ﷺ قال: نَضَّرَ اللهُ رَجُلًا سَمِعَ مِنَّا كَلِمَةً فَبَلَّغَهَا كَمَا سَمِعَ، فَإِنَّهُ رُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ) رواه البيهقي في شعب الإيمان: (١٧٣٨).

٢) عن عبيد الله بن عمر أَنَّهُ قال: كنا عند الأعمش وهو يسأل أبا حنيفة عن مسائل ويجيبه ابو حنيفة، فيقول له الأعمش: من أين لك هذا؟ فيقول: انت حدثتنا عن إبراهيم بكذا وحدثتنا عن الشعبي بكذا، قال (عبيد الله بن عمر): فكان الأعمش عند ذلك يقول: (يَا مَعْشَرَ الْفُقَهَاءِ، أَنْتُمْ الْأَطِبَّاءُ وَنَحْنُ الصَّيَادِلَةُ). الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي، ج: (٢)، ص: (٨٤).

مەبەست ئەوەیە زۆر كەس ئایەتی زۆری لەبەرن، فەرموودەی زۆری لەبەرن، بەڵام تێیاناگاو نازانێ چ حوكمێكیان لێوەردەگیرێ.

## دووەم: سەرپەرشتی قیادەو مشوورخۆریی‌و چاودێرییكردنی بۆ سەرجەم ئۆرگان‌و كارەكان:

دەبێ قیادە سەرپەرشتی تێكڕای ئۆرگان‌و كاروبارەكانی كۆمەڵ بكات و، بیانخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوەو ئاگای لێیان بێ، چونكە مادام لە بەرانبەریاندا بەرپرسیارە، دەبێ مشووریان لێ بخوا، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {كُلُّكُمْ راعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رعِيَّتِهِ ...} رواه البخاري: (٢٥٥٤)، ومسلم: (١٨٢٩)، دیارە چاودێریی كردن هەر بە قسە نیە، دەبێ بەكردەوەش چاودێربێ، جا ئەگەر هەموومان بەگشتیی بەرپرسیاربین، ئەوە بێگومان كەسێك كە مسوڵمانان خۆیان هەڵیبژێرن بۆ بەرپرسیارێتیی، بەتەئكید زیاتر بەرپرسیارەو دەبێ زیاتر چاودێریی بكات‌و مشوور بخوا.

## سێیەم: ئەهمیەت‌و بایەخدانی قیادە بە تێكڕای ئەندامانی كۆمەڵ، بەبێ جیاوازیی:

ئەهمیەت‌و بایەخدانی قیادە بە یەك بەیەكی ئەندامانی كۆمەڵ، بەبێ جیاوازیی‌و، بە تەنگەوەبوونیان‌و خەم لێ خواردنیان، بنەمایەكی سەرەكی كاروبار بەڕێوەبردنی‌و ئەركێكی گەورەو گرنگی سەر شانیەتی، چونكە -وەك گوتمان- مادام لە بەرانبەریاندا بەرپرسیارە، وەك لە فەرموودەكەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە كە بوخاریی‌و موسلیم دەیگێڕنەوە، دەفەرموێ: {... فَالْإِمَامُ راعٍ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رعِيَّتِهِ ...} رواه البخاري: (٢٥٥٨) واللفظ له، ومسلم: (١٨٢٩)، واتە: (پێشەوا یان سەركردە

چاودێره و، بەرپرسیاریشە بەرانبەر ئەوانەی کە دەبێ چاودێریان بکاتو لەبەردەستیدان)، بۆیە دەبێ لێیان بێ خەم نەبێو، ئەوەندەی بۆی دەلوێ بەتەنگیانەوە بێ، دیارە خەم لێخواردنو ئەهمیەتو گرنگی پێدانی قیادەش بۆ ئەندامان، هەموو شتێكو هەموو لایەنێك دەگرێتەوە، هەر لە زانیاریو تێگەیشتنو ئیمانو عەقیدەیانەوە، هەتا عیبادەتو ئەخلاقو هەڵسوکەوتی رۆژانەی شەخسییو نێو خێزانو کۆمەڵگاو ... هتد. لە هەموو ڕوویەکەوە ئەو قیادەیە دەبێ ئاگای لەو خەڵکەبێ، کە لەبەر دەستیدانو مشووریان لێ بخوا.

## چوارەم: هەوڵدانی قیادە بۆ چەسپاندنی دادگەری لەنێو (کۆمەڵ)دا لە هەموو ڕوویەکەوە:

کۆمەڵێکی ئیسلامیی ئامانجی ئەوەیە کە دادگەری (العدل) لەنێو کۆمەڵگاو جەماوەریشدا بەگشتی بچەسپێنێ، چونکە ئەوە ئامانجی کاری سەرجەم پێغەمبەرانی خوایە علیهم الصلاة والسلام، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ ... ﴿٢٥﴾﴾ الحديد، واتە: {بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانەوە ناردوونو، کتێبو تەرازووشمان لەگەڵ ناردوون، تاکو خەڵك بەدادگەریی بەڕێوەبچن ...}، دەجا بێگومان چاکترو لەپێشتر پێویستە کە ئەو دادگەرییە لەنێو ئەندامانی خۆیدا بچەسپێنێ، واتە: ئەگەر ئێمە دەمانەوێ دادگەریی لەنێو هەموو کۆمەڵگاو خەڵکدا بچەسپێنین، دیارە لەنێو ئەندامانی خۆماندا زیاتر مولزەمین کە ئەو دادگەرییە بچەسپێنین، کە ئەوە هەم ئەرکێکی شەرعیی سەرشانیانەو، هەم ڕێخۆشکەرو زەمینە سازێنەری ئەوەشە کە لەنێو کۆمەڵگاشدا بەگشتی ئەو دادگەرییە

بەڕێوەبەرن، هەڵبەتە ئەو بەرپاکردنەی دادگەرییش، خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ کە بفەرموێ: ﴿... وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ...﴿١٥﴾﴾ الشورى، واتە: (... وە فەرمانم پێ کراوە کە لەنێوتاندا دادگەربم و دادگەرییتان لەنێودا بچەسپێنم ...)، سەرجەم لایەن و بوارە ماددیی و مەعنەوییەکان دەگرێتەوەو، دیارە دادگەریی موتڵەقیش، تەنیا هەر بە خوای دادگەر ﷻ ئەنجام دەدرێ، بەلام ئێمەش دەبێ ئەوەندەی بۆمان دەلوێ، کردو کۆش بکەین و هەوڵی بۆ بدەین، وە لەبەرئەوەی کە ناتوانین دادگەریی بە رەهایی بچەسپێنین، مانای وانیە لەو ئەندازەیەش کە لە تواناماندا هەیە عەفو دەکرێین، زانایان بنچینە (قاعدة)یەکی شەرعییان داناوە، دەڵێن: (لا يَسْقُطُ الْمَيْسُورُ بِالْمَعْسُورِ)، واتە: (ئەو شتەی کە بەئاسانیی دەکرێ، لەسەرت لاناچێ، بەهۆی ئەو شتەوە کە بەزەحمەت نەبێ بۆت ناکرێ، یان بەزەحمەتیش بۆت ناکرێ).

## پێنجەم: غەمخۆریی قیادەو بەتەنگەوەبوونی بۆ چارەسەری کێشەو گرفتی ئەندامانی کۆمەڵ:

سووربوون و بەتەنگەوەبوونی قیادە بۆ چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکانی ئەندامان، یەکێکی دیکەیە لە ئەرکەکانی سەرشانی و، نابێ کەمتەرخەمیی تێدا بکات، کوردەواریی خۆشمان گوتوویانە: (بۆیە پێتدەڵێم خاڵە چۆلەکانم بۆ بگری)، بەڵێ کەسێك کە بەرپرسە، بۆیە بەرپرسە، دەبێ بەتەنگ خەڵکەوەبێ و بەدەم کێشەو گرفتەکانیانەوە بچێ، هەڵبەتە هەرکەسەو بەقەدەر خۆی و بەپێی توانای خۆی.

بەڵێ بەڕاستی بەرپرسێتیی لە ئیسلامدا بریتیە لە ماندووبوون و ڕەنجدانی زیاترو، هەڵگرتنی کۆڵی قورستر، نەك وەرگرتنی ئیمتیازی زیاتر، وەك گەلێك لە

بەرپرسان تەنها بەو بارەیاندا سەرنجی بەرپرسێتی دەدەن، بۆیەش بەپێچەوانەی ئاراستەی دەقەکانی قورئانو سوننەتو عادەتی پێشینەی چاکمان، لەجیاتی لێڕاکردنی، زۆریش هەوڵی بۆ دەدەنو کوتەی بۆ دەکەنو بۆی رادەکەن!!

## شەشەم: هەوڵدانی قیادە بۆ دابینکردنی پێداویستییە ماددییو مەعنەوییەکانی ئەندامان:

هەروەها ئەرکێکی دیکەی گرنگی قیادە لە بەرانبەر ژێردەستانیدا، ئەوەیە کە هەوڵبدا بەپێی توانا پێداویستیو بەرژەوەندییە ماددییو مەعنەوییەکانیان دابین بکاتو، هەرچی لە خێرو قازانجی دنیاو دوارۆژیاندایە، لەگەڵیاندا رەچاوی بکات، هەر لە دەرس پێگوتنو ئامۆژگارییکردنی جۆراوجۆرو ... هتدەوە، بگرە هەتا گێڕانەوەو دەستگرتنیان لە هەر شتێك کە مایەی گوناهبارییو عەیبدارییان بێو، جێبەجێ کردنی هەر پێویستییەکیان کە دینو ژینیان پەکیان لەسەری کەوتبێ، هەڵبەتە هەمموو ئەوانەش، وەك گوتمان بەپێی توانا، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ... ﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة، واتە: (خوا لە هیچ کەسێك داوا ناکات، مەگەر ئەوەی لەتواناییدا هەیە).

## حەوتەم: پابەندیی تەواوی قیادە بە بنچینەی راوێژکردن بە ئەندامانەوە:

پابەندییش بە راوێژکردن (المشورة)ەوە، بە هەردووك جۆری گشتی (شوری)و تایبەتیی (إستشارة)ەوە، یەکێکە لە بنەمایەکانی کارکردنی قیادەو، ئەو بابەتەش

زۆر هەڵدەگرێ، بەڵام لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نیە لێكۆڵینەوەی تێروتەسەلی لەبارەوە بكەین[١]، بۆیە بەم چەند ئاماژە كورتە وازی لێدێنین:

**١- ئایا راوێژ پێكردنی قیادە بە قاعیدە فەڕزە یان سوننەتە؟**

هەرچەندە لەوبارەوە كە ئایا راوێژ پێكردنی قیادە بە قاعیدە فەڕزە یان سوننەتە، واتە: هەر ئەسڵی ئەوە كە سەركردایەتی راوێژ بە قاعیدە بكات، ئایا ئەوە فەڕزە یان سوننەتە؟ تا رادەیەك مشتومڕ لەنێوان زانایاندا هەبووە، بەڵام بەڕاستی بەبۆچوونی من ئەو مشتومڕە هیچ پاساوی نیە، بۆچی؟ چونكە لە دوو ئایەتدا باسی راوێژ كراوە: (الشورى ٣٨ و آل عمران ١٥٩)، لە ئایەتی یەكەمیاندا خوا ﷻ باسی سیفەتی كۆمەڵی مسوڵمانان دەكاتو دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨ ﴾ الشورى، واتە: (وە ئەوانەی بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە چوونو، نوێژیان بەرپاكردووەو، كاروباریان لەنێو خۆیاندا بە راوێژەو، لەوەی پێمانداون دەبەخشن)، وەك دەبینین خوای پەروەردگار ﷻ كاروبار بە راوێژ بەڕێوەبردنی مسوڵمانانی، خستۆتە نێوان (نوێژ بەرپاكردنو ماڵ بەخشین)ەوە، كە زۆر لە زانایان دەڵێن: مەبەستی پێی ماڵ بەخشینی فەڕزە، واتە (زەكات)، كەواتە: چۆن نوێژو زەكات لەسەر مسوڵمانان فەڕزن، كاروبار بە راوێژ بەڕێوەبردنیشیان لەسەر فەڕزە، ئینجا كە بە رستەی ناویی (الجملة الإسمية)

---

١) ئێمە لە ئاڵقەكانی بەرنامەی (سەرنج)ی كەناڵی ئاسمانیی (پەیام)دا كە لەژێر ناوونیشانی (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوكمڕانیی)دا پێشكەش دەكرێن، لێكۆڵینەوەیەكی خەستو خۆڵمان لەبارەی (شورى)وە كردووەو تیشكی باشمان خستۆتەسەر، بەڵام لێرەش دەتوانین چەند وردە خاڵێك دەربارەی مەسەلەی راوێژكردن (الشورى)و راوێژپێكردن (الإستشارة) بخەینەڕوو.

هێناویێتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾، واتە كاروبار بەڕاوێژ بەڕێوەبردنی مسوڵمانان زۆر شتێكی سەقامگیرو چەسپاوەو عادەتیان وایە هەر بەم شێوەیە كاروباری خۆیان بەڕێوەدەبەن.

لە ئایەتی دووەمیشیاندا خوا ﷻ فەرمان (أمر) بە پێغەمبەر ﷺ دەكات و دەفەرموێ: ﴿... وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ... ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران، واتە: (... وە لە كاروباردا[1] راوێژیان پێ بكە ...)، ئینجا وەك زانایانی (أصول الفقه)یش گوتوویانە: مەگەر نیشانە (قرينة)یەك هەبێ كە نەهێڵێ، ئەگەرنا شێوەی فەرمان (صيغة الأمر) لە زمانی (عەرەبی)دا هەر بۆ فەرزبوون (وجوب)ە.

كەواتە بە سەرنجدانی هەردووك رستەی قورئانی، زۆر روون و ئاشكرا بۆمان دەردەكەوێ، كە لەڕاستیدا راوێژكردنی بەرپرسان بەوانەی كە لەژێردەستیاندان، فەرزە.

هەروەها بە سەرنجدانی سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار جێنشینە سەرراستە هیدایەتدراوەكانی (ئەبو بەكرو عومەرو عوسمان و عەلی) – خوا لێیان رازی بێ-، بۆمان دەردەكەوێ كە هیچ كارێكی گرنگیان بەبێ راوێژو مەشوەرەت كردن بە مسوڵمانان نەكردوە، هەڵبەتە هی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر (وحي) بۆ هاتبێ ئەوە دیارە كە: (لا إِجْتِهَادَ فِي مَعْرِضِ النَّصِّ) یان (فِي مُقَابِلِ النَّصِّ)، واتە: (كۆشش كردن لە بەرانبەر دەقی شەرعییدا دروست نیە)، (شوری)ش جۆرێكە لە (إجتهاد)، كۆشش (إجتهاد) كردن و راوێژكردنیش لە بەرانبەر دەقی شەرعیی و (وحي)دا دروست نیەو ناگونجێ

---

١) وشەی (الأمر) كاروباری جەنگ و ئاشتی و سیاسی و كۆمەڵایەتی و... هتد، هەمووی دەگرێتەوە

خوای بەرز بفەرمویٚ: وابكەن! بڵـێـیٚ: ڕاوەسـتە با ڕاوێـژ بكـەین، داخـوٚ بزانین بیكەین یـان نەیكـەین، شـتی وا نیـە! خـوا ﷻ كـە فـەرمانی كـرد، دەبـیٚ جێبـەجیٚ بكریٚ، بوٚ نموونە: لە ئاشتەوایی حودەیبیەدا خوا ﷻ فەرمانی كردبوو، كە هەندێك ئەوە بـە بەڵگــە دێننـەوە، بـەڵام نـا، خـوا ﷻ فـەرمانی كردبـوو بـە پێغەمبـەر ﷺ كە دەبیٚ ئەو ئاشتەواییە بكـریٚ، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ ڕاوێـژی بـە كەس نەكردو گوێشی نەدا بە موعارەزەیان، ئینجا چوٚن دەزانین ئەو ئاشـتەوایی‌یـە فەرمانی پیٚ كرابوو؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنِّي رَسُـولُ اللهِ وَلَسْتُ أَعْصِـيهِ وَهُـوَ نَاصِـرِي)(1) رواه البخاري: (٢٧٣١ – ٢٧٣٢)، واته: (مـن پێغەمبـەری

---

١) تەواوی گێڕانەوەكە بەم شێوەیە: {عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ يُصَدِّقُ حَدِيثُ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ قَالاَ: (خَرَجَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي بِضْعَ عَشْرَةَ مِائَـةً مِـنْ أَصْـحَابِهِ حَتَّـى إِذَا كَانُوا بِذِي الْحُلَيْفَةِ قَلَّدَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ الْهَدْيَ وَأَشْعَرَهُ وَأَحْرَمَ بِالْعُمْرَةِ وَبَعَثَ بَـيْنَ يَدَيْـهِ عَيْنًـا لَـهُ مِـنْ خُزَاعَةَ يُخْبِرُهُ عَنْ قُرَيْشٍ وَسَارَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَ بِوَادِي الأَشْطَاطِ قَرِيبٍ مِـنْ عُـسْفَانَ أَتَـاهُ عَيْنُهُ الْخُزَاعِيُّ فَقَالَ: إِنِّي تَرَكْتُ كَعْبَ بْنَ لُؤَيٍّ وَعَامِرَ بْنَ لُؤَيٍّ قَدْ جَمَعُوا لَكَ الأَحَابِشَ قَالَ أَحْمَـدُ بْـنُ حَنْبَلٍ وَقَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ: قَدْ جَمَعُوا لَـكَ الأَحَـابِيشَ وَجَمَعُـوا لَـكَ جُمُوعًـا وَإِنَّهُـمْ مُقَاتِلُوكَ وَصَادُّوكَ عَنِ الْبَيْتِ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَشِيرُوا عَلَيَّ أَتَرَوْنَ أَنْ نَمِيلَ إِلَـى ذَرَارِيِّ هَـؤُلاَءِ الَّـذِينَ أَعَانُوهُمْ فَنُصِيبَهُمْ فَإِنْ قَعَدُوا قَعَدُوا مَوْتُورِينَ مَحْزُونِينَ وَإِنْ نَجَوْا تَكُنْ عُنُقًا قَطَعَهَا اللّهُ أَوْ تَرَوْنَ أَنْ نَـؤُمَّ الْبَيْتَ فَمَنْ صَدَّنَا عَنْهُ قَاتَلْنَاهُ». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﵁ اللّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ يَا نَبِيَّ اللّهِ إِنَّمَا جِئْنَا مُعْتَمِرِينَ وَلَـمْ نَجِئْ نُقَاتِلُ أَحَدًا وَلَكِنْ مَنْ حَالَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْبَيْتِ قَاتَلْنَاهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَرُوحُوا إِذًا». قَالَ الزُّهْرِيُّ وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا قَطٍّ كَانَ أَكْثَرَ مَشُورَةً لأَصْحَابِهِ مِنْ رَسُولِ اللّهِ ﷺ. قَالَ الزُّهْرِيُّ فِي حَدِيثِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ : فَرَاحُوا حَتَّى إِذَا كَـانَ بِـبَعْضِ الطَّرِيـقِ قَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ:« إِنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ بِالْغَمِيمِ فِي خَيْلٍ لِقُرَيْشٍ طَلِيعَةً فَخُذُوا ذَاتَ الْيَمِينِ». فَوَاللّهِ مَا شَعَرَ بِهِمْ خَالِدُ حَتَّى إِذَا هُوَ بِغَبْرَةِ الْجَيْشِ فَانْطَلَقَ يَرْكُضُ نَذِيرًا لِقُرَيْشٍ وَسَارَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالثَّنِيَّةِ الَّتِي يُهْبَطُ عَلَيْهِمْ مِنْهَا بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ فَقَالَ النَّاسُ حَلْ حَلْ فَأَلَحَّتْ فَقَالُوا خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ وَمَا ذَاكَ لَهَا بِخُلُقٍ وَلَكِنْ حَبَسَهَا حَابِسُ الْفِيلِ». ثُمَّ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَسْأَلُونِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُمَاتِ اللّهِ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا». ثُمَّ زَجَرَهَا فَوَثَبَـتْ بِـهِ قَـالَ فَعَدَلَ عَنْهَا حَتَّى نَزَلَ بِأَقْصَى الْحُدَيْبِيَةِ عَلَى ثَمَدٍ قَلِيلِ الْمَاءِ إِنَّمَا يَتَبَرَّضُهُ النَّاسُ تَبَرُّضًا فَلَمْ يُلَبِّثْهُ النَّاسُ أَنْ نَزَحُوهُ فَشُكِيَ إِلَى رَسُولِ اللّهِ ﷺ الْعَطَشُ فَانْتَزَعَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ ثُـمَّ أَمَـرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُـوهُ فِيـهِ قَـالَ:

فَوَاللّهِ مَا زَالَ يَجِيشُ لَهُمْ بِالرِّيِّ حَتَّى صَدَرُوا عَنْهُ قَالَ: فَبَيْنَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ جَاءَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ الْخُزَاعِيُّ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ وَكَانُوا عَيْبَةَ نُصْحِ رَسُولِ اللّهِ ﷺ مِنْ أَهْلِ تِهَامَةَ فَقَالَ: إِنِّي تَرَكْتُ كَعْبَ بْنَ لُؤَيّ وَعَامِرَ بْنَ لُؤَيّ قَالَ أَحْمَدُ حَدَّثَنَاهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ وَقَالَ: إِنِّي تَرَكْتُ كَعْبَ بْنَ لُؤَيّ وَعَامِرَ بْنَ لُؤَيّ نَزَلُوا أَعْدَادَ مِيَاهِ الْحُدَيْبِيَةِ مَعَهُمُ الْعُوذُ الْمَطَافِيلُ وَهُمْ مُقَاتِلُوكَ وَصَادُّوكَ عَنِ الْبَيْتِ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّا لَمْ نَجِئْ لِقِتَالِ أَحَدٍ وَلَكِنَّا جِئْنَا مُعْتَمِرِينَ وَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ نَهِكَتْهُمُ الْحَرْبُ وَأَضَرَّتْ بِهِمْ فَإِنْ شَاءُوا مَادَدْتُهُمْ مُدَّةً وَيُخَلُّوا بَيْنِي وَبَيْنَ النَّاسِ فَإِنْ أَظْهَرْ فَإِنْ شَاءُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِيمَا دَخَلَ فِيهِ النَّاسُ فَعَلُوا وَإِلاّ فَقَدْ جَمُّوا وَإِنْ أَبَوْا فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى أَمْرِي هَذَا حَتَّى تَنْفَرِدَ سَالِفَتِي أَوْ لَيُنَفِّذَنَّ اللّهُ أَمْرَهُ». قَالَ بُدَيْلٌ: سَأُبَلِّغُهُمْ مَا تَقُولُ فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى قُرَيْشًا فَقَالَ: إِنَّا قَدْ جِئْنَاكُمْ مِنْ عِنْدِ هَذَا الرَّجُلِ وَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ قَوْلاً فَإِنْ شِئْتُمْ نَعْرِضُهُ عَلَيْكُمْ فَقَالَ سُفَهَاؤُهُمْ: لاَ حَاجَةَ لَنَا فِي أَنْ تُحَدِّثَنَا عَنْهُ بِشَيْءٍ. وَقَالَ ذَوُو الرَّأْيِ مِنْهُمْ: هَاتِ مَا سَمِعْتَهُ يَقُولُ قَالَ سَمِعْتُهُ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا فَحَدَّثَهُمْ بِمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَامَ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيُّ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ أَلَسْتُمْ بِالْوَالِدِ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: أَوَلَسْتُ بِالْوَلَدِ؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: فَهَلْ تَتَّهِمُونِي؟ قَالُوا: لاَ قَالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي اسْتَنْفَرْتُ أَهْلَ عُكَاظٍ فَلَمَّا جَمَحُوا عَلَيَّ جِئْتُكُمْ بِأَهْلِي وَوَلَدِي وَمَنْ أَطَاعَنِي. قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّ هَذَا قَدْ عَرَضَ عَلَيْكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ فَاقْبَلُوهَا وَدَعُونِي آتِهِ، فَقَالُوا: ائْتِهِ فَأَتَاهُ فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ لَهُ نَحْوًا مِنْ قَوْلِهِ لِبُدَيْلٍ فَقَالَ عُرْوَةُ عِنْدَ ذَلِكَ : أَيْ مُحَمَّدُ أَرَأَيْتَ إِن اسْتَأْصَلْتَ قَوْمَكَ هَلْ سَمِعْتَ بِأَحَدٍ مِنَ الْعَرَبِ اجْتَاحَ أَصْلَهُ قَبْلَكَ وَإِنْ تَكُنِ الأُخْرَى فَوَاللّهِ إِنِّي لأَرَى وُجُوهًا وَأَرَى أَوْشَابًا مِنَ النَّاسِ خُلَقَاءَ أَنْ يَفِرُّوا وَيَدَعُوكَ فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: امْصَصْ بَظْرَ اللاّتِ أَنَحْنُ نَفِرُّ عَنْهُ وَنَدَعُهُ فَقَالَ: مَنْ ذَا؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ قَالَ : أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ يَدٌ كَانَتْ لَكَ عِنْدِي لَمْ أَجْزِكَ بِهَا لأَجَبْتُكَ وَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ ﷺ فَلَمَّا كَلَّمَهُ أَخَذَ بِلِحْيَتِهِ وَالْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ ﷺ وَمَعَهُ السَّيْفُ وَعَلَيْهِ الْمِغْفَرُ فَكُلَّمَا أَهْوَى عُرْوَةُ بِيَدِهِ إِلَى لِحْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ ضَرَبَ يَدَهُ بِنَعْلِ السَّيْفِ وَقَالَ : أَخِّرْ يَدَكَ عَنْ لِحْيَةِ رَسُولِ اللّهِ ﷺ فَرَفَعَ عُرْوَةُ يَدَهُ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا : الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَالَ : أَيْ غُدَرُ أَوَلَسْتُ أَسْعَى فِي غَدْرَتِكَ وَكَانَ الْمُغِيرَةُ صَحِبَ قَوْمًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَقَتَلَهُمْ وَأَخَذَ أَمْوَالَهُمْ ثُمَّ جَاءَ وَأَسْلَمَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ:« أَمَّا الإِسْلاَمُ فَأَقْبَلُ وَأَمَّا الْمَالُ فَلَسْتُ مِنْهُ فِي شَيْءٍ ». ثُمَّ إِنَّ عُرْوَةَ جَعَلَ يَرْمُقُ النَّبِيَّ ﷺ بِعَيْنِهِ قَالَ : فَوَاللّهِ مَا تَنَخَّمَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ نُخَامَةً إِلاّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بِهَا جِلْدَهُ وَوَجْهَهُ وَإِذَا أَمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ وَإِذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ وَإِذَا تَكَلَّمُوا خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ وَمَا يُحِدُّونَ النَّظَرَ إِلَيْهِ تَعْظِيمًا لَهُ فَرَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ : أَيْ قَوْمِ وَاللّهِ لَقَدْ وَفَدْتُ عَلَى الْمُلُوكِ وَوَفَدْتُ عَلَى قَيْصَرَ وَكِسْرَى وَالنَّجَاشِيِّ وَاللّهِ إِنْ رَأَيْتُ مَلِكًا قَطُّ يُعَظِّمُهُ أَصْحَابُهُ مَا يُعَظِّمُ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ مُحَمَّدًا وَاللّهِ إِنْ تَنَخَّمَ نُخَامَةً إِلاّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ وَإِذَا أَمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ وَإِذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ وَإِذَا تَكَلَّمُوا خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيمًا لَهُ وَإِنَّهُ قَدْ عَرَضَ عَلَيْكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ فَاقْبَلُوهَا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي كِنَانَةَ : دَعُونِي آتِهِ قَالُوا : ائْتِهِ فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَصْحَابِهِ قَالَ

النَّبِيُّ ﷺ: «هَذَا فُلاَنٌ وَهُوَ مِنْ قَوْمٍ يُعَظِّمُونَ الْبُدْنَ فَابْعَثُوهَا لَهُ ». فَبُعِثَتْ لَهُ وَاسْتَقْبَلَهُ الْقَوْمُ يُلَبُّونَ فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَالَ : سُبْحَانَ اللَّهِ مَا يَنْبَغِي لِهَؤُلاَءِ أَنْ يُصَدُّوا عَنِ الْبَيْتِ فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ قَالَ : رَأَيْتُ الْبُدْنَ قَدْ قُلِّدَتْ وَأُشْعِرَتْ فَلَمْ أَرَ أَنْ يُصَدُّوا عَنِ الْبَيْتِ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ مِكْرَزُ بْنُ حَفْصٍ فَقَالَ: دَعُونِي آتِهِ فَقَالُوا : ائْتِهِ فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَذَا مِكْرَزٌ وَهْوَ رَجُلٌ فَاجِرٌ». فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ ﷺ فَبَيْنَا هُوَ يُكَلِّمُهُ ﷺ إِذْ جَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ مَعْمَرٌ فَأَخْبَرَنِي أَيُّوبُ عَنْ عِكْرِمَةَ أَنَّهُ لَمَّا جَاءَ سُهَيْلٌ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَدْ سُهِّلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ ». قَالَ الزُّهْرِيُّ فِي حَدِيثِهِ فَجَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فَقَالَ : هَاتِ أَكْتُبْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابًا فَدَعَا الْكَاتِبَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اكْتُبْ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ». فَقَالَ سُهَيْلٌ : أَمَّا الرَّحْمَنُ فَوَاللَّهِ مَا أَدْرِى مَا هُوَ وَلَكِنِ اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ كَمَا كُنْتَ تَكْتُبُ فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ : لاَ نَكْتُبُهَا إِلاَّ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ ». ثُمَّ قَالَ:« هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ». فَقَالَ سُهَيْلٌ : وَاللَّهِ لَوْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُهُ اصَدَدْنَاكَ عَنِ الْبَيْتِ وَلاَ قَاتَلْنَاكَ وَلَكِنِ اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَاللَّهِ إِنِّي لَرَسُولُ اللَّهِ وَإِنْ كَذَّبْتُمُونِي اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ». قَالَ الزُّهْرِيُّ وَذَلِكَ لِقَوْلِهِ :«لاَ يَسْأَلُونِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُمَاتِ اللَّهِ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا». فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى أَنْ تُخَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَنَطُوفُ بِهِ». فَقَالَ سُهَيْلٌ : وَاللَّهِ لاَ تَتَحَدَّثُ الْعَرَبُ أَنَّا أُخِذْنَا ضَغْطَةً وَلَكِنْ لَكَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ فَكَتَبَ فَقَالَ سُهَيْلٌ : عَلَى أَنْ لاَ يَأْتِيَكَ مِنَّا رَجُلٌ وَإِنْ كَانَ عَلَى دِينِكَ إِلاَّ رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: سُبْحَانَ اللَّهِ كَيْفَ يُرَدُّ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَقَدْ جَاءَ مُسْلِمًا؟ فَبَيْنَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ جَاءَ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو يَرْسُفُ وَقَالَ يَحْيَى عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ يَرْصُفُ فِي قُيُودِهِ وَقَدْ خَرَجَ مِنْ أَسْفَلِ مَكَّةَ حَتَّى رَمَى بِنَفْسِهِ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ سُهَيْلٌ : هَذَا يَا مُحَمَّدُ أَوَّلُ مَا أُقَاضِيكَ عَلَيْهِ أَنْ تَرُدَّهُ إِلَيَّ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّا لَمْ نَقْضِ الْكِتَابَ بَعْدُ». قَالَ: فَوَاللَّهِ إِذًا لاَ نُصَالِحَكَ عَلَى شَيْءٍ أَبَدًا فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَأَجِرْهُ لِي». قَالَ : مَا أَنَا بِمُجِيرِهِ قَالَ: «بَلَى فَافْعَلْ».

قَالَ : مَا أَنَّا بِفَاعِلٍ. قَالَ مِكْرَزٌ : بَلَى قَدْ أَجَرْنَاهُ لَكَ. فَقَالَ أَبُو جَنْدَلٍ : أَىْ مَعَاشِرَ الْمُسْلِمِينَ أُرَدُّ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَقَدْ جِئْتُ مُسْلِمًا أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ أُتِيتُ وَكَانَ قَدْ عُذِّبَ عَذَابًا شَدِيدًا فِي اللَّهِ ﷻ فَقَالَ عُمَرُ ﵁: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ أَلَسْتَ نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: «بَلَى». قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: «بَلَى». قُلْتُ : فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذًا؟ قَالَ :«إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ وَلَسْتُ أَعْصِيهِ وَهُوَ نَاصِرِي». قُلْتُ : أَوَلَيْس كُنْتَ تُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي الْبَيْتَ فَنَطُوفُ بِهِ قَالَ :« بَلَى فَأَخْبَرْتُكَ أَنَّكَ تَأْتِيهِ الْعَامَ». قُلْتُ: لاَ قَالَ :« فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَوِّفٌ بِهِ ». قَالَ : فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ ﵁ فَقُلْتُ : يَا أَبَا بَكْرٍ أَلَيْسَ هَذَا نَبِيُّ اللَّهِ حَقًّا؟ قَالَ : بَلَى قُلْتُ : أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ : بَلَى قُلْتُ : فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذًا؟ قَالَ : أَيُّهَا الرَّجُلُ إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ وَلَنْ يَعْصِيَ رَبَّهُ وَهُوَ نَاصِرُهُ فَاسْتَمْسِكْ بِغَرْزِهِ حَتَّى تَمُوتَ فَوَاللَّهِ إِنَّهُ لَعَلَى الْحَقِّ قُلْتُ : أَوَلَيْسَ كَانَ يُحَدِّثُنَا أَنَّهُ سَيَأْتِي الْبَيْتَ وَيَطُوفُ بِهِ؟ قَالَ : بَلَى أَفَأَخْبَرَكَ أَنَّكَ تَأْتِيهِ الْعَامَ قُلْتُ : لاَ قَالَ : فَإِنَّكَ آتِيهِ فَتَطُوفُ بِهِ قَالَ الزُّهْرِيُّ قَالَ عُمَرُ : فَعَمِلْتُ لِذَلِكَ أَعْمَالاً قَالَ : فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قَضِيَّةِ الْكِتَابِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأَصْحَابِهِ :« قُومُوا فَانْحَرُوا ثُمَّ احْلِقُوا».

خوام و، سەرپێچیی فەرمانی ناكەم، خواش سەرم دەخات)، واتە: خوا ﷻ فەرمانی پێ كردوە كە ئاشتەوایی‌یەكە بكات، بەهەرحاڵ ئەوە باس‌و خواسی زۆری دەوێ، گرنگ ئەوەیە كە راوێژكردنی بەرپرسان بەوانەی كە لەبەردەستیانن، قورئان‌و سوننەت دەلالەت لەسەر ئەوە دەكەن كە فەرزەو، فەرزێكی گەورەشە.

---

قَالَ : فَوَاللَّهِ مَا قَامَ مِنْهُمْ رَجُلٌ حَتَّى قَالَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَلَمَّا لَمْ يَقُمْ مِنْهُمْ أَحَدٌ قَامَ فَدَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَذَكَرَ لَهَا مَا لَقِيَ مِنَ النَّاسِ فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتُحِبُّ ذَلِكَ اخْرُجْ ثُمَّ لاَ تُكَلِّمْ أَحَدًا مِنْهُمْ كَلِمَةً حَتَّى تَنْحَرَ بُدْنَكَ وَتَدْعُوَ حَالِقَكَ فَيَحْلِقَكَ فَقَامَ فَخَرَجَ فَلَمْ يُكَلِّمْ أَحَدًا مِنْهُمْ حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ وَنَحَرَ هَدْيَهُ وَدَعَا حَالِقَهُ يَعْنِى فَحَلَقَهُ فَلَمَّا رَأَوْا ذَلِكَ قَامُوا فَنَحَرُوا وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَحْلِقُ بَعْضًا حَتَّى كَادَ بَعْضُهُمْ يَقْتُلُ بَعْضًا غَمًّا ثُمَّ جَاءَهُ نِسْوَةٌ مُؤْمِنَاتٌ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ) حَتَّى بَلَغَ (بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ) قَالَ : فَطَلَّقَ عُمَرُ يَوْمَئِذٍ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا لَهُ فِى الشِّرْكِ فَتَزَوَّجَ إِحْدَاهُمَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِى سُفْيَانَ وَالأُخْرَى صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْمَدِينَةِ فَجَاءَهُ أَبُو بَصِيرٍ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ وَهُوَ مُسْلِمٌ وَقَالَ يَحْيَى عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ فَقَدِمَ عَلَيْهِ أَبُو بَصِيرِ بْنُ أَسِيدٍ الثَّقَفِىُّ مُسْلِمًا مُهَاجِرًا فَاسْتَأْجَرَ الأَخْنَسُ بْنُ شَرِيقٍ رَجُلاً كَافِرًا مِنْ بَنِى عَامِرِ بْنِ لُؤَىٍ وَمَوْلًى مَعَهُ وَكَتَبَ مَعَهُمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَسْأَلُهُ الْوَفَاءَ قَالَ : فَأَرْسَلُوا فِى طَلَبِهِ رَجُلَيْنِ فَقَالُوا : الْعَهْدَ الَّذِى جَعَلْتَ لَنَا فِيهِ فَدَفَعَهُ إِلَى الرَّجُلَيْنِ فَخَرَجَا بِهِ حَتَّى بَلَغَا بِهِ ذَا الْحُلَيْفَةِ فَنَزَلُوا يَأْكُلُوا مِنْ تَمْرٍ لَهُمْ فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ لأَحَدِ الرَّجُلَيْنِ : وَاللَّهِ إِنِّى لأَرَى سَيْفَكَ يَا فُلاَنُ هَذَا جَيِّدًا فَاسْتَلَّهُ الآخَرُ فَقَالَ : أَجَلْ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَجَيِّدٌ لَقَدْ جَرَّبْتُ بِهِ ثُمَّ جَرَّبْتُ قَالَ أَبُو بَصِيرٍ أَرِنِى أَنْظُرْ إِلَيْهِ فَأَمْكَنَهُ مِنْهُ فَضَرَبَهُ بِهِ حَتَّى بَرَدَ وَفَرَّ الآخَرُ حَتَّى أَتَى الْمَدِينَةَ فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ يَعْدُو فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ رَأَى هَذَا ذُعْرًا». فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قُتِلَ وَاللَّهِ صَاحِبِى وَإِنِّى لَمَقْتُولٌ فَجَاءَ أَبُو بَصِيرٍ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ قَدْ وَاللَّهِ أَوْفَى اللَّهُ ذِمَّتَكَ قَدْ رَدَدْتَنِى إِلَيْهِمْ ثُمَّ أَنْجَانِى اللَّهُ مِنْهُمْ فَقَالَ النَّبِىُّ ﷺ: «وَيْلُ أُمِّهِ مِسْعَرَ حَرْبٍ لَوْ كَانَ لَهُ أَحَدٌ». فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ عَرَفَ أَنَّهُ سَيَرُدُّهُ إِلَيْهِمْ فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى سِيفَ الْبَحْرِ قَالَ: وَيَنْفَلِتُ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلٍ فَلَحِقَ بِأَبِى بَصِيرٍ فَجَعَلَ لاَ يَخْرُجُ مِنْ قُرَيْشٍ رَجُلٌ قَدْ أَسْلَمَ إِلاَّ لَحِقَ بِأَبِى بَصِيرٍ حَتَّى اجْتَمَعَتْ مِنْهُمْ عِصَابَةٌ قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا يَسْمَعُونَ بِعِيرٍ خَرَجَتْ لِقُرَيْشٍ إِلَى الشَّامِ إِلاَّ اعْتَرَضُوا لَهَا فَقَتَلُوهُمْ وَأَخَذُوا أَمْوَالَهُمْ فَأَرْسَلَتْ قُرَيْشٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ تُنَاشِدُهُ اللَّهَ وَالرَّحِمَ لَمَّا أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ فَمَنْ أَتَاهُ فَهُوَ آمِنٌ فَأَرْسَلَ النَّبِىُّ ﷺ إِلَيْهِمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ (وَهُوَ الَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ) حَتَّى بَلَغَ (حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ) وَكَانَتْ حَمِيَّتُهُمْ أَنَّهُمْ لَمْ يُقِرُّوا أَنَّهُ نَبِىُّ اللَّهِ وَلَمْ يُقِرُّوا بِبِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ وَحَالُوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْبَيْتِ} رواه البخاري: (٢٧٣١، ٢٧٣٢).

لەوەی رابـرد وەك مـانگی چـوارده بۆمـان ئاشـكرا دەبـێ، كـە رای زۆربـەی هــەرەزۆری زانایــان راســتە كــە گوتوویانــە: راوێــژكردن لەســەر حــوكمڕانو كاربەدەستانی مسوڵمانان فەرزەو، سوننەت نیە!

**٢- ئـەنجامی راوێــژكردن (نتیجـة المـشورة) بـۆ بابـای بـەرپرس (أمیــر) پابەندكەر (مُلْـزِمَة)یە یـان هەر ئاگاداركەرەوە (مُعْلِـمَة)یە؟**

لەوبارەوە كە ئایا ئەنجامی راوێـژكردن (نتیجـة الـمـشورة) بـۆ بابـای بـەرپرس (أمیـر) پابەندكەر (مُلْـزِم)ە، یان هەر ئاگاداركـەرەوە (مُعْــلِم)ە؟! كاتێـك راوێـژ لەسەر شتێك دەكریو دوایی زۆرینە بڕیـاردەدەن، ئایـا ئـەو ئەنجامـە كـە زۆرینـە بڕیاریانــداوە، پابەندكــەرە بــۆ ئــەو كەســەی كــە بەرپرســە، یــاخود هــەر بــۆ ئاگاداركردنەوەیەتی؟ هەرچەندە لەوبارەوەش قسەو باس زۆرنو مشتومڕی زۆری لەسەرەو ئێستاش مشتومڕ لەوبارەوە نەبڕاوەتەوە، بەڵام بەڕاستی ئێمە پێمان وایەو من دوای رامانو لێكۆڵینەوەو ئەزموونی زۆر، گەیشتوومەتە ئـەو قەناعەتـەی كـە راوێژكردن (مشورة) دوو جۆرە: راوێژكردنی گشتیو راوێژكردنی تایبەتی، بۆیە منیش ناومناون: راوێژكردنو راوێژپێكردن (الشورى والإستشارة)[1].

مەبەستمان لە راوێژكردنی گشتی، ئەوەیە كە مسوڵمانان بەگـشتی لـە شـتێكدا راوێژبكەنو سەرجەمیان تێیدا بەشداربن، وە راوێژ پێكردنی تایبەتیش ئەوەیـە كـە بەرپرس بەتایبەت راوێژ بكـات بـە كەسـێك یـان چـەند كەسـێك، كـە پـسپۆڕو شارەزان لەو بوارەدا، یان نوێنەرو بڕیار بەدەستی خەڵكێكن.

---

١) یەكێك لە زانایانی هاوچەرخ پێموایە بۆ یەكەمجار ئـەو زاراوەیـەی بـەكارهێناوە، كـە (الـدكتور توفیق الشاوي)یە لە كتێبـی (فقه الشورى والإستشارة)دا.

شایانی باسیشە لە ڕاوێژكردنی گشتیدا ڕای زۆرینە دەیخوا، بەڵام لە ڕاوێژ پێكردنی تایبەتیدا، ڕای خەڵكی شارەزاو پسپۆڕ دەیخوا، بۆ نموونە: كە پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی كردوە لە جەنگی ئوحوددا بچین بۆ دەرەوە یان لەنێو شاردا بمێنینەوە؟ وە زۆرینە گوتوویانە با بچینە دەرەوە[1]، چوونەتە دەرەوە، وە لە جەنگی (بەدر)دا كە ڕاوێژی كردوە: بچین بەرەو دوژمن یاخود نەچین؟ وە لەپێشدا تەنیا هەر كۆچكەران قسەیانكرد، بۆیە هەر فەرمووی: (أَشِيرُوا عَلَيَّ أَيُّهَا النَّاسُ)[2]، واتە: (ڕای خۆتانم پێبڵێن ئەی خەڵكینە)! بەڵام دوایی كە سەعدی كوڕی موعاز قسەی كردو گوتی: وەك بڵێی مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەوجار گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە لەخزمەتداین، فەرموو، بۆچی وا دەڵێ؟ چونكە ئەوان زۆرینەی خەڵكەكەیان پێكدەهێناو ئەو (٣١٤) كەسە كە لەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺدا بوون، زۆرینەیان پشتیوانان (الأنصار) بوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ بزانێ داخۆ زۆرینە دەڵێن چی؟ وە دوای ئەوەی زۆرینە گوتیان با بچین، ئەوجار چوو، ئەوە لە شتێكدا كە بەگشتی ڕاوێژی تێدا دەكرێ.

وە لە شتێكدا كە بەتایبەتی ڕاوێژی تێدا دەكرێ، بۆ نموونە: دوای ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ دەچێت بۆ جەنگی بەدر، لە شوێنێك بارگەو بنە دەخەن، (الحَبَّابُ بْنُ الْمُنْذِرِ) كە یەكێكە لە هاوەڵان دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! كە لێرە مەنزڵمان گرتوە، ئەوە وەحی خوایە ﷻ، یان هەر ڕاو بۆچوونی خۆتەو تاكتیكی جەنگییە؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: نەخێر وەحی خوا ﷻ نیەو هەر

---

١) (فَلَمْ يَزَلْ النّاسُ بِرَسُولِ اللّهِ ﷺ الّذِينَ كَانَ مِنْ أَمْرِهِمْ حُبّ لِقَاءِ الْقَوْمِ) السيرة النبوية لابن هشام، ج: (٣)، ص: (١٥).

٢) السيرة النبوية لابن هشام ج: (٢)، ص: (٣٣٢ – ٣٣٣).

راو بۆچوونی خۆمەو تاکتیکی جەنگی یە، دەڵێ: کەواتە ئێرە باش نیە، با بگوازینەوە بۆ سەرێ و بۆی ڕووندەکاتەوە بۆچی؟! ئەویش بیروڕایەکەی پەسند دەکات و دەفەرموێ: (لَقَدْ أَشَرْتَ بِالرَّأْيِ)، وە دەگوازنەوە بۆ ئەوێ[1]، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: ئەرێ خەڵکینە! ئێوە راتان چییە؟ بۆچی؟ چونکە (الحَبَابُ بْنُ الْمُنْذِرِ) پیاوێکی پسپۆڕو شارەزایە لە کاروباری جەنگیداو، ئەو کارەش پێویستی بە ئەهلی خۆی هەیە، هەروەها جاری وا هەبووە تەنیا مەشوەرەتی بە ئەبو بەکرو عومەر - خوا لێیان رازی بێ- کردوە[2]، وە جاری وا هەبووە راوێژی کردوە بە کەنیزەکێك[3]، وە جارێکیان بەس راوێژی بە عەلی و ئوسامەی کوڕی زەید

---

١) هەمان سەرچاوە، ج: (٢)، ص: (٣٣٤).

٢) (قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَلَمَّا أَسَرُوا الأُسَارَى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: مَا تَرَوْنَ فِي هَؤُلاَءِ الأُسَارَى؟...) رواه مسلم: ١٧٦٣.

٣) (... أن عائشة رضي الله عنها زوج النبي ﷺ قالت كان رسول الله ﷺ إذا أراد أن يخرج أقرع بين أزواجه فأيتهن خرج سهمها خرج بها رسول الله ﷺ معه قالت عائشة فأقرع بيننا في غزوة غزاها فخرج سهمي فخرجت مع رسول الله ﷺ بعد ما نزل الحجاب فأنا أحمل في هودجي وأنزل فيه فسرنا حتى إذا فرغ رسول الله ﷺ من غزوته تلك وقفل ودنونا من المدينة قافلين آذن ليلة بالرحيل فقمت حين آذنوا بالرحيل فمشيت حتى جاوزت الجيش فلما قضيت شأني أقبلت إلى رحيلي فإذا عقد لي من جزع ظفار قد انقطع فالتمست عقدي وحبسني ابتغاؤه وأقبل الرهط الذين كانوا يرحلون لي فاحتملوا هودجي فرحلوه على بعيري الذي كنت ركبت وهم يحسبون أني فيه وكان النساء إذ ذاك خفافا لم يثقلهن اللحم إنما تأكل العلقة من الطعام فلم يستنكر القوم خفة الهودج حين رفعوه وكنت جارية حديثة السن فبعثوا الجمل وساروا فوجدت عقدي بعد ما استمر الجيش فجئت منازلهم وليس بها داع ولا مجيب فأممت منزلي الذي كنت به وظننت أنهم سيفقدونني فيرجعون إلي فبينا أنا جالسة في منزلي غلبتني عيني فنمت وكان صفوان بن المعطل السلمي ثم الذكواني من وراء الجيش فأدلج فأصبح عند منزلي فرأى سواد إنسان نائم فأتاني فعرفني حين رآني وكان يراني قبل الحجاب فاستيقظت باسترجاعه حين عرفني فخمرت وجهي بجلبابي والله ما كلمني كلمة ولا سمعت منه كلمة غير استرجاعه حين أناخ راحلته فوطئ على يديها فركبتها فانطلق يقود بي الراحلة حتى أتينا الجيش بعد ما نزلوا موغرين في

كـــــرد[1] ـ خوا لێیان رازی بێ ـ.

بەڵێ له مەسەلەی راوێـژ پێكردنـدا، لـەجیاتی رای زۆرینـه بـیروڕای پـسپۆڕو شارەزایان دەخواو دەور دەبینێ، دیارە هەر ئەوەش شتێكی مەنتیقییە، ئێستا ئەگەر ئێمە دەربارەی نەخۆشییەك قسەبكەین، ئایا دەبێ بڵێین: ئەرێ خـەڵكی هـەولێرێ راتان چییە؟ یان دوو پزیشكی مەعقووڵ دێنین و دەڵێین: ئەرێ پزیشكەكان! راتـان

نحر الظهيرة فهلك من هلك وكان الذي تولى الإفك عبد الله ابـن أبـي ابـن سـلول فقـدمنا المدينـة فاشتكيت حين قدمت شهرا والناس يفيضون في قول أصحاب الإفك لاأشعر بشيء من ذلك وهـو يريبنـي في وجعي أني لا أعرف من رسول الله ﷺ اللطف الذي كنت أرى منه حين أشتكي إنما يدخل علي رسول الله ﷺ فيسلم ثم يقول (كيف تيكم) ثـم ينـصرف فـذاك الـذي يـريبني ولا أشـعر حتـى خرجت بعد ما نقهت فخرجت معي أم مسطح قبل المناصع وهو متبرزنا وكنا لانخـرج إلا لـيلا إلى لـيل وذلك قبل أن نتخذ الكنف قريبا من بيوتنا وأمرنا أمر العرب الأول في التبرز قبل الغـائط فكنـا نتـأذى بالكنف أن نتخذها عند بيوتنا فانطلقت أنا وأم مسطح وهي ابنـة أبي رهم بن عبد منـاف وأمهـا بنـت صخر بن عامر خالة أبي بكر الصديق وابنها مسطح ابن أثاثة فأقبلت أنا وأم مسطح قبل بيتي قد فرغنـا من شأننا فعثرت أم مسطح في مرطها فقالت تعس مسطح فقلت لها بئس ما قلـت أتـسبين رجـلا شـهد بدرا قالت أي هنتاه أو لم تسمعي ما قال؟ قالت قلت وما قال؟ فـأخبرتني بقـول أهـل الإفـك فـازددت مرضا على مرضي فلما رجعت إلـى بيتـي ودخل علي رسول الله ﷺ – تعنـي – سلم ثم قال (كيـف تيكم) فقلت أتأذن لي أن آتي أبوي؟ قالت وأنا حينئذ أريد أن أستيقن الخبر من قبلهما قالت فـأذن لـي رسول الله ﷺ فجئـت أبوي فقلت لأمي يا أمتـاه ما يتحدث النـاس؟ قالت يابنيـة هوني عليك فـوالله لقلما كانت امرأة قط وضيئة عند رجل يحبها ولها ضرائر إلا كثرنا عليها. قالت سبحان الله ولقد تحدث الناس بهذا ؟ قالت فبكيت تلك الليلة حتى أصبحت لا يرقـأ لي دمع ولا أكتحل بنوم حتـى أصـبحت أبكي فدعا رسول الله ﷺ علي بن أبي طالب وأسامة بن زيد رضي الله عنهمـا حـين اسـتلبث الـوحي يسـتأمرهما في فراق أهله قالت فأما أسامة بن زيد فأشار على رسول الله ﷺ بالـذي يعلـم مـن بـراءة أهله وبالذي يعلم لهم في نفسه من الود فقال يا رسول الله أهلك وما نعلم إلا خيرا، وأما علي بـن أبـي طالب فقال يا رسول الله لم يضيق الله عليك والنساء سواها كثير وإن تـسأل الجـارية تـصدقك قالـت فدعا رسول الله ﷺ بريرة فقال (أي بريـرة هل رأيت من شيء يريبك)، قالت بريـرة لا والذي بعثـك بالحق إني رأيت عليها أمرا أغمصه عليها أكثر من أنها جارية حديثة السن تنام عن عجين أهلـها فتـأتي الداجن فتأكله) صحيح البخاري: (٤٧٥٠).

١) صحيح البخاري: (٤٧٥٠).

چییه؟ دیاره قسەی پزیشكێك دەیخوا نەك هی هەزار كەس، یان ئەگەر بڵێین: ئەرێ دەبێ (فاعل) (مرفوع) بێ، یان (منصوب) بێ، یان (مجرور)؟ نایخەینە دەنگدانەوە، چونكە قسەی هەموو خەڵكی دنیایە بەقەدەر قسەی زانایەك لە (ڕێزمانی عەرەبی)دا نایخوا.

**٣- هەم دەقەكانی قورئانو هەم سیرەی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺو چوار خەلیفە راشیدەكانیشی -خوا لێیان رازی بێ-، بۆ هەركام لە دوو رایەكان بوارو دەرفەت دەڕەخسێنن و، ڕێی مشتومڕیان هێشتۆتەوە:**

پێویستە ئەو راستییەش بگوترێ كە بەڕاستی هەم دەقەكانی قورئانو هەم سیرەی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺو چوار خەلیفە راشیدەكانیشی -خوا لێیان رازی بێ-، بۆ هەركام لە دوو رایەكان -واتە بە پابەندكەر (مُلزِمَة) زانینی (شووری)، یان بە ئاگاداركەرەوە (مُعْلِمَة) زانینی-، بوارو دەرفەت دەڕەخسێنن و، ڕێی مشتومڕیان هێشتۆتەوەو، مەسەلەكەیان بە روونیی یەكلایی نەكردۆتەوە! بەلاّم بێگومان بەڵگەكانی بە (مُلْزِمَة) زانینی بەهێزترن..

بەڵێ من وای دەبینم، كە دەقەكانی قورئانو سوننەت ئەگەر لێیان وردبینەوە، تاڕاددەیەك هەڵدەگرن، كە ئەو قەزیەیە مشتومڕێكی تێدابێت، كە ئایا ئەنجامی راوێژكردن، چ راوێژكردنی گشتیو چ راوێژكردنی تایبەتی، پابەندكەرە یان پابەندكەر نیەو هەر بۆ ئاگاداركردنەوەیە؟ هەربۆیەش راجیایی كەوتۆتێ، بەلاّم پێموایە ئەو رایە بەهێزترە كە ئەنجامی راوێژكردن پابەندكەرە بۆ بەرپرسان، هەر ئەوەش سەلامەترو بێ گرفترە.

وە من پێم وایە حیكمەتی ئـەو حاڵەتـەش ئەوەیـە كـە مـسوڵمانان لـەو بـوارەدا دەستیان كراوە بێ و، بە چ لایەكـدا پێیـان وابـوو بەرژەوەنـدییان چـاكتر دێتـەدی وابكەن، لە حاڵێكدا كە متمانەو باوەڕی تەواویان بە عەقڵ‌و زانیاریی‌و ئـەزموون‌و تەقواو ئیخلاسی بەرپرسەكەیان هەیە، با لێی بگـەڕێن ئـازادو سەرپـشك (مختـار) بێ، لە هەڵبژاردنی ئەو رایەدا كە پێی راستترو پەسندترە، بەڵام ئەگەر لەبـەر هـەر هۆیەك بێ وا نەبوو و، ئەو متمانەیان بۆ دروست نـەبووبوو، بـا لەسـەری بكەنـە مەرج كە نابێ لە مەسەلە گشتییەكاندا لە رای زۆرینە دەربچێ‌و، با بڵێن: دەیخەینـە دەنگدانەوە داخۆ كام رایە لایەنگری زیاترە!

ئەم ڕوونكردنەوەیەشم زیاتر بۆ ئەوە بـوو كـە راسـتییە شـەرعییەكان (الحقـائق الشرعية) وەك خۆیان بزانرێن و، هیچ كەسیش وانەزانێ كـە بـە (مُعْلِمَـة) زانینـی ئەنجامی راوێژی گشتی بۆ ئەمیرو بەرپرس، شتێكی شەرعیی نیە و، لە دیندا جێی نابێتەوە.

وە لە راستیدا ئەگەر بڵێین: پابەندكەر (مُلْـزِمَة) بوونی ئـەنجامی راوێـژ مـافێكی رەوای خەڵك‌و كۆمەڵگایە لەسەر بەرپرسان، مەگـەر خۆیـان دەسـتبەرداری بـن‌و تەنازولی لـێ بكەن، سەرجەم دەقەكان پێكەوە كۆدەبنـەوە، چـونكە دەڵـێین: ئـەو دەقانەی پابەندكـەریی ئـەنجامی راوێـژ دەگەیەنـن، مەبەسـت پێیـان حاڵـەتی ئاساییەو، ئەو دەقانەش كە وادەگەیـەنن ئەنجامی راوێژ تەنیا ئاگاداركەرەوە بـێ، مەبەست پێیان حاڵەتی نائاسایی‌و تەنازولكردنی خەڵكە لەو مافەیـان، لەبەر زێـدە باوەڕو متمانەیان بە بەرپرسەكەیان.

## هەشـــتەم: کـەڵکی خـراپ وەرنـەگرتنی قیـادە لـە پلەوپایەکـەی بـۆ دابینکردنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی:

بەرپرس دەبێ ئەو بەرپرسیارێتییەی وەریگرتوە، بە ئەمانەتی بزانێو دڵنیابـێ کـە ئەوە سپاردەیەکەو پێی سپێردراوە، نەك پێیوابێ غەنیمەتێکە کەوتۆتـە دەسـتیو بـۆ خۆیو بۆ ئەوەی کە کەیفی لێبێ، بەکاری بێنێ.

وە بە حەقیقەت ئەمەش خەسڵەتێکی دیکەی گـەورەو گرنگـی بابـای بـەرپرسو قیادییە لە کاری ئیسلامییدا، چونکە هەرکەسێك هەر خـۆی بـە مـسوڵمان بزانـێ، دەبێ خۆیو هەرچی هەیەتی لەپێناوی خـوا ﷻو بەرنامەکەیـدا، بـە دڵو بـە گیـان ئامادەی بەخشینی بێ، چ جـای کەسـێك کـە خـۆی بـە بـەرپرسو مـشوورخۆری ئیسلامو مسوڵمانان بزانێ!

بۆیە سوودی خراپ وەرگرتنی بابای کاربەدەست، لەو کـارو پلەوپایەیـەی کـە پێی سپێردراوە، جا چ بۆخۆی چ بۆ کوڕو کـچو خـزمو عەشـیرەتو ... هتـدی، شتێکی خراپو قەدەغەیە و، مایەی گوناهبـاریيو عەیبدارییـەو، بەسـەرهاتی ئـەو هاوەڵـەش (إِبْـنُ اللَّتْبِيَّــة) کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ نـاردبووی بـۆ کۆکردنـەوەی زەکاتو، لە پەنای ئەوەشدا دیـاریيو بەخشـشی لـە مـسوڵمانان وەرگرتبـوو کـە گەڕایەوە، زەکاتەکـەی تەسـلیمی شـوێنی خـۆی کـردو گـوتی: ئـەو زەکاتـە هـی ئێوەیـەو، ئەوەش کە بەدیاریی وەریگرتبوو، گوتی: ئەمـەش دیـاریيو بەخشـشەو دراوە بەخۆم! ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوەی زانی چووە سەر مینبەرو وتـاری داو رەخنەی توندی لەو رەفتـارە گـرتو، فـەرمووی: ئایـا ئەگـەر لـە مـاڵی بـابی دابنیشتبایە هیچ کەس خەڵاتو دیاریی بۆ دەهێنا؟!! لە پەنای ئەو کارە ئیسلامییەدایە کە دیارییان بۆ هێناوە، کەواتە نابێ بە هی خۆی بزانێ.

بەڕاستی ئەو ڕووداوە گەورەترین پەندو عیبرەتی لەوبارەوە تێدایە، كە بەرپرسان دەبێ ئاگاداری خۆیان بن‌و لە پەنای دیندا دنیا نەخۆن، لە پەنای كارە ئیسلامییەكەیاندا، بەهرەی شەخسی بۆخۆیان یان بۆ دەوروبەرەكەیان وەرنەگرن(١).

ئینجا بێگومان گوریس لە بن دنیا ڕاخستن‌و زیاد لە پێویست ئەمیەت پێدانی، لە هەموو كەس ناشیرینە، بەڵام بەتایبەت لە مشوورخۆران‌و كاربەدەستانی ئیسلامیی، ناشیرینترو دزێوترە، ئەو وتەیەش كە دەڵێ: (حُبُّ الدُّنْيَا رَأْسُ كُلُّ خَطِيئَةٍ)، واتە: (خۆشویستنی دنیا سەری هەموو گوناهێكە)، هەتا بڵێی مانادارو جوانە، هەروەها دنیا بەكەمگرتن (الزهد)یش لە هەموو كەس هەر جوان‌و دڵگیرە، بەڵام لە بەرپرسان‌و حوكمڕانان جوانترو شیرینترەو، بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ دنیا بەكەمگرتن، مایەی خۆشویسترانی ئینسانە لەلایەن خوای بێوێنە ﷻو لەلایەن خەڵكیشەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِزْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبُّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ} رواه ابن ماجه: (٤١٠٢) عن سهل بن سعد الساعدي ﷺ، وصححه الألباني، واتە: (لە دنیادا زاهید – دنیا

---

١) ئەمەش دەقی بەسەرهاتەكەیە: {إِسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رجُلا مِنْ الْأَسْدِ يُقَالُ لَهُ إِبْنُ اللَّتْبِيَّةِ –قَالَ عَمْرو وَابْنُ أَبِي عُمَرَ: عَلَى الصَّدَقَةِ–، فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ هَذَا لَكُمْ وَهَذَا لِي أُهْدِيَ لِي قَالَ فَقَامَ رسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنى عَلَيْهِ وَقَالَ مَا بَالُ عَامِلٍ أَبْعَثُهُ فَيَقُولُ هَذَا لَكُمْ وَهَذَا أُهْدِيَ لِي أَفَلَا قَعَدَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ أَوْ فِي بَيْتِ أُمِّهِ حَتَّى يَنْظُرَ أَيُهْدَى إِلَيْهِ أَمْ لاَ؟ ...} رواه البخاري: (٦٦٣٦)، ومسلم: ١٨٣٢ واللفظ له عن أبي حُمَيْدٍ الساعدي. واتە: (پێغەمبەر ﷺ پیاوێكی لە هۆزی ئەسد دانابوو، بەرپرسێتی كۆكردنەوەی زەكاتی پێ سپاردبوو، ناوی إِبْنُ اللَّتْبِيَّة بوو، جا كە گەڕایەوە گوتی: ئەوە زەكاتەكەیە هی ئێوەیە و، ئەوەش دیارییە دراوە بەمن، پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەر سوپاس‌و ستایشی خوای كرد –واتە وتاری داو دوایی فەرمووی: بۆچی كارمەندێك من دەینێرم دوایی دەڵێ: ئەوە هی ئێوەیەو ئەوەش بەدیاریی دراومەتێ، ئەدی بۆ لەماڵی بابی یاخود لەماڵی دایكی دانەدەنیشت با تەماشای كردبا، داخۆ دیاریی بۆ دێنن یان نا؟!).

بەكەمگـر ـ بە، خوا خۆشی دەوێی، وە چاوت لەو شتانە نەبێ كە لـەلای خـەڵكن و بێ تەماع بە، خەڵكیش خۆشی دەوێی).

ئینجا ئەگەر ئینسان دینی بە دنیای خۆی بدات كەودەنیی و نەفامیی بێ، دیارە كـە دینی خۆ بە دنیاو بەرژەوەندیی غەیری خۆ دان، ئەوپەڕی نەفامیی و بەهەڵەدا چوونە!

ڕەحمەتی خواش لە پیرەمێردی شاعیر كە گوتوویەتی:

**تەماع وەك ئاوی سوێری دەریـــایە        هەر دەیخۆیتـــەوەو تەسەللات نایە**

ئاوی سوێر هەتا بیخۆیتەوە زیاتر تینووت دەبێ.

## نۆیـــەم: گـوێگرتن بـۆ ڕەخنــەو پێـشنیارەكانی ئەنــدامانو، بــە ســینەی فراوانو ڕەوشـتی جوانــەوە وەرگـرتنیــان:

یەكی دیكە لە خەسـڵەتە گـەورەو پێویـستەكانی ئینـسانی قیـادیی و بـەرپرس لـە ئیسلامدا، ئەوەیە كە بە دڵێكی گەورەو سـینەیەكی فـراوانو ڕەوشـتێكی جوانـەوە، گوێ بۆ ڕەخنەو پێشنیارو تێبینییەكانی هەر كەسێك بگرێ و، بە ڕێـزو حورمـەت و ئەمیـەت پێدانیــشەوە لێــی وەربگــرێ، پاشــان بــە ویــژدانو ئینـسافەوە هــەڵیان بسـەنگێنـێ و، هەرچی هەق و چاك بوو لێیان هەڵبژێرێ و لێیان بەهرەمەند بـێ. وەك خـوای كاربــەجێ ﷻ فەرموویــەتی: ﴿... فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٨﴾ الزمر. واتە: (... جا موژدە بدە بە بەندەكانم، ئەوانەی كە گوێ بۆ هەموو قـسەیەك رادەگرن، پاشان دەكەونە شوێن چاكترینی، ئا ئەوانە كەسانێكن كـە خـوا ڕێنمـایی كردوون، وە ئا ئەوانەن عاقڵمەندان).

ئاشكراشە كە هیچ كەسێك هەرچەندە زاناو پایەبەرز بێ، ناتوانێ لافی ئەوە لێبدا كە هەموو قسەو بۆچوونێكی راستو دروستەو، هیچ هەڵوێستو كردەوەیەكی هەڵەو پەڵەی تێدا نیە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (كُـلُّ ابْـنِ آدَمَ خَطَّاءٌ وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ) رواه الترمذي: (٢٤٩٩) واللفظ له، وابن ماجه: (٤٢٥١)، عن أنس بن مالك، وقال الألباني: حسن، واتە: (هەموو وەچەی ئادەم هەڵەكارنو، باشترینی هەڵەكارانیش زۆر گەڕاوانن بۆلای خوا)، كەواتە: هەموو كەسێك پێویستی بە ئاگاداركردنەوەو تێبینیو پێشنیارو ئامۆژگاریی هەر هەیەو، هیچ كەسێك نیە لە سەرووی رەخنە لێگیرانەوە بێ.

ئینجا بێگومان ئینسان هەتا زیاتر بجووڵێ، زیاتر دەگونجێ گیرۆدەی هەڵەو پەڵە ببێو، ئەو كەسە هەڵە ناكات كە هیچ ناكا! بۆیە بابای مشوورخۆرو بەرپرس، بە حوكمی كارو پلەوپایەكەی لە هەموو كەس زیاتر پێویستی بە ئاگاداركردنەوەو ئامۆژگاریی كرانو رەخنە لێگیران هەیە، بگرە هەركەسێك بەڕاستیی لە ماناو ئامانجی بەرپرسێتی (المسؤلية) لە ئیسلامدا حاڵی بووبێ، نەك هەر بە سینگی فراوانو رەوشتی بەرز، پێشوازیی لە رەخنەو پێشنیاری خەڵكی دەكات، بەڵكو زۆریش پێی خۆشحاڵ دەبێو، مەمنوونی خاوەنەكەشیان دەبێ، ئەوەتا عومەری كوڕی خەتتاب – خوا لێی رازی بێ ـ لەمبارەوە ئەم وتە بەرزو شیرینەی گوتوە: (رَحِمَ اللّٰهُ امْرَءاً أَهْدَى إِلَـيَّ عُيُـوبِي)[1]، واتە: (رەحمەتی خوا لەو كەسەبێ كە ناتەواوییەكانی خۆمم بە دیاریی بۆ دەنێرێ).

لێرەدا با شتێكتان پێبڵێم: جاروبار بە هەندێك لە ئەندامانی سەركردایەتیو مەكتەبی سیاسییم گوتوە: ئێوە پێتانخۆشە بۆ خوار خۆتان دیكتاتۆریی بێ، بەڵام

---

١) أصول الدعوة ص: (١٠٢).

لەگەڵ سەرەوەی خۆتان دیموکراسیی بێ، واتە: پێتانخۆشە لەخوار خۆتان کەس لە قسەتان دەرنەچێ‌و ڕەخنەشتان لێنەگرێ، بەڵام پێتانخۆشە لەگەڵ سەرەوە ڕەخنەبگرن‌و قسەتان وەربگیرێ، هەڵبەتە نابێ ئینسان وابێ، پێتخۆشە سەرێ لەگەڵت چۆن بێ، لەگەڵ خوار خۆشت وابە، وە پێتخۆشە خوار خۆت لەگەڵت چۆن بێ، لەگەڵ سەرەوەی خۆشت وابە، بەڵام من بە تەجرەبە بۆم دەرکەوتوە، مەگەر ئینسان زۆر نەفسی خۆی تەزکیە کردبێ، ئەگەرنا هیچ شتێك لە خوار خۆی قبووڵ ناکا، بەڵام لەگەڵ سەرەوەی خۆی دەڵێ: دەبێ هەموو شتێکم لێ قبووڵ بکەن! واتە: (بانێکەو دوو هەوا) بێ!! بەڵام نەخێر، چۆن تۆ پێتخۆشە خوار خۆت ڕێزت لێبگرن، سەرووی تۆش وەهای پێخۆشە، وە چۆن تۆ پێتخۆشە لەسەرەوە قسەت لێوەربگیرێ، خوار خۆشت هەروایە.

**دەیەم: پابەندیی موو بە موو بەو بەرنامەو پەیڕەوەوە، کە هەموو لایەك لەسەری ڕێککەوتوونو، بەو مەرجانەوە کە لەسەریان پێکهاتوون:**

پابەندیی بەو مەرجانەو بەرنامەو پەیڕەوەوە کە ئەو کۆمەڵە لەنێو خۆیاندا لەسەریان ڕێککەوتوون، ئەمیش یەکی دیکەیە لە خەسڵەتە بەرزو پێویستەکانی بەرپرسانو مشوورخۆران لە کاری ئیسلامییدا، چونکە بێگومان – وەك پێشتر باسمانکرد- هیچ کۆمەڵێك بەبێ بەرنامەو پەیڕەوێکی ڕاستو ڕوون ناگاتە ئامانج، وەك خوای بەرزو بێوێنە فەرموویەتی: ﴿... لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ... (٤٨)﴾ المائدة، واتە: (... بۆ هەرکامێك لە ئێوە بەرنامەو ڕێبازێکمان داناوە ...)، (شِرْعَة) بەو ڕێیە دەڵێن کە خەڵك ئاوی لێوە دێنێ لە کانی، (مِنْهَاج)یش واتە ڕێیەکی ڕوونو ڕۆشن کە گرێ‌و گۆڵ‌و تاریکی تێدانەبێ، ئینجا دیارە واش لە

ئینسـانی بەرپرس و مشـوورخۆر چاوەڕێ دەکرێ، کە لـە هـەموو کـەس چـاکترو زیاتر لە بەرنامـەو پەیڕەوەکـەی تێگەیـشتبێ و، لەسەریـشی پێگەیـشتبێ و، پێـشیەوە پابەندبێ، بۆیە بەهیچ شێوەیەك لادان و سەرپێچییـکردنی لـێ ناوەشـێتەوە، هەڵبەتـە قسەو کردار لەیەك جیابوونیش لە هەموو کەسدا شتێکی بێــزراوو خراپـە، ئینـسان قسەی جوان و کردەوەی خراپ بێ خراپە، بەڵام لە کەسێکدا کە خۆی بە چاوساغ و پێشڕەوی خەڵکی دەزانێ، بێزراوتـرو خـراپترە، خـوای دادگـەریش ﷻ زۆر تونـد سەرزەنشتی ئەو کەسانەی کردوە کە شـارەزای کتێـب و بەرنامـەی خـوان، کەچـی قـسەیان چـاك و پاکـەو، کـردەوەو پـەرێزیان خـراپ و پیـسە، وەك دەفـەرموێ:

﴿أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾ البقرة، کە مەبەست پـێی جوولەکەکانە، واتە: (ئایا ئێوە خەڵکـی بـە چـاکەکاریی رادەسپێرن و خۆتان لەبیـردەکەن؟ لە حاڵێکدا کـە کتێبـی – خـوا – د ەخوێننـەوە؟ ئایا نافـامن)؟! کەواتە کەسێك قسەی باش دەکـات و کـردەوەی خـراپ دەکـات، بەخەڵکی دەڵێ: کردەوەی بـاش بکـەن، بـەڵام بۆخـۆی وانیـە، ئـەوە لەڕاسـتییدا نەفامە، خوای زاناو توانا بـمانپـارێزێ لە نەفامیـی.

عارەبیش لەوبارەیەوە پەندێکی جوانیـان هەیـە کە دەڵێ: ئینسـان دەبێ بـەکردەوە کاریگەریی لەسەر دەوروبەری دابنێ، نەك بەقسەی رووت، پێش قسەو وتاری، بە کردەوەو ئاکاری ئامۆژگاری خەڵکی بکات، گوتوویـانـە: (مَنْ وَعَظَ بِقَوْلِـهِ ضَـاعَ كَلامُهُ، وَمَنْ وَعَظَ بِعَمَلِهِ نَفَذَتْ سِهَامُهُ)، واتـە: (هەرکەسـێك بەقـسە ئامۆژگـاریی خـەڵك بکـات، قـسەکانی تـەنیا قـسەی رووتـن و زایـەدەبن، بـەڵام هەرکەسـێك بـەکردەوەی ئامۆژگـاریی خـەڵك بکـات، تیرەکـانی نیـشانە دەپـێکن و قـسەکانی لێوەردەگیرێن).

شایانی باسیشە كە بەسەرهاتی مووسا عليه السلام و خضر رضي الله عنه كە لە فەرمایشتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دا ناوی بە (خضر) هاتووەو لە كوردەواریی خۆماندا پێی دەڵێین: (خدری زیندە)، وە خوا سبحانه وتعالى پێناسەی دەكات بە ﴿... عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾﴾ الكهف، خوا سبحانه وتعالى لەبارەیەوە دەفەرموێ: (... بەندەیەك لە بەندەكانی ئێمە كە لەلایەن خۆمانەوە بەزەییمان پێداوەو، بەشێوەیەكی تایبەت لەلای خۆمانەوە زانیاریمان فێركردوە)، وە لە سوورەتی (الكهف)دا لە ئایەتەكانی (٦٠ ـ ٨٢)دا بەسەرهاتی (خضر) لەگەڵ مووسادا باسكراوە، بەڵگەیەكی گەورەو گرنگ هەیە بۆ ئەو مەسەلەیەی ئێمە، چونكە: كاتێك مووسا داوای لێ دەكات و دەڵێ: ﴿... هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾﴾ الكهف، واتە: (... ئایا بەدوات بكەوم و لەگەڵت بم تاوەكو لەو زانیارییەی فێرتكراوە فێرم بكەی؟)، ئەویش (خضر) پێی دەڵێ: ناتوانی، مووسا دەڵێ: إنشاء الله دەتوانم، خضر دەڵێ: ﴿... فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾﴾ الكهف، واتە: (...دە باشە ئەگەر بەدوام دەكەوی، هیچ شتێكم لێ مەپرسە، هەتاكو بۆخۆم بۆتی باس نەكەم)، واتە: لەخۆوە ڕەخنە مەگرەو پرسیار مەكە، ئەو مەرجەی لەسەر دادەنێ، دیارە مووسا عليه السلام ڕازی دەبێ لەسەر مەرجەكانی، دوایی سێ جاران مەرجەكە دەشكێنێ، جاری یەكەم داوای لێبوردن دەكات، جاری دووەم داوای لێبوردن دەكات و دەڵێ: ﴿... إِن سَأَلْتُكَ عَن شَىْءٍۭ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِى ۖ قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّى عُذْرًا ﴿٧٦﴾﴾ الكهف، واتە: (...ئەگەر ئەمجارە – واتە جاری سێیەم – دەربارەی هیچ شتێك پرسیارم لێ كردی – واتە ئەگەر ئەمجارە مەرجەكەم شكاند ـ تۆ بۆت هەیە هاوڕێیەتیم نەكەی)،

ئینجا جاری سێیەم كـە دەیـشكێنێ، بەنـدە سـاڵحەكە دەڵـێ: ﴿... هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾﴾الكهف، واته: (... ئەوە كاتی لێك جیابوونەوەی منو تۆیـە – تەواو سێ جار مەرجەكەت شكاند ـ).

بەڵێ ئەمە ئەوەی لـێ وەردەگیرێ، كە هەر كۆمەڵـە خەڵكێك یان دوو كەس یـان زیاتر، كە لەسەر كۆمەڵێك مەرج، یان لەسەر مەرجێك یـان زیـاتر پێكـەوە كارێـك دەكەن، لەسەر هەردوولا پێویستە كە پابەند بن بەو مەرجەوە، وە كـە مەرجەكـەیان شكاند، كەواتە بۆیان هەیـە ئەو گرێبەستەی نێوانیان هەڵوەشێننەوە، ئەم بەسـەرهاتە چاكترین بەڵگەی پێویست بوونی پابەندییە بەو مەرجانە (شروط)ەوە كـە دوو لایـەن لەسەریان رێكدەكەون، چونكە مووسا عليه السلام پاش رازیبوون بە مەرجەكانی خـضر، هەر جارێك مەرجێكی شكاندبێ، داوای لێبوردنی كردووەو عـوزری هێناوەتـەوەو، دووبارە ئامادەیی خۆی پێشانداوە كە بەو مەرجانەوە پابەند بێتەوە، كە پێشتر لەگـەڵ خضر لەسەریان پێكهاتوون.

## یازدەیـەمو دوازدەیەم: لێپرسـینەوەو سزادانی لادەرانو سەرپێـچییكەرانو، تەقدیركردنو پاداشـتدانەوەی چاكـەكـارانو گوێـڕایـەڵان:

بـەڵێ ئـەم دووانـەش، دوو بنـەمای دیكـەی گـرنگو دوو خەسـڵەتی گـەورەی هەركەسێكن كە چـاودێریی و سـەرپەرشتیاریی كاروبـاری ئیسـلامیی و مسوڵمانانی بە ئەستۆوەیە، چونكە هەبوونی لێپرسـینەوەو سـزا بـۆ لادەرو سەرپێـچییـكەرانو، وەفاو تەقدیـرو پاداشت بۆ چاكەكارانو بەقسـەكەران، وێڕای سـزاو پاداشـتی خوا سبحانه وتعالى لە دوارۆژدا – سزاو پاداشتی خواش هەر هەیە – كاریگەرییـەكی گەورەی هەیە لە كەمكردنەوەی خراپەو لادانو، زیادكردنی چاكەو پابەندییـدا.

خـــوای كاربـــەجێو دادگـــەریش ﷻ كـــە بـــە مەدحكردنـــەوە، بەســـەرهاتی (ذوالقرنین)مـان بـۆ دەگێڕێتـەوە، لەسـەر زمـانی ئـەو پادشـاو حوكمڕانـە پەسـندو ستایشكراوە، باسی ئەوە دەكات كە سیاسـەتی مامەڵـەكردنی لەگـەڵ چـاكەكاران‌و خراپەكاراندا، هەر بەو شێوەیە بووە كە گوتــمان: سـزای خراپـەكاران بـدات و، پاداشتی چاكەكارانیش بداتەوە، خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾﴾ الكهف، واتە: (... گوتــمان: ئـەی ذوالقـرنین! بـۆت هەیـە خەڵكی سزابدەی‌و بۆشت هەیـە چاكەیان لەگەڵدا بكەی –واتە دەستت كراوەیـە بـۆ چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكی ئەو وڵاتانەی كە تۆ ئازادیان دەكەی‌و دەیانخەیـە ژێر ركێفی خۆتەوە-، - ذوالقرنین - گوتی: ئینجا هەركەسێك سـتەم بكـات، ئـەوە ئێمە سزای دەدەین، دواییش دەگێڕدرێتەوە لای پەروەردگاری‌و، ئەویش بە ئازارێكی بێـڕەزا سزای دەدا، بەڵام هەركەسێك ئیمـانی هەبێ‌و كردەوەی چاك بكات، ئـەوە چاكترین پاداشتی - لای خوا - بۆ هەیە، ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە قسەیەكی ئاسانی لەگەڵ دەكەین – هەر نەبێ سـتایشـێكی دەكەین، دەستخۆشییەكی لێدەكەین - ).

لێـرەدا جێی سەرنج ئەوەیە – وەك لە شوێنی دیكەش گوتوومـە - ذوالقـرنین[١] بەراورد دەكات لەنێوان ستەم (ظلـم)و بڕوا (إیـمان)دا، نەك كـوفرو ئیمـان، ناڵـێ (أَمَّا مَنْ كَفَـرَ) چونكە لەكاتێكدا شەریعەتی خـوا حـاكم دەبـێ، ڕێگـا دەدا خـەڵك

---

١) (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)، ئاڵقـەی: (لـەنێوان جیهـانێتی ئیـسلام‌و جیهـانگیریی ڕۆژئاوادا).

کوفر هەڵبژێرێ، ڕێی کوفر دەدا، چونکە کوفر پەیوەندی بەبیروبۆچوونو عەقڵو ئیرادەی ئینسانەوە هەیە، وە پاشان دەگونجێ خەڵکی هەندێکی کافر بێو هەندێکی مسوڵمان بێو پێکەوەش بژین، بەڵام ئەوەی کە ڕێی پێنادرێ لە شەریعەتی خوادا، بریتیە لە ستەم (ظلم)، بۆچی؟ چونکە وەختێ یەکێك ستەم (ظلم) دەکاتو دەبێتە ستەمکار (ظالم)، ئەویدیکە دەبێتە ستەملێکراو (مظلوم)، هەمیشە ستەمی ستەمکاران، لەسەر حیسابی ستەملێکراویی ستەملێکراوانو بەشخوراوانە، بەڵام دەگونجێ کابرا کافر بێو ئەویدیکە ئیماندار بێو پێکەوەش بژین، بۆیە زانایانی ئیسلام زۆر جوانیان گوتوە: (قَدْ يَدُومُ الْمُلْكُ مَعَ الْكُفْرِ، وَلا يَدُومُ مَعَ الظُّلْمِ)، واتە: (سەڵتەنەتو دەسەلاتی سیاسیی، لەگەڵ کوفر بەردەوام دەبێ، بەڵام لەگەڵ ستەمدا بەردەوام نابێ).

جا بەهەرحاڵ دیارە ذوالقرنين سیاسەتەکەی وابووە، دەڵێ هەرکەس چاکە بکات ئێمەش سوپاسی دەکەینو دەستخۆشیی لێدەکەینو، خوا پاداشتی بداتەوە، ئەوەش کە ستەمو خراپە بکات، ئەوە ئێمە سزای دەدەین لەسەر ستەمەکەی.

شایانی باسیشە کە مەبەست لە هەرکام لە لێپرسینەوەو سزاو، وەفاو تەقدیرو پاداشت، زۆر شت دەگرێتەوە، هەر لە سەرزەنشتو گلەییو ڕەخنە، یان سوپاسکردنو مەدحو ستایشەوە بگرە، هەتا هەموو پلەو جۆرەکانی سزاو پاداشتی مەعنەوییو ماددیی کە لە بازنەی فراوانی شەریعەتدا جێیان دەبێتەوەو، دەبنە مایەی گێڕانەوەی خەڵکی لە خراپەو لادانو سەرپێچییو، هەڵنانیانو هاندانیان بەرەو چاکەو خێرخوازیی.

وە بە تەئکید پێغەمبەری خواش ﷺ وەك چۆن لە هەموو بوارەکانی ژیانو گوزەرانماندا چاکترین پێشەواو سەرمەشقمانە، لەو بوارە گرنگو هەستیارەشدا، بە هەمان شێوە پێویستە ورد ورد سەرنجی سیرەو سوننەتی ئەو زاتە بەرزە بدەین،

تاكو لێی فێربین كە چۆن چۆنی بەهۆی هەموو جۆرو شێوازەكانی لێپرسینەوەو سزاو، پاداشتدانەوەو تەقدیرەوە، خەڵكی بەرەو چاكەو تاعەتو پارێزكاریی هانبدەین.

لە كۆتایی ئەم بنەمایەشدا خستنەڕووی دوو ئاگاداریی بە پێویست دەزانم:

١/ بەپێی ئایەتی: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ... ﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة، واتە: (خوا لە هیچ كەسێك داوا ناكات مەگەر ئەوەی كە لەتوانایدایە ...)، وە: ﴿...لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ... ﴿٧﴾﴾ الطلاق، واتە: (خوا لە هیچ كەسێك داوا ناكات مەگەر ئەوەندەی كە پێیداوە ...)، چەندی پێداوە ئەوەندەش داوای لێدەكات، وە: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ...﴿١٦﴾﴾ التغابن، واتە: (ئەوەندەی لەتواناتاندایە پارێز لە خوا بكەن ...). بەپێی ئەم ئایەتانە، هەرچەندە بابای بەرپرس كۆمەڵێك ئەركی گەورەو گرنگی لەسەر شانن، بەڵام بێگومان مادام كەمتەرخەمیی نەكاو توانای خۆی خەرج بكات، لەسەر ئەنجام نەدانی هەندێك لە ئەركو كارەكانی كە بڕستو توانای بەسەریاندا ناشكێو بۆی هەڵناسووڕێن، گوناهبار نابێو، نابێ هیچ كەسیش هەر لەخۆوە لە بابای بەرپرس بەبیانوو بێو، هەمیشە بۆی لە بۆسەی ڕەخنە لێگرتنو گلەییو گازندە لێكردن دابێ! ئەگەرنا كابرا قەت دەرناچێ.

٢/ هەروەها بەپێی بنچینەی (الغُرْمُ بِالْغُنْمِ)، واتە: (لە بەرانبەر زەرەردا، ئینسان دەبێ قازانج بكات)، بابای بەرپرس پێویستە بە ئەندازەی بارگرانییو ئەركی سەرشانی، مافە ماددییو مەعنەوییەكانیشی لەبەرچاو بگیرێنو، دەبێ لەلایەن ژێردەستەكانیەوە زۆر چاك فەرمانبەریی (الإطاعة)ی بۆ بكرێو هاوكاریی بكرێ، ئەگەرنا بەتەئكید بابای بەرپرس هەرچەندە زۆر لێهاتووو

لێبڕاو بیٚ‌و، هیچ كەمتەرخەمییشی نەبیٚ، مادام خەڵكەكە بە قسەی نەكاو هاوكاریی نەكات، هیچی بۆ بەهیچ ناكریٚ، ئایا بابایەكی ئیفلیجی بەسەر زیندوو، دەتوانیٚ هیچ كارێك ئەنجام بدات؟! نەخێر.

ڕۆژێك كابرایەك لە بازاڕی كوفە یەخەی (عەلی) ـ خوا لێی ڕازی بیٚ ـ گرت‌و ڕەخنەی لێگرت، گوتی: لەسەردەمی (ئەبو بەكر)و (عومەر)دا وابووو وابوو، بەڵام دیارە تۆ چاكی لیٚ نازانی بۆیە حاڵ واو حیساب وا، (عەلی)ش ـ خوا لێی ڕازی بیٚ ـ گوتی: وانیە، بەڵام هی وەك من لە خزمەتی (ئەبو بەكر)و (عومەر)دا بوون، بەڵام ئێستا هی وەك جەنابت لە خزمەتی مندایە، (ئەوەتا لە بازاڕدا شەڕم پێدەفرۆشی)، ئیشەكەم چۆن بۆ بڕوا؟!

هەربۆیەش ئێمە لە بنەمای: (بیست‌و پێنج)دا وێڕای چەند شوێنێكی دیكەش باسی ئەركەكانی سەرشانی قاعیدەمان كردوە بەرانبەر بە قیادە بەگشتی‌و، كەسی یەكەم (أمیر) بەتایبەت، چونكە بێگومان هەركەسێك لەهەر ئاستێكدا بیٚ، تەنها لە كاتێكدا ئەركەكانی سەرشانی بۆ جێبەجیٚ دەكرێن، كە ماف‌و پێداویستییەكانی بۆ دابین بكرێن‌و هەر مافێك لەبەرانبەریدا ئەركێك هەیە، تۆ مافت هەیە‌و ئەركیشت لەسەر شانە، ئەو ئینسانە مافی هەیە لەسەر تۆ، ئەركێكی تۆشی لەسەر شانە، خوای پەروەردگار ﷻ وامان لێبكا ئەگەر بەرپرس بین یان ژێردەست بین، یان لەهەر شوێنێكدابین، بە ئەركی سەر شانی خۆمان هەڵسین‌و، دڵسۆزو ساغ‌و ساف‌و هاوكارو دەستبارگربین.

# بنەمـای پێـنجـەم

## بەرپرسیارێتی ئەمیـر و بەرپرسانی دیکـە بەرانبـەر بە ئەندامـان و دابیـنکـردنی مافـەکانیان بەگوێـرەی توانـایـان لە هـەموو ڕووێکـەوەو، بە سـینە فراوانیـیەوە گوێگرتـنیان بۆ پێشـنیارو گـلـەیـی و ڕەخنـەکـانیان.

# بنەمای پێنجەم

## بەرپرسیارێتی ئەمیرو بەرپرسانی دیكە بەرانبەر بە ئەندامانو دابینكردنی مافەكانیان بەگوێرەی توانایان لە هەموو ڕوویەكەوە، بە سینە فراوانییەوە گوێگرتنیان بۆ پێشنیارو گلەیی و ڕەخنەكانیان.

هەركام لە ئەمیر وەك كەسی یەكەمو سەرجەم بەرپرسانی دیكەش، هەركەسە لەقەدەر خۆی لە هەموو ڕوویەكەوە بەپێی توانایان بەرانبەر بە ئەندامان بەرپرسیارنو پێویستە بە جیددیی مشوورخۆرو دڵسۆزیان بن لە هەموو بوارو لایەنەكانی دینو ژینیانداو، خۆیان لە كەمتەرخەمیی لە بواری دابینكردنی مافەكانیاندا بپارێزن.

هەروەها پێویستە بە سینگ فراوانییەوە - وێڕای ڕاوێژپێكردن - گوێ بۆ پێشنیارو گلەییو ڕەخنەكانیان بگرنو، بێزارییو سەغڵەتیی دەرنەبڕنو، هەمیشە ئەو قسەیەی عومەری كوڕی خەتتاب – خوا لێی ڕازی بێت - یان لە گوێدا بزرینگێتەوە: (لا خَيْرَ فِيكُمْ إِنْ لَمْ تَقُولُوهَا، وَلا خَيْرَ فِينَا إِنْ لَمْ نَقْبَلْهَا مِنْكُمْ)[1]، واتە: (ئێوە ئەگەر قسەی هەق نەڵێن خێرتان پێوە نیەو، ئێمەش ئەگەر وەرینەگرین بێ خێرین).

بەڵام پێویستە قسەی هەق گوتنو ڕەخنەگرتنو ڕاستكردنەوەكەش، بەرێزو حورمەتەوەو بە شێوازێكی ڕاستو گونجاو بێت.

---

١) محض الصواب في فضائل أمير المؤمنين عمر بن الخطاب، ج: (٢)، ص: (٦٠١).

چونکە:

١- خوای کاربەجێ ڕوو لە بڕواداران دەکات و دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ التوبة، واتە: (ڕەوانەکراوێکتان لە خۆتان بۆ هاتوە هەر شتێك مایەی نارەحەتیتان بێت لەسەر دڵی زۆر قورسە، لەسەر خێرو چاکەتان سوورە، بەرانبەر بە بڕواداران میهرەبان و بە بەزەیی یە).

٢- دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ پێشڕەوو سەرمەشقی مسوڵمانانە بەگشتیو بەتایبەت بەرپرس و مشوورخۆرانیان، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ الأحزاب. واتە: (بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقێکی باشتان هەیە، بۆ هەر کامێکتان بە ئومێدی (بەزەیی خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بێ و زۆر یادی خوا بکات).

٣- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا لِمَنْ؟! قَالَ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ) رواه مسلم: (٥٥) عن تميم الداري رضي الله عنه. واتە: (دین دڵسۆزییە[1]، گوتمان - هاوەڵە بەڕێزەکان لە پێغەمبەر ﷺ یان پرسی-: - دڵسۆزیی و بەتەنگەوەبوون و پەرۆشیی - بۆ کێ؟! فەرمووی: بۆ خواو بۆ کتێبی خواو بۆ پێغەمبەری

---

١) لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: نەسیحەتی کرد، بە مانای ئامۆژگاریی (موعظة) بەکاری دێنن، بەڵام (نصیحة) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای دڵسۆزیی و بێ خەوشیی و بەتەنگەوەبوون دێ.

خـوا ﷺ و بـۆ پێـشەوایانو مـشورخۆرانی مـسوڵمانان و بـۆ تێكـڕای مسوڵمانان بەگشتی).

٤- هەروەها فەرموویـەتی: (مَا مِنْ أَمِيرٍ يَلِي أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ ثُمَّ لاَ يَجْهَدُ لَهُمْ وَيَنْصَحُ إِلاَّ لَمْ يَدْخُلْ مَعَهُمُ الْجَنَّةَ) رواه مسلم: (١٤٢)، عن معقل بن يسار، واتە: (هەر ئەمیـر "بەرپرس"ێك كاری مـسوڵمانان بەئەستۆوە بگرێ، پاشان خۆیان بـۆ مانـدوو نـەكاتو بۆیان دڵـسۆز نـەبێ، لەگەڵیان ناچێتە بەهەشـتێ).

٥- هـەروەها فەرموویەتی: (اللّهُمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَشَقَّ عَلَيْهِمْ فَاشْقُقْ عَلَيْهِ وَمَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَرَفَقَ بِهِمْ فَارْفُقْ بِهِ) رواه مسلم: (١٨٢٨) عن عائشة رضي الله عنها، واتـە: (ئـەی خوایـە! هـەر كەسێك شتێك لە كاروباری ئۆممەتمی كەوتە دەست و لەسەریان توند بـوو "بە ناهەق" تۆش لەسـەری توند بە، وە هەر كەسێك شتێك لە كاروباری ئۆممـەتمی كەوتـە دەسـتو لەگەڵـیان میهرەبـان بـوو، تـۆش لەگەڵـی میهرەبان بە).

٦- هـەروەها پێغـەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: (أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ) رواه أبوداود: (٤٣٤٤) وابن ماجه: (٤٠١١) عن أبي سعيد الخُدْرِي رضي الله عنه، وقال الألباني: صحيح، واتە: (چاكتـرین تێكۆشان گوتنی قسەیەكی داگەرانەیە لەلای حوكمڕانێكی ستەمكار).

هەڵبەتـە بۆیـەش گـوتنی قـسەی دادگەرانـەو هـەق لـەلای بەرپرسـانی سـتەمكار بـە گـەورەترین جیهـادو تێكۆشـان دانـراوە، چـونكە مەترسـیی تێدایە بۆ خاوەنەكەی، ئەگەرنا لـەلای هـەموو بەرپرسان هەقگوتن هـەر خێرو چاكەیەو پاداشتی هەیەو جۆرێكە لە تێكۆشان.

٧- خوای كاربەجێیش ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَ ...﴿١٠٥﴾﴾ الإسراء، واتە: (وە قورئانمان بە شێوازێكی هەق دابەزاندووەو، هەقیشمان تێدا ناردۆتە خوار ...)، كەواتە: هەقبێژیی چەندە گرنگە، بە شێوازی هەقو چاك گوتنیشی هێندە !

## ڕوونكـردنەوە:

خوا پشـتیوان بێ ئـەم بنـەمای پێنجەمـە كـە تایبەتـە بـە ڕوونكردنـەوەی ئـەركی بەرپرسان بەرانبەر بە ژێردەستانیان، لە پێنج خاڵ دا دەخەینەڕووو شی دەكەینەوە:

**یەكـەم: سـۆزو بەزەییو پەرۆشو دڵسۆزییو بەتەنگەوەبوونی بەرپرسان بـۆ ئەنـدامانی ژێردەسـتیانو، هەوڵدانیـان بـۆ دابینكـردنی مافـە ماددییو مەعنەوییـەكانیان، فـەڕزەو بـە كەمتەرخـەمیی تێداكردنـی گوناهبـار دەبـن:**

دیـارە لەوبارەشـەوە بەڵگـە زۆرن، چ لـە ئایەتـەكانی قورئـانو چ لـە دەقـەكانی سوننەتدا، بۆ نـموونە:

١/ خوای بەرزو بێ وێنـە لەبارەی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ فەرموویەتی: ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ التوبة.

وەك دەبیـنین خوا ﷻ پێغەمبـەری خۆی لە بواری چۆنیـەتی هەڵسوكەوتو هەڵوێستی لەگـەڵ مـسوڵمانانی شـوێنكەوتوویدا، بـە چـوار سـیفەت وەسـف دەكات:

أـ ﴿عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ﴾ هەر شـتێك مایـەی ناڕەحـەتیو ئـازاری ئێوەبـێ پـێی ناخۆشـەو لەسـەر دڵـی قورسـە، واتـە: بـە ناڕەحەتییـەكانی ئێـوە ناڕەحەتو، بە خۆشـییەكانتان بەختـەوەرو ئاسوودە دەبێ.

ب- ﴿حَرِيصٌ عَلَيْكُم﴾ سوورو مكوڕە لەسەر بەرژەوەندییەكانتانو سوودو قازانجتان، واتە: هەمیشە بەتەنگتانەوەیەو سەرگەرمی ئەوەیە، كە خێرو خۆشییو بەرژەوەندییەكانتان بۆ دابینو دەستەبەر بكات.

جـ، د- ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بەرانبەر بە بڕواداران میهرەبانو بە بەزەییو پەرۆشە، دیارە كەسێكیش خاوەنی میهرەبانییو بەزەییو پەرۆش بێ بە هەموو توانای هەوڵی ئەوە دەدات كە هەقو مافەكانی ئەوانەی بەرانبەریان میهرەبانو بە بەزەییە دابین بكاتو، بەختەوەرو ئاسوودەی دنیاو، سەرفرازو سەربەرزی دوارۆژیان بكات.

جا لێرەدا رەنگە یەكێك بپرسێت:

ئایا پەیوەندیی ئەم ئایەتە بەپێزە بە بەرپرسانی كارو پڕۆژەی ئیسلامییەوە چییە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

مادام پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشقو چاوساغو پێشڕەوی مسوڵمانانە بەگشتی، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ الأحزاب، كەواتە: سەرجەم مسوڵمانان لەسەریان پێویستە چاو لە پێغەمبەرەكەیان بكەنو بیكەنە سەرمەشقو پێشڕەویان، بەتایبەت مشوورخۆرو بەرپرسانیان كە بە جێنشینو میراتگری پێغەمبەر ﷺ دادەنرێن.

٢/ هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (مَا مِنْ أَمِيرٍ يَلِي أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ ثُمَّ لاَ يَجْهَدُ لَهُمْ وَيَنْصَحُ إِلاَّ لَمْ يَدْخُلْ مَعَهُمُ الْجَنَّةَ) رواه

مسلم: (١٤٣)، عن معقل بن يسار، كەواتە: دڵسۆزیی و بەزەیی و پەرۆش و بەتەنگەوەبوونی بەرپرسان بۆ مسوڵمانان و هەوڵدانیان بۆ دابینكردنی ماف و بەرژەوەندییەكانیان فەرز و ئەركێكی شەرعیی سەرشانیانەو، بە كەمتەرخەمیی تێداكردنی دووچاری سزاو لێپرسینەوەی خوا ﷻ و، بگرە بێبەشكران لە بەهەشت دەبن!

دیارە هەر بەرپرس و كاربەدەستێكی مسوڵمانانیش بە ئەندازەی ئیمانی بەو ئایەت و فەرمایشتانە، هەست بە ئەركی سەرشانی دەكات و خۆی لە كەمتەرخەمیی دەپارێزێ. چونكە دڵنیایەو دەزانێ كە مسوڵمانان بۆیە ڕێزیان لێناوەو لەپێش خۆیان دایانناوە، كە دڵسۆز و مشوورخۆریان بێ و، بەپێچەوانەوە، وێڕای سزاو تووڕەیی خوا ﷻ، دووچاری لێپرسینەوەو هەڵوێست لێوەرگرتنی مسوڵمانانیش دەبێ!

**دووەم: دڵسۆزیی و ڕاست و ساغیی هەر كام لە بەرپرسان و فەرمانبەران بۆ یەكدی پێویستەو، سەنگی مەحەكی دینداریی و مسوڵمانەتییەكەشیانە:**

مرۆڤی مسوڵمان لە هەموو حاڵاندا پێویستە ڕاست و ساغ و دڵسۆز بێ، چونكە هەركام لە ڕاستیی و ساغیی و دڵسۆزیی لە خودی خۆیاندا خەسڵەتی بەرز و پەسند و بەهای گەورەو گرنگن و، پێچەوانەكانیشیان كە (لاریی و ناپاكیی و موخەننەتیی)ن لە خودی خۆیاندا سیفەتی خراپ و ناپەسندن و، ناگونجێ لە مرۆڤی مسوڵماندا هەبن.

بەڵام بێگومان بۆ كەسانی مشوورخۆر و بەرپرس، ئەو سیفەتانە پێویستترن، هەروەها بۆ مسوڵمانان لەنێو خۆیانداو بۆ مامەڵەكردنیان لەگەڵ بەرپرسانیاندا.

بەڵگەی ئەوەش كە گوتمان زۆرێك لە ئایەتەكانی قورئانو دەقەكانی سوننەتن، بۆ نموونە:

١/ خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ (١١٩)﴾ التوبة، واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بكەنو لەگەڵ ڕاستان دابن)، دیارە ڕاستكردن (صِدْق)یش بەرهەمو زادەی پارێزكاریی (تَقْوَى)یەو، مرۆڤیش هەتا ڕاست (صَادِقْ) نەبێ ناگونجێ بچێتە ریزی ڕاستان (صَادِقِين)ەوە!

شایانی باسیشە كە ڕاست (صَادِقْ) بوون چەمكو واتایەكەی فراوانترە لە ڕاستگۆیی (صَادِقُ الْقَوْل)و، ڕاست بوون، دەروونو دەرو قسەو كردەوەو ...هتد، دەگرێتەوە.

٢/ خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ (٦٨)﴾ الأعراف، واتە: (پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێڕادەگەیەنم، وە من دڵسۆزێكی ئەمیندارتانم)، كە دیارە ئەمە قسەی (هوود)ە ﵇ لەگەڵ گەلەكەی (عاد)دا. بەلام بێگومان دڵسۆزیی و ئەمینداریی بۆ خەڵك، خەسڵەتی تێكڕای پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلامو شوێنكەوتوە ڕەسەنو ڕاستەكانیانە لەگەڵ خەڵكیدا.

٣/ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا لِمَنْ؟! قَالَ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ) رواه مسلم:(٥٥) عن تميم الداري ﵁.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ دینداریی و مسوڵمانەتیی مسوڵمانانی لە دڵسۆزیی و ساغیی و بەتەنگەوەبوون بۆ خواو كتێبەكەی و پێغەمبەرەكەی و پێشەواو بەرپرسانو سەرجەم مسوڵماناندا كورتكردۆتەوە.

كەواتە: هەركام لە بەرپرسانو خەڵكی مسوڵمان بەگشتی لەسەریان پێویستە وەك ئەركێكی بنەڕەتیی دینداریی و مسوڵمانەتییان كە پاش خوا ﷻو قورئانو پێغەمبەر ﷺ، بۆ یەكدی دڵسۆزو غەمخۆرو بە پەرۆش بنو بە تەنگ بەرژەوەندیی یەكدییەوە بن، ئنجا وەك پێشتریش باسمانكردوە بەرژەوەندیی (مَصْلَحَة) بریتییە لە دوورخستنەوەی زیانەكانو دابینكردنی سوودەكان (دَفْعُ الْمَضَارِّ وَجَلْبُ الْمَنَافِعِ).

هەڵبەتە بابای بەرپرسو كاربەدەستیش بە حوكمی پلەو پایەو پێگەو ئەركەكەی پێویستە (بەپێی توانای) بۆ هەر چاكەو خێرێك سەرمەشقو دەستپێشخەر بێو، لە بەرانبەرەكانی چاكتر بێو، لەوان دڵسۆزترو بە تەنگەوەبووترو غەمخۆرتر بێ.

## سێیەم: بەرپرسان دەبێ نەرمو نیانو میهرەبانو خۆشڕەفتار بنو، خۆیان لە زبریی و ئەزیەتدانی ژێردەستانیان بپارێزن:

نەرمیی و میهرەبانیی و ڕووخۆشیی و قسەخۆشیی، چەند خەسڵەتێكی گرنگی مرۆڤی مسوڵمانن، هەر كەسێك بێو هەر پێگەیەكی هەبێ، بەڵام بێگومان بۆ بابای كاربەدەستو بەرپرس، هەركام لەم خەسڵەتانە یەكجار گرنگو پێویستن، چونكە بە دەقی قورئان بەبێ ئەم خەسڵەتە پەسندانە، لە كارەكەیدا نەك هەر سەركەوتوو نابێ، بگرە دووچاری شكستێكی گەورەش دەبێ!

وەك خوای كاربەجێ ﷻ بە پێغەمبەری كۆتایی و سەروەرمان ﷺی فەرموەوە: ﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ...﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران، واتە: (بەهۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرمو نیان بووی، وە ئەگەر قسە زبرو دڵڕەق بووایەی لەدەورت دەپڕژان، دەجا لێیان ببوورەو داوای لێبوردنیان بۆ –لە خوا- بكەو لە كاروباردا ڕاوێژیان پێ بكە ...).

کەواتە: تەنانەت پێغەمبەری خاتەمو سەروەریش ﷺ بەهۆی نەرمو نیانیی و میهرەبانیی و خۆشڕەفتارییەکەیەوە، توانیویەتی هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو بهێڵێتەوەو، ئەگەر دڵڕەق و قسە زبرو چی و چی بووایە، هاوەڵەکانی لە دەور نەدەمان!!

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (اللّهُمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَشَقَّ عَلَيْهِمْ فَاشْقُقْ عَلَيْهِ، وَمَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَرَفَقَ بِهِمْ فَارْفُقْ بِهِ) رواه مسلم: (١٨٢٨) عن عائشة رضي الله عنها.

ئنجا گومانیشی تێدانییە کە دوعاو پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ گیرایەو، هەڵبەتە هەرکەسێکیش خوای دادگەر ﷻ بەهۆی زبریی و توندوتیژیی و بێ ڕەحمیی یەوە لەگەڵ بەردەست و هاوکارانیدا، لەسەری توند بێ، دووچاری فەوتان و ماڵوێرانی دەبێ، هەروەها بەپێچەوانەشەوە، هەرکەسێك خوای بەخشەر ﷻ لە سۆنگەی سۆزو بەزەیی و میهرەبانیی و نەرمو نیانیی یەوە لەگەڵ هاوکاران و بەردەستانیدا، لەگەڵی نەرمو نیان و بە ڕەحم بێت، بە مرادی دنیاو دوارۆژی خۆی دەگات و ئەرکەکانی بە هێزو پێزەوە ئەنجام دەدات.

## چوارەم: دڵسۆزیی و ڕێزو خۆشەویستی و گوێڕایەڵیی ئەندامان بۆ بەرپرسانیان، لەگەڵ هەقبێژیی و تێبینی و سەرنج و ڕەخنەگرتندا تێکناگیرێ:

بەڵێ مەرج نییە هەمیشە دڵسۆزیی و دەربڕینی ڕێزو خۆشەویستی و گوێڕایەڵیی کردنی ئەندامان بۆ مشوورخۆرو بەرپرسانیان، بریتی بێ لە بێدەنگیی و قسەنەکردن و ڕەخنە نەگرتن!

بەڵکو گەلێك جاران و لە شوێنی خۆیداو بە شێوازی شایستە، قسەی هەق کردن و تێبینی و سەرنج و ڕەخنەگرتن، مایەو بەڵگەی دڵسۆزیی و پەرۆش و بەتەنگەوەبوونی

خەڵكو ئەندامانـە بـۆ مـشوورخۆرو بەرپرسـانیان، پێـشینانیش جوانیـان گوتـوە: (دۆست ئەو كەسەیە دەتگریەنیێو، دوژمن ئەو كەسەیە دەتخەنێنێ[1]).

هەربۆیەش عومەری كوڕی خەتتاب – خوا لێی رازی بێ ـ قسەی هەق گـوتنی خـەڵكو گـوێگرتنو وەرگرتنـی بەرپرسـانی بـە مایـەی چـاك بـوونی كۆمـەڵگای مسوڵمان داناوەو، پێچەوانەكەیشی بە پێچەوانـەوە.

دیـارە پێغەمبەری خواش ﷺ كە فەرموویەتی: {أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَـدْلٍ عِنْـدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ} رواه أبوداود: (٤٣٤٤) وابـن ماجــه: (٤٠١١) عـن أبـي سـعيد الخُدْرِيِّ رضي الله عنه، وقال الألبـاني: صحيح، ویستوویەتی مسوڵمانانی ئۆممەتی هانبـدات بۆ هەقبێژییو بوێریی لە بەرانبـەر نەك تەنیـا بەرپرسانی ئاسـاییـدا، بگرە بـەرپرسو حوكمڕانانی ستەمكارو بەزەبرو زۆریشـدا، ئاشكراشە كە هەقبێـژییو فـەرمان بـە چاكە كردنو ڕێگریی لە خراپە كردن، لەگەڵ هەموو حوكمڕانو كاربەدەستاندا هەر خێرو چاكەیەو پاداشتی هەیە، بەڵام بۆیە هەقبێژییو بوێریی لـە بەرانبـەر بـەرپرسو كاربەدەستانی ستەمكارو لاردا بە گەورەترین جـۆری تێكۆشـانو جیهـاد دانـراوە، چونكە مەترسیی گەورەی هەیـە بـۆ سـەر خاوەنەكـەی، بەپێـچەوانەی بەرپرسـانی دیكەوە، كە بە سوپاسو ڕێزو خۆشحاڵییەوە، ڕەخنەو تێبینیو سـەرنجی خـەڵكی وەردەگرنو بە دیارییو خەڵاتی دادەنێن!

## پێنجـەم: قسـەی هـەق گـوتنو خـستنەڕووی ڕەخنـەو پێـشنیارەكـان، بـە ڕێـزو حورمـەتو بە ئەدەبـی شـەرعییـەوە:

ئەوە بزانن كە ئیسلام هـەموو شـتەكانی هـەر شـتەی لـە شـوێنی خۆیـەتیو وەك دەڵێن: (لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَالٌ)، واتە: (بۆ هەر كاتێكو جێگەیەك قسەی خـۆی هەیـە)،

---

١) خەنین: پێكەنین، دەتخەنێنێ: دەتهێنێتە پێكەنین.

کە دەڵێین: دەبێ لەلای بەرپرس قسەی هەق بگوترێو ڕەخنە بگیرێ، مانای وانیە بێڕێزو بێ حورمەت بین، وە کە دەڵێین: دەبێ ڕێزی لێبگرین، مانای وانیە هەقێ نەڵێین، بەڵێ کە دەڵێین: دەبێ ڕێز لە بەرپرسی خۆت بگری، مانای وانیە هیچ هەقێکی پێ نەڵێیو ڕەخنەی لێنەگری، ئەگەر ناشەرعییش بکات، وە هیچ پێشنیارێکت بۆی نەبێو هیچ پرسیارێکی لێنەکەی، ڕێزی بگرە، ڕێز لە جێی خۆیو پرسیارکردنیش لە جێی خۆی، حورمەت گرتن لە جێی خۆیو ڕەخنە لێگرتنیش لە شوێنی خۆی، بەڵام ڕەخنە گرتنەکە دەبێ بە ڕێزو حورمەتەوە بێ.

وەك پێشتر باسمانکرد کە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتەکەیدا دەفەرموێ: {أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ}[1] رواه أبوداود: (٤٣٤٤)، وابن ماجه: (٤٠١١) عن أبي سعيد الخُدْرِي رضي الله عنه، وقال الألباني: صحيح.

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ چەمكو واتای جیهاد بۆ ئێمە زۆر فراوان دەکات، ئێمە وەها لە چەمكو واتای جیهاد حاڵی بووین، واتە: سەرو ماڵی خۆ بەخشین لەپێناوی خوا ﷻدا، وە لە شەڕو جەنگ لە بەرانبەر بێ بڕوایانو کافراندا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: گەورەترین جۆری جیهاد ئەوەیە کە قسەیەکی حەق بکەی، حەقێك کە پێویست بێ بگوترێ، لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار، بۆ دەڵێ دەسەڵاتداری ستەمکار؟ چونکە ئەو دەسەڵاتدارەی کە ستەم نەکا، حەق گوتن لەلای ئازایەتی نیە، ئەوەی کە لەسەر ئەوە کە حەقێ دەڵێی سوپاسیشت دەکاتو دەستخۆشییشت لێ دەکاتو ئەملاو ئەولاشت ماچ دەکات، هیچ هونەر نیە،

---

١) وە لە ریوایەتێکی دیکە هاتوە: (عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: عَرَضَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ رَجُلٌ عِنْدَ الْجَمْرَةِ الأُولى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ، فَلَمَّا رَأَى الْجَمْرَةَ الثَّانِيَةَ سَأَلَهُ، فَسَكَتَ عَنْهُ، فَلَمَّا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الغَرْزِ لِيَرْكَبَ قَالَ: "أين السائل؟" قَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: "كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ ذِي سُلْطَانٍ جَائِرٍ") رواه ابن ماجة: (٤٠١٢)، وقال الألباني: حسن صحيح.

ئەوە ئازایەتییە، تینی سەری خۆت لێبیءو حەقیء بڵێی، تینت لێبیء لەسەرت بدەنو حەقیء بڵێی، وەك لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ هەر لەوبارەیەوە دەفەرمویء: (سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ حَمْزَةُ بن عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَرَجُلٌ قَامَ إِلَى إِمَامٍ جَائِرٍ فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ فَقَتَلَهُ) رواه الحاكم وقال: صحيح الإسناد[1]، واتە: {گەورەی شەهیدان (حەمزەی کوڕی عەبدولموتەللیب)ە، وە پیاوێکە هەڵدەستیء لەلای پێشەوایەکی ستەمکار فەرمانی پێدەکات بە چاکەو ڕێگریی لیء دەکات -لە خراپە-، ئەویش دەیکوژیء}، ئەوە گەورەترین شەهیدە، گەورەترین شەهید حەمزەیەو ئەو کابرایەیە، مانای وایە دەگونجیء ئینسان لە گوتنی حەقێشدا سەری خۆی لەسەر دابنیء، جا گوتنی حەق لەو جێیەدا گەورەترین جیهادە، ئەگەرنا مادام هیچ ئەرکت نەکەوێتەسەر، هیچ ئازایەتی نیە.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ گوتنی قسەی هەق و، خستنەڕووی هەقی لەلای حوکمڕانانی ستەمکاری، بە چاکترین جۆری جەنگو جیهاد داناوە، تاوەکو مسوڵمانان هانبدا کە هەرگیز لە هەق گوتن نەسڵەمنەوە و، دڵنیابن کە هەڵسانیان بەو ئەرکە گرنگە بە چاکترین شێوەو جۆری جیهاد لەڕێی خوادا، بۆیان لەقەڵەمدەدریء!

قسەی هەق گوتن لەلای حوکمڕانو کاربەدەستانی مسوڵمانان، ئەرکێکی گەورەی سەرشانی مسوڵمانانە، تەنانەت ئەگەر ئەو حوکمڕانو کاربەدەستانە ستەمکارو خوێنڕێژیش بن! بۆیە دەفەرمویء: قسەی هەق گوتن لەلای حوکمڕانی ستەمکار گەورەترین جیهادە، چونکە مەترسیی تێدایە، ئەدی ئەگەر ستەمکار نەبوو، دەبیء هەقی پێنەڵیء؟ هەردەبیء بیڵیء، بەلام دیارە ئەگەر لەلای

---

١) الترغيب والترهيب من الحديث الشريف، ج: (٣)، ص: (١٧٨)، ورقم الحديث: (٣٤٠٤).

حوکمڕانی ستەمکار پێویست بوو هەق بڵێی، ئەوە لەلای دەسەڵاتدارێکی چاکەکار کە چاوی لە ستەم نیە، هیچ ئازایەتی تێدا نیە و، چاکتر فەرزو پێویستە! چونکە لەلای ستەمکارەکە مەترسیی هەیە، بەڵام لەلای چاکەکارەکە هیچ مەترسیی نیە و، دوو جار لەسەرت واجب دەبێ، چونکە لەوانەیە هەندێ کەس بڵێ: ئیللا دەبێ حوکمڕانەکە ستەمکاربێ ئەوجار من دەچم چاکترین جیهاد (أفضل الجهاد)ی لەگەڵدا دەکەم! نا مەرج نیە، ئەگەر ستەمکاریش نەبوو، تۆ دەبێ هەقی خۆت هەر بڵێی، بەڵکو زیاتر پێویستە، چونکە ئەو هیچ مەترسییەکی لێ نیەو لەوانەیە سوپاسیشت بکات، وەك عومەری کوڕی خەتتاب ـ خوا لێی رازی بێ ـ دەیگوت: (رَحِمَ اللَّهُ امْـرَءًا أَهْدَى إِلَيَّ عُيُوبِي)، واتە: (خوا بەزەیی بە کەسێکدا بێتەوە کە کەمو کوڕییەکانی خۆمم بەدیاری بۆ دەنێرێ)، وە دەیگوت: (أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ مَـنْ رَفَعَ إِلَيَّ عُيُوبِي)[1]، واتە: (خۆشەویسترین کەس لەلام ئەو کەسەیە کە کەمو کوڕییەکانی خۆمم پێشاندەدات)[2].

وە ئەبو بەکر ـ خوا لێی رازی بێت ـ یەکەم رۆژ کە هەڵبژێردراو وتاریدا گوتی: (فَإِنْ أَحْـسَنْتُ فَـأَعِينُونِي، وَإِنْ أَسَـأْتُ فَقَوِّمُـونِي)[3]، واتە: (ئەگەر چاکەم کرد

---

١) الطبقات الكبـرى لابن سعد، ج: (٣)، ص: (١٥٦).

٢) وە عومەر ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەیگوت: (إِذَا رَأَيْتُمْ مِنِّي اعْوِجَاجًا فَقَوِّمُونِي)، واتە: (ئەگەر لارییەکتان لە مندا بینی راستم بکەنەوە)، جا یەکێك لە هاوەڵان لەوێ بوو گوتی: (وَاللهِ لَوْ رَأَيْنَا فِيكَ اعْوِجَاجًا لَقَوَّمْنَاهُ بِسُيُوفِنَا)، واتە: (سوێند بە خوا ئەگەر لارییەکت لێ ببینین بە شمشێرەکانمان راستی دەکەینەوە)، هەندێك لەوێ بوون گوتیان تۆ چۆن قسەی وا بە ئەمیری ئیمانداران دەڵێی؟! عومەر ـ خوا لێی رازی بێ ـ فەرمووی: لێی گەڕێن، سوپاس بۆ ئەو خوایەی لە رەعیەتی عومەردا کەسێکی وای داناوە، کە ئەگەر عومەر لاربێ ئەو بە شمشێر راستی دەکاتەوە.

٣) (تاريخ الخلفاء للسيوطي ص٦٩)، و(السيرة النبوية لابن هشام) ج: (٤)، ص: (٣٩٣).

هاوکارییم بکەن، وە ئەگەر خراپەشم کردو لارییەکتان لە مندا بینی ڕاستم بکەنەوە).

وە ڕۆژێکیان عومەری کوڕی خەتتاب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لەکاتێکدا کە بەگشتی قسەی لەگەڵ مسوڵماناندا دەکرد، ئەم وتووێژەی بوو لەگەڵ پیاوێك لە مسوڵماناندا:

{– يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ! مَاذَا تَقُولُونَ لَوْ مِلْتُ بِرَأْسِي إِلَى الدُّنْيَا هَكَذَا (وَأَمَالَ رَأْسَهُ)؟!

– فَقَامَ رَجُلٌ[1] فَقَالَ: كُنَّا نَقُولُ بِالسَّيْفِ كَذَا (وَأَشَارَ إِلَى القَطْعِ)،

– فَقَالَ عُمَر: إِيَّايَ تَعْنِي؟!

– قَالَ: نَعَمْ إِيَّاكَ أَعْنِي بِقَوْلِي.

– فَقَالَ عُمَر: رَحِمَكَ اللهُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي رَعِيَّتِي مَنْ إِذا تَعَوَّجْتُ قَوَّمَنِي}[2].

واتە:

{ـ ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان! ئەگەر ئاوا سەر بەرەو دنیا بسووڕێنم (سەریشی خوارکردەوە) چی دەڵێن؟!

ـ پیاوێك هەڵساو گوتی: ئێمە بە شمشێر ئاوامان دەکرد (وە ئاماژەی کرد بە بڕین).

ـ عومەر گوتی: مەبەستت منە؟!

---

١) ئەو پیاوە بەڕێزە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بوو – خوا لێی ڕازی بێت ـ، کە یەکێك بووە لە هاوەڵە ئازاو چاونەترسەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢) الرياض النضرة في مناقب العشرة، تأليف: المحب الخطيب.

ـ گوتی : بەڵێ مەبەستی قسـەکەم تۆیـە .

ـ عومەر گوتی: خـوا رەحمـەت پـێ بکـات، سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە لـە کۆمەڵگاکـەمدا کەسی وایداناوە، کە ئەگەر لاربم راستم دەکاتەوە} .

ئەها تەماشا بکەن عومەر ـ خوا لێی رازی بێ ـ چـەند حـوکمڕانو خەلیفەیـەکی دووربینو بەسەلیقە بووە!! ویستوویەتی میللـەت فێـری جورئـەت بکـات، فێـری ئازادییو هەقبێژییان بکات، چونکە میللەت کە نەیتوانی هەق بڵـێو رەخنـە بگـرێ، مانای وایـە زینـدوویەتی تێدا نەمـاوەو بـە کـەڵکی هـیچ نایـێ، پێغەمبـەریش ﷺ فەرموویەتی: {إِذا رَأَيْتَ أُمَّتِـي تَهَـابُ فَـلا تَقُـولُ لِلظَّـالِمِ يَـا ظَـالِمٌ فَـقَدْ تُـوُدِّعَ مِنْهُمْ}[1] قال الحاكم في الـمستدرك: (٧٠٣٦) هذا حديث صحيح الإسناد و لـم يخرجـاه، وقال الذهبـي في التلخيص: صحيح‌ واتە: (ئەگەر ئۆممـەتی منـت بینی کـە دەترسا لەوەی بە سـتەمکـار بڵـێ: تـۆ سـتەمکـاری! ئـەوە خواحافیزییـان لـێ کراوەو بەکەڵکی هیچ نەماون)، یانی: زیندووێتییان تێـدا نەماوە .

هەڵبەتە حوکمڕانـانیش زۆر دەور دەبیـنن لـەوەدا کـە خـەڵك فێـری جورئـەتو ئازایەتییو بوێرییو هەقبێژیی بکـەن، یـاخود سـەری بکوتنـەوەو وای لێبکـەن کـە مەگەر لە دڵی خۆیدا لەعنەتیان لێبکا، ئەگەرنا نەوێرێ دوو وشە بڵێ، بەڵام ئەوانەی هەمیشە میللەتو کۆمـەڵگای خۆیـان هانـدەدەن، لەسـەر هەقبێـژییو جورئـەتو بوێرییو ئازایەتییو ئازادیی بیروڕا، ئەوانە هەمیشە قـازانج دەکـەن، ئەویدیکـە کـە وادەکات خەڵك هەمووی رقی لـێ هەڵبستێو لە دڵـدا بیبوغزێنـێ، بـەڵام نـەوێرێ

---

١) وقال البيهقي: (والـمعنى في هذا: أنهم إذا خافوا على أنفسهم من هذا القول فتـركوه، كانوا مما هـو أشد منـه و أعظم من القول والعمل أخوف و كـانوا إلـى أن يَـدَعوا جهـاد الـمشركين خوفًـا علـى أنفسهم و أموالهم أقرب و إذا صاروا كذلك فقد تُوُدِّعَ منهم و استوى وجـودهم و عـدمهم)، شـعب الإيـمان، ج: (٦)، ص: (٨١).

دەربڕیێ، ئەوە لە هەقیقەتدا ڕۆژبەڕۆژ تەمەنی خۆی کورتدەکاتەوەو خۆشی دەخاتە عەزابەوەو، وا دەکات لە ئاست هەموو کەسدا لە خۆی بترسێ.

ئینجا گرنگە ئەوەیە کە هەق گوتن گرنگە، بەڵام چۆنیەتییەکەشی بەڕاستی زۆر گرنگە، دەبێ وریابن‌و بزانن کە خودی هەق گوتن‌و هەڵە ڕاستکردنەوەکە، چەندە گرنگە، شێوازو چۆنێتییەکەشی هێندەو بگرە زیاتریش، ئینسان دەبێ هەق بڵێ، بەڵام دەبێ بخەفتێ‌و بە شێوەیەکی هەقیش بیڵێ‌و شێوازێکی گونجاوی بۆ هەڵبژێرێ، زۆرجار ئەو نموونەیەم هێناوەتەوە: ئەگەر ئینسان بیەوێ شانە هەنگوینێکی زۆر جوان‌و ئەسڵ بۆ میوانێکی دابنێ، ئەوە لە کوێ کە لەسەر سینییەکی خاوێن دایبنێ‌و پەشتەماڵێکی بەسەردا بدات‌و بە جوانیی بیهێنێ، وە ئەوە لە کوێ کە لە قاپێکی ژەنگاویی باوێ و، پەڕۆیەکی چڵکنی بەسەردا بدا؟ بە تەئکید هەرچەند هەنگوینی باش بێ، میوانەکەی تەبیعەتی نایبا، کەواتە دەبێ مسوڵمانان هەقگوتن‌و شتی ڕاست‌و هەق خستنە بەرچاوی کاربەدەست‌و مشوورخۆرانیان، بە فەڕزو ئەرکی سەرشانیان بزانن، بەڵام دەبێ هەق گوتنەکەش بە شێوەیەکی هەق‌و چاك بێ، خوای دادگەر ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَ... ﴿١٠٥﴾﴾ الإسراء، واتە: (وە قورئانمان بە شێوەیەکی هەق ناردۆتە خوارێ‌و، هەقیشی تێدا نێرراوەتە خوارێ ...)، ئێمەش دەبێ قسەی هەق بکەین‌و، بە شێوەیەکی هەقیش بیکەین.

لەوانەیە بیستبتان کە کابرایەك چووە بۆ داخوازی کچێکی کابرایەکی دی‌و بە شێوەیەکی ناجۆر داخوازی کردوە، گوتوویەتی: هاتووین ئەو کچەی خۆت بدەی بە فلان کەس‌و بیکاتە خێزانی خۆی، دیارە ئەویش تووڕە بووەو داواکەی ڕەفزکردوون، بەڵام بێگومان ئەگەر گوتبایان: ئێمە ئەو جەماعەتە هەموو هاتووین لەبەرئەوەی کە ئێوە بە ماڵێکی باش‌و بە بنەماڵەیەکی بەڕێزو چاك دەزانین، هاتووین پێمانخۆش بوو کە خزمایەتییتان لەگەڵدا بکەین، یان گوتبایان: هاتووین گوڵێکتان

لە باغەكەتاندایە پێمانخۆشە پێشكەشمانی بكەن، یان گوتبایان: هاتووین فلان كەس بكەن بە كوڕی خۆتان، ئەوە بێگومان ئەو جۆرە تەعبیرانە هەڵوێستێكی دیكەیان لە بابای داخوازیی لێكراودا پەیدادەكرد، بەڵێ تەعبیرو شێوازی دەربڕین زۆر دەور دەبینێ، بۆیە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: (أُءْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ بِالْمَعْرُوفِ، وَانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ لا بِالْمُنْكَرِ)، واتە: (بە شێوەیەكی چاك فەرمان بە چاكە بكەو، قەدەغەی خراپە بكە، بەڵام بەشێوەیەكی خراپ نا)!

دیارە بە ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو پەسندی شەرعییەوە مامەڵەكردن لەگەڵ هەموو كەسدا هەر پێویستو گرنگە، خۆ دەبێ مرۆڤ لەگەڵ هەموو كەسدا بە ئەدەبی شەرعییو ڕەوشتی جوانو بە ڕێزو حورمەتەوە مامەڵە بكات، بەڵام بە تەئكید لەگەڵ حوكمڕانو بەرپرسانی شەرعییدا، گرنگترو پێویسترە، چونكە هەم ئەوان هەقیان زیاترەو ئەركیان قورسترە، كەسێك كە بۆ خۆی تەنیا لە بەرانبەر خۆیدا بەرپرسیارە، جیایە لەوەی كە لە بەرانبەر خەڵكێكدا بەرپرسیارە، كەسێك كە ئەركو باری قورسترە، دیارە هەقو مافیشی گەورەترە لەسەر مسوڵمانان، مادام ئەركی قورستری لەسەر شان بێ، دیارە مافی زیاتریشی هەیە، وە هەم هەق گوتن بە بەرپرسو مشوورخۆر، ئەگەر بە ئەدەبو حورمەتو ڕێزەوە بێو بە شێوەیەكی جوان بێ، چاكتر بەرهەمی دەبێو كاریگەریی زیاتری دەبێو چاكتر نیشانە دەپێكێو، زیاتر ئومێدی ئەوەی لێدەكرێ قسەو ڕەخنەو پێشنیارەكە وەربگیرێ، لەبەرئەوە پێویستە بەوپەڕی ئەمیەت پێدانو لێوردبوونەوەوە، ئەم كارە ئەنجامبدرێ.

ئینجا كۆتایی ئەم باسە بەم بەسەرهاتە دێنین، دەڵێن: جارێك یەكێك لە زانایان بە شێوازێكی توندو كرچو كاڵ ئامۆژگاریی یەكێك لە خەلیفەكانی عەبباسیی دەكات، دیارە حوكمڕانەكەش ئەهلی عیلم بووەو شارەزا بووە – چونكە زۆربەی

دەسەڵاتدارانی ئەو کاتە ئەهلی عیلم بوونو شارەزا بوون ـ، دوای ئەوەی زانایەکە بە توندی قسەکانی خۆی دەکاتو تەواودەبێ، ئەویش هیچ خۆی تێکنەداو پێی دەڵێ: بەڕێز فلانە کەس! خوا جَلَّ جَلَالُهُ یەکێکی زۆر لە تۆ باشتری ناردە لای یەکێکی زۆر لە من خراپتر، (مووساو هاڕوون)ی ناردن بۆ لای (فیرعەون)، کە (مووساو هاڕوون) هەرچۆنێك بن لە تۆ چاکترن، (فیرعەون)یش هەرچۆنێك بێ هەر لە من خراپترە، کەچی خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بە (مووساو هاڕوون)ی بڕای علیهما السلام فەرموو: ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾﴾ طه، واتە: (قسەیەکی نەرمو نیانی لەگەڵ بکەن، بەڵکو هەقی بکەوێتەوە یاد یان لە خوا بترسێ)! واتە: کە تۆ بتەوێ ئەو ئینسانە هەقیقەتی بیربکەوێتەوە، یاخود ترسی خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى ی بچێتە دڵ، دەبێ دەروازەی دڵی پێبزانیو، پێویستە بە نەرمییو لەسەرەخۆ ئامۆژگاری بکەی، بە ڕەقییو توندیی قسە وەرناگیرێ، منداڵێکی گچکە تێوەی بخوڕە، لێت هەڵدەگەڕێتەوەو قسەکەت وەرناگرێ، ئەوە لە کوێو ئەوەش لەکوێ دەستێکی بەسەردا بێنیو ماچێکی لێ بکەیو بڵێی: ئەو شتە ئاوا بکە، کوردەواریی خۆشمان دەڵێ: (ماریش بە قسەی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ)، جا ئەوە کە وایان گوتوە مەبەستی دیکەیان هەبووە، ئەگەرنا مار سەد قسەی خۆشی بۆ بکەی نایەتە دەرەوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە مار دەچێتە کونێکەوە جاری وایە کلکی نەچۆتە کونەکەوە، ئەگەر بتەوێ بیهێنیە دەرێ، کە کلکت گرت دەبێ شلەو توندەی پێ بکەی، ئەگەر هەر ڕایکێشی ئەویش خۆی چیڕ دەکاتەوە بۆت نایەتەدەرێ، مەگەر کلکی بپسێ، بەڵام تۆ دەبێ بۆی شل بکەی، ئەویش خۆی شل دەکات، ئینجا ڕایکێشی، ئاوا دێتە دەرێ، بەڵام تۆ یەك تەکان بۆ ئەم لایە تێی دەنووسێی، ئەویش بۆ ئەو لای تێدەنووسێ، وەك دژە ئاڕاستە (الإتجاه المعاكس) ناگەنە ئەنجام.

## پوختـەی قسـان:

لەگـەڵ مـشوورخۆرو بەرپرسـاندا پێویـستە ئینـسان ئەوەنـدەی بـۆی دەكـرێ، شێوازی جوانو تەعبیری شیرینو وشەی رێـك بـەكاربێنێ، بـە شـێوەیەكی وا كـە كاریگەریی هەبێ لەسەر دڵو دەروونیو ئەو حەقەی كە پێتە لێـت وەربگـرێ، نـەك بەهۆی ئەو شێوازە ناهەقەی كە بەكاری دێنی، ئەو هەقەش كە پێتـە بەسـەرتدا رەت بكرێتەوە.

خوای پەروەردگار بە لوتفو كەرەمی خـۆی شـارەزامان بكـاتو وامـان لێبكـا هـەقێ بڵـێینو بـە شـێوەیەكی هـەق بیڵـێین، چ لەگـەڵ بەرپرسـانداو چ لەگـەڵ دەوروبەرمانو چ تێكڕای خەڵكدا.

# بنەمای شەشەم

**خۆشەویستی و ڕێز لەنێوان ئەندامانداا بەگشتی و، قیادە و قاعیدەدا بەتایبەت و، خۆپاراستن لە هەرچی پێچەوانەی ڕێز و خۆشەویستییە.**

# بنەمای شەشــەم

## خۆشەویستی و ڕێز لەنێوان ئەندامانددا بەگشتی و، قیادەو قاعیدەدا بەتایبەت و، خۆپاراستن لە هەرچی پێچەوانەی ڕێزو خۆشەویستییە.

خۆشەویستیو ڕێزو حورمەتو وەفای دووسەرە (المتبادل) لەنێوان سەرجەم ئەندامانددا بە گشتیو قیادەو قاعیدەدا بە تایبەت، وە داخستنی دەرگای غەیبەتو قسە هێنانو بردنو تانە لێدانو زەم کردنو ... هتد، وە دڵ ساغ (سلیم) بوون و دەمو دەست سەلامەت بوون لەگەڵ یەکدی، وە خۆپاراستن لە هەر جۆرە دەمارگیریی یەك (تَعَصُّب) بۆ دەستەو تاقمو ناوچەو شارو تیرەو عەشیرەتو ... هتد، چونکە:

١- خوای کاربەجێو دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة، واتە: (بڕوادارانی پیاوو ئافرەت هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن – یان سەرپەرشتیاری هەندێکیانن-، فەرمان بە شتە پەسندەکان دەکەنو قەدەغەی شتە ناپەسندەکان دەکەن، وە نوێژ بەرپا دەکەنو زەکات دەدەن، وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە بێگومان خوا بەزەیی پێیاندادێ، بە تەئکید خوا زاڵی کاربەجێیە).

٢- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَفَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ) رواه مسلم: (٥٤)، وأبو داود: (٥١٩٣)، وابن ماجه: (٦٨)، والترمذي: (٢٦٨٨)، عن أبي هريرة ﷺ، وصححه الألباني، واللفظ لأصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ سوێند دەخوا بە خوا ﷻ و دەفەرموێ: (سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، ناچنە بەهەشتێ هەتا ئیمان، نەهێنن، ئیمانیش ناهێنن هەتا یەكدیتان خۆشنەوێ، ئایا شتێكتان پێبلێم ئەگەر بیكەن یەكدیتان خۆشبوێ؟ زۆر سەلام لە یەكدی بكەن).

٣- هەروەها فەرموویەتی: (لاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ) رواه البخاري: (٦٠٦٥) واللفظ له، ومسلم: (٢٥٥٩) عن أنس بن مالك ﷺ. واتە: (ڕقتان لە یەكدی نەبێتەوەو، ئێرەیی بە یەكدی مەبەن و، پشت لە یەكدی مەكەن و، لە یەكدی دامەبڕێن، وە ئەی بەندەكانی خوا! پێكەوە برا بن، وە حەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك كە لە سێ ڕۆژان زیاتر دەنگ لە برای مسوڵمانی ببڕێتەوەو قسەی لەگەڵدا نەكا).

٤- هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ قُتِلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ يَدْعُو عَصَبِيَّةً أَوْ يَنْصُرُ عَصَبِيَّةً فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ) رواه مسلم: (١٨٥٠) واللفظ له، والنسائي: (٤١١٥)، واتە: (هەر كەسێك لەژێر ئاڵایەكی كوێرانەدا بكوژرێ، بانگەواز بۆ دەمارگیریی بكات، یان پشتگیریی دەمارگیریی بكات -پاشان بكوژرێ-، ئەوە بە شێوەیەكی نەفامانە كوژراوە).

## ڕوونكــردنەوە:

بۆ شـیكردنەوەی واتـاو چـەمكی ئـەم بنـەمای شەشـەمە، لـەم چـوار خاڵـەدا، نێوەڕۆكەكەی دەخەینەڕوو، لە خاڵی یەكەمیشیاندا تیشكێك دەخەینەسـەر چـەمك‌و واتای ئایەتی ژمارە (٧١)ی (التـوبة)، كە هەوێن‌و بناغەی ئەم بنەمای شەشـەمەیە:

### یەكەم: شیكردنەوەی چەمكی ئایەتی ژمارە (٧١)ی (التوبة):

خوای بەرزو مەزن لـەم ئایەتـە بـەپێزەدا بڕوادارانـی پیـاوو ئـافرەتی بـە هـەردوو ڕەگـەزی نێـرو مـێ وە، بـە دۆسـت‌و پـشتیوان‌و مـشوورخۆرو سەرپەرشـتیكارو هاوكاری یەكدی پێناسە دەكا، جا خوا ﷻ لە چەند ئایەتێكی پێش ئەم ئایەتەدا باسی دووڕوو (منـافق)ەكان دەكـات‌و دەفـەرموێ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ... ﴿٦٧﴾ ﴾ التوبة، واتە: (پیاوانی دەغەڵ‌و ئافرەتانی دەغەڵ هەندێكیان لـە هەندێكیانن ...)، بەڵام سەبارەت بە بـڕواداران دەفـەرموێ: هەنـدێكیان دۆسـت‌و پشـتیوانی هەندێكـیانن، جا ئایا ئەوە چی لێوەردەگیرێ؟ ئەوەی لێـوەردەگیرێ كـە پەیوەندیی ئەهلی ئیمـان پێكەوە، پەیوەندییەكی دۆستانەو ڕیشەیی (صَـمِیمِي)یـەو، پەیوەندییەكە لە دڵ‌و دەروونەوە هەڵدەقوڵێ، بـەڵام پەیوەنـدیی مونـافیق‌و دەغـەڵ‌و كافرەكان پێكەوە، پەیوەندییەكی ڕووكەشـیی‌و ڕواڵـەتیی‌و دنیاییـە، پەیوەندییـەكی مادديی‌و كاتی‌یە، بۆیە بۆ وان هەر دەفەرموێ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ... ﴿٦٧﴾ ﴾ التوبة، واتە: بەس پەیوەندییان پێكـەوە هەیـە، سـەرو كاریـان لەگەڵ یەك هەیە، بەڵام دۆست‌و پشتیوانی یەكدی نین‌و، ساغ‌و دڵـسۆز (صَـمِیمِي)

نین لەگەڵ یەکدی، جا لەبارەی ئەوانەوە دەفەرمویٰ: ﴿... يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾﴾ التوبة، واتە: (... فەرمان دەکەن بە شتی ناپەسندو ڕێگریی دەکەن لە شتی پەسند و، دەست دەنووقێنن ـ لەجیاتی ببەخشن دەست دەگرنەوە ـ، وە خوایان لەبیرچووەو خواش ئەوانی لەبیرچووە ـ واتە ئیهمالی کردوون ـ، بێگومان دووڕووەکان خراپەکارن).

لەبارەی بڕوادارانیشەوە، دوای ئەوەی رایدەگەیەنیٰ کە دۆستو پشتیوانو هاوکارو هاودەمو مشوورخۆری یەکدین، بە شەش وەسف پێناسەیان دەکاتو دەفەرمویٰ: ﴿... يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾﴾ التوبة، وەك دەبینین لەم ئایەتەدا خوا ﷻ بە شەش وەسف پێناسەی ئیمانداران دەکاتو شەش خەسڵەتی تێدا خستوونەڕوو، کە پێکەوە بە هێنانەدییان هەڵدەستن، کە بریتین لە:

أ/ ﴿يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ واتە: فەرمان بە شتە پەسندەکان دەکەن: دیارە وشەی (المعروف) ئەلیفو لام (أل)ی لەسەرە کە لە زمانی عەرەبیدا کاتێك ناو ئەلیفو لام (أل)ی چووە سەریٰ، ئەوە دەلالەت لەسەر (إِسْتِغْرَاق) دەکات، دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە (جِنْس)ی ئەو شتە هەمووی دەگرێتەوە، کە گوتمان: (الكتاب) واتە هەموو کتێبێك یاخود ئەو کتێبەی کەوا زانراوە (معهود)ە، وە کە گوتمان: (المعروف) واتە هەرچی چاکەیە،

وە کە گوتمان: (الـمنکر) واتە هەرچی خراپـەیە، لـە زمـانی کوردیـدا شـتێکی وامان نیـە، وشەیەك بێو پیتێـك بێ، هـەموو تاکـەکانی ئـەو شـتە بگرێتـەوە، بەڵکو دەبێ بڵـێین: هەموو شتە پەسـندەکان، یـان هـەموو شـتە ناپەسـندەکان، بەڵام یەکێك لە تایبەتـمەندییەکانی زمانی عەرەبی، ئەوەیە کە بە پیتـێك یەك بـار مانا دێنێتـەگۆڕێ.

(معـروف) واتـە: چـاکە، بـەڵام (الــمعروف) هەرچـییەکی چـاكو پەسـندە هـەمووی دەگرێتـەوە، وە (منکـر)، واتـە: شـتی نەناسـراوو ناپەسـند، بـەڵام (الـمنکر) هەرچی شتی ناپەسندو خراپە هەمووی دەگرێتـەوە، جـا یـەکێك لـە خەسڵەتەکانی ئیمـانداران ئەوەیـە کە هەرچی شـتی باشو پەسـندە فەرمـانی پێ دەکەن، واتـە چ پەیوەندیی بە لایـەنی عەقیـدەو فیکـرەوە هـەبێ، چ پەیوەنـدیی بەلایەنی عیبادەتەوە هـەبێ، چ بەلایـەنی ئـەخلاقو هەڵـسوکەوتەوە هـەبێ، چ بەلایەنی حوکمو سیاسەتەوە، چ بەلایـەنی بازرگـانییو ئـابووریی‌یـەوە، چ بـە لایەنی جەنگو ئاشتییەوە ... هتد، بەڵێ یەکەم سـیفەتی ئیمانـداران ئەوەیـە کـە فەرمان دەکەن بە هەرچی شتی پەسندو چاکە، ئـەویش بـەهۆی پـشتی یەکـدی گرتنـیانەوە، چونکە پێـشـتر دەفـەرموێ: ﴿... بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ...﴿٧١﴾﴾ التـوبة، واتە: (... هەنـدێکیان پـشـتیوانی هەنـدێکیانن ...). چـونکە، ئایـا چ ئیماندارانێك دەتوانن فەرمان بە هەموو شتێکی چاكو پەسـند بکـەن؟ بێگومـان ئیماندارانێك کە پێکـەوە تۆکمەو تونـدوتـۆڵ بن، دۆستو پشـتیوانی یەکـدی بن، هاوکاری یەکدی بن، ئەگـەرنا تۆ بە تەنیا بچـۆ داخـۆ دەتوانی بە تـەنیا لـە بازاڕ دوکانی مەشرووب فرۆشیی داخـەی؟ یاخود کەسێك سـتەم دەکـا، خراپـە دەکا، گەندەڵیی دەکـا، ئایا دەتـوانی ڕێـی لێبـگری؟ بێگومـان نـا، بۆچـی؟

چونكە مسوڵمانان یەكگـرتوو نین‌و وەك خوا ﷻ دەفەرمویٚ واین‌و هەنـدێكیان دۆست‌و پشتیوانی هەندێكیان نین، بـەڵكو هەنـدێكیان دوژمنـی هەنـدێكیانن، لەبەر نەزانیی‌و بیٚ ئاگایی‌یان لە دینەكەیان.

ب/ ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾، واتـە: (قەدەغـەی شـتە ناپەسـندەكان دەكـەن)، هەرچی شتی خراپ‌و ناپەسندە قەدەغەی دەكەن‌و ڕێی لێدەگرن، ئەمیش دیسان ئەلیف‌و لام (أل)ی لەسەرە، (الـمنكر) واتە هەرچی ناپەسندەو خراپەیـە، جـا ئەویش سەرجەم جۆرەكانی خراپە دەگرێتـەوە، هەر لە شیرك‌و كوفرو نیفاقـەوە كـە پەیوەندییـــان بـە لایـەنی فیكریـی‌و عەقیدەییـــەوە هەیـــە، هەتـــا تێكـڕای جۆرەكانی گونـــاەو سەرپێـچیی بـە گـەورەو گـچكـەو پـەنهان‌و ئاشـــكراوە، هەرچی خراپەیە هەرچـی زەرەری هەیـە بـۆ دنیـاو دوارۆژی ئینسان بـۆ تـاك‌و كۆمەڵ‌و خێزان‌و ... لە هەموو بوارەكانی ژیاندا بە ناپەسـند (مُنْكَـر) دادەنـریٚ، ئیمانداارانی پیاوو ئافرەت لەسەر بناغەی دۆست‌و پشتیوانی یەكدی بـوون، ڕیٚ لە هەموو شتە ناپەسندو خراپەكان دەگرن.

ج/ ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، واتـە: (وە نوێـژ بەرپادەكـەن): دیـارە نوێـژیش گەورەترین‌و زەقترین ڕەمزی بەندایـەتی ئەهلی ئیمانـە بۆ خوای پـەروەردگاری بیٚ وێنـــەو هـاوەڵ.

د/ ﴿وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، واتـــە: (وە زەكـــات دەدەن): كـــە گرنگـــترین‌و كاریگـەرترین دروشـمــەو، نیـشانەی دۆسـتایەتی‌و بەتـەنگ یەكدییـەوەبوونی بڕوادارانە، ئەگەر نوێـژ هـەقی خوایە ﷻ، زەكاتیش هەقی خەڵكی خوایـە، وە ئەگەر نوێژ ڕەمزی جۆری پەیوەندیی مرۆڤی مسوڵمانە لەگـەڵ خـوادا ﷻ، كـە

بریتیە لە كڕنووش بۆ بردنیو ركووع بۆ بردنیو لە خزمەتدا وەستانیو ئەوپەڕی ئەدەبو ڕێزو حورمەت پێشاندان بەرانبەر بە خوا ﷻ، كە ئاشكرایە ئەوپەڕی ملكەچیی بۆ خوا لە نوێژدایە، ئەوا زەكاتیش ڕەمزو هێمای جۆری پەیوەندیی ئینسانی مسوڵمانە لەگەڵ كۆمەڵگادا، كە بریتیە لە بەخشینو هاوكاریی كردنو چاكە لەگەڵدا كردنی.

هـ ، و/ ﴿ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ﴾، واتە: (وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن): كە بێگومان ئەو چوارەی ڕابردوو (فەرمان كردن بە چاكەو ڕێگریی كردن لە خراپەو، نوێژ بەرپاكردنو زەكات دان)و گەلێك شتی دیكەشو سەرجەم شەریعەتیش، هەر دێنەوە نێو فەرمانبەریی كردنی خوا ﷻو فەرمانبەریی كردن بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، چونكە فەرمانبەریی كردن بۆ خوا ﷻو پێغەمبەرەكەی ﷺ، واتە: پابەندیی بە قورئانو سوننەتەوە، قورئانو سوننەتیش ئەو چوارانەی پێشتریش دەگرنە خۆیانو، غەیری ئەو چوارانەش دەگرنە نێو خۆیان، وە فەرمانبەرییكردنی تەواو بۆ خوا ﷻو پێغەمبەرەكەی ﷺ، تەنها بە كەسانێك دەكرێ كە موو بە موو بە تێكڕای ئایەتەكانی خوا ﷻو سوننەتەكانی پێغەمبەری خواوە ﷺ پابەند بن، دیارە تەنیا كەسانێكی ئاواش شایستەی ئەوەن كە خوای خاوەن بەزەیی ﷻ، بەزەیی پێیاندا بێتەوە و، لێیان خۆشبیو بیانبەخشێ.

لە كۆتایی ئایەتەكەشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ ... ﴿٧١﴾﴾ التوبة. واتە: (... ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندادێ ...). خوا بەزەیی بە چ جۆرە مسوڵمانێكدا دێ؟ لەگەڵ چ جۆرە مسوڵمانێكدا بە لوتفو كەرەمە؟ سۆزو بەزەیی لەگەڵ كێیە؟ لەگەڵ كەسانێكە كە خاوەنی ئەو شەش سیفەتانەن.

ئینجـا دوای ئـەوە دەفـەرموێ: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾﴾ التوبـة، واتە: (... بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیـە)، زاڵە بۆئەوەی کە دوژمنانی مـسوڵمانان لە پەلوپۆ بخـا، وە هـەرکاتێك شایـستەی ئـەوەبوون تەختیـان بکـــا، تـا رێ بـۆ مسـوڵمانان چۆڵ بکـا، وە کاربەجێشـە دەزانـێ کەی دەیکـاو بۆکێـی دەکا، بەڵـێ خوا ﷻ کاربەجێ‌یـەو ئیشی بە هەوەنتـەو گۆترە ناکا، پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

کاکـە خوا کـاری نابەجـێ ناکـــات

تا کێـو نەبینـێ بەفـری تێنـاکـــــــا

دووەم: خۆشەویـستیو ڕێـزی دوو سـەرە، لـەنێوان سـەرجەم ئەندامانـدا بەگشـتیو، قیـادەو قاعیدەدا بەتایبـەت:

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: (وَالَّـذِي نَفْـسِـي بِيَــدِهِ[1] لاَ تَـدْخُلُوا الْجَنَّـةَ حَتَّـى تُؤْمِنُـوا[2] وَلاَ تُؤْمِنُـوا حَتَّـى تَحَـابُّوا، أَفَـلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْـرٍ إِذَا فَعَلْتُمُـوهُ تَحَابَبْــتُمْ؟ أَفْشُـوا السَّـلاَمَ بَيْنَكُـمْ) رواه مـسلم: (٥٤)، وأبـو داود: (٥١٩٣)، وابـن ماجـه: (٦٨)، والتـرمذي: (٢٦٨٨)، عن أبي هريــرة رضي الله عنه، وصـححه الألبـاني، واللفـظ لأصحاب السـنن، لێرەدا یەکێـك بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی کوا نوێژ؟ کـوا ڕۆژوو؟

١) چونکە ئایا ئەو ڕۆحە ئەمـانەتـە کە ئێمە بەوەوە ئینسـانین، لەبەردەسـتی کێدایــە؟ بێگومـان بەس لەبەردەسـتی خوادایە ﷻ، خوا ﷻ خستوویەتە نێو جەستەی ئێمەوەو، بـەس بـە خـواش ﷻ دێتەوە دەرێو، هـەتا خـوا ﷻ نەفـەرموێ ئـەو ڕۆحـە لـەو جەسـتەیە جیانابێتـەوە، وە لـە قیامەتێشـدا بەس خوا ﷻ دەتوانێ ئەو ڕۆحـە بخاتەوە ئەو جەستەیەوەو زیندووی بکاتـەوە، جـا بۆیە پێغەمبەر ﷺ سوێندی بەو سیفەتەی خوا ﷻ خواردوە.

٢) ئایا بەبێ ئیمان ئینسان دەچێتـە بەهەشـت؟ بەتەئکیـد نەخێر.

لـە وەڵامـدا دەڵـێین : لێـرەدا پێغەمبـەر ﷺ سـەرنجمان رادەکێـشێ بـۆ سـیفەتێکی کۆمەڵایەتیی ، کە زۆرجار مسوڵمانان لێی بێ ئاگا دەبن ، چونکە هـەر مـسوڵمانێك لێی بپرسی : دەزانێ کە نوێژ پێویستەو ئەوەی بیەوێ بە ئیمانـدار لـە قەڵـەم بـدرێ ، دەبێ نوێژ بکاتو رۆژوو بگرێو زەکـات بـداتو حـەج بکـات ، بـەڵام زۆربـەی مسوڵمانان نـازانن کـە دەبـێ یەکـدییان خۆشـبوێ ، ئـەوجار بـە ئیمانـدار لەقەڵـەم دەدرێـن ، جـا پێغەمبـەر ﷺ دەیـەوێ سـەرنجی ئێمـە رابکێـشێ ، بـۆ یـەکێك لـەو مەرجانـەی کـە خـەڵکی مـسوڵمانی پـێ دەبێتـە ئیمانـدار ، کـە بریتیـە لـە یەکـدی خۆشویـستنو پێکـەوە پەیوەسـت بـوونو پێکـەوە دۆسـت بـوون ، ئینجـا دوایـی دەفەرموێ : {أَوَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُـوهُ تَحَـابَبْتُمْ؟ أَفْـشُوا الـسَّلَامَ بَيْـنَكُمْ} ، سەلام لە یەکدی کردن هەر ئەوە نیە بەرێیـەدا بڕۆی بڵـێی (سـلام علـیکم) ، بـچۆ سەردانی ، بچـۆ لێـی بپرسـەو هەواڵی بپرسـەو ئاگات لێـی بـێو ... هتـد .

بەڕاسـتی ئـەو فەرمایـشتەی پێغەمبـەر ﷺ زۆر جـێی سـەرنجە ، وەك دەبیـنین پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئیمانی کردوە بـە کلیلـی کردنـەوەی دەرگـای بەهەشـتو هۆکاری چوونە بەهەشت دەفەرموێ : (ناچنە بەهەشـت هـەتا ئیمـان نـەهێنن) ، وە یەکـدی خۆشویـستنی بڕوادارانیـشی ، کـردوە بـە مـەرجی پەیـدابوونو بەڵگـەی ئیسـپاتی ئیمان !

ئینجـا سـەلام لـە یەکـدیکردنو هـەواڵ پرسـینو سـەردانکردنی یەکـدیو هاموشۆکردنی یەکـدیش ، دەکاتـە هۆکـاری گرنگـی پەیـدابوونی خۆشەویـستیو برایەتیی ، بەڵێ : دوای یەکدی خۆشویستن ، بوونی ئیمان ئیـسپات دەبـێ و ، دوای ئیمانیش ئینسان شایستەی چوونە بەهەشتە .

ئنجا یەكدی خۆشویستن‌و ڕێزو حورمەت لە یەكدی گرتنی مسوڵمانان[١]، زادەو بەرهەمی عەقیدەو ئیمان‌و بەندایەتی كردنیان بۆ خوا ﷻو برایەتییانە لەگەڵ یەكدیدا، بۆچی مسوڵمانان یەكدییان خۆشدەوێ‌و ڕێز لە یەكدی دەگرن‌و حورمەتی یەكدی دەگرن‌و بۆ یەكدی بە پەرۆشن؟ لە ڕاستیدا ئیمان بە خوا بوونیان‌و، ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بوونیان‌و، برایەتی لەگەڵ یەكدیدا كردنیان، ئەو هەڵوێستانەیان تێدا پەیدا دەكات، هەربۆیەش مسوڵمانان هەتا ئیمانیان دامەزراوتر بێ‌و، عیبادەتیان چاكتر بێ‌و، پارێزكارییان زۆرتر بێ، برایەتی‌و تەبایی‌و صەفای نێوانیشیان چاكترو پتەوتر دەبێ، تۆ تەماشا بكە! لەنێوان دوو برای مسوڵمان، یان دوو خوشكی مسوڵمان، یان براو خوشكێكی مسوڵماندا، كامیان لەویدیكە چاكترە لە بەرانبەرەكەی بۆ وی؟ لە ڕاستیدا ئەوەیان كە ئیمانی باشترە، هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە، كاتێك كە پرسیاری لێكراوە كە دوو مسوڵمان دەگەنە یەكدی كامیان پێشێ سەلام لەویدیكە بكات؟ فەرمووی: (أَوْلاهُمَا بِاللهِ)[٢]، واتە: (ئەوەیان كە لە خوا نزیكترە)، كامەیان لە خوا ﷻ نزیكتر بێ، ئەوەیان پێشتر سەلام لەویدیكە دەكات، چونكە بەڕاستی برایەتیی جێبەجێ كردن لەگەڵ مسوڵماناندا، بناغەكەی شتێكی مەعنەوییە، دیارە ئێمە برایەتیی ڕاستەقینە دەڵێین، نەك برایەتیی ڕووكەشیی‌و ڕواڵەتیی، ئەوە كە مرۆڤ لە دڵەوە مسوڵمانانی خۆشبوێ‌و، بۆیان بە پەرۆش بێ‌و، بە تەنگیانەوە بێ‌و، ڕێزیان لێ بگرێ‌و، خۆشیی وانی پێ خۆش بێ‌و، ناخۆشییانی پێ ناخۆش بێ، ئەوە لە حەقیقەتدا ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە ئیمانەوە هەیە.

---

١) مسوڵمانان بەگشتی، چ جای كۆمەڵێكی مسوڵمانان وەك كۆمەڵی ئیسلامیی.

٢) (عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، الرَّجُلَانِ يَلْتَقِيَانِ أَيُّهُمَا يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ: فَقَالَ: أَوْلَاهُمَا بِاللَّهِ) رواه الترمذي: (٢٦٩٤) وحسنه، و قال الألباني: صحيح.

هەر بۆیەش خوای كاربەجێ ﷻ لە سەرەتای سوورەتی (الأنفال)دا، بەرلەوەی فەرمان بە مسوڵمانان بكات كە نێوانیان چاكو پەیوەندییان پتەو بكەن، فەرمانی پێكردوون كە تەقوایان زیاد بكەنو پارێزكار بن، دەفەرموێ: ﴿... فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ... ①﴾ الأنفال، واتە: (... پارێز لە خوا بكەنو پەیوەندیی نێوانتان چاك بكەن ...). پێشێ فەرمانیان پێدەكات بە تەقوا، ئەوجار فەرمانیان پێدەكات بە برایەتییو بە پەیوەندیی نێوان چاككردنو دۆستایەتیكردن، چونكە لە راستیدا ئەوەی لەگەڵ خوا ﷻ راست بێ، لەگەڵ خەڵكیش چاكە، ئینجا ئەوە دیارە بەگشتی مسوڵمانان دەبێ وابن، بەڵام هەڵبەتە بە تەئكید ئەو رێزو خۆشەویستیو حورمەتو برایەتییو ئەدەبو وەفایەی نێوان مسوڵمانان، لەبەینی قیادەو قاعیدەو سەرێو خوارێی كۆمەڵێكی ئیسلامییدا، گرنگترو پێویسترەو دەبێ زیاتر جەختی لەسەر بكرێ، چونكە بەبێ ئەو رێزو خۆشەویستییەو بەبێ ئەو بە تەنگ یەكدییەوە بوونو هاوكاری پێكەوە كردنەی قیادەو قاعیدە، كارو چالاكی ئیسلامیی ئەنجام نادرێو مشوورخواردن لە دینو ژینی مسوڵمانان مەحاڵە، ئینجا دیارە باشترین سەرمەشقو پێشڕەویش بۆ كۆمەڵی ئیسلامیی لەو بارەوە كێیە؟ هەڵبەتە پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەكانی – خوا لێیان رازی بێو رازیشیان بكات ـ، كە بێگومان هەم رێزو خۆشەویستیو پەرۆشیی ئەوان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو هەم هی ئەویش بۆ ئەوان، شتێكی نموونەییو یەكجار ناوازە بووە و، زۆر رێزو حورمەتیان لە یەكدی گرتوە، هەتا لە سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، دەربارەی هاوەڵە بەڕێزەكانی كە كاتێك پێغەمبەر ﷺ لە مەجلیسدا قسەی فەرمووە، دەڵێ: {كَأَنَّمَا عَلَى رُؤُسِهِمُ الطَّيْرُ}[1]، واتە: (وەك باڵندەیان

---

١) (وروى أسامة بن شريك، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ حَوْلَهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُؤُسِهِمُ الطَّيْرُ) الشفا بتعريف حقوق المصطفى، تأليف: العلامة القاضي أبو الفضل عياض، ج: (٢)، ص: (٢٨٧).

لەسەر سـەری نیشتبێ، خۆیان نەدەجووڵاند)، چونكە ئینسان ئەگەر باڵندەی لەسەر سەری نیشتبێ، خۆی بجووڵێنـێ دەفـڕێ و، ئەگـەر بیـەوێ نـەفڕێ، دەبـێ خـۆی نەجووڵێنێ! دیارە پێغەمبەریش ﷺ لە بەرانبەردا یـەكجار زۆر بـە تـەنگ هـاوەڵانی بەڕێزیەوە بووە و، جاری وا بووە پێشنوێژی كردوە، گوێی لە دەنگی منداڵێك بـووە گریاوە، نوێژەكەی كورت كردۆتەوە، فەرموویەتی: لەبەر دایكـی، زانیویـەتی كـە دایكـی لەگەڵیانـدا جەماعـەت دەكـات و دڵـشی لـەلای منداڵەكەیـەتی و گـوێی لـە دەنگیەتی، نوێژەكەی كورتكردۆتەوە بۆئەوەی ئەو دایكـە زۆر نارەحـەت نـەبێ[(١)]، ئیدی ئەگەر باسی بەزەیی و سۆزی پێغەمبەر ﷺ بكەین، ئەوە وێنە زۆرن، وە ئەگەر باسی ڕێزو حورمەت و خۆشەویستیی هاوەڵانی بەڕێزیش بكـەین بـۆ پێغەمبـەر ﷺ نموونە زۆرن، بەڵام وەك عەرەب دەڵێن: (وَالْفَضْلُ مَا شَهِدَتْ بِهِ الأَعْـدَاءُ)، واتـە: (چاكە ئەوەیە دوژمنان دانـی پێـدا بێـنن)، كەواتـە: بـا شـایەدیی دانـی یـەكێك لـە سەرسەختترین دوژمنانی پێغەمبەری خوا ﷺ ـ پـێش مـسوڵمانبوونی ـ بـە نـموونە بێنـینەوە، كە ئەبو سـوفیانە:

ئەبو سوفیان لەوبارەوە دەڵێ: (مَا رَأَيْتُ فِـي النَّـاسِ أَحَـداً يُحِـبُّ أَحَـداً كَحُـبِّ أَصْـحَابِ مُحَمَّـدٍ مُحَمَّـداً)[(٢)]، واتـە: (هـیچ كەسـم لـە خـەڵكی نـەدیوە كەسـی خۆشویستبێ، هێندەی خۆشـەویستی هاوەڵانی موحەممەد بۆ موحەممەد)! بێگومان ڕاستیش دەكات، كەواتە: ئەو یەكدی خۆشویستن و ڕێزو حورمەتەی نێوانی قیادەو قاعیـدە، لەڕاسـتیدا وەك گوتمـان ڕەنگدانـەوەی تـەواویی عیبـادەت و تەقوایانـە و، پێویستیی دینداریی و مسوڵمانەتیی و كاری ئیسلامییشە.

---

١) پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنِّي لَأَقُومُ فِي الصَّلاةِ أُرِيدُ أَنْ أُطَـوِّلَ فِيهَـا فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ فِي صَـلاتِي كَرَاهِيَـةَ أَنْ أَشُـقَّ عَلَى أُمِّهِ) رواه البخاري: (٧٠٧)، عن أبي قتـادة.

٢) السيـرة النبويـة، لإبن هشام، ج: (٣)، ص: (٨٠).

**سێیەم: دڵ پێكەوە ساف بوون و، زمانو دەست پێكەوە سەلامەت بوونو، داخستنی دەرگای زەمو غەیبەتو عەیب لە یەكدی دۆزینەوەو ...هتد:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَدَابَرُوا[1] وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ) رواه البخاري: (٦٠٦٥) واللفظ له، ومسلم: (٢٥٥٩) عن أنس بن مالك رضي الله عنه، لێرەشدا دەبینین كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەو شتانەی كە دەبنە مایەی دابڕدابڕ بوونی مسوڵمانانو تێكچوونی ریزەكانیان، قەدەغەی كردوون، وە فەرمانی پێكردوون كە لەسەر بناغەی بەندایەتییان بۆ خوا جل جلاله، برایەتی لەگەڵ یەكدییدا بكەن، وە ئەگەر لە یەكدیش نیگەران بوون، لە سێ ڕۆژان زیاتر نەخایەنیو پێكەوە ئاشت ببنەوە.

ئەو سێ ڕۆژەش بۆیە دانراون، كە مەرج نیە تۆ سێ ڕۆژەكان تەواوبكەی، ئینجا بچی ئاشت بیەوە، دوای یەك سەعات بچۆ ئاشت بەوە لەگەڵی، بەس نابێ لە سێ ڕۆژان تێبپەڕێ، بەس تا سێ ڕۆژان بۆت هەیە، بۆچی؟ چونكە جاری وا هەیە ئینسان شتێكی لەگەڵ كەسێك لە دڵدا پەیدادەبێ، با سێ ڕۆژی پێ بچن، نەك بە ڕواڵەتو بە ڕووكەشیی پێكەوە ئاشت ببنەوە، بەس لە دڵیاندا بوغزو غەرەز مابێ، لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا، با دڵی خۆیان بەرانبەر یەكدی پاكبكەنەوە، بۆ ئەوەی كە دوایی دەچنەوە بۆلای یەكدی، بە دڵێكی ساغو سەلیم بێ، نەك بە فرتو فێڵو بە ڕواڵەتو ڕووكەشیی بێ، چونكە ئەوە هیچ نیە لە ڕواڵەتدا یەكدی ماچ بكەن، بەلام لە دڵدا یەكدی ببوغزێنن، بەڵێ ئەو سێ ڕۆژە بۆیە دانراون، كە لەو سێ ڕۆژەدا ئینسان خەریك بێ سەرو سینەی خۆی صاف بكاتەوە، ئینجا ئەگەر بەرانبەرەكەت ناحەقیشی بێ، تۆ بچۆ بۆ لای ئەو، بچۆ دەستی بەسەردا بێنەو

---

١) پەرتەوازە مەبن، ببنە دەستە دەستە.

بڵێ: ئەگەر حەقی منە گەردنت ئازادبێو، ئەگەر حەقی تۆشە گەردنم ئازاد بكە، ئینسان ئەگەر بە نەفسی خۆی بوێرێ زۆر ئاسانە، دیارە ئەوە زۆر زۆریش چاكترە لەوەی كە تۆ لەو بگەڕێیو ئەو لە تۆ بگەڕێ، دوایی تووشی شتی حەڕامیش دەبن، چونكە هەركامیان تووشی غەیبەت دەبێ بەرانبەر بەوی دیكەو، ناچاردەبێ بۆ ئەوەی پاساو بێنێتەوە بۆ هەڵوێستی خۆی بڵێ: خەتای وی بوو، ئەو ئاوای گوتو ئاوای گوتو ئاوای گوت، جگە لەوەی كە قسەی لێ دابڕیوەو لە سێ ڕۆژان زیاتر، ئەوە حەڕامێكە، ئینجا تووشی چەندان حەڕامی دیكەش دەبێ، بە خراپە باسی دەكاتو، لەوانەیە تۆمەتیشی بۆ بكات!

ئینجا ئەم خاڵی سێیەمەش هەر دەچێتەوە نێو خاڵی دووەم، چونكە بەڕاستی ئەگەر تاكەكانی كۆمەڵێك یەكدییان خۆشبوێو، ڕێزو خۆشەویستییان هەبێ بۆ یەكدیو، حورمەتی یەكدییان لەدڵدا هەبێ، ڕێگا بە خۆیان نادەن زەمو غەیبەتی یەكدی بكەنو، بە ناهەق دڵی یەكدی بریندار بكەن.

دیارە ئەمیش بەرهەمو ئەنجامی سروشتیو ڕاستەوخۆی، یەكدی خۆشویستنو ڕێز لە یەكدی گرتنو ئەدەبو وەفای دوو سەرەی نێوان قیادەو قاعیدەیە، چونكە ئەوەی كە پاڵ بە خەڵكەوە دەنێ، زەمو غەیبەتی یەكدی بكەنو، هەوڵی یەكدی شكاندن بدەنو، بە دەستو زمان زیان بەیەكدی بگەیەنن، چییە؟بێگومان ئەو بوغزو غەرەزو كینەیە كە لە دڵو دەروونیاندا بەرانبەر بە یەكدی جێگیربووە، ئایا ئەگەر تۆ ڕقت لە كەسێك هەڵنەستێ، هیچ پاڵنەرێكت هەیە بیشكێنیو زەمو غەیبەتی بكەی؟ نەخێر، كەسێكت خۆشویست مەدحی دەكەی، ڕقت لە كەسێك هەڵسا ڕقەكەت پاڵت پێوەدەنێ زەمی بكەی، بۆیە ئیسلام بەرلەوەی بە خەڵكی بڵێ: زەمی یەكدی مەكەن، دەڵێ: ڕقتان لە یەكدی نەبێتەوە، بەرلەوەی بڵێ: دوعای خێر بۆ یەكدی بكەن، دەڵێ: یەكدیتان خۆشبوێ، ئاخر مرۆڤ بەرلەوەی زمانو دەستو جەستە

بێ، دڵو دەروونە، ئەگەر لێرەوە (واتە: دڵ) وەزعەکە باش بوو، بەتەئکید ڕواڵەتیش باش دەبێ، هەربۆیە جێی سەرنجی خوای پەروەردگاریش ﷻ دڵو دەروونە پێش هەموو شتێك، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ} رواه مسلم: (٢٥٦٤)، وابن ماجه: (٤١٤٣)، واتە: (بێگومان خوا سەرنجی دیمەنو ماڵو سامانتان نادات[1]، بەڵكو تەماشای دڵو کردەوەکانتان دەکات)، ئەگەر دڵ باش بوو کردەوەش باش دەبێ، ناڵێ: گۆزە چی تێدابێ ئەوەی لێ دەڕژێ؟ بە تەئکید وایە. ئینجا دیسان بە هەردوو بارەکاندا، بە پێچەوانەشەوە، یەکدی خۆشویستنو ڕێزو حورمەت بۆ یەکدی دانانە، کە وایان لێدەکات دەستو زمانیان بەرانبەر بە یەکدی سەلامەت بێ، بەڵكو مەدحی یەکدی بکەنو پشتی یەکدی بگرنو دیفاع لە یەکدی بکەن، هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لاَ يَسْتَقِيمُ إِيمَانُ عَبْدٍ حَتَّى يَسْتَقِيمَ قَلْبُهُ وَلاَ يَسْتَقِيمُ قَلْبُهُ حَتَّى يَسْتَقِيمَ لِسَانُهُ ...} رواه أحمد: (١٣٠٤٨) (١٣٠٧٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف. واتە: (ئیمانی هیچ بەندەیەك ڕێكو تەواو نابێ، تاکو دڵی ڕاست نەبێو، دڵیشی ڕاست نابێ، هەتا زمانی ڕێکوپێك نەبێ ...)، واتە ئەگەر دڵەکە ڕاست بوو ئیمانەکەش چاك دەبێو زمانەکەش باش دەگەڕێو ئەندامەکانی دیکەش ملکەچی شەرع دەبن، هەڵبەتە دڵو دەروون پێکەوە ساغو سافبوونی هەموو مسوڵمانانیش، دیسان هەر شتێکی پێویستو پەسندە، بەڵام هی قیادەو قاعیدەی کۆمەڵێکی ئیسلامیی پێویسترەو، زەمو غەیبەتی یەکدیکردنی هەموو مسوڵمانانیش حەرامەو خراپە، بەڵام هی قیادەو قاعیدە خراپترو بە زەرترو ناقۆڵاترە.

---

١) کێ قەدو قیافەی بەرزترە؟ کێ ڕەنگو ڕووی جوانترە؟ کێ سەروەتو سامانی زیاترە؟ کێ کۆشكو باڵاخانەی جوانترە؟ ئەوە جێی سەرنجی خوا ﷻ نیە، ئەدی جێی سەرنجی خوا چییە؟ دڵو کردەوەیە.

جا ئەو بەسەرهاتەی (عبدالله بن عمرو بن العاص)[1]یش ـخوا لێیـان رازی بـێ ـ پەندو عیبرەتێكی گەورەی تێدایە كە من هەر بەكوردی بۆتـان دێنمـەوە، لـە (مـسند الإمام أحمد)و (شعب الإيـمان)ی (البيهقي)[2]دا هاتوە، پوختەكەی ئەوەیە كە: ئـەو عەبدوڵلایـە سێ رۆژان لەسەریەك گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ كـە شـایەدیی بەهەشـتیی بـوون بـۆ پیاوێـك دەدات و، دەفـەرموێ: (ئێـستا كابرایـەك دێ،

١) عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص، پیاوێكی زۆر ساڵح بووە، یـەكێك بـووە لـە چـوار عەبدوڵلا زۆر سـاڵح و زۆر شـارەزایەكان: عەبـدوڵلای كـوڕی عومـەر، عەبـدوڵلای كـوڕی عـەبباس، عەبـدوڵلای كـوڕی زوبێـر، عەبـدوڵلای كـوڕی عـەمری كـوڕی عـاص، وە ئـەم عەبدوڵلایـە یـەكێك بـووە لەوانـەی كـە فـەرموودەكانی پێغەمبـەر ﷺی نووسـیونەوە، ئـەو تایبەتمەندییەی هەبووە، ئەبو هورەیرە گوتوویەتی: (عەبدوڵلای كوڕی عـەمری كـوڕی عـاص جیـاوازیی لەگـەڵ مـن ئـەوەبوو مـن هـەر ئیعتیمـادم لەسـەر لەبـەركردن دەكـرد، بـەلام ئـەو فەرموودەكانی دەنووسینەوە)، خوا لە هەموویان رازی بێ.

٢) (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَطْلُعُ عَلَيْكُمْ الْآنَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَطَلَعَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ تَنْطِفُ لِحْيَتُهُ مِنْ وُضُوئِهِ قَدْ تَعَلَّقَ نَعْلَيْهِ فِي يَدِهِ الشِّمَالِ. فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ مِثْلَ ذَلِكَ، فَطَلَعَ ذَلِكَ الرَّجُلُ مِثْلَ الْمَرَّةِ الْأُولَى. فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الثَّالِثُ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ مِثْلَ مَقَالَتِهِ أَيْضًا، فَطَلَعَ ذَلِكَ الرَّجُلُ عَلَى مِثْلِ حَالِهِ الْأُولَى. فَلَمَّا قَامَ النَّبِيُّ ﷺ تَبِعَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، فَقَالَ: إِنِّي لَاحَيْتُ أَبِي فَأَقْسَمْتُ أَنْ لَا أَدْخُلَ عَلَيْهِ ثَلَاثًا، فَإِنْ رَأَيْتَ أَنْ تُؤْوِيَنِي إِلَيْكَ حَتَّى تَمْضِيَ فَعَلْتَ. قَالَ: نَعَمْ. قَالَ أَنَسٌ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُحَدِّثُ أَنَّهُ بَاتَ مَعَهُ تِلْكَ اللَّيَالِي الثَّلَاثَ فَلَمْ يَرَهُ يَقُومُ مِنْ اللَّيْلِ شَيْئًا غَيْرَ أَنَّهُ إِذَا تَعَارَّ وَتَقَلَّبَ عَلَى فِرَاشِهِ ذَكَرَ اللَّهَ ﷻ وَكَبَّرَ حَتَّى يَقُومَ لِصَلَاةِ الْفَجْرِ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: غَيْرَ أَنِّي لَمْ أَسْمَعْهُ يَقُولُ إِلَّا خَيْرًا. فَلَمَّا مَضَتْ الثَّلَاثُ لَيَالٍ وَكِدْتُ أَنْ أَحْتَقِرَ عَمَلَهُ، قُلْتُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، إِنِّي لَمْ يَكُنْ بَيْنِي وَبَيْنَ أَبِي غَضَبٌ وَلَا هَجْرٌ ثَمَّ، وَلَكِنْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ لَكَ ثَلَاثَ مِرَارٍ يَطْلُعُ عَلَيْكُمْ الْآنَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَطَلَعْتَ أَنْتَ الثَّلَاثَ مِرَارٍ، فَأَرَدْتُ أَنْ آوِيَ إِلَيْكَ لِأَنْظُرَ مَا عَمَلُكَ فَأَقْتَدِيَ بِهِ، فَلَمْ أَرَكَ تَعْمَلُ كَثِيرَ عَمَلٍ!! فَمَا الَّذِي بَلَغَ بِكَ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: مَا هُوَ إِلَّا مَا رَأَيْتَ. قَالَ: فَلَمَّا وَلَّيْتُ دَعَانِي، فَقَالَ: مَا هُوَ إِلَّا مَا رَأَيْتَ غَيْرَ أَنِّي لَا أَجِدُ فِي نَفْسِي لِأَحَدٍ مِنْ الْمُسْلِمِينَ غِشًّا وَلَا أَحْسُدُ أَحَدًا عَلَى خَيْرٍ أَعْطَاهُ اللَّهُ إِيَّاهُ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: هَذِهِ الَّتِي بَلَغَتْ بِكَ وَهِيَ الَّتِي لَا نُطِيقُ). رواه أحمد في مسنده: (١٢٧٢٠) واللفظ له، والبيهقي في شعب الإيمان: (٦٦٠٥)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

بەهەشتییە)، ڕۆژێك وا دەفەرموێ دیارە جەمعێك دەبن ئەو کابرایە دێ عەبدوڵلاش لەوێ دەبێ، ڕۆژی دووەمیش هەر ئەو دەبێو ڕۆژی سێیەمیش هەر ئەو دەبێ، (عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص)یش ـخوا لێیان ڕازی بێـ (دیارە ئەو کاتی ژنی نەهێناوەو گەنج دەبێ) بەو کابرایە دەڵێ: ئەگەر ئیجازەم بدەی دەمەوێ لە ماڵی ئێوەبم، لەگەڵ بابم ساردییەکم هەیە، شتێکمان کەوتۆتە بەین، دەمەوێ لە ماڵی خۆتان بمحەوێنیەوە سێ ڕۆژان، ـ ئیدی کابرا نازانێ بۆچییەـ دەڵێ باشە، بەس ئەو (عەبدوڵلا) ئامانجی ئەوەبووە کە ئەو کابرایە ساڵحە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ئێستا پیاوێك دێ، بەهەشتییە)، بزانێ چییە؟ عیبادەتی، تاعەتی، ئەخلاقی، هەڵسوکەوتی چۆنە ئیستیفادەی لێبکا، سێ شەوو ڕۆژان بۆ بەهرە لێوەرگرتنی میوانی دەبێ، بەڵام هیچ تاعەتێکی زیادەی پێوە نابینێ، چونکە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص زۆر عابد بووەو ئەهلی تاعەت بووە، شتێکی لە خۆی زیاتری پێوە نابینێ، دوای سێ ڕۆژەکان مۆڵەتی لێوەردەگرێو دەڵێ: سوپاست دەکەم دەڕۆم، ئەوەی ڕاستی بێ من هیچم لەگەڵ بابم نیە، بەڵکو گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو سێ ڕۆژان شتێکی وای فەرموو، منیش ویستم بێم تەماشای وەزعی تۆ بکەمو ئیستیفادەت لێ بکەم، ئێستاش تەماشادەکەم شتێکی لە خۆم زیادەت پێوە نابینم، ئیدی دەڕۆم، کابراش دەڵێ: ئەوەی بینیومت هەر ئەوەندەیە، تۆزێك دەڕوا، دوایی پیاوەکە بانگی دەکاتەوەو دەڵێ: وەرە، دەڵێ: بەڵێ، دەڵێ: ئەوەی کە بینیوتە کردەوەو تاعەتی من هەر ئەوەندەیە کە بینیوتە، بەڵام خەسڵەتێکیدیکەشم هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەرچی غەشو کینەو حەسەدە، بەرانبەر بە هیچ مسوڵمانێك لە دڵمدا نیە و، دڵم لەگەڵ هەموویان سافو بێگەردە، وە زیانو قازانجی هەمووشیان بە هی خۆم دەزانم (واتە: هەرشتێکی چاك بۆ هەر کامێکیان بێتە پێشێ وادەزانم بۆ خۆم هاتوە، ناخۆشییەك بەسەر هەرکامێکیان دابێ، وادەزانم بەسەر خۆم هاتوە).

عەبدوڵلاش دەڵێ: ئاخر ئەوەیە كە تۆی گەیاندۆتە ئەو پایەو بۆ ئێمەش زەحمەتەو پێمان ناكرێ!

## چوارەم: خۆپاراستن لە هەر جۆرە دەمارگیریی (تعصب)ێك بۆ دەستەو تاقمو تیرەو عەشیرەتو ناوچەو شارو ... هتد:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ) رواه أبوداود: (٥١٢١) عن جبير بن مطعم، قال أبو داود: مرسل، وقال الألباني: ضعيف. وشەی (عَصَبِيَّة)، بە كوردی یانی: (دەمارگیریی)، دەمارگیرییش ئەوەیە كە ئینسان توندیی‌و زبریی بنوێنێ بۆ شتێك، بەڵام بە شێوازێكی ناڕەواو لەسەر بناغەیەكی هەڵە، ئەگەرنا ئەصڵی توندیی‌و زبریی نواندن‌و توندوتۆڵ بوون شتێكی پەسندە، بەڵام بۆ ئامانجێكی خراپ، یان لەسەر بناغەیەكی هەڵە، شتێكی خراپە.

خەسڵەتێكی دیكەی گەورەو گرنگی قیادەو قاعیدەی كۆمەڵێكی ئیسلامیی، بریتیە لە بە یەك چاو تەماشاكردنی مسوڵمانان و، خستنەڕووی ڕێزو حورمەت‌و خۆشەویستی بۆ هەموویان بە ئەندازەی دینداریی‌و پارێزكارییان و، خۆ دوورگرتن لە هەموو جۆرە دەمارگیرییەك چ بۆ دەستەو تاقم، چ بۆ بنەماڵەو تیرەو عەشیرەت‌و نەتەوە، چ بۆ ناوچەو شار، چ بۆ زمان‌و ڕەگەز، چ بۆ هەرشتێكی دی . . . بۆ دەستەو تاقم، كە ئەو مەڵبەندە دەمارگیریی هەبێ دژی مەڵبەندێكی دیكە. بۆ شار، كە هەولێریی بڵێن سلێمانەیی وا، سلێمانەیی بڵێن هەولێریی وا، یان سۆرانیی بڵێن بادینیی وا، بادینیی بڵێن سۆرانیی وا.

بۆ نەتەوە، كە عەرەب خۆی پێ لە كورد چاكتربێ، یان كورد خۆی پێ لە عەرەب چاكتربێ، یان هەردووكیان خۆیان پێ لە تورك چاكتربێ، یان تورك خۆی پێ لە هەردووكیان چاكتربێ.

بۆ عەشیرەت كە بگوترێ: ئەوە خۆشناوە، یان ئەوە جافە، یان ئەوە گەردییە، یان ئەوە میراودەلییە، یان ئەوە دزەیی‌یە، یان ئەوە ڕێكانییە، یان ئەوە ئەركەوازییە، وە لە عەشیرەت‌و هۆزەكانی دیكە چاكترە.

بۆ ڕەگەز، كە بگوترێ: بە ڕەهایی پیاو لە ژنان چاكترن، یان ژن لە پیاوان چاكترن! دەمارگیریی لەسەر بناغەی هەركامێك لەوانە شتێكی بێ جێیە، بۆچی؟ چونكە هیچ كام لەوانە ئینسان ئیختیاری تێیاندا نیە، خەڵكی كوێی؟ ڕەنگ‌و قیافەت چۆنە؟ چ قەومێكی؟ چ ڕەگەزێكی؟ چ عەشیرەتێكی؟ هیچی ئیختیاری خۆت نیە، شتێكی بێ مانایە ئینسان خۆی بە شتێكەوە هەڵكێشێ كە بە دەستی خۆی پەیدای نەكردوە، یان بە شتێك خۆی بەسەردا هەڵكێشن كە خەتای خۆی نیە، ئافرەت بۆخۆی خۆی نەكردۆتە مێ، پیاو بۆخۆی خۆی نێر نەكردوە، وە هەروەها كورد بۆخۆی خۆی نەكردۆتە كورد و، عەرەب بۆخۆی خۆی نەكردۆتە عەرەب‌و ...هتد، بەڵكو هەمووی بە ویستی خوایە ﷻ: ﴿... وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ ...﴿١٣﴾﴾ الحجرات، وە هەروەها ڕەگەزی نێرو مێ، دیسان هەر بە ویستی خوایە ﷻ: ﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾﴾ القیامة، وە هەروەها ئەوانە هەموویان بەدەر لە ئیرادەو ویستی خۆمانە، لەبەرئەوە خۆ پێوە هەڵكێشانیان شتێكی بێ مانایە، لەبەرئەوە كە دەستمان تێیدا نیە، وە شتێكی بێ ماناشە لەبەرئەوەی چاك‌و خراپ لە هەموو شوێنان هەن، ئەو شارە خەڵكی باشی لێیەو خەڵكی خراپیشی لێیە، شارەكەی دیكەش بەهەمان شێوە، ئەو عەشیرەتە خەڵكی باشی هەیەو خەڵكی

خراپیشی هەیە، لە ڕۆژگارێکدا عەشیرەتێك خەڵکی باشی زیاد دەبێ یەکی دیکە هی خراپ، دوایی بە پێچەوانەوە ئەوەی دیکە خەڵکی خراپی هەیە، ئەوجار ئەو باشی تێدا زیاد دەبێ، ئەویدیکە خراپی تێدا زیاد دەبێ، لە ڕۆژگارێکدا خەڵکی شارێك دیندارتر دەبن، لە ڕۆژگارێکی دیکەدا خەڵکی شارێکی دیکە، لەڕۆژگارێکدا خەڵکی ئەو ناوچەیە سیفەتێکی باشیان هەیەو ئەویدیکە سیفەتێکی دیکەی باشیان هەیە.

ئینجا ئێمە تەماشادەکەین خوای دادگەر ﷻ مسوڵمانانی لەسەر بناغەی ئیمان کردوونەتە خوشكو برای یەکدیو ئاوا وەصفی کردوون: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٠﴾﴾ الحجرات، واتە: (بێگومان بڕواداران خوشكو برای یەکدین، جا چاکە لە نێوان دوو براکانتاندا بکەن کاتێك ناکۆك دەبن، وە پارێز لە خوا بکەن بەڵکو خوا بەزەیی پێتاندا بێتەوە)، دیارە وشەی (إِخۡوَةٞ)ش بۆ پیاوانو ئافرەتانیش بەکاردێ، بە بەڵگەی چی؟ یەکەم لە زمانی عەرەبییدا وایە، وە پێش زمانی عەرەبی قورئان وا دەفەرموێ، کە قورئان بناغەی زمانی عەرەبییە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ ... ﴿١٧٦﴾﴾ النساء، باسی (كَلالَة) دەکات، واتە: (كَلالَة) کێیە؟ نە ئەصڵێکی هەیە وەك بابو دایك، نە فەرعێکی هەیە وەك کوڕو کچ میراتی لێ بگرن، واتە: {...ـ ئەوانەی کە میرات دەگرن لەو کەسەی پێی دەگوترێ (كَلالَة)ـ ئەگەر (إخوة) بوون لە پیاوانو ئافرەتان، ـ کەواتە: وشەی (إخوة) پیاوانیشو ئافرەتانیش دەگرێتەوەـ، ئەوە با بۆ نێر هەبێ دوو ئەوەندەی مێ...}، کەوابێ کە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ... ﴿١٠﴾﴾ سێ مانایان دەگرێتەوە، واتە:

أ/ بێگومان تەنیا پیاوانی ئیماندار برای یەكـدین .

ب/ بێگومان تەنیا ئافرەتانی بڕوادار خوشـكی یەكدین .

ج/ بێگومان تەنیا پیاوانو ئافرەتانی بڕوادار خوشكو برای یەكدین .

هەرسێك ماناكـە دەگرێتـەوە، كەواتـە وشـەی (إِخْوَةٌ ) لێـرەدا، هـەم برایـەتیی پیاوانی مسوڵمانو، هەم خوشكایەتیی ئافرەتانو، هەم خوشكو برایـەتیی پیـاوانو ئافرەتانیش دەگرێتەوە .

ئینجا بێگومان لێرەدا پێویستە ئـەو حەقیقەتـە ڕوونبكرێتـەوە، كـە لـە سـنووری شەرعدا خۆشویـستنو ڕێزلێگـرتنو بەتەنگـەوەبوونو خـەم لێخـواردنی دۆسـتو خزمو دراوسێو تیرەو هۆزو عەشیرەتو نەتەوەو گـەلو میللـەتو خـەڵكی شـارو ناوچە، هیچ ناشەرعییەكی تێدانیەو بە دەمارگیریی دانانرێو، نەك خراپ نیە، بگرە شتێكی پەسندو پێویستیشە، ئەگـەر لـە سـنووری شـەرعدا تـۆ گرنگـی بـدەی بـە عەشیرەتو خزمو دراوسێو هاوشارییو هاوزمانو نەتـەوەی خـۆت، ئـەوە هـیچ ناشەرعییەكی تێدانیـە، ئەدی ناشەرعیی لەكوێدایە؟ ناشەرعیی لەوەدایە كە تـۆ بێنـی بەناحەق ئەوەی كە لێتەوە نزیكە، جا خزمە، دراوسێیە، عەشیرەتە، تیرەو هـۆزە، نەتەوەیە، هەڵیكێشی بەسەر خەڵكێكی دیكەداو حـەقی خـەڵكی دیكـەی بـۆ بێنـی، یاخود لە شتێكدا كە وەك یەكن، هی خۆت بە چاكتر دابنێـی، ئافرەتێـك كـە نـاوی (فَسِيلَة)یە، دەگێڕێتەوە كە لە بابی بیستوە گوتوویەتی: ﴿سَـأَلْتُ النَّبِـيَّ، فَقُلْـتُ: يَـا رَسُولَ اللَّهِ! أَمِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ مِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُعِـينَ الرَّجُـلُ قَوْمَـهُ عَلَـى الظُّلْـمِ﴾ رواه ابـن ماجـه: (٣٩٤٩) واللفـظ لـه، وأبـو داود: (٥١١٩)، قال الألبـاني: ضعيف، وقـال شـعيب الأرنـؤوط: حـسن، واتـە: ﴿لـە پێغەمبـەرم پرسیو گوتـم: ئەی پێغەمبــەری خـوا! ئایـا لـە دەمـارگیریی حیساب

دەكرێ ئینسان قەومی خۆی[1] خۆشبوێ؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: نەخێر، لە دەمارگیریی نیە ئینسان خەڵكی خۆی خۆشبوێ (ئەوانەی لێی نزیكن بە حوكمی حزبایەتیی، یان بە حوكمی عەشیرەتایەتیی، یان بە حوكمی هاوشارێتیو هاودەڤەرێتی، یان بە حوكمی نەتەوایەتیی، یان بە حوكمی كەسابەتو هاوپیشەیی یەوە، بە حوكمی خزمایەتیی، ئەوە دەمارگیریی نیە)، بەڵكو دەمارگیریی ئەوەیە كە پشتگیریی خەڵكەكەی خۆت بكەیتو هاوكاریان بی لەسەر زوڵمو ستەمو ناهەقی} ، ئەگەر باریان بە لادا لاربوو تۆ هەر دیفاعیان لێبكەیو، ئەگەر لەسەر زوڵمو ستەمو خراپە بوون، تۆ هەر پشتیان بەرنەدەی، ئا ئەوەیە دەمارگیریی.

## كەواتە بە كورتی:

لە ئیسلامدا دانهێنراوە بە خزمایەتی (القرابة)و هەموو جۆرە سەرپێبوونەكان (الإنتماءات)ی دیكەدا، ئینتیمای ئینسان بۆ شار، ئینتیمای بۆ عەشیرەتو تیرەو هۆز، ئینتیمای بۆ دراوسێیەتی (الجوار)، ئینتیمای بۆ نەتەوەی خۆی، ئینتیمای بۆ ناوچەكەی، ئینتیمای بۆ ڕەگەز، ئینتیمای بۆ زمان، ئینتیمای بۆ ئەوە كە ئیشێك بەیەكەوە دەكەن، دان بەوانە هەموویاندا هێنراوەو ئەوە هیچ گرفت نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوانە لەسەر بناغەی شەریعەت بنو بۆ مەبەستو ئامانجی ڕەوا بن، ئەوەی كە خراپە ئەوەیە تۆ بێنی ئەو ئینتیماو سەرپێبوونانە، بكەی بە بناغە بۆ شتی نارەواو ناحەقو زوڵمو دیفاع كردن لە یەكدی، لەسەر شتی زوڵمو خراپە، یان بۆ دژایەتیی كردنی خەڵكی دیكەو بۆ زەوتكردنی مافی خەڵكی دیكە.

---

١) قەومی خۆی: یەعنی خەڵكی خۆی، بۆ وێنە: خەڵكی تۆ كۆمەڵی ئیسلامییە، یان عەشیرەتەكەتە، یان نەتەوەكەتە، خەڵكی شارەكەتو گەڕەكەكەتە، خەڵكی خۆت، هەموویان دەگرێتەوە.

ئینجا بێگومان ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ بە گشتیو مسوڵمانانی هەر ناوچەیەك بە تایبەتو مسوڵمانانی نێو هەر كۆمەڵێك بە تایبەتی تر، كاتێك تۆكمەو توندوتۆڵ دەبن، كە هەموو ئەو جۆرە سەرپێبوونو پەیوەندییانەی دیكە بخەنەوە سەر بناغەی شەریعەت، برایەتییو دیفاع لە یەكدی كردنیانو، پشتی یەكدی گرتنیان، بۆ سەرخستنی شەریعەت بكەن بە ئامانج، ئیدی لە دوای ئەوە كێشە نیە ئەوە خەڵكی هەولێرە، ئەویدیكە خەڵكی سلێمانیە، ئەویدیكە خەڵكی دهۆكە، ئەویدیكە خەڵكی مهابادە، ئەویدیكە خەڵكی دیاربەكرە، یەكیدیكە خەڵكی قامیشلییە، ئەویدیكە عەرەبەو خەڵكی بەغدایە، ئەویدیكە توركەو خەڵكی ئەستەمبۆڵە، ئەویدیكە ئەفغانە، شەریعەت ئینكاریی ئەو ئینتیما خوارِسك (فِطْرِي)یانە ناكا، ئەوە ئەفغانە، ئەوە عەرەبە، ئەوە كوردە، ئەوە توركە، لەنێو قەومێكیشدا ئەوە فلان عەشیرەتەو ئەوە فیسار عەشیرەتە، ئەوە فلان شارەو ئەوە فیسار شارە، ئیسلام ئینكاریی ئەوانە ناكا، بەڵام ئینكاریی ئەوە دەكات ئەوانە بكرێنە بناغە بۆ دابڕِ دابڕبوون، هەولێریی رقی لە سلێمانەیی بێ، بادینیی رقی لە سۆرانیی بێ، كورد رقی لە عەرەب بێ، عەرەب رقی لە فارس بێ، فارس رقی لە تورك بێ، ڕەش رقی لە سپی بێ، سپی رقی لە ڕەش بێ، ئافرەت بەگژ پیاواندا بچنو بڵێن پیاو زاڵمە، پیاوان بەگژ ئافرەتاندا بچن، ئیسلام ئەوە ڕەفزدەكات، دەبێ بناغەیەك هەموویان كۆبكاتەوە كە بریتیە لە بەندەی خوا بوونو پێكەوە برابوونو پێكەوە تەبابوون، باقی دیكە ئەو ئینتیمایانەی دیكە شتی خوارِسك (فِطْرِي)نو لە واقیعدا پەیدادەبن، بێ ئەوەی كە ئینسان دەستی تێیاندا هەبێ.

ئینجا وەك گوتمان خوشكو برایەتییەكە كەنگێ پەیدادەبێ؟ وە كەنگێ مسوڵمانان دەگونجێ پێكەوە خوشكو برابن؟ لەسەر ئاستی كۆمەڵێك یان ناوچەیەك یان نەتەوەیەك یان ئۆممەت، لەڕاستیدا كاتێك كە ئیمان بكەنە بناغەی كۆبوونەوەیانو،

برایەتیی و دۆستایەتیی لەگەڵ یەکتردا بکەنە بناغە، ئیدی کە ئەوەیان کرد، ئەوەیدیکە هیچی زەرەر نادا، چونکە هێندێك کەس لێی ئیشکالە: جا باشە ئاخر ئێمە مسوڵمانەتیی بکەین، یان ئەوە؟! جاری وایە لێم دەپرسن: مامۆستا ئێوە کوردایەتیی پێش مسوڵمانەتیی دەخەن، یان مسوڵمانەتیی پێش کوردایەتیی دەخەن؟ مامۆستا ئێوە ئیسلام بۆ خزمەتی کورد بەکاردێنن، یان کورد بۆ خزمەتی ئیسلام؟ هێندێکجار تۆ ناچاری حەتمەن دەبێ یەکیان بە قوربانی ئەویدیکەیان بکەی؟! بەڵام پرسیارەکە بۆ خۆی شتێکی بێ جێیە! هیچیان بە قوربانی هیچیان ناکەم، بەڵکو بە ئیسلام خزمەتی میللەتەکەم دەکەمو، بە میللەتەکەشم خزمەتی ئیسلام دەکەم، خۆ ناچار نین یەکیان بە قوربانی ئەویدیکەیان بکەین، یەکیان لەبن پێی ئەویدیکەیاندا بپلیشێنینەوە، بەڵێ ئەگەر بڵێی کورد بە قوربانی عەرەب دەکەین، یان عەرەب بە قوربانی کورد دەکەین، ئەوە راستەو جاری وایە نەتەوەکان تێکدەگیرێن، ئەگەر وەك قەوم لە راست یەکیان رابێنی، بەڵام ئینسانو فیکر، ئینسانو بەرنامە تێکناگیرێن، تا بڵێی: کێ بە قوربانی کێ دەکەی؟ بەرنامەکە بۆ ئینسانەکە هاتوە کە بەختەوەری بکاتو، ئینسانەکەش پێویستی بە بەرنامەکەیە خۆی پێ بەختەوەربکا.

بەڵێ پێویستە ئەو جۆرە پەیوەندیی و سەرپێبوون (إرتباط وإنتماء)انە لەسەر بناغەی شەریعەت بنو بەشێوەیەکی رەوا بنو، تەنها چوارچێوەو بناغەی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی (الموالاة والمعاداة)یش دینداریی و مسوڵمانەتیی بێ، کە بێگومان تەنها ئەو بناغەو بازنەیەش جێگای هەموو مسوڵمانانی تێدا دەبێتەوەو، لەسەر بناغەی ئیمانو ئیسلامیش نەبێ دادگەریی و یەکسانیی لە نێو مسوڵماناندا نایەتەدیو، بەبێ هاتنەدیی دادگەریی و یەکسانییش، هەرگیزاو هەرگیز ئەو ئوممەتە ئیسلامییە تۆکمەو تووندوتۆڵو یەك دەنگو رەنگو سەنگە، کە خوا ﷻو پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان بە هێنانەدیی و بنیاتنانی کردوە، پەیدانابێ.

ئینجا ـ وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ـ هەمیشە برایەتیی و یەکڕیزیی و تۆکمەیی و تەبایی مسوڵمانان، لە قەدەر ڕاددەی ئیمان و پارێزکارییانە، وە کە لەم ڕۆژگارەشدا دەبینین مسوڵمانان گیرۆدەی داوی پەرتەوازەیی و دابڕ دابڕ بوون بوونە، بەهۆی دەمارگیریی و سەرپێبوون (إنتماء)ی جۆراوجۆریان بۆ تیرەو گەلو ناوچەو زمانو ڕەگەزو ... هتدەوەیە، بەدەر لە چوارچێوەو یاساکانی شەریعەت، وە دەبێ دڵنیابین کە هەتا لە بناغەوە چارەی ئەو دەردە کوشندەیان نەکەین و، لە چاوگو سەرچاوەوە ئاوەکەیان ڕوون نەکەینەوە، هەر هەوڵێکی دیکەمان بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستە بێ سوودو ئاکام دەبێ!

خوای پەروەردگار بە لوتفو کەرەمی خۆی یارمەتی هەموو لایەکمان بدات کە زیاترو چاکتر لە دینەکەمان تێبگەین و، ڕێزو خۆشەویستی و حورمەت و مەحەببەتی نێوانمان زیادبکا، چ وەك قیادەو قاعیدە، چ وەك مسوڵمانان بە گشتی.

# بنەمای حەوتەم

## دانەبەزین لە بنەما و ئامانجە سەرەکیی و نەگۆڕەکان و، بێئاگانەبوون لە مەداراکردن:

بە هیچ شێوەیەك دانەبەزینو دەستبەردارنەبوون لەو بنەماو مەبدەئە شەرعییانەی کە وازلێهێنانیان، سەردەکێشێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی بناغەی لەسەر وەستانی کۆمەڵی ئیسلامییو شەرعییەت پێوە نەمانیو پووچەڵ بوونی، بۆ وێنە: دۆستایەتییکردنو پشتگیرییکردنو پشت پێبەستنی ئەهلی کوفرو شیرك‌و نیفاق، کە پێچەوانەی بنچینەی گەورەو گرنگی: دۆستایەتییکردنو دوژمنایەتییکردن لەبەر خوا (الموالاة والمعاداة في الله)یە!

بەڵام پێویستە زۆر وریا بین ! پێکەوە مەداراکردنو گونجان (المداراة) لەگەڵ دەوروبەردا، بەبێ نەرمیی کێشان (المداهنة) و وازهێنان لە بنەماکان (مبادیء) و سیاسەت‌و ستراتیژی خۆ، کە بێگومان بۆ هەر کارو جموجۆڵێکی سیاسییانە پێویستە، لەگەڵ لێ دابەزینی بنەما شەرعییەکان، تێکەڵ نەکەین، چونکە دابەزین (تنازل) و نەرمکێشیی (مداهنة) هەمیشە حەڕامن، بەڵام مەداراکردنو گونجان (مداراة) دروست (جائز)و بگرە جاری وا هەیە فەرزیش دەبێ، مادام ئامانج‌و مەبەستێکی شەرعیی پەکی لەسەری بکەوێ، دیارە بواری سیاسەتی شەرعییش، لە سۆنگەی ئەوەوە کە دەقەکانی شەریعەتی تێدا کەمن، تارادەیەکی زۆر دەستی مسوڵمانانی تێدا کراوەیەو، گرنگ ئەوەیە

لەگەڵ دەقێكی روونو بێ چەندوچوونی قورئان و سوننەتدا تێكگیران نەبێ، ئەگەرنا سەنگی مەحەك دابینكردنی بەرژەوەندی (تحقيق المصلحة)یە، چونكە وەك چۆن بناغە لە خواپەرستییەكاندا وەستێنرانە (الأصل في العبادات التوقيف)، بە پێچەوانەوە: بناغە لە هەڵسوكەوتەكاندا ڕێپێدرانە (الأصل في العادات العفو)[١]، واتە: دروست نیە هیچ خواپەرستییەك ئەنجام بدرێ، مەگەر دەقێكی شەریعەتی لەسەربێ، بەڵام بۆ هەڵسوكەوت و عادەتەكان هەموو شتێك رەواو ڕێپێدراوە، مەگەر دەقێكی شەیعەت قەدەغەی كردبێ.
بەڵگەی ئەوەش كە گوترا، ئەمانەن:

١- ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ زۆر جوان ئەو راستییە دەدرەوشێنێتەوەو چاكترین بەڵگەیە لەوبارەوە، كە هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ كابرایەكی بە خراپترین كەسی تیرەكەی زانیوە، كەچی كاتێك كە هاتۆتەلای ڕێزی گرتوەو قسەی نەرمی لەگەڵ كردوە: (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ رَجُلاً اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِئْذَنُوا لَهُ فَلَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ أَوْ بِئْسَ رَجُلُ الْعَشِيرَةِ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ أَلانَ لَهُ الْقَوْلَ، قَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ لَهُ الَّذِي قُلْتَ ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ؟ قَالَ: يَا عَائِشَةُ إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ وَدَعَهُ النَّاسُ أَوْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ) رواه البخاري: (٦٠٥٤) و

---

١) بڕوانە: (القواعد النورانية الفقهية)ى (إبن تيمية) ص: (١١٢)، كە ئەوەی هێناومە دەقی قسەكەیەتی، وە بڕوانە: (رسالة لطيفة جامعة في أصول الفقه المهمة)ى (عبد الرحمن بن ناصر السعدي) ص: (١٠٥- ١٠٦)، كە بنچینەی ناوبراوی بەم شێوەیە هێناوە: (الأصل في العبادات الحظر، إلا ما ورد عن الشارع تشريعه. والأصل في العادات الإباحة، إلا ما ورد عن الشارع تحريمه)، واتە: (بناغە لە خواپەرستییەكاندا قەدەغەبوونە، جگە لەوەی كە شەرع دانەر دایبنابێ. وە بناغە لە عادەتەكاندا رەوایی یە، جگە لەوەی كە شەرع دانەر قەدەغەی كردبێ).

مسلم: (٢٥٩١) واللفظ له. واته: (دایكمان عائیشه - خوا لێی رازی بێ- دەگێڕێتەوە كە پیاوێك مۆڵەت وەردەگرێ بێتەلای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: مۆڵەتی بدەن با بێ، هەرچەندە خراپترین كوڕی هۆزەكەی خۆیەتی، یان خراپترین پیاوی هۆزەكەی خۆیەتی، جا كاتێك دێتە ژوور، پێغەمبەر ﷺ قسەی نەرمی لەگەڵ دەكاتو ڕێزی دەگرێ، وەك عادەتی خۆی، عائیشە - خوا لێی رازی بێ- دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوەت فەرموو كە فەرمووت - واتە كە ئینسانێكی خراپە-، دواییش قسەی نەرمت لەگەڵ كرد ؟! پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی عائیشە ! شوێنو پلەی خراپترین كەس لەلای خوا لە ڕۆژی دواییدا، كەسێكە كە خەڵك لەبەر خراپییانی دووریی لێبگرنو وازی لێبهێنن).

٢- خوای كاربەجێ و تۆڵەستێن و باڵادەستیش ﷻ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾﴾ الإسراء، خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە كە تۆمان ڕاگیر كردو چەسپاند - واتە لەسەر پابەندیی بە شەریعەتەوە -، بە تەئكید نزیك بوو كە تۆزێك بە لایاندا بچی، ئەگەر واشت كردبایە بەڕاستی لە ژیانی دنیاداو دوای مردنیش، دوو قات سزامان دەدای، پاشان هیچ كەسیشت چنگ نەدەكەوت كە لە بەرانبەر ئێمەدا پشتت بگرێو یارمەتیت بدات).

كەواتە: دابەزین لە بنەماكانو دەست لێ هەڵگرتنی پرەنسیپو مەبدەئەكان، گوناهێكی نەبەخشراوە، تەنانەت ئەگەر لە پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووبدا، كە ئەوە مەحاڵە، بەڵام وەك كوردەواریی خۆمان

دەڵـێ: (دیـوار لەگـەڵ تۆمـە، گـوێ سـوانە گوێـت لـێبـێ)، واتـە: كـە لێـرەدا خوای پەروەردگار ﷻ فەرمایشت لەگەڵ پێغەمبـەر ﷺ دەكاتو مەبەست پیێ ئۆممەتەكەیەتی.

٣- هـەروەها خـوای بـێ وێنـە ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ المائدة، واتە: (زۆرێكیان -لە جوولەكە و دیانەكان- دەبینی كـە دۆستایەتیی ئەوانە دەكەن كە كافرن، بێگومان خراپترین شت كـە پـێش دەستی خۆیانی دەخەن بۆ دواڕۆژ، ئەوەیە كـە خـوا لێـیان تووڕەدەبـێ و، بـە هەمیـشەیی لـە ئـاگردا دەمێننـەوە، وە ئەگـەر هاتبـا و بڕوایـان بـە خـوا و بـە پێغەمبـەرو بەوەی كە بۆی نێردراوەتـە خـوار، بـبوایـە، ئـەوانیان بـە دۆسـت نـەدەگرت، بەڵام زۆربەیان لەڕێ دەرچوون).

## ڕوونكـردنەوە:

ئێستاش نۆرەی ڕوونكردنەوەی نێوەڕۆكی ئەم بنـەمای حەوتەمەیــەو، دەڵـێین: ئەم بنەمـای حەوتەمە دوو بابـەت (موضوع)ی گرنگی گرتوونە خـۆ:

**یەكـەم: دەسـتبەردارنەبوونی ئـەو بنـەماو مەبدەئـە شــەرعییە گەورانـەی كە كۆمـەڵی ئیـسلامیی یـان لەسـەر بنیـاتنراوەو، وازلێهـێنانیان دەبێتـە مایەی شـەرعییەت پێوە نەمانیو پووچەڵبوونی:**

سەبارەت بەم بابەتە، پێویستە دوو ڕاستی گرنگی لەبارەوە بزانین:

أ/ ئامـانجو مەبەسـتی كـارو كۆمـەڵی ئیـسلامیی بریتییـە لـە پابەنـدیی بـە بنـەما شــەرعییەكانەوەو، بەرجەسـتەكردنیان لە دنیای واقیعـدا:

بۆیە هەر كارو كۆمەڵێكی ئیسلامیی لەو مەبدەئانە خاڵی بـۆوە، كـە بناغـەی لەسەر ڕۆنرانو ئامانجو مەبەستنی، ئەوە بێگومان ئەو كارو كۆمەڵە لەسەر بوون (وجود)ەكەی قەرزدار بۆتەوەو، نەمانی چاكترە، چونكە بێگومـان هـەر شـتێك نێوەڕۆكی تێدا نەماو، ئەو ئامانجەی كە بۆی پەیــداكراوە، فـەوتا، مانـای وایـە ماوەتەوە ناوی بێ نێوەڕۆكو، قاوغو قەپێلكی بۆشو بێ كاكڵ!

ب/ بەرپرسو مشوورخۆرانی كارو كۆمەڵی ئیسلامیی، ئەگەر زۆر وریاو تونـدو تۆڵو دامەزراو نەبن، ئەوە ناحەزو دوژمنانیان لەژێر گوشاری هەوڵو تەقـەللاو پیلانی جۆراوجۆردا، لە بنەما شەرعییەكان (الثوابت الشرعية)یـان لایانـدەدەنو دەستیان پێ لە دینەكـەیان بەردەدەن:

وەك خـوای باڵادەسـتو زاڵ ﷻ فەرموویـەتی: ﴿وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾﴾ الإسراء، كە پێشتر مانامان كرد.

یان كە لە سەرەتای سوورەتی (الأحزاب) دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ...﴿١﴾﴾، واتە: (ئەی پێغەمبـەر! پارێـز لە خـوا بكەو، فەرمانبەریی كافرو مونافیقەكان مەكەو بە قسەیان مەكە ...)، بە تەئكیـد خوا ﷻ دەزانێ پێغەمبەری خۆی ﷺ پارێزراوە، لەوەی بەقسەی كافران بكـا، لەوەی كە بێ تەقـوا بێ، لەوەی كە لە راستە شەقامی خوا لابدا، بەڵام مەبەست پێی ئۆمـەتەكەیەتی.

**دووەم: وریابوون لە تێكەڵكردنی دۆسـتایەتیی كـردن (الـموالاة)و پێكـەوە مـەداركردن (الـمداراة)، كـە یەكـەمیان لەگـەڵ غـەیری مـسوڵمانانـدا قەدەغەیـە و، دووەمیـشیان لەگـەڵ هـەموو كەسـدا نـەك هـەر دروسـت (جائز)ە، بگرە فەرزیشـە:**

**أ) دۆستایەتی گـرتن (الـمـوالاة):**

دۆسـتایەتی گرتـنو دوژمنـایەتی كردن لەپێنـاوی خوادا (الـموالاة والـمعاداة فـي الله) یەكێكە لەو مەسەلانەی كە خوای پەروەردگار ﷻ لە قورئاندا پانتاییەكی باشی بۆ تەرخانكردوونو، لە چەندان ئایەتدا خستوونیە ڕوو، كە دوایـی ئامـاژە بە هەندێكیان دەكەین.

چـەمك‌و واتـای (دۆسـتایەتی گـرتن‌و دوژمنایـەتی كـردن لەبـەر خـوا)ش بەكورتی‌و پوختی ئەوەیە كە: دەبێ ئینسانی مسوڵمان هەركەسێكی خۆشبوێ‌و دۆستایەتی بكات، تەنها لەبەر خوا بێ‌و، هەركەسێكیشی بوغزاندو دژایەتی كرد، دیسان هەر لەبەر خوا بێ.

ئاشكراشە كە خۆشویستن‌و بە دۆست گرتنێك لەپێناوی خـوادا بـێ، لەسـەر دۆستانی خوا (أولیـاء الله) كورت هەڵدێ كە بڕواداران، خـوای بـەرزو مـەزن دەفـەرموێ: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ...﴿٢٥٧﴾﴾ البقـرة، واتـە: (خـوا ﷻ دۆست‌و پشتیوانی بڕوادارانە ...).

هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوەی كـە مـسوڵمانان دەبـێ تـەنیا ئـەهلی ئیمـان بـە دۆسـت بگـرن، ئەوەیـە كـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾﴾ یونس، دەفەرموێ: (ئاگادار بن دۆستانی خوا نـە ترسـیان لەسـەرەو نـە پەژارە دایاندەگرێ، ئەوانەی بڕوایـان هێنـاوەو پارێزیـان كـردوە)، كەواتـە كـێ دۆستی خوایە؟ ئیماندارانی پارێزكار، وەك زانایان گوتوویانە: (مَنْ كَانَ مُؤْمِنًـا تَقِـيًّا كَانَ لِلّهِ وَلِـيًّا)، واتە: (هەر كەسێ بڕواداری پارێزكار بـێ، ئـەوە دۆسـتی خوایە)، هەرچەندە زۆر جار خەڵكی عەوامی ئێمە وا دەزانن دۆسـتان‌و ئـەولیای خوا ﷻ خەڵكی گێـژو وێژو فەقیرو سادەن‌و ئەوانەن كە شـێتن! كـە لـە راسـتیدا وانیە، دۆسـتانی خـوا ﷻ دەبـێ لـە نێـو خـەڵكی زەمـانی خۆیانـدا بـە عـەقڵ‌و مەعریفەت‌و تێگەیشتن‌و شارەزایی قووڵ لە ئیسلام‌و پابەنـدیی بـاش ناسـرابن، ئەوانە دۆستی خوان ﷻ، هەڵبەتە مەرج نیـە پارەو سامان‌و موڵـك‌و دەسـەڵاتیان

هەبێ، بەڵام بە تەئكید دەبێ تێگەیشتوو بنو لە دیندا شارەزا بن، ئەگەرنا كەسێك شێت بێ هەر تەكلیفی لەسەر نیە، چ جای ئەوەی ببێتە دۆستی خوا ﷻ!!

هەروەها بوغزاندنو بە دوژمن گرتنێكیش لەپێناوی خوا ﷻدا بێ، دەبێ تایبەت بكرێ بە دوژمنو ناحەزانی خوای دادگەرەوە ﷻ، كە پێڕو تاقمەكانی كافرو مونافیقو موشریكەكانن، ئیماندار دەبێ ئەوانە ببوغزێنێ كە خوا ﷻ دەیانبوغزێنێو ناحەزو دوژمنی خوان ﷻ، لەپێش هەمووشیانەوە شەیتان، لەو بارەشەوە ئایەت زۆرن، ئەمەش چەند ئایەتێك وەك بەڵگە، دەربارەی ئەو مەسەلە گەورەو گرنگە:

١- خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾﴾ فاطر، واتە: (بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنە، ئێوەش بە دوژمنی بزانن و بە دوژمنی بگرن، ئەو كۆمەڵی خۆی بانگ دەكات تاوەكو بیانكاتە خاوەنی كڵپەی دۆزەخ).

٢- وە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾﴾ النساء. واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! كافران لە جیاتی ئیمانداران مەگرن بە دۆست، ئایا دەتانەوێ بەڵگەیەكی ئاشكرا لەلایەن خوا وە لەسەر خۆتان تۆمار بكەن؟)، واتە: خوا ﷻ بەڵگەی لەسەرتان بێ كە ئێوە خوا ﷻتان خۆش ناوێتو دۆستی خوا ﷻ نینو ئیمانتان نیە؟

٣- خوا ﷻ ڕووی دواندن لە پێغەمبەر ﷺ دەكات، یان هەر كەسێك كە قورئان دەخوێنێت، یاخود بە ڕێی پێغەمبەر ﷺدا دەڕواتو، دەفەرموێ:

﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ...﴿٢٢﴾﴾ المجادلة، واته: (کەسانێکت دەست ناکەون بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، خۆشەویستیو دۆستایەتییان هەبێ بۆ کەسانێك کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، با ئەو کەسانە بابیان بن، یان کوڕیان بن، یان برایان بن، یان تیرەو هۆزیان بن ...)، دوایی خوا ﷻ هەر لەو ئایەتەدا مەدحی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، کە بە هیچ شێوەیەك دۆستایەتیی دوژمنانی خوا ﷻو پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەنو خۆشیان ناوێن، مەدحیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿... أُو۟لَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾﴾ المجادلة، واتە: (... ئا ئەوانە خوا ئیمانی لە دڵدا نووسیون – واتە: چەسپاندوە،[1] وە بە ڕۆحێك لەلایەن خۆیەوە پشتگیریی کردوون[2]، وە دەیانخاتە چەند باخێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆنو بۆ هەمیشە تێیاندا دەمێننەوە، خوا لەوان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازین، ئا ئەوانە کۆمەڵی خوان، بێگومان کۆمەڵی خوا سەرفرازن).

---

١) چونکە تۆ کە شتێك دەنووسی چی لێدەکەی؟ لەسەر وەرەقە دەیچەسپێنی.

٢) ئەو ڕۆحە چییە؟ ئەو نوورو ڕۆشنایییەی ئیمانو هیدایەتەیە، کە لە دڵدا جێگیر دەبێ.

٤- هەروەها خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾ المائدة، واتە: (بێگومان دۆستی ئێوە، تەنها خواو پێغەمبەرەکەیو ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە، کەسانێك کە نوێژ بەرپادەکەنو زەکات دەدەنو هەمیشە رکووع بەرن، وە هەر کەسێکیش دۆستایەتیی خواو پێغەمبەرەکەیو ئەوانە بکات کە ئیمانیان هێناوە ـئەوە کۆمەڵی خوایەـ، وە بێگومان هەر کۆمەڵی خواش زاڵن).

حیزبی خوا کێیە؟ لێرەدا دەفەرمویٚ: بێگومان دۆستی ئێوە، یانی کەسیٚ ئێوە بیگرن بە دۆستو پشتیوانی خۆتانو دۆستایەتیی بکەن: خوایە ﷻ، پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوەو نوێژ بەرپا دەکەنو زەکات دەدەنو رکووع دەبەن، دوایی دەفەرمویٚ: هەر کەسێك دۆستایەتیی خوا ﷻو پێغەمبەری خوا ﷺو ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، بکات، ﴿... فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾ المائدة، واتە: (... ئەوە کۆمەڵی خوا سەرکەوتوون)، واتە: ئەوە کۆمەڵی خوایە، کەواتە (حِزْبُ اللّٰهِ) کێن؟ لە ئایەتەکەی سوورەتی (الـمجادلة)دا فەرمووی: حیزبی خوا ئەوانەن کە دوژمنانی خوا، کەسانێك کە ناحەزایەتی خوا ﷻو پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن، ئەگەر بابو براو کوڕو خزمو عەشیرەتیشیان بن، خۆشیان ناوێنو بە دۆستیان ناگرن، لەویٚ بە بارە سەلبییەکەیدا پێناسەی کۆمەڵی خوای کرد، لێرە بە بارە ئیجابییەکەیدا، چونکە دەبیٚ بە هەردووك دیواندا بیٚ، هەر بەوەندە پێکنایە ئینسان تاعەت بکات بۆ خوا ﷻ، دەبیٚ خۆشت لە گوناح بە دوور بگری، تەقوا هەر ئەوە نیە کە گوناحان نەکەی، بەڵکو پێش گوناح نەکردنیٚ،

تەقوا بریتیـە لە چاکە کـردن، تـەقوا هـەر ئـەوە نیـە لانـەدەی، بـەڵکو دەبـێ ڕاستیش بڕۆی، دۆستایەتییکردنی خوای پەروەردگار ﷻو دۆستایەتییکردنی پێغەمبـەری خوا ﷺو دۆستایەتییکردنی ئیمانداران، کاتێك دەچەسپێ، کـە بەولادا بە هیچ شێوەیەك دۆستایەتیی دوژمنو ناحەزانی خـوا ﷻو پێغەمبـەری خوا ﷺو ئیمـانداران نەکەی.

جـا ئـەوەی کـە لـەم ئایەتـە بەپێـزانـە دەفامرێتـەوە، زۆر بـە ڕوونیـــیو بێچـەندوچوون، دوو ڕاستی گەورەو گرنگـن:

**ڕاسـتیی یەکـەم**: ناگونجـێ ئینسان ئیمـانی هـەبێو دوژمنـانی خـوای – کـە کافرانو موشریکەکانو مونافیقەکانن ـ خۆشبوێو دۆستایەتییان بکـات، وە دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ دوژمنانی خوادا بە هەموو جۆرەکانیانەوە، نیـشانەی بێ ئیمانییو لە دین دەرچوونە! وەك لە ئایەتی ژمارە (٥١)ی (الـمائدة)دا زۆر بە ڕاشکاویی خوای پەنهان بین ﷻ فەرموویەتی کە هەر کەسـێك جوولەکـەو دیانەکان بگرێ بە دۆست، ئەوە مسوڵمان نەماوە و، حوکمی ئـەوانی هەیـەو چۆتە ریـزی جوولەکـەو نەسـڕانییەکانەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ المائدة، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێناوە! جوولەکەو نەسڕانییەکان مەگرن بە دۆست، ئـەوان لـە نێـو خۆیانـدا دۆستایەتیی یەکدی دەکەنو، هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن و پشتی یەکـدی دەگرن، وە هەر کەسێك لە ئێوە دۆستی ئـەوان بـێو، دۆسـتایەتییان لەگەڵـدا بگرێ، ئەوە لەوانە، بێگومان خوا کەسانی سـتەمکار ڕێنمایی ناکا).

هەروەها لەبارەی دۆستایەتییكردنی خاوەن كتێبەكان لەگەڵ كافرەكانی دیكەدا فەرموویەتی: ﴿ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ المائدة.

ئەوەی لێرەدا بە پێویستی دەزانم بیڵێم ئەوەیە كە خوا ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ باسی جوولەكەو نەسرانییەكان دەكا، دەفەرموێ: زۆر لەوانە دەبینی دۆستایەتیی كافران دەكەن، ئەوە خراپترین شتە ـ دۆستایەتیی كردنی ئەوان بۆ كافران خراپترین شتەـ كە پێش دەستی خۆیانی دەخەن بۆ قیامەت، چونكە بەهۆی ئەوەوە خوا لێیان تووڕەیەو، بە هەمیشەیی لە ئازارو ئەشكەنجەی دۆزەخدا دەمێننەوە)، دوایی خوا ﷻ زۆر بە ڕوونو ڕاشكاویی دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ المائدة، واتە: (ئەگەر ئەوانە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرو بەوەی كە بۆ پێغەمبەر نێرداوەتە خوارێ، هەبووایە كافرەكانیان بە دۆست نەدەگرت)، كەواتە ئەوە سەنگی مەحەكەو بەڕاستی ئەو شیعرە عەرەبیە زۆر جوانە كە دەڵێ:

لا تَسَلْ عَنِ المَرْءِ وَسَلْ عَنْ قَرِينِهِ

فَكُلُّ قَرِينٍ بِالْمُقَارِنِ يَقْتَدِي

واتە: (پرسیار دەربارەی مرۆڤ مەكە، بەڵكو پرسیار دەربارەی برادەرو هاودەمی بكە، چونكە هەموو هاوەڵێك شوێن پێی هاوەڵەكەی هەڵدەگرێ).

ئەگەر ویستت كەسێك بناسی، بزانە لەگەڵ كێ تێكەڵە، ئەگەرنا ئەگەر هەر ئیددیعای مسوڵمانەتی بێ، ئەوە هەموو كەس دەتوانێ، قسە بێ دەسەڵاتە هەموو كەس پێی دەوێرێ، بەڵام ئەگەر دەتەوێ لێی حاڵی بی لەگەڵ كێیەو، بزانی ڕووی لە چییەو، لەسەر چ بەرنامەیەكە؟ تەماشا بكە لەگەڵ كێ دەڕوا، ڕووی لە كوێیە، بە هۆی ڕێبازو ڕەفیقەكانییەوە دەیناسی، بەڵێ بەڕاستی ئەم ئایەتە تەرازوویەكی باش دەخاتە بەردەستی ئێمە، بۆ خۆناسینو خەڵك ناسین، وە بەڕاستی ئەو مەسەلەی دۆستایەتیكردنو تێكەڵی كردنی خەڵك زۆر گرنگە، دەبێ بزانی كە تێكەڵیی كردن بە مەعنای خۆشویستنیانو پشتگرتنیانو لەگەڵدا بوونیان، بەڕاستی هەروا شتێكی سادە نیە، مرۆڤ پێیوابێ كە مادام نوێژی كرد، ئەوجار لەگەڵ هەر كەسێك بە ڕێگادا بڕوا، لە هەر ڕێیەكدا سەری بە فەتارەت بچێ، قەیدێ ناكا، نەخێر وانیە، بەڵكو وەك چۆن چوونە مزگەوتەكەت لەبەر خوایە، دەبێ هەڵسوكەوتی بازاڕو كۆمەڵاتییشتو هەڵوێستی سیاسییشت لەبەر خوا بێ و، بەپێی شەرعی خوا بێ، ئەگەر نا نوێژێكی بێ ڕۆح تۆ لەوە نەگێڕێتەوە كە لە خزمەتی كوفردا بی، هیچ نیە، خوای كاربەجێ ﷻ ئەو نوێژەی فەڕز نەكردوە لەسەر تۆ، بەڵكو نوێژێكی لەسەر تۆ فەرز كردوە، كە لە هەرچی خراپەیە بتگێڕێتەوە، ئەدی ئەگەر لە گەورەترین خراپە نەتگێڕێتەوە؟! كە ئەوەیە پشتی ئەهلی كوفر بگریو لەگەڵ ئەهلی كوفر دابیو ئەوانت خۆش بوێت، مانای وایە نوێژت نەكردوە!! چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿...إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ... ﴿٤٥﴾﴾ العنكبوت. واتە: {... بێگومان نوێژ مرۆڤ قەدەغە دەكات لە (فحشاء)و لە (منكر) ...}. (فحشاء): بریتیە لە

هەموو ئەو شتانەی کە ناقۆڵاو خراپن‌و بە زمان دەگوترێن، (منکر)یش: بریتیە لە هەموو ئەو کردەوە خراپانەی کە بە ئەندامەکان دەکرێن، دیارە شتی زۆر خراپیش ئەوەیە کە ئینسان دوژمنانی خوا بە دۆست بگریێ‌و، ئەگەر نوێژەکەت لەوەی نەگێڕایەوە، مانای وایە نوێژ نیە، چونکە ئەگەر نوێژ بووایە دەیگێڕایەوە.

**ڕاستیی دووەم**: تەنها کەسانێك کە دروست بێ مسوڵمانان بە دۆستیان بگرن‌و، پاش خوا ﷻ‌و پێغەمبەری خوا ﷺ لە حاڵی حەیاتیدا پشتیان پێ ببەستن[1]، تەنیا کەسانێك کە دروست بێ، ئینسان دۆستایەتییان لەگەڵدا بگرێ، کێن؟ بێگومان ئیماندارانن، واتە: غەیری ئەوان لەسەر مسوڵمانان قەدەغەکراوە کە بە دۆستیان بگرن‌و پشتیان پێ ببەستن، ئەوە بە نسبەت دۆستایەتیی گرتن، ئەوجار بێینە سەر مەسەلەی مەدارکردن:

**ب- مەدارکردن (المداراة):**

ئەگەر دۆستایەتیی گرتنی مسوڵمانان تایبەتە بە ئەهلی ئیمانەوە -وەك پێشتر باسمانکرد-، ئەوە مەدارکردن‌و دڵ ڕاگرتنی خەڵك‌و لەگەڵ ساچاندنیان‌و گونجان لەگەڵیان، گشتییەو، مسوڵمانان‌و کافران دەگرێتەوە، واتە: دەبێ تەنیا دۆستایەتیی مسوڵمانان بکەی، بەڵام دەبێ مودارا‌و گونجاندن‌و ساچاندن لەگەڵ هەموو کەس هەبێ‌و، شەریعەت نەك هەر ڕێیپێداوە، بگرە بە پەسندی داناوەو

---

١) چونکە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ تەنیا پشت بە خوا ﷻ دەبەسترێ، بەڵام گونجاوە کە لە حاڵی حەیاتی پێغەمبەردا ﷺ مسوڵمانان پشتیان بە پێغەمبەر ﷺ قایم بێ‌و لە دوای خوا ﷻ سەرپەرشتییان بکاو بگەڕێنەوە بۆ خزمەتی.

پێویستیشی کردوە کە مسوڵمانان – بەتایبەت لە بواری کارو چالاکی ئیسلامییدا- لە سنووری شەرعدا بە شێوەیەك لەگەڵ خەڵکیدا مامەڵەو ڕەفتار بکەن، کە زەرەرو زیان دووربخرێتەوەو، بەرژەوەندی دابین بکرێ و، کاروباری ئیسلام پێشبخرێو گەشەی پێبدرێ، بەپێی ئەو بنچینە شەرعییەی کە دەڵێ: (لِلْوَسَائِلِ حُكْمُ الْمَقَاصِدِ)، واتە: (ئامرازەکان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە)، ئەگەر تۆ نەتتوانی کۆمەڵگا چاك بکەی بەبێ مودارا لەگەڵدا کردنیان، موداراکردنەکە پێویستە، وە چاککردنی خەڵکیشو گۆڕینی خەڵکیش بە تەئکید فەرزە، کەواتە: موداراکردنەکەش فەرزە.

هەڵبەتە مەبەستیش لە مودارا ئەوەیە کە تۆ بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکەی کە زەرەرو زیان دووربخەیتەوەو، قازانجو چاکە دەستەبەر بکەیو کاری ئیسلامیی بەرەو پێشەوە بەری.

ئینجا لەنێوان دۆستایەتیی گرتن (الموالاة)، کە وەك گوتمان لەگەڵ غەیری ئەهلی ئیماندا دروست نیە، وە مەدارکردن (المداراة)دا، کە لەگەڵ هەموو کەس بە کافرو مسوڵمانەوە دروستە، چەند جیاوازییەك هەن کە گرنگترینیانو سەرەکیترینیان ئەوەیە: دۆستایەتیی گرتنو خۆشویستن بەر لە هەر شتێك پەیوەندیی بە دڵو دەروونەوە هەیەو پێیەوە پەیوەستە، بەڵام مودارا زیاتر پەیوەندیی بە ڕواڵەتەوە هەیە، واتە لە دۆستایەتییدا دەبێ لە دەروونو ناخەوە بەرانبەرەکەت خۆشبوێ، بەڵام لە موداراداوا نیەو، گرنگ ئەوەیە دیوی دەرەوەو ڕواڵەت لەگەڵی سازو گونجاو بێ، قسەت لەگەڵی خۆش بێو ڕووت لەگەڵی خۆش بێو حورمەتی بگری، ئەوە مودارایە، بەڵکو قەدەغەیە کە ئینسانی ئیماندار لە دڵەوە غەیری ئەهلی ئیمانی خۆشبوێ.

بەڵام بێگومان ئەوە كە مرۆڤی مسـوڵمان سیفەتی باشی لە مرۆڤی نامسوڵماندا خۆشـبوێ هیچ ئیشـكالی تێدانییـە بە بەڵگـەی ئـەوە كە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە (أَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ)ی فەرموو: (إِنَّ فِيكَ خَـصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَـا اللَّـهُ الْحِلْـمُ وَالأَنَـاةُ) رواه مسلم: (١٧)، والترمذي: (٢٠١١)، وابن ماجـه: (٤١٨٨). واتە: (تـۆ دوو سـیفەتت تێـدان خوا خۆشـیدەوێن: هێـوریی و لەسـەرخۆیی)، كـە دیـارە ئەو كاتە جارێ مسـوڵمان نەبوو بوو.

ئـەو فەرمایـشتەی پێغەمبـەریش ﷺ كـە پێـشتر هێنامـان چـاكترین بەڵگەیـە لەوبارەوە، كە جارێكیان كابرایەكی خراپ مۆڵـەت دەخـوازێ كـە بـچێتە مـاڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دوای ئەوەی دەزانێ كێیە، دەفـەرموێ: (... إِئْـذَنُوا لَـهُ فَلَـبِئْسَ أَخُــو الْعَـشِـيرَةِ أَوْ إِبْـنُ الْعَـشِـيرَةِ ...) رواه البخـاري: (٦٠٥٤)، ومسلم: (٢٥٩١)، واتـە: (مۆڵەتی بـدەن با بێ، هەرچـەندە خراپتــرین بــرای یان كوڕی كەسی هۆزەكەیەتی ...). ئینجــا كـە دێتـە ژوورەوەش، پێغەمبـەری خوا ﷺ ڕێزی دەگرێ‌و قسەی خۆشی لەگـەڵ دەكـات! جـا ئایـا پێغەمبـەر ﷺ كاتێك كە دەفەرموێ: (... إِئْذَنُوا لَهُ فَلَبِئْسَ أَخُــو الْعَـشِـيرَةِ ...)، دەگونجـێ لـە دڵـەوە خۆشی بوێ، بە تەئكید نەخێر، چونكە مادام ئەوەندە خراپ بـێ، چـۆن خۆشی دەوێ؟! كـە ڕەنگـە هـەر مـسوڵمانیش نـەبووبێ، بـەڵام بـە ڕواڵـەتیش پێغەمبەر ﷺ ڕێزی لـێ گرتووەو مودارای لەگەڵدا كردووەو قسەی نەرمی لەگەڵـدا كردوە، بۆیەش دایكمان عائیشـە خوا لێی ڕازی بێ سـەری سـوڕماوە، چـونكە ئەو وایزانیوە كە هەر كەسـێكت بـە دڵ خـۆش نەویـست، دەبـێ بـە ڕواڵـەتیش دوژمنـایەتیی‌و بوغزی پێشان بدەی، بەڵام پێغەمبـەر ﷺ لێی حاڵیی كـردوە كـە نەخێـر، جاری وا هەیـە دەبێ تۆ ڕقی خۆت قـوت بدەیـەوە، هەسـتی نێـو دڵ‌و

دەرووونی خۆت كپ بكەیەوە، لەپێناو بەرژەوەندییەكی گەورەتردا[1]، كە ئەویش هەر ئیسلام فەرمانی پێكردوە.

كەواتە: جیاوازیی سەرەكیی نێوان دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ مەداركردن، ئەوەیە كە دۆستایەتیی كردن زیاتر پەیوەندیی بە ناخو دەروونەوە هەیە و، مودارا كردنیش زیاتر پەیوەندیی بە ڕواڵەتەوە هەیە.

هەروەها مەداركردن (المداراة)و نەرمكێشیی (المداهنة)ش دیسان لەیەك جیان، چونكە مودارا بریتیە لە قسەی خۆش‌و ڕووی گەش‌و ڕێزو حورمەت گرتنی بەرانبەر، بەڵام موداهەنە بریتیە لە نەرمكێشیی‌و دابەزین لە حەق (التنازل عن الحق)، یان ناهەق كردنە هەق‌و هەق كردنە ناهەق، بۆ ڕازیكردنی بەرانبەر، ئەوەش بە تەئكید قەدەغەیە، بۆیە دەبێ ئەوەش بزانین كە دیسان مودارا لەگەڵ موداهەنەش لێك جیایە، هەربۆیەش مودارا چەند ڕەواو پەسندە، موداهەنە بەپێچەوانەوە هێندە نارەواو ناپەسندە.

ئینجا پێویستە ئەو حەقیقەتە باش بزانین كە ئەنجامدانی كارو چالاكی سیاسیی‌و كۆمەڵایەتیی ئیسلامیی‌و غەیری ئیسلامییش، بەبێ مودارا ناكرێ‌و،

---

١) واتە: منیش كە قسەی نەرمم لەگەڵدا كرد لەبەر چاكییانی نەبوو، بەڵكو بۆ ئەوە بوو لە خراپەی دوور بم، جا ئەوە مودارایە، كە پێغەمبەر ﷺ بە تەئكید لە دڵییەوە خۆشی نەویستوە، چونكە ئینسانی هێندە خراپ بێ، خراپترین كوڕ یان پیاوی عەشیرەتەكەی بێ، بە تەئكید خۆشی ناوێ، بەڵام بە ڕواڵەت ڕێزی لێ گرتوە، ئاخر ئەو چۆتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو پێغەمبەریش ﷺ هەر ئەوەی لێ دەوەشێتەوە، جا ئەوە پێی دەگوترێ مودارا، ڕەنگە یەكێ پرسیارێكی بۆ دروستبێ: ئایا ئەوە جۆرێك نییە لە دووفلیقانەیی (إزدواجية)؟ دەڵێین: نەخێر، چونكە پێغەمبەر ﷺ لە لایەكەوە خۆشی ناوێ لەبەر ئەوەی خراپە، لە لایەكیدیكەشەوە هاتوە بۆ لای وەك میوان‌و دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ.

پێغەمبەرانی خواش علیهم الصلاة والسلام بەتایبەتی پێغەمبەری گەورەو سەروەریان موحەممەد ﷺ لە هەموو كەس زیاترو چاكتر لە بواری مودارادا سەركەوتوو بووە، وەك چۆن لە هەموو كەسیش مەبدەئییتر بووە! كەس هەبووە بەقەدەر پێغەمبەر ﷺ مەبدەئیی بووبێ؟ نەخێر، ئەدی كەس هەبووە بەقەدەر ئەو لێبوردە بووبێ، تەنانەت لەگەڵ دوژمنەكانیشیدا؟ هەڵبەتە موداراش بە هەموو كەس ناكرێ، چونكە موداراش دڵێكی گەورەی دەوێ، عەقڵێكی گەورەی دەوێ، ئەخلاقێكی گەورەی دەوێ، ئەوەی چیكڵدانە گچكەو دڵ گچكە بێ، چی لە دڵدابێ یەكسەر هەمووی هەڵدەڕێژێ، بەڵێ بە عەقڵ و دڵێكی گەورە مودارا دەكرێ، وە بەبێ مودارا كردن لەگەڵ خەڵك، كاری ئیسلامیی و كاری كۆمەڵایەتیی و كاری سیاسیی ناكرێ.

ئینجا هی وا هەیە، وا دەزانێ ئەگەر مەبدەئیی بووی، نابێ مودارا بكەی و ئەگەر موداراتت كرد، دەبێ دەست لە مەبدەء هەڵبگری! بەڵام وانیە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشقی ئێمەیە، هیچ كەس هیچ گومانی لەوەدا نیە كە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو كەس مەبدەئییتر بووەو پابەندتر بووە بە مەبدەئەكانی خۆیەوە، بەڵام تەماشا دەكەی ئەوپەڕی موداراو باخەڵ فەڕاحیی و چاوپۆشیی و لێبوردن و قسە خۆشیی و روو خۆشیشی هەبووە، تەنانەت لەگەڵ نەیارو ناحەزەكانیشیدا.

كەواتە: با هیچ كەس وانەزانێ كە مەبدەئیی بوون (المبدئية) لەگەڵ مودارا كردندا، پێكەوە دژو ناكۆكن! هەروەها با هیچ كەس گومانی وا نەبێ كە بەدەم خەڵكەوە پێكەنین و رووگەش بوون و قسە خۆش بوون و چاك و چۆنی گەرم و پێشوازیی و بەخێرهێنان و رێزلێنانی خەڵكی نا مسوڵمان، یان خەڵكی فاسق و گوناهبار، شتێكی ناشەرعییەو دروست نیەو پێچەوانەی عیززەتی نەفسە! وەك بەداخەوە هەندێك خەڵكی سادەو سەركێڵ و دڵگەرم وا بیردەكەنەوەو وا گومان

دەبەن! نەخێر لە راستیدا وا نیە، بەڵكو ئەو خوایە ﷻ كە فەرمانی پێ كردووین، بە موو لە مەبدەئەكانی خۆمان لانەدەین، هەر ئەویش فەرمانی پێ كردووین كە قسەی خۆش لەگەڵ خەڵك بكەین، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ...﴾ البقرة، واتە: (... وە قسەی خۆش لەگەڵ خەڵكی بكەن ...)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿... وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ البقرة، واتە: (... وە چاكە بكەن، خوا چاكەكارانی خۆشدەوێ)، وە هەروەها دەفەرموێ: ﴿... فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ ...﴾ المائدة، واتە: (... جا لێیان خۆش بەو چاوپۆشیی بكە ...)، وە پێغەمبەر ﷺ كە هاوەڵە بەڕێزەكانی دەنێرێ بۆ بانگكردنی خەڵك دەفەرموێ: {بَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا}[1] رواه البخاري: (٦٩)، ومسلم: (١٧٣٢)،

---

١) عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا بَعَثَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ قَالَ: (بَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا) رواه مسلم: (١٧٣٢)، وأحمد (١٩٥٧٢)، (١٩٨٠١)، وأبوداود: (٤٨٣٥)، واتە: (ئەگەر پێغەمبەر هاوەڵێكی بناردابووایە بۆ كارێكی، دەیفەرموو: موژدەدەر بن‌و تەكێنەرەوە مەبن، وە ئاسانكەر بن‌و بە زەحمەتخەر مەبن).

{عَن سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ عَن أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا وَأَبَا مُوسَى إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: بَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا وَيَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا وَتَطَاوَعَا وَلَا تَخْتَلِفَا)، قَالَ: فَكَانَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا فُسْطَاطًا يَكُونُ فِيهِ يَزُورُ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَظُنُّهُ عَن أَبِي مُوسَى} رواه أحمد: (١٩٦٩٩) (١٩٩٣٥)، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح. واتە: {(پێغەمبەر موعازو بابی مووسای ناردە یەمەن، فەرمووی: موژدەدەر بن‌و تەكێنەرەوە مەبن، وە ئاسانكەر بن‌و بە زەحمەتخەر مەبن، وە خۆبەخش بن‌و ناتەبا مەبن) – ئەبو سەعید ـ دەڵێ: هەریەكەیان ـ موعازو ئەبو مووسا ـ چادرێكی هەبوو تێیدا دەمایەوە، هەریەكەیان سەردانی هاوەڵەكەی دەكرد} ، ئەبو عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: گومان دەبەم لە بابی مووساوە، بووە ـ واتە گێڕانەوەی ئەم قسەیە ـ.

وأبـو داود: (٤٨٣٥)، واتـــە: (دڵخۆشـکەر بـن‌و سـڵەمێنەرەوە مـەبن، وە ئاسانکەر بن‌و وەزەحمەتخـەر مەبـن)، ئەگەر بتەوێ خەڵکی بـانگ بکـەی، نابـێ دووریان بخەیـەوەو بیانسـڵەمێنیەوە، بەڵکو دەبێ سەرنجیان رابکێشی، جا ئایا بـە چی سەرنجیان رادەکێشرێ؟ بێگومان بە قسەی خۆش‌و رووی خـۆش‌و گـەش‌و چاکەو رێز لێگرتن‌و هاوکاریی کردن، بـە نـەرم‌و نیـانیی‌و میهرەبـانیی، ئەگـەر بشـتەوێ بیانسـڵەمێنیەوە، دوو قسـەی رەق بکـە، کەس گوێت بۆ ناگـرێ.

هەروەها بە لایدیکەشیاندا با هیچ کەسیش پێی وانـەبێ کـە کـافرو مونـافیق‌و موشریك‌و زەندیق بـە دوژمـن زانـین‌و، دژایەتییـکردن (معـاداة)یـان لـەڕووی عەقیـدەیی‌و مەبدەئییـەوە، رێگـا لـە ئینـسانی مـسوڵمان‌و کۆمـەڵ‌و کۆمـەڵگای ئیسلامیی دەگرێ کە لە بواری هەڵسوکەوت (فـي مجـال التعـامل)دا، لەگـەڵیان چاکەکارو دادگەرو خۆشڕەفتار بن! دیارە ئێمە لە رووی فیکریـی‌و عەقیدەییـەوە ئەوە ئاشکرایە غەیری ئیسلاممان پێ گومڕایی‌و کوفرە، بەڵام ئـەوە کـە لـە رووی عەقیدەیی‌و فیکرییەوە غەیری ئیسـلاممان پێ هەڵەیـە، ئـەوە رێمـان لێنـاگرێ کـە لەگەڵ خەڵکی نامسوڵماندا خۆش رەفتارو ئاکار پەسند بـین، بـەڵکو دینەکـەمان وەك چۆن بەوە فەرمانمان پێ دەکات کە تەنها ئیسلاممان پێ راست بێ، بە هـەمان شێوە فەرمانیشمان پێ دەکات کە لەگەڵ خەڵکدا قسەی بـاش بکـەین‌و کـرداری باش بکەین‌و، بە رەوشتی جوان لەگەڵیاندا مامەڵە بکەین.

وە پێویستە ئەوە بزانین کە نابـێ ئینـسانی مـسوڵمان رێگـا بـدات‌و لـە خـۆی بوەشێنێتەوە، هیچ کەس ئەخلاقی لەوی جوانتر بێ‌و، لە بواری رەفتارو مامەڵەدا هیچ کەس لەو بەڕێزو حورمەتترو چـاکەکارترو دادگـەرترو قـسە شـیرینترو بـە ئینسافتر بێ.

جاری دیکەش گێڕاومەتەوە: کاتی خۆی ئێمە پێشمەرگە بووین لەو شاخ و داخە، مەفرەزە بووین گەیشتینە برایەکی پێشمەرگەی خۆمان کە لە هێزێکی دیکە بوو ئێمەش هێزی حەمزە بووین، سەلامی کردو گوتی: ئەرێ مامۆستا پرسیارێکم هەیە، گوتم: بەڵێ، گوتی: ئەرێ ئێمە لە ڕێگا دەگەینە پێشمەرگەی ئەو لایەنانە: پارتی و یەکێتی و شیوعی و سۆشیالیست و ئەوانە، سەلاممان لێدەکەن، ئایا دروستە وەڵامیان بدەینەوە؟ منیش گوتم: کاکە جەنابت ناوت چییە؟ گوتی: ناوم (هەوراز)ە، گوتم: کاکە گیان! زۆر هەوراز ڕۆیشتووی تۆزێك وەرەوە خوارێ، گوتی: چۆن مامۆستا؟ گوتم: کاکی من، نەك هەر دروستە جوابی سەلامیان بدەیەوە، بەڵکو ئەوە هەر واجبە، بگرە پەسند وایە تۆ سەلامیان لێ بکەی، گوتی: جا ئاخر چۆن دەبێ؟ گوتم: چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿...وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ...﴿٨٣﴾﴾ البقرة، واتە: (... لەگەڵ خەڵکدا قسەی باش بکەن ...)، دیارە سڵاوکردنیش قسەیەکی باشە، بۆیە کە دەیگەیێ لە ڕێگا وا باشە سەلامی لێبکەی، ئاخر تۆ کە ئیسلامیی، نابێ شتێکت لەوان زیاتر پێبێ؟ سەلامێکت پێ نەبێ، قسەیەکی خۆشت پێ نەبێ، ڕوویەکی گەشت نەبێ، ئەدی چی زیادەت پێیە؟ خۆ هەر بە ریش نابێ، دەبێ ئیشیشمان هەبێ و بە ئیشیش لەوان جیابین، نەك بەس بە ریش!!

وە لە ڕاستیدا ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین لە هەموو شتێکدا لە پێش خەڵکەوە بین، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {... الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنْ الْيَدِ السُّفْلَى ...} رواه البخاري: (١٤٧٢)، ومسلم: (١٠٣٦)، واتە: (دەستی بەرز لە دەستی نزم چاکترە ...). دەستی بەرز دەستی بەخشینە، وە دەستی نزم دەستی وەرگرە، دیارە بەخشین هەر پارە بەخشین نییە، سەلام لە خەڵکی بکەی بەخشینە،

ئامۆژگارییان بكەی بەخشینە، نەخۆش دەكەون سەریان لێبدەی، هاوكارییان بكەی، قسەیەكی خۆشیان بۆ بكەی، ئەوەش هەر بەخشینە، چونكە بەخشینی ماددیی هەیەو هی مەعنەوییش هەیە.

خوای دادگەرو كاربەجێش ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة، واتە: (خوا ڕێتان لێناگرێ كە چاكەكارو بەخشەر بن لەگەڵ كەسانێكدا –كە ئەهلی كوفرن ـ كە لەبەر دینتان لەگەڵتان ناجەنگن و لە نیشتمانتان وەدەرتان نانێن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن)[1].

هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ...﴿٨٦﴾﴾ النساء، واتە: (وە هەركاتێك –لەلایەن هەركەسێكەوە ـ بە جۆرە سڵاوكردنێك سڵاوتان لێكرا، ئێوەش بە چاكتر یان – لانیكەم ـ وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە)، كەسێك سڵاوت لێدەكات بە لایەنیكەم وەك خۆی وەڵامی بدەوە، یان بە چاكتر وەڵامی بدەوە، وە ئەگەر تۆش پێشتر سڵاو بكەی، بە تەئكید ئەوە لە تۆ چاوەڕێ دەكرێ، ئیدی ئەوە هیچ پەیوەندیی بە مەسەلەی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی (ولاء و براء)ەوە نیە، چونكە ئەوە لە جۆری موداراتە، هەڵبەتە ئەوە لە حاڵێكدایە كە تۆ بە مسوڵمانیان نەزانی، بڕوانە پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرموێ: (عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا:

---

١) دوایی لە ڕوونكردنەوەی (بنەمای پازدەیەم)دا، ڕوونی دەكەینەوە كە (مُقْسِطِين) لێرەدا بە مانای ماڵی خۆ بەخشەرانە، نەك دادگەران.

أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ) رواه البخاري: (١٢)، ومسلم: (٣٩)، واتە: (لە عەبدوڵلای كوڕی عەمر دەگێڕنەوە كە پیاوێك لە پێغەمبەر ﷺی پرسی: چ مسوڵمانەتییەك چاكترە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خواردن بدەیو، سڵاو بكەی لەوەی دەیناسیو لەوەش كە نایناسی).

شایانی باسیشە كە هەندێك لە شەرعزانان لەو مەسەلانەدا تۆزێك بە وشكیی گرتوویانە، ئەویش زیاتر لە كاردانەوەی ئەو واقیعە سیاسییو كۆمەڵایەتییەدا بووە كە خۆیان تێیدا ژیاون، بۆ وێنە: هەندێك لە شەرعزانان گوتوویانە: دروست نیە سەلام لە ئەهلی كیتاب بكەی، وە ئەگەر سەلامیشیان لێكردی، دەبێ بڵێی: (وعلیكم)، بەڵام ئەوە شەرعزانان گوتوویانە، نەك خوا ﷻو پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی واقیعێكدا كە خۆیان تێیدا ژیاون، كە جوولەكەو نەسرانیی دژایەتیی مسوڵمانانیان كردووەو، جەنگەكانی خاچپەرستان (الحروب الصلیبیة)یان دژی مسوڵمانان كردووەو بەردەوام خەریكی تاكتیكو فێڵ بوون لە دژی مسوڵمانان، ئەگەرنا بێیە سەر ڕاستە شەرعەكە وانیە، چونكە ئایەتەكە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ... ﴿٨٦﴾ ﴾ النساء، واتە: (وە ئەگەر سڵاوتان لێكرا، بە چاكتر یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە ...).

جارێكیان (الشعبي) وەڵامی سڵاوی نەسرانییەك یان جوولەكەیەكی دایەوە، یان سڵاوی لە نەسرانییەك كرد گوتی: (وعلیكم السلام ورحمة الله) یان (السلام علیكم ورحمة الله)، ئینجا كە لەوبارەوە پرسیاری ڕەخنەگرانەی لێكرا، گوتی: (أَلَيْسَ فِي رَحْمَةِ اللهِ يَعِيش)؟! واتە: (ئەدی بەهۆی بەزەیی خوا وە ناژیەت؟!).

کە دیارە مەبەستی بارانو رزقو رۆزیی و نیعمەتەکانی خوایە ﷻ، کە بەگشتی مرۆڤەکان لێیان بەهرەمەندن[١].

ئینجا خوای بەرزو مەزن دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء، واتە: (ئێمە هەر بۆیە تۆمان ناردوە تاکو رەحمەتو بەزەیی بی بۆ هەموو جیهانییان)، کەواتە: ئەوانەی ئیمانیشیان پێ‌ی نەهێناوە، دیارە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوانیش هەر رەحمەتە، جا ئایا رەحمەت بوونەکەی بۆ ئەوان چییە؟ ئەوەیە کە ئەوانەی لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەژین، سەرو ماڵو نەفسو ناموسیان پارێزراو دەبێ‌و ئەوەش رەحمەتە[٢].

ئیدی هیوادارم بەم برە توێژینەوەیە روونبووبێتەوە کە جیاوازیی نێوان دۆستایەتیی (الموالاة)و مەدارکردن (المداراة) چییەو چۆنە؟ کە یەکەمیان تایبەتە بەئەهلی ئیمانەوەو، دووەمیشیان گشتگیرەو مسوڵمانو کافر دەگرێتەوەو، یەکەمیان بۆ بنیاتنانو تۆکمەو توندوتۆڵکردنی کۆمەڵو کۆمەڵگای ئیسلامییەو، دووەمیشیان بۆ خۆپاراستنو خۆلادانە لە زۆر گرفتو کێشەو بەرەوپێشبردنی

---

١) (عن الشَّعبيّ أنه قال لِنَصْرانيّ: وعليْكم السَّلام ورَحمة الله، فقيل له فيه، فقال: أَلَيْس في رَحْمَة الله يَعِيشُ؟) تفسير الفخر الرازى، ج: (١٠)، ص: (١٨٨).

(عن الحسن بن عبدالرحمن قال: رأيت الشعبي يسلم على موسى النصراني فقال: السلام عليكم ورحمة الله! فقيل له في ذلك؟ فقال: أو ليس في رحمة الله؟ لو لم يكن في رحمة الله هلك). حلية الأولياء وطبقات الأصفياء ج: (٤)، ص: (٣١٤)، المؤلف: أبو نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني.

(رُوِيَ عَنْ الشَّعْبِيِّ أَنَّهُ قَالَ لِلْيَهُودِيِّ: عَلَيْك السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَقِيلَ لَهُ تَقُولُ لِيَهُودِيّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ؟ فَقَالَ: أَلَيْسَ فِي رَحْمَةِ اللَّهِ يَعِيشُ؟) المنتقى شرح الموطأ ج: (١٠)، ص: (٣٣٠).

٢) ئێمە لە باسی (تەبایی‌و پێکەوە ژیان)یشدا کە یەکێکە لە باسەکانی کتێبی: (چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر رۆشنایی عەقڵو وەحی دا)، بە درێژیی باسی ئەم بابەتەمان کردوە.

كارو چالاكی ئیسلامییو، گەشەپێدانی، وێڕای ئەوەی كە ئـەدەبو ڕەوشـتێكی ئیسلامییشـەو، دەبێتە مایەی سەرنج ڕاكێشانی لایەنی بەرانبـەرو، دڵنـەرمبوونو گوێگرتنیو هەق وەرگرتنی، كـوردەواریی خۆشمـان گوتوویانـە: (مـاریش بـە قسەی خۆش لە كونێ دێتـەدەرێ).

وە بەڕاستی ئێمە وەك ئیسلامیی زۆر پێویستیمان بەوە هەیە كە ئـەو مەسـەلەی دۆستایەتیی كردن، لەگەڵ قەزیەی مـوداراو مـەداركردنو گونجـان، بـاش لێـك جیابكەینەوەو تێكەڵیان نەكەینو، بە بیـانووی مـەداركردنو خـۆ گونجاندنـەوە، دەستبەرداری بنەماكانمان نەبینو، بە بیـانووی مەبـدەئیی بـوونو دەسـتگرتن بـە بنەمایەكانـەوە، لایـەنی مـەداركردنو گونجـانیش فـەرامۆش نەكـەین، چـونكە پێغەمبـەر ﷺ هەردووكی بەیەكەوە كۆكردوونەتەوە.

خوای پەروەردگار ﷻ لەو كەسانەمان بگێـڕێ كە هەموو شەریعەتو هـەموو بەشەكانی شەریعەت دەگـرنو، هـیچ لایـەكی بـۆ لایـەكی دیكـەی فـەرامۆش ناكـەن.

# بنەمـای هەشـتەم

## هـەڵپەنەکردن بۆ بەرپرسـیارێتیی و، ئـەرك نەسـپاردن بە کەسانی هەڵپـەکەر.

## بنەمـای هەشـتەم

## هەڵپەنـەكردن بـۆ بەرپرسـیارێتیی و، ئـەرك نەسـپاردن بـە كەسـانی هەڵپەكـەر.

هەڵپەنەكردن بۆ پلـەوپایەو بەرپرسـیارێتییو داوانـەكردنیو سـوورنەبوون لەسەر تێدامانەوەی، چونكە ئەم ڕەفتارانە یان قەدەغە (حـرام)ن، یان ناپەسند (مكروە)ن، وەك ئایەتەكانی خوا ﷻو فەرموودەكـانی پێغەمبەری خـوا ﷺ بـە ئاماژە یان بە ڕاشـكاویـی (إِشَارَةً أَوْ صَرَاحَةً) دەیگـەیەنن، بۆ وێنــە:

١- خـوای كاربــەجێ ﷻ فەرمووویــەتی: ﴿ تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ القـصص، خـوا ﷻ باسـی چـەند شـتێك دەكـات، دوایـی باسـی دواڕۆژ دەكـات، باسـی عاقیبـەتو سەرەنجـام دەكـات، لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا دەفەرموێ: {ئا ئەو مەنزڵگـای دواڕۆژە (بەهەشـت) بـۆ ئـەو كەسـانەی دەگێـڕین (دەیكـەین بـە مەنزڵگـاو شـوێنی تێدا حەوانەوەی كەسانێك) كـە نایانـەوێ لەسـەر زەوییـدا بـەرزیی بە ناحەق پەیدا بكەن، (واتـە: باڵادەسـتیی خۆیـان بـە ناحـەق فـەرز بكـەن بەسـەر خەڵـكیدا)، وە خراپەكارییـشیان لەسـەر زەویـدا مەبەسـت نیـە، وە سەرەنجامی (چاكـیی دنیـاو دواڕۆژ)یـش بۆ پارێزكـارانە}.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە:

٢- {عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ لِي رسُولُ اللهِ ﷺ: يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ! لَا تَسْأَلِ الْإِمَارَةَ فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا ...} رواه البخاري: (٧١٤٧) واللفظ له، ومسلم: (١٦٥٢)، واتە: {لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوتم: ئەی عەبدوڕڕەحمان ! داوای بەرپرسێتیی و سەرپەرشتیارێتیی خەڵك مەکە، چونکە بەرپرسێتیی ئەگەر بە داواکردن و دواکەوتنی خۆتەوە چنگت بکەوێ، ئەوکاتە حەواڵەی ئەو بەرپرسارێتییە دەکرێی، (واتە: خوا یارمەتیت نادا، خۆت و ئیشەکەت)، بەلاّم ئەگەر بۆ خۆت داوای نەکەی و بەرپرسارێتییت پێ بدرێ، ئەوا هاوکاریی دەکرێی (لەلایەن خوای پەروەردگارو لەلایەن فریشتەکانیەوە)}.

٣- (عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنَا وَرَجُلَانِ مِنْ بَنِي عَمِّي، فَقَالَ أَحَدُ الرَّجُلَيْنِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمِّرْنَا عَلَى بَعْضِ مَا وَلَّاكَ اللَّهُ ﷻ، وَقَالَ الْآخَرُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّا وَاللَّهِ لَا نُوَلِّي عَلَى هَذَا الْعَمَلِ أَحَدًا سَأَلَهُ وَلَا أَحَدًا حَرَصَ عَلَيْهِ) رواه البخاري: ٧١٤٩، ومسلم: ١٧٣٣ واللفظ له. واتە: (لە ئەبو مووسای ئەشعەرییەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێ: ڕۆژێك من و دوو لە وەچەی مامم - واتە لە خزمانی پشتی- چووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، یەکێك لەو دوو نەفەرەی کە لەگەڵمدا بوون گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لەو ئیشوکارەی کە خوای بەرزو بالاّدەست خستوویەتە بەردەستی تۆ - واتە: کاروباری مسوڵمانان -، ئێمەش بکە بە بەرپرس و ئیشێك — بەرپرسیارێتییەك- مان پێ بسپێرە، ئەوەی دیکەش دیسان هەر وایگوت، - واتە: داوای بەرپرسیارێتییان کرد -، پێغەمبەریش

ﷺ فەرمووی: سوێند بە خوا، کەسێك ناکەینە سەرپەرشتیکاری هیچ شتێك کە بۆ خۆی داوای بکات، یان کەسێك سوور بێ لەسەری).

٤- (عَنْ أَبِي ذَر قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا تَسْتَعْمِلُنِي؟ قَالَ: فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى مَنْكِبِي ثُمَّ قَالَ: يَا أَبَا ذَر إِنَّكَ ضَعِيفٌ وَإِنَّهَا أَمَانَةٌ وَإِنَّهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ إِلَّا مَنْ أَخَذَهَا بِحَقِّهَا وَأَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ فِيهَا) رواه مسلم: (١٨٢٥)، واتە: (ئەبو زەڕ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆژێك گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا کارم پێ ناسپێری؟ -مەبەستی پێی پلەوپایەو بەرپرسیارێتی بووە-، دەڵێ: ئەویش دەستی لە شانی دام، - دەستی خستە سەر شانم - دوایی فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! تۆ بێهێزی ئەو کارەش سپاردەیە، وە لە ڕۆژی دواییدا مایەی شەرمەزاریی و پەشێمانییە، مەگەر کەسێك بە حەقی خۆی وەریبگرێ‌و ئەو حەقەی لەسەریەتی تێیدا جێبەجێی بکات)، واتە: دەبێ باباى کار پێ سپێرراو:

<u>یەکەم</u>: شایستە بێ،

<u>دووەم</u>: کەمتەرخەمیی تێدا نەکاو حەقی خۆی پێبدا.

ئەگەر ئەو دوو مەرجەی تێدا نەیەنە دی، ئەوا بەرپرسێتییەکەی دەبێتە مایەی شەرمەزاریی و پەشێمانیی.

بەڵام لە کاتێکدا مرۆڤ لە خۆی راببینێ کە تواناو شایستەیی هەیەو پاڵنەریشی خزمەتی خەڵك‌و پاداشتی خوا ﷻ بێ‌و، قەناعەتیشی وابێ، کە بە ڕاکردنی لە ئەرکی بەرپرسیارێتیی گوناهبار دەبێ، ئەوا لەو حاڵەتەدا نەك هەر قەدەغەو ناپەسند نیە، بگرە پەسندیشەو جاری وا هەیە پێویستیش دەبێ، بەلام بە مەرجێك بەبێ هەڵپەکردن‌و سووربوون لەسەری، بێ، چونکە:

٥- خوای زاناو شارەزا لەسەر زمانی (عِبَادُ الرَّحْمن) كە بە كۆمەڵێك سیفەت وەسفیان دەكات، ئینجا دوایی ئەم دوعایەیان لێ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ﴿... رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ الفرقان، واتە: (... - بەندەكانی خوا دەڵێن:- پەروەردگارمان ! لە هاوسەرانمانو لە وەچەكانمان مایەی بەرچاو ڕوونییمان پێ بدە، وە بۆ پارێزكاران بمانگێڕە بە پێشەوا).

٦- هەروەها لەسەر زمانی (یوسف) عليه السلام فەرموویەتی: ﴿... اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾﴾ یوسف، واتە: (... لەسەر خەزێنەو عەمبارەكانی زەویم دابنێ، چونكە من پارێزەری زانام)، بە زاراوەی ئەمڕۆ یانی: بمكە وەزیری دارایی و ئابووریی.

بۆیە پێویستە، یان لانیكەم وا باشە، هەركەسێك بە زەقیی هەڵپەكردنو سووربوون لەسەر بەرپرسیارێتیی لێ بینرا، ئەگەر شایستەش بێ كاری بەرپرسیارێتیی پێ نەسپێردرێ.

بەڵام كەسانێك شایستەو لێهاتوو بن، پێویستە چاویان بۆ بگێڕرێو داوایان لێ بكرێو كاریان پێ بسپێررێ.

## ڕوونكـردنەوە:

ئێستا بابێینە سەر ڕوونكـردنەوەی ئەم بنەمـایە، لە دوو خاڵی سەرەكیـدا:

### یەكـەم: هەڵوێستی زانایـان لەبارەی ئەم مەسـەلەیەوە:

ئایـا حـوكمی ئـەو مەسـەلەیە چـییە؟ ئایـا دروسـتە ئینـسان بـۆ خـۆی داوای بەرپرسیارێتیی بكات؟ وە ئەگەر دروست نیە بۆچی؟ وە ئەگەر دروستە لەچ حاڵێكدا دروستە؟ یاخود ئایا دروستە هەوڵی بۆ بدات؟ چونكە مەرج نیە بە زەقیی‌و ڕوونیـی داوای بكات!!

جارێ با تەماشای هەڵوێستی زانایان بكەین: من سێ وێنەم هێناونەوە، ئەگـەرنا زانـایان زۆر قسەیان لـێ كردوە، بەس من سێ قسەی سێ لە زانایانم وەك نـموونە وەرگرتوە:ـ

أ/ بوخاریی ڕەحمـەتی خـوای لێـبێ لـە كتێبەكـەی خـۆی (صـحیح البخـاري)دا هەنـدێك لـەو فەرمایـشتانەی ئاماژەمـان پـێ دان، لـەژێر ئـەم ناوونیـشانانەدا هێنـاوەو، گوتوویەتی:

١ـ (بـابٌ: مَنْ لَمْ يَسْأَلِ الإِمَارَةَ أَعَـانَهُ اللهُ عَلَيْـهِ)، واتە: (باسی ئـەوە كـە هـەر كەسێك داوای بەرپرسـێتیی نەكـا، خـوا یارمــەتی دەدا)، ئینجـا چـەند فەرموودەیەكی هێنـاون.

٢ـ (بـابٌ: مَـنْ سَـأَلَ الإِمَـارَةَ وُكِـلَ إِلَيْهَـا)، واتـە: (هـەر كەسـێك داوای بەرپرسـیارێتیی بكـات، حەواڵـەی ئـەو ئیـشە دەكرێـت)، واتـە: خـوا هاوكاریی ناكات‌و پشتی ناگرێ.

٣ـ (بابٌ: مَا يُكْرَهُ مِنَ الْحِرْصِ عَلَى الإِمَارَةِ)، واته: (باسی ئەوه کە شتێکی ناپەسندە ئینسان سوور بێ لەسەر بەرپرسێتیی و لەسەر ئەمیرایەتیی).

ئەوانە هەمووی لە لاپەڕە (٩٨٢)دا ئەو ناوونیشانانەی هێناون، کە ئێمە لەو ناوونیشانانەوە، کە هەندێکیان هەروەك بڵێی دەقی فەرمایشتەکەی پێغەمبەرن ﷺ، جگە لە سێهەمیان کە بوخاریی بە شتێکی ناپەسندی دەزانێ ئینسان سوور بێ لەسەر بەرپرسێتی.

ب/ موسلیم لە کتێبەکەی خۆیدا (صحيح مسلم)، هەندێك لەو فەرمایشتانەی لەژێر ئەم دوو ناوونیشانانەدا هێناون:

١) (بابُ النَّهيِ عَنْ طَلَبِ الإِمَارَةِ وَالْحِرْصِ عَلَيْهَا)، لاپەڕە (٧٩٣). واتە: (باسی ڕێگرتن لە داواکردنی بەرپرسێتیی و سوور بوون لەسەری)، مانای وایە لە هەندێ حاڵاندا بەپێی ڕای موسلیم داواکردنی بەرپرسێتی قەدەغەیە.

٢)(بابُ كَرَاهَةِ الإِمَارَةِ بِغَيْرِ ضَرُورَةٍ)، لاپەڕە (٧٩٤)، واتە: (باسی ئەوە کە شتێکی ناپەسندە، کە بەبێ ئەوەی پێویست بێ ئینسان بەرپرسێتیی لە ئەستۆ بگرێ)، ئەوە ئەگەر پێویست نەبێ، بەڵام ئەگەر پێویست بێ، دیارە نەك هەر حەرام نیە، بەڵکو ناپەسندیش نیە بەپێی ڕای موسلیم، چونکە ـ بۆ زانیارییتان ـ هەر یەکە لە بوخاریی و موسلیم کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ دێنن، ئەگەر ئینسان تەماشای ناوونیشانەکانیان بکات، کە فەرمایشتەکانیان لەژێردا دێنن، زۆر لە ئەحکامەکانی فیقهیشی دەست دەکەون، کە دەلالەت لەسەر ئیجتیهادی ئەوان دەکات.

ج/ (یحیی بن شرف الدین النووي) لە لاپەڕەکانی (٢٤٣ ـ ٢٤٤)ی (ریاض الصالحین)دا هەندێك لەو ئایەتو فەرمایشتانەی هێناون کە ئێمە ئاماژەمان پێ دان، لەژێر ناوونیشانی: (بابُ النَّهي عَنْ سُؤَالِ الإمَارَةِ وَإخْتِيَارُ تَرْكِ الْوِلايَاتِ إذا لَمْ يَتَعَيَّنْ عَلَيْهِ وَلَمْ تَدْعُ حَاجَةٌ إلَيْهِ)، واتە: (باسی قەدەغەکردنی داواکردنی بەرپرسێتی، وە پەسند بوونی وازهێنان لە بەرپرسێتیی ـ واتە بەدوایدا نەڕۆیو شانی خۆت نەخەیە ژێر باری بەرپرسێتیی ـ، مادام نەبووبێتە فەرز لەسەری، وە پێویستیش نەکا ئەو ئەرکو بەرپرسیارێتییە بە ئەستۆوە بگرێ)، کەواتە: ئەگەر لەسەری بووە فەرزی عەین، یاخود پێویست بوو بیکا، لەو حاڵەتەدا نەك هەر نەهی لێ نەکراوە، بەڵکو پەسند نیە کە وازیشی لێ بهێنێ، بەڵکو وا پەسندە کە لە ئەستۆی بگرێ، بەڵکو جاری وا هەیە ـ وەك ئێمە باسمان کرد ـ فەرزیش دەبێ.

ئینجا بۆ زانیاری ئێوە کە دەڵێ: (یتعین علیه)، فەرز دوو بەشە: فەرزی کیفایە هەیە، فەرزی عەین هەیە:

**فەرزی کیفایە (الفرض الكفائي):** واتە: شتێك لەسەر خەڵکێك فەرزدەبێ بەگشتیو ئەگەر یەکێکیان، یان دووانیان، یان کۆمەڵێکیان، بایی ئەوەندە کە ئەو شتەیان پێ جێبەجێ ببێ، بەو کارە هەڵسان، لەسەر هەمووان لادەچێ، ئەگەرنا هەموویان لەسەر کەمتەرخەمیی تێداکردنی گوناهبارن.

ئێستا ئێمە لێرە دانیشتووین، یەکێك بێتە ژووری بڵێ: (السلام علیکم ورحمة الله) دیارە سەلام کردن سوننەتە، ئەویش لە هەموو حاڵانیشدا سوننەت نیە، ئەگەر کەسێك لە نوێژدا بێ سوننەت نیە سەلامی لێ بکەی، وە لەسەر نانخواردن بێ سوننەت نیە سەلامی لێ بکەی، کابرا جاری وا لە

وەڵامدانەوەدا پارووی لە قوڕگی دەگیرێ، هەروەها لە هەندێ حاڵەتی دیکەدا، بۆ نموونە: ئێمە دەرس دەڵێینەوە یەکێك دێ، سوننەت نیە سەلام بکاتو دەرسەکەمان پێ ببڕێ، بەڵام کاتێك ئێمە بۆ خۆمان دانیشتووینو دەرسێ ناڵێینەوە، یەکێك دێ سەلام دەکات، سەلام کردن لە بنەڕەتدا سوننەتە، جگە لە هەندێ حاڵەتی هەڵاوێردراو، بەڵام وەڵامدانەوەی فەڕزە، لەسەر رای زۆربەی زانایان، جا ئایا فەڕزە لەگەڵ سەلامکردنی ئەودا ئێمە هەموو بە کۆڕس بڵێین: (وعليكم السلام ورحمة الله)؟ نەخێر، بەڵکو یەکێکمان وا بڵێ، دوو وا بڵێن، سێ وا بڵێن، لەسەر هەمووان لادەچێ.

هەروەها زانایان بۆ (فەڕزی کیفایە) ئەوە بە نموونە دێننەوە کە کەسێك دەمرێ نوێژی لەسەر بکرێو بشورێو بشاردرێتەوە، ئەوانە فەڕزی (کیفایە)ن، بەڵام فەڕزی کیفایە زۆر زۆرن، زۆربەی فەڕزەکان فەڕزی کیفایەن، واتە: لەسەر خەڵك پێویستن بەگشتی، بەڵام ئەگەر هەندێکیان پێی هەڵسان بایی ئەوەندەی کە بەش بکات، ـدەبێ بایی ئەوەندە بەو کارە هەڵسن کە بەشی بکاتو جێبەجێی بکەنـ ئەوە لەسەر ئەوانی دی لادەچێ.

**فەڕزی عەین (فرض العين)**: ئەوەیە کە لەسەر تاك تاك فەرز دەبێو دەبێ هەرکامێکیان لە زاتی خۆیدا پێی هەڵبستێ، وەك: پێنج نوێژە فەڕزەکانو، ڕۆژووگرتنی مانگی رەمەزان و، حەج لەسەر ئەوانەی کە لەسەریان فەڕزدەبێو، زەکات لەسەر ئەوانەی کە لەسەریان فەڕز دەبێ و، جیهاد کە پێویست دەبێ، جا لێرەدا ئیمام نەوەوی دەڵێت: (إِذَا لَمْ يَتَعَيَّنْ عَلَيْهِ) جاری وایە شتەکە فەڕزی کیفایەیە، بەڵام لەسەر کەسێك دەبێتە فەڕزی عەین، بۆ نموونە: لە دێیەکدا بەس مامۆستایەکەیان دەتوانێ وتاریان بۆ بدات و، بەس

ئەو دەتوانێ پێشنوێژییان بۆ بکات، بەس ئەو دەزانێ بانگ بڵێ، ئایا لەسەری نابێتە فەرزی عەین؟ بێگومان دەبێتە فەرزی عەین، چونکە ئەو کارانە هەر بەو دەکرێن، هەروەها هەر کارێکی دیکە ئەگەر لەسەر کەسێك یان لەسەر چەند کەسێك پەکی بکەویٚو، ئەگەر ئەوان نەیکەن موسوڵمانان تووشی زەرەر بن، ئەوا ئیختیاریان نابێ لەو حاڵەتەدا، یانی: ئەو کاتە لەسەریان دەبێتە فەرزی عەین، هەرچەندە لە بنچینەدا فەرزی کیفایەیە، بەڵام مادام هەر بەو نەفەرە جێبەجێ بکرێ، یان بەو چەند کەسە جێبەجێ بکرێ، ئەو فەرزە دەگۆڕێ لە فەرزی کیفایەوە بۆ فەرزی عەین، بە نسبەت ئەو کەسە یان ئەو کەسانەوە.

**دووەم: هەڵوێستی ڕاستو دروست لەم مەسەلەیەدا:**

پاش ئەوەی شەرحی ئایەتەکانو فەرمایشتەکانم کردو وتەی زانایانم هێنا، ئینجا لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتو فەرموودانەداو لە میانەی قسەی زانایاندا، هەڵوێستی خۆم لە چوار خاڵدا دەخەمە ڕوو، واتە هەڵوێستی خۆم دەربارەی داواکردنی بەرپرسیارێتییو وە ئەستۆ گرتنیو وە ئەستۆ نەگرتنی، یان لەبەر ڕاکردنیو بەدوادا ڕاکردنی:

١/ هەڵپەکردن بۆ بەرپرسیارێتییو سووربوون لەسەر تێدامانەوەی، لە بنەڕەتدا قەدەغە یان بە لایەنی کەم ناپەسندە، ئەگەر ئەو کەسە ناشایستە بێ، ئەوە قەدەغەیە، ئەگەرنا ناپەسندە، یانی کەسێك داوای بەرپرسیارێتیی بکات، ئەگەر ناشایستە بێو لە توانایدا نەبێ، ئەوە قەدەغەیەو گوناهبار دەبێ، ئەدی ئەگەر لە توانایدا هەبێ، بێ ئەوەی کە هیچ پاڵنەرێك هەبێ چاك یان خراپ، وە بێ ئەوەی کە هیچ شتێك پەکی لەسەر وی کەوتبێ، هەر بۆ خۆی داوای بکاتو هەڵپەی

بۆ بکات؟ ئەوە ناپەسندە، ناپەسند واتە: ئەگەر نەیکا خێری دەگا، وە ئەگەر بیشیکا گوناهی ناگات، حەرام ئەوەیە کە ئەگەر بیکا گوناهی دەگات، وە ئەگەر وازیشی لێ بهێنێ لەبەر خوا، خێری دەگات.

٢/ هەرچەندە مرۆڤ شایستە بێو پێی وابێت کارەکە پەکیشی لەسەری کەوتوە، بەڵام هەر وا باشترە کە هەتا داوای لێ نەکرێ، نەیکات! ئەگەر کارەکە پەکیشی لەسەر وی کەوتوە، بەڵام واباشە ـ نەمگوتوە فەرزە ـ، چونکە هەیە کەس داوای لێ ناکات لەبەرئەوەی نایناسن، یان چونکە عەقڵیان پێی ناشکێ داوای لێ بکەن، وەك یوسف ، خۆ کەس بە (یوسف)ی نەگوت: وەرە بتکەینە بەرپرس! هەر خۆی گوتی: ﴿... ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ ...﴾، لەبەرئەوەی خۆیان عەقڵیان پێ نەدەشکا، ئەو کابرایە بەکەڵکی چی دێ، بۆخۆی دەزانێ چی لە تواناد هەیە، دوایی گوتی: (... إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾﴾ یوسف، واتە: (... من پارێزەرمو زاناشم)، هەرچی پێم بسپێردرێ دەیپارێزمو خیانەتی تێدا ناکەم، ـوەك ئێستا دەڵێن گەندەڵیی تێدا ناکەمـ وە زاناشم دەزانم چۆنی دەکەم.

بەڵام بۆچی گوتم وا باشترە؟ لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: (فَإِنَّكَ إِنْ أُوتِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا) یان (أُوكِلْتَ إِلَيْهَا) هەردوو بێژە (لَفْظ)کە هاتوون، تۆ ئەگەر بەهۆی داواکردنی خۆتەوە کارت پێ بسپێردرێ، حەواڵەی کارەکەت دەکرێی، (وَإِنْ أُوتِيتَهَا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا) بەڵام ئەگەر بێ ئەوەی بۆ خۆت داوای بکەی پێت بسپێردرێ، یارمەتی دەدرێی، جا ئەوە باشتر نیە؟ مادام بەهۆی ئەوەوە کە داوای ناکەی، پێت

دەسپێردریٚ، پشتگیریی خوای گەورە ﷻو پشتگیریی فریشتەکان بۆ خۆت دەستەبەر بکەی، بۆچی واناکەی؟! بۆیە مرۆڤـ ئەگەر شایستەش بیٚ، وا باشە بۆ خۆی داوای بەرپرسێتیی نەکا لە خەڵك.

٣/ بەڵام ئەگەر لە شوێنێك بوو کە نەیاندەناسیو شارەزای نەبوون و، دەشیزانی ئیشەکە پەکی لەسەر ئەو کەوتوە، وە ئەگەر ئەو بەو کارە هەڵنەستیٚ ئەو خەڵکە لەو شوێنە زەرەر دەکات، ئەوە لەو حاڵەتەدا بوارو مۆڵەتی هەیە، مادام شایستەبیٚو بە پێویستی بزانیٚ بە شێوەیەکی جوان هەوڵی بۆ بدات، وەك یوسف ، هەڵبەتە هەڵپەکردن هەر قەدەغەیە، سوور بوونو هەڵپەکردنو بەدوادا گەڕانو خۆ ناشیرین کردن لەسەر ئەوەی ئیشی پیٚ دەسپێرن یان نا، بڵیٚ: لە من چاکتری تێدا نیە، هەر شتێکی ناشیرینە، ئەگەر واش بیٚ هەر ناشیرینە، بەڵام ئایا کەس هەبووە لەو کاتەدا لە یوسف شایستەتر بیٚ؟ نەخێر، پێغەمبەری خوا بووە، وە ئایا ئەو ئیشە پەکی لەسەر ئەو نەکەوتوە؟ با، چونکە ئەو نەخشە پازدە ساڵییە ئابوورییەی کە یوسف داینا، دوای تەعبیری خەونەکەی پادشا، هەر بە خۆی جێبەجیٚ دەکرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایا یوسف هەڵپەی بۆ کرد؟ وە کاتێك پادشای میسر لە دوای نارد یەکسەر چوو؟ نەخێر، بەڵکو گوتی: جاریٚ نایەمە دەریٚ: ﴿... ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾﴾، یوسف بە نوێنەرەکەی پادشای گوت: جاریٚ بگەڕێوە بۆ لای گەورەو بەرپرسەکەتو لێی بپرسە: ئایا ئەو ئافرەتانەی کە قسەیان لەسەر کردوەو دەستی خۆیان لەو ڕووداوەدا بڕی، بپرسە بزانە مەسەلەکەیان چی بوو؟ مەبەستی ئەوەبوو بڵیٚ: بوختانیان بۆ من کردوەو بە ناهەق گیراوم، بەس پیٚی عەیب بوو خەڵکی تۆمەتبار بکات،

مەبەستی ئەوە نەبوو کە ئەوانی تێدا تۆمەتبار بکات، مەبەستی ئەوە بوو کە ساحەی خۆی پاك بکاتەوە، چونکە ئەو بیەویَ ڕۆڵ ببینیَ، دەبیَ پەرێزی پاك بیَ، نابیَ تۆمەتبار بیَ، ئینجا دوای ئەوەی پادشای میسر لێیان دەپرسیَ، ئەوانیش بێتاوانیی یوسف دەردەخەن، ئەوجار دووبارە لە دوای دەنێرێتەوە، واتە یوسف عليه السلام پەلە ناکات لە هاتنە دەرەوە لە زیندان، تاکو پەرێزی خۆی پاك نەکاتەوە لەلای پادشا، ئەگەر نا هەر پەرێزی پاك بووە.

دوای ئەوە پادشا پێی دەڵیَ: ﴿... إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾﴾ یوسف، واتە: (... ئەمڕۆ تۆ لەلای ئێمە خاوەنی ڕێزو حورمەتو جێگەو ڕێگەیو ئەمینداریشی)، واتە: هیچ نیشانەی پرسیارت لەسەر نیە، {لای ئێمە تۆ کەسێکی متمانەپێکراوی}، ئینجا ئەویش دەڵیَ: مادام وایە: ﴿... ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾﴾ یوسف.

٤/ لە ڕاستیدا نیازو مەبەست، ڕۆڵی کاریگەری لە حوکمی ئەم مەسەلەیەدا هەیە، چ شتێك پاڵت پێوەدەنیَ؟ چ شتێك هانت دەدا؟ کە ئەو کارەت پیَ دەسپێردریَو ئەو ئەرکەت دەخەنە سەر شان، هاندەرت چییە؟ ئەگەر هاندەرو پاڵنەرت ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار بیَو، ئەوەبیَ خزمەت بە دینو ژینی مسوڵمانان بکەی، ئەوە حوکمێکی هەیەو، ئەگەر ئامانجیشت شتێکی دیکە بیَ، ئەوە شتێکی دیکەیەو حوکمێکی دیکەی هەیە.

جا ئێستا دێمە سەر ئەوە کە بۆچی ئەوەم گوتووە:

أ) نیەت زۆر دەوری هەیە لە گۆڕینی حوکمی داواکردنی بەرپرسیارێتییدا – هەڵبەتە بە شێوەیەکی جوان ـ، وە سووربوون لەسەریو هەڵپەکردن

بۆی، ئەوە لـە هـەموو حاڵانـدا شـتێکی خراپـەو نیـشانەی نیـەتو پاڵنـەری خراپو ناشـەرعییشـە!

ب) دووەم شت کە کاریگەریی هەیـە لەسەر حوکمی ئـەو مەسـەلەیە، بریتیـە لـە شایستەیی، کەسـێك کـە شایـستەیی هـەبێ، شایـستەیی و توانـاییش دیـسان حوکمەکەی دەگۆڕێ، جاریٰ مرۆڤـ ئەگەر نیەتی باش نەبێ، شایـستەش بـێ هەر بە کەڵك نایەت، هەیە شایستەیە بۆ کار پێ سپێردران، بەڵام نیەتی ئەوەیە دنیای لە پەنادا بخوا، ئەوە بێگومان گوناهبار دەبێ، یاخود نیەتی باشە، بـەڵام شایستە نیەو خۆی نەناسیوە، دیسان لەسەر ئەوەش تووشـی گونـاه دەبـێ کـە خۆی نەناسیوە، کەواتە دەبێ: یەکەم: شایستە بـێ، دووەم: نیەتیـشی بـاش بێ، ئینجـا ئەگـەر بـە شـێوەیەکی جـوان لـە شـوێنێك کـە نەیناسـن، داوای بەرپرسێتی بکات، بڵێ: من دەتوانم ئەو ئیشە بکەمو لەبەر خـوا ئامـادەم ئـەو کارەتان بۆ بکەم، وە لە خـۆم رادەبیـنم، ئـەوە بـۆی هەیـە، بـەڵام ئـەوە لـە شوێنێك کە نەیناسن، بەڵام ئەگەر بیناسن، با خـەڵك داوای لێبکـا بۆئـەوەی فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر ﷺ بۆ بێتـەجێ، ئینجـا ئایـا بەڵگـەمان لەسـەر ئەو دوو شـتە چییـە؟ بەڵگەی نیەت ئەو ئایەتەی خوایـە ﷻ کـە دەفـەرموێ:

﴿ تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾[1] القصص، واتە: (ئەو مەنزڵگای دوارۆژە، تەرخان دەکەین بۆ کەسانێك کە بەرزییان ناوێ لەسـەر زەوی، وە خراپەکارییـشیان نـاوێ)، واتە: نیـەتو هانـدەرو پاڵنـەریان ئەوە نیـە.

---

١) (نەوەویی) ئەم ئایەتەی لە (رياض الصالحين)ەکەیداو لەژێر سەرباسی: (باب النهي عن سؤال الإمارة واختيار ترك الولايات إذا لم يتعين عليه أو تدعُ حاجة إليه) ص: (٢٤٣)دا هێناوە.

ئینجا لەو فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ كە دەفەرموێ: {إِنَّا وَاللَّهِ لا نُـوَلِّي عَلَى هَـذا الْعَمَلِ أَحَدًا سَأَلَهُ وَلا أَحَدًا حَرَصَ عَلَيْـهِ}[1]، تۆ وەك ئینسان شتێك بۆ خۆت داوا بكەیو سوور بی لەسـەری، مانـای وایـە، دیـارە مەبەسـتێكی تایبەتییو (شخصي)ت پێی هەیـە، هـەروەها تـەعبیری: (مَـنْ أَرَادَهُ) كـە لـە ریوایـەتێكی دیكـەدا هەیـە، مانـای وایـە نیـەتی وایـە كـە ئیـشەكەی هـەر دەستكەوێ، بە هەر نرخێك بێو بە هەر شێوەیەك بێ!

بە نسبەت شایسـتەییشەوە كە حوكمەكەی دەگـۆڕێ، ئەگـەر شایـستە بـێ حوكمێكی هەیەو، ئەگەر شایستەش نەبێ حوكمێكی دیكەی هەیە، بەڵگەمان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ كە ئەبو زەڕی غـەفاریی[2] – خـوا لێـی رازی بێ- دەڵێت: (يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلا تَسْـتَعْمِلُـنِي)؟ پێغەمبـەریش ﷺ دەفـەرموێ: (يَا أَبَا ذَر إِنَّكَ ضَعِيفٌ)، واتە: (ئەی ئەبو زەڕ! بێگومان تۆ بێهـێزی)، جا ئایا بۆچی پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو زەڕی فەرمووە: (إنك ضعيف)؟ ئایا ئـەبو زەڕ لـە چیدا بێهێز بووە؟ ئیمانی بێ هێز بووە؟ نەخێر، تەقوای كـەم بـووە؟ نـەخێر، زوهدی كەم بووە؟ نەخێر، بەڵكو ئەبو زەڕی غەفاریی (مَـضْرِبُ الْمَثَـل)[3]ی زوهدو راستبێژیی بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَـا أَقَلَّـتِ الْغَبْـرَاءُ وَلَـا أَظَلَّتِ الْخَضْرَاءُ مِنْ رَجُلٍ أَصْدَقَ لَهْجَـةً مِنْ أَبِي ذرّ) رواه ابن ماجه: (١٥٦)، وصححه الألباني، واتە: (زەوی هەڵی نەگرتووەو ئاسمان سێبەری نەكردوە لـە

١) چونكە ئەو بەرپرسیارێتی‌یە دوو حاڵەتی هەیە: یان نیەتیو داوای دەكا، یـان هەیـەتیو سـوور دەبێ لەسەری، جا بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ كە سوێندیشی لەسەر دەخوا، هیچ كـام لـەم دووە بەپێی تەرازووی شەریعەت شایستەی كار پێ سپێردران نین.

٢) هاوەڵ (صحابي)ێكی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بووە.

٣) جێگەی نـموونە پێ هێنانەوە بووە لەبارەی دنیا بە كەمگرییو راستگۆیی‌یەوە.

پیاوێك، ڕاستگۆتر بێ لە (ئەبو زەڕ). زۆر ڕاستبێژ بـووەو زۆریـش زاهیـدو دنیا بـە كـەمگر بـووە، ئـەدی لـە چـیدا لاواز بـووە؟ دیـارە تایبەتمەندییـەكان (خَصَائِص)ی قیادەی تێدا نـەبوونو سـیفەتەكانی بەرپرسـێتیی تێـدا نـەبوون، چونكە بەرپرسیارێتیی بۆ خۆی كۆمەڵێك سیفەتی پێویستن، كە ئەگەر ئینسان ئەو سیفەتانەی تێدا نەبن، ئەو كارەی بۆ بەڕێوە ناچێ، بەڵگەشمان لـەوبارەوە ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموێ، دواییش كـە لـە ئـەبو زەڕ – خـوا لێـی ڕازی بێ- ورد دەبینـەوە، نـابینین كـە ئیمـانی لاواز بـێو تـەقوای كەمـبێو زوهـدی كەمـبێو زانیـاریی نـەبێ، كەواتـە دیـارە سـیفەتەكانی قیـادەییو بەرپرسێتیی تێـدانەبوون، وە دواییش كە تەماشـای ژیـانی ئـەبو زەڕ – خـوا لێی ڕازی بێ- دەكەین ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەكەوێ، چونكە دوایی ئەبو زەڕ ـ خـوا لێـی ڕازی بـێ- لـە شـامدا لەگـەڵ موعاویـە ـ خـوا لێـی ڕازی بـێ- تێكدەگیرێ، دوایی دێتەوە لەگـەڵ خەلیفـەی مـسوڵمانان عوسمـانی كـوڕی عەففان ـ خوا لێی ڕازی بێ – تێكـدەگیرێ، یەكێك لە بۆچوونەكانی ئەبو زەڕ ـ خوا لێی ڕازی بێ- ئەوە بوو كە گوتوویـەتی: {نابـێ یـەك فلـس لـە (بیـت الـمال)دا هـەبێ، دەبـێ لەگـەڵ پـارە هـات، یەكـسەر بڵاوبكرێتـەوە}، گوتوویانە: ئاخر دەبێ هەڵیـبگرین وەك دەڵێن: (ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش)، چونكە سوپامان هەیـە، لێقـەومان دەبـێ، برسـێتیی دەبـێ، پێویـستە هـەڵی بگرین، گوتوویەتی: {نەخێر نابێ یەك فلس لـە (بیـت الـمال)دا هـەبێ}، زۆر كێشەی لەگەڵدا كـردوون، ئـەویش دیـارە لێـرەدا لـێی تێینەگەیـشتوە، ئەگەرنا وڵات بە خەزێنەی خـاڵیی ئیـدارە نـاكرێو بەڕێوەناچـێ، جـا ئـەوە یەكێك بووە لە خاڵـە بێهـێزەكانی كە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە.

وە دوایی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِلاَّ مَنْ أَخَذَهَا بِحَقِّهَا وَأَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ فِيهَا}، واتە: (مەگەر کەسێك بە مافی خۆی وەری بگرێ و، ئەو مافەی کە لەسەری پێویستە لەو کارەدا جێبەجێی بکات)، جا وا دیارە کە ئەبو زەڕ نەیتوانیوە ئەو حەقەی بەرپرسیارێتیی جێبەجێ بکات و، ئەو ئامانجەی بۆی رەچاوکراوە بیهێنێتەدی.

کەواتـــە:

کاتێك وەرگرتنی بەرپرسیارێتیی رەواو بێ گرێو گۆڵە، کە مرۆڤــ نیەتی بـاش بێو شایستەییو تواناشـی هـەبێ، نـەك بۆخـۆی، بـە شـایەدیی خـەڵك، چـونکە شایەدیی ئینسان بۆ خۆی رەوا نیەو دەبێ خەڵك تێت راببینێ، وەك پێغەمبەر ﷺ لـە جەنگی (مؤتة)دا بۆ سوپای مسوڵمانان سێ فەرماندەی دیاری کـردن، فـەرمووی: ﴿زەیدی کوڕی حاریسە فەرماندەتانە، ئەگەر ئەو کـوژرا جەعفـەری کـوڕی ئـەبو تالیب، ئەگەر ئەویش کوژرا عەبدوڵڵای کـوڕی رەواحـە، ئەگـەر ئـەویش کـوژرا (فَلْيَرْتَضِ الـمسلمون رَجُلاً)﴾[1] وەك لـە (الأحكـام الـسلطانية)ی (الــماوردي)دا هـاتوە، واتـە: بـا مـسوڵمانان لەسـەر پیاوێـك رێکبکـەون، جـا ئایـا لەسـەر کـێ رێککەوتن؟ دوای ئەوەی دوا فەرماندەی مسوڵمانان کە عەبدوڵڵای کوڕی رەواحـە بوو شەهید کرا، یەکێك لە مسوڵمانان ئاڵاکەی هەڵگرتەوە بێ ئەوەی فەرماندە بێ، چونکە ئەوکاتە قاعیدەی شەڕ وا بووە کێ فەرماندەبێ، دەبووایە ئاڵاکـە هـەڵگرێ، مسوڵمانانیش گوتوویانە: تۆ فەرماندەمان بە، ئەویش گوتوویەتی: نـا ئـەوە ئیـشی

---

١) (اسْتَخْلَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى جَيْشِ مُؤْتَةَ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ وَقَالَ: فَإِنْ أُصِيبَ فَجَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، فَإِنْ أُصِيبَ فَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ، فَإِنْ أُصِيبَ فَلْيَرْتَضِ الْمُسْلِمُونَ رَجُلًا. فَتَقَدَّمَ زَيْدٌ فَقُتِلَ، فَأَخَذَ الرَّايَةَ جَعْفَرٌ وَتَقَدَّمَ فَقُتِلَ، فَأَخَذَ الرَّايَةَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَتَقَدَّمَ فَقُتِلَ، فَاخْتَارَ الْمُسْلِمُونَ بَعْدَهُ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ) الأحكام السلطانية والولايات الدينية ص: (٢٦).

من نیەو لە خۆم ڕانابینم، گوتی: ئـەدی کـێ فەرمانـدە بـێ؟ مەشـوەرەتیان کـردوە گوتوویانە: با خالیدی کوڕی وەلید بێ، جا پێغەمبەر ﷺ کە لە مەدینە دانیشتبوون، فەرمووی: ئەوا زەید کوژرا، دوایی فەرمووی: ئەوا جەعفـەریش کـوژرا، دوایـی فەرمووی: ئەوا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەش کوژرا ـ خوا لێیان ڕازی بێ ـ، دوایی فەرمووی: (ئینجا یەکێك لە شمشێرەکانی خوا ئاڵاکەی هەڵگرت)، وە خوا لەسەر دەستی ئەو سەرکەوتنی هێنایەدی.

فەتحەکەش ئەوە بوو خالید بتوانێ ئەو سێ هەزار کەسـە دەربـاز بکـات، ئـەوەی شەهید بوو شەهید بوو، ئەوانیدیکە پاشەکشێیان پێ بکات، چونکە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار ڕۆمو (١٠٠,٠٠٠) سـەد هـەزار عـەرەبی کرێگرتـە (الْمُرْتَزِقَـة) بۆیـان هاتبوون، دیارە (٣٠٠٠) سێ هەزار کەسو (٢٠٠,٠٠٠) دوو سەد هەزار کـەس نەگوتراوە! مانای وایە ئەگـەر خالیـد بتوانـێ پاشەکـشەیان پـێ بکـاتو دەربازیـان بکات، دیارە ئەوە سەرکەوتنێکی مەزنە.

کەواتە: بۆ وەرگرتنی ئەرکی بەرپرسیارێتیی، دەبێ وابی کە خەڵك بە شایـستەت بزانێ، جا هەرکاتێك خەڵك بە شایستەیان زانیو هەڵیانبژاردی، نیەتەکەشت بـاش بوو، ئەوە بێگومان خوای بە بەزەییو بەخشەریش هاوکارو پشتگیرت دەبێ.

# بنەمای نۆیەم

## پشت بە خوا بەستن و لەسەر پێی خۆ وەستان و، پاراستنی سەربەخۆیی لە هەموو ڕوویێکەوە


ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# بنەمای نۆیەم

## پشت بە خوا بەستن و لەسەر پێی خۆ وەستان و، پاراستنی سەربەخۆیی لە هەموو ڕوویێکەوە.

تەنها پشت بە خوا بەستنو لەسەر پێی خۆ وەستان لە ڕووی ئابوورییەوەو، پاراستنی سەربەخۆیی فیکریىو سیاسیی خۆو، ڕەدکردنەوەی هەر جۆرە وابەستەییەك، چونکە بەبێ پشت بە خوا بەستن (التَّوَكُّلُ عَلَى اللّه) و لەسەر پێی خۆ وەستان (الإِعْتِمَادُ عَلَى الذَّات)و سەربەخۆیی (إستقلال)ی خۆپاراستن، کۆمەڵی ئیسلامیی ناتوانێو ڕێی نادرێ ئامانجە شەرعییەکان بێنێتەدی، وەك:

١- خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾ آل عمران، واتە: (ئەگەر خوا سەرتان بخا کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ، وە ئەگەر ئەو پشتتان بەربدات، لە دوای وی کێ سەرتان دەخا؟ - واتە: کەس- وە با ئیمانداران تەنها پشت بەخوا ببەستن).

٢- وە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَإِن يُرِيدُوٓا۟ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾﴾ الأنفال، بێگومان دواندن (خطاب) لەگەڵ پێغەمبەرە ﷺ واتە: (وە ئەگەر بیانەوێ فێڵت

لێ بكەن، ئەوە بێگومان خوا بۆ تۆ بەسە، ئەو تۆی بەهێز كردوە بە یارمەتیو سەرخستنی خۆیو بە ئیماندارانیش)، واتە: بەو ئیماندارانەی كە لە خزمەتتدانو پشتت دەگرن.

٣- وە خوای بەدیهێنەر ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٤﴾ الأنفال، واتە: (ئەی پێغەمبەر! خوا بۆ تۆ بەسە، وە بۆ ئەو بڕوادارانەش كە شوێنت كەوتوون). شایانی باسە ئەم ئایەتە دوو واتای هەیە: واتە پشتیوانیی خوا ﷻ بۆ تۆ بەسە، وە پشتگیریی ئەو بڕوادارانەش كە شوێنت كەوتوون، یاخود پشتیوانیی خوا ﷻ بۆ تۆو ئەو بڕوادارانەی كە شوێنت كەوتوون، بەسە، كە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان ئەو مانایەی دووەمینیان پێ بەهێزترە.

٤- وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ٥٥﴾ المائدة. واتە: {بێگومان پشتیوانی ئێوە (یاخود سەرپەرشتیارو دۆستی ئێوە) تەنیا خواو پێغەمبەری خوایە، وە (لە دوای خواو پێغەمبەری خوا) دۆستو پشتیوانی ئێوە ئەوانەن كە بڕوایان هێناوە، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەكەنو زەكات دەدەنو هەمیشە ركووع دەبەن).

دیارە پشتیوان بوونی خوا ﷻ بۆ ئیمانداران واتایەكی هەیەو، هی پێغەمبەر ﷺ واتایەكی دیكەی هەیە.

٥- وە دەربارەی هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ، دوای ئەوەی پێشتر چەند سیفەتێكیان لێ هەڵدەدات لە ئایەتەكانی كۆتایی سووڕەتی (الفتح)دا، ئینجا ئاوا وەسفیان دەكات: ﴿... ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي

ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ...﴿٢٩﴾ الفتح، واتە: (... ئەوە وەسفیانە لە تەوراتدا، وە وەسفیان لە ئینجیلدا وەك درەختێكە كە لق و پۆپ دەردەكات بەملاو بەولادا - پێشی نەمامە، دوایی لقو پۆپ دەردەكاتو ئەو لق و پۆپە- قەدەكەی بەهێز دەكاتو چڕو پڕ دەبێو، لەسەر ئەو قەدەی خۆی دەوەستێو بەرز هەڵدەچێ ...).

**ڕوونکـردنەوە:**

لە ڕوونکردنـەوەی ئەم بنەمـای نۆیەمەدا، لە سـێ خاڵانــدا باسـی سـێ بابـەتی گرنگ دەکەین، کە (پشت بە خوا بەستن)و (لەسەر پێی خۆ وەسـتان)و ( پاراسـتنی سەربەخۆیی فیکریی و سیاسیی خۆ)ن:

**یەکـەم: پشــت بەخوا بەســتن (التَّوَكُّلُ عَلَى اللهِ):**

مانای پشت بەخوا بەستن چییـە؟ وشەی (تَوَكُّــلْ) لـە زمـانی عەرەبیـدا لەسـەر کـێش (وَزْن)ی (تَفَعُّـل)ە، واتـە: شـتێك بکـرێ بـە زۆر لـەخۆ کـردن، یـاخود دەردەسەریی (مَشَقَّة)و زەحمەتی بوێ. وەك دەڵێ: (يَتَجَشَّمُ السَّفَرَ)، واتـە: (خـۆی زەحمەت دەدا تا سەفەرەکە بکات). (تَوَكُّـلْ) لەسەر ئەو کێش (وَزْن)ەیە، وە مانـای (تَوَكُّـلْ) واتە: وەکیل گرتن، (التَّوَكُّــلُ عَلَـى اللهِ)، واتـە: تـۆ خـوا ﷻ بکـەی بـە پشتو پەنای خۆتو، پشـتی پێ ببەسـتیو، خوا ﷻ بکەی بە وەکیلـی خـۆتو، کاری خۆت بە خوا ﷻ بسـپێری.

**گرنگیی و پێگـەی پشت بە خوا بەستن لە ئیسـلامدا:**

**أ/ پشت بە خوا بەستن دوای ئیمـان، گرنگتـرین تایبەتـمەندیـی (خِصِّـيصـة)ی مسـوڵمانـانە:**

لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی بـەپێزدا باسـی (تَوَكُّـلْ) کـراوە، بـۆ وێنـە: لـە سوورەتی (الشورى) لە ئایەتی (٣٦ – ٣٩)دا خوای بەرزو مەزن باسی (٩ ، ١٠) لـە سـیفەتەکانی کۆمـەڵی مـسوڵمان دەکـات، جـارێ هـەر لـە مەککـە بـوون

نەچووبوونــە مەدینــەو نەبووبوونــە قــەوارەی سیاســی، باســی (٩، ١٠) لــە سیفەتەكانیان دەكات، خوا ﷻ ئاوا دەست پێدەكاتو دەفـەرمویٚ: ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الشورى، واتـە: (هەرچـی پێتـان دراوە هەمووی رابـواردنێكی كـەمی ژیـانی دنیایـە، وە ئـەوەی لـەلای خوایـە، چاكترەو دەشمێنێتەوە، بۆ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو پـشت بـە پـەروەردگاریان دەبەستن. وە ئەوانەش كە خۆیان لـە گونـاهی گـەورەو كـاری ناپەسـندو دزێـو دەپارێـزن، وە كاتێكـیش تووڕە دەبـن چاوپۆشـیی دەكـەن، وە ئەوانــەش كــە بەدەم بانگی پەروەردگاری خۆیانەوە چـوونو نوێـژیان بـەرپاكردو كــاروباریان لەنێو خۆیاندا بە راوێژەو لەو رۆزییەی پێمانـداون دەبەخـشن، وە ئەوانـەش كـە كاتێـك سـتەمو ناحـەقییان بەرانبـەر دەكـریٚ، بـەدەنگ دێـنو تۆڵـەی خۆیـان دەكــەنەوە)، وەك دەبینــین لــە دوای ئیمــان، باسـی پـشت بـە خـوا بەسـتن دەكــات.

لە راستیدا كەسێك پشت بە خوا دەبەســتیٚ، كـە بـاش ئیمـانی بـە خـوا ﷻ هەبیٚ، بەو ئەندازەیەی كە ئیمانت بە خوا ﷻ هەیـە، پشت بـە خـوا دەبەسـتی، بەڵام پشت بە خوا بەستن مانای دەست هەڵگرتن لە هۆكارەكان (أسباب) نیە، وەك دوایی باسی دەكەین.

**ب/ وە پشت بە خوا بەستن، مەرجی بە بڕوادار حیساب كرانە:**

خوا ﷻ پشت بەخوا بەستنی بە مەرجی بە بڕوادار لە قەڵەمدران داناوە، وەك لەسەر زاری یەعقووب بابی یوسف ؑ دەفەرمویٚ: ﴿... إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾﴾ یوسف، واتە: (حوكم ـ یانی: بڕیار یاخود بەرنامە دانان، یان هەردووكی ـ تەنها هی خوایە، پشتم بەو بەستوە، وە با پشت بەستووان تەنها پشت بەو ببەستن)، واتە: ئەوەی كە ئیمانداربیٚو بیەویٚ پشت بە شتێك ببەستیٚ، دەبیٚ تەنها پشت بە خوا ببەستیٚ.

**ج/ دیارە پشت بە خوا بەستنیش پێچەوانەی سازكردنی هۆكارەكان نیە:**

ئینجا بە تەئكید پشت بە خوا بەستنیش ـ وەك گوتمان ـ مانای دەست بەردان نیە لە هۆكارەكان، وە مانای دەست بە خۆدا بەردانەوە نیە، بەڵێ: پشتم بە خوا بەستوەو لەسەر گازی پشتیٚ لیٚی راكشیٚ! بۆچی؟ چونكە خوا ﷻ باسی یەكێك لە بەندە چاكەكانی خۆی دەكات كە (ذوالقرنين)ە، كە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن یەكێكە لە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام، زۆر مەدحی دەكات، دوایی دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾﴾ الكهف، واتە: (ئێمە دەسەڵاتمان پێدا لە زەویدا وە لە هەموو شتێك هۆكارێكمان بۆ رەخساندبوو ...)، ئەویش بەدوای هۆكارەكان دەكەوت، دوایی چەند جارێك ئەو رستەیە دووبارە دەبێتەوە: ﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾ الكهف، واتە: (بەدوای هۆكارەكان كەوت)، واتە: (ذوالقرنين) كە پیاوێكی هێندە چاك بوو، خوا ﷻ لە ریزی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام دا باسی دەكات، بۆ

ئەوەی کە پێغەمبەری کۆتایی موحەمـمەد ﷺ و ئۆممەتەکەی بیکەنە سەرمەشـق، کەچی تەماشای دەکەی هەرچەندە بەندەیەکی چـاك (عبد صالح)ی خـوا بـووە، هەندێکیش دەڵێـن پێغەمبـەریش بووە، بەڵام خوای بـێ هاوتـا ﷻ بۆمـان بـاس دەکات کە پشـتی بە هۆکارەکان دەبەست، واتە: دڵی بـە خـواوە ﷻ پەیوەسـت بوو، بەڵام دەسـتیشـی بە هۆکارەکانەوە بەسـتبوو.

لە فەرموودەیەکدا هاتوە کە: {عن جعفر بن عمرو بن أمية، عن أبيه، قال: قال رجل للنبـي ﷺ: أُرْسِلُ نَاقَـتِي وَأَتَوَكَّلُ؟ قَالَ: أَعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ} رواه ابـن حبـان في صحيحه: (٧٣١)، وقال شـعيب الأرنؤوط: حديث حسن، واتـە: (ـ ڕۆژێك کابرایەکی عەرەبی دەشـتەکیی دێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وشترێکی پێـدەبێ ـ، پیاوەکە لە پێغەمبـەر ﷺی پرسی: ـ وشترەکەم ـ بەڕەڵـلا بکەم‌و پشت بـە خـوا ببەسـتم؟ پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: بیبەستەوە، ئینجا پشت بە خوا ببەسـتە).

بەڵـێ، بە هۆکارەکان پەیوەست بوونـەوە، لەگـەڵ پـشت بـە خـوا بەسـتن، تێکناگیرێن، بەڵکو کەسێك پشتی بە خوا قایم بێ، دەبێ چاکیش بە قسەی خـوا بکات، خوای بەرز ﷻ خۆی دەفەرموێ: هۆکارەکان ڕەچاو بکەن.

## دووەم: لەسـەر پـێی خـۆ وەسـتان (الإِعْتِمَـادُ عَلَـى الـذَّاتِ) لـە ڕووی ئابوورییەوە:

بنچینەیەك هەیە کە زۆر باوە، دەڵێ: (مَنْ لايَمْلِكُ قُوتَـهُ لا يَمْلِكُ قَرَارَهُ)، واتە: (هەر کەسێك بژێـوی خۆی بەدەست نەبێ، بڕیاری خۆی بەدەست نیە)، بەڕاسـتی تارادەیەکـی زۆر وایـە، ئـەوە چ بـۆ تـاك وایـە، چ بـۆ کۆمـەڵ وایـە، چ بـۆ دەوڵـەتیش وایـە.

كۆمەڵێكی ئیسلامیی ئەگەر بیەوێ ئامانجەكانی بەدەست بێنێ، دەبێ هەوڵ بدات لەسەر پێی خۆی بوەستێ‌و پشت بە خۆی ببەستێ.

بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەدا پشت بە خۆ بەستن لە ڕووی ئابوورییەوەو لەسەر پێی خۆ وەستان، یەكجار گرنگە، بۆیەش من ئەو ئایەتەی سووڕەتی (فتح)م بۆ هێناوەتەوە، كە خوای پەروەردگار دەربارەی هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ، دوای ئەوەی پێشتر چەند سیفەتێكیان لێ هەڵدەدات، لە ئایەتەكانی كۆتایی سووڕەتی (الفتح)دا[١]، ئینجا ئاوا وەسفیان دەكات: ﴿... ذَٰلِكَ

---

١) خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾﴾ الفتح، واتە: (موحەممەد ڕەوانەكراوی خوایە، وە ئەوانەی لەگەڵیدانو شوێنی كەوتوون، بە زەبرو توندوتیژن بەرانبەر كافرانو، دڵ نەرمو بەسۆزن لەنێوان خۆیاندا، دەیانبینی هەردەم لە ركووعو سەجدەدان، ئاواتیان بەدەستهێنانی بەخششو ڕەزامەندیی خوایە، لە روخساریاندا نیشانەو شوێنەواری كڕنووش بردن هەیە، ئەوە وەسفیانە لە تەوراتدا، وە وەسفیان لە ئینجیلدا وەك درەختێكە كە لقو پۆپ دەردەكا بەملاو بەولادا ـ پێشێ نەمامە دوایی لقو پۆپ دەردەكا ئەو لقو پۆپەـ قەدەكەی بەهێز دەكاتو چڕو پڕ دەبێ‌و لەسەر ئەو قەدەی خۆی دەوەستێ‌و بەرز هەڵدەچێ، ـ ئەوەندە زوو گەشە دەكات ـ جوتیارەكان سەرسام دەكات، ـ خوا ئاوا بە خێرایی هاوەڵانی پێغەمبەری زیادكرد ـ تاوەكو رقی بێبڕوایانیان پێ هەڵسێنێ، خوا بەڵێنی بەو كەسانە داوە كە بڕوایان هێناوەو كارە چاكەكانیان ئەنجامداوە، بە لێبوردنی تەواوو پاداشتێكی گەورە).

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پێغەمبەر ئاوا بوون: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك نەمامەكە بووە، ئەوانیش وەك لقو پۆپەكە بوون، ئەویان بەهێز كردووەو ئەویان بەرز كردۆتەوە بەرەو ئاسمانو لقو پۆپی هاویشتوە.

مَثَلُهُمْ (١) فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ (٢) وَمَثَلُهُمْ فِي ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ ...﴿٢٩﴾﴾ الفتح.

خوای کاربەجێ ﷻ وێنە بۆ پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەڕێزی دێنێتەوە بە درەختێك کە ڕەگ و ڕیشەکەی بە قووڵایی زەوییدا چۆتە خوارێو لەسەر قەدو بنکی خۆی وەستاوە.

دیارە وەرگرتنی هاوکاریی و یارمەتییش بەبێ مەرج و بەرانبەرو بەشێوەیەکی لێزانانە، پێچەوانەی لەسەرپێی خۆ وەستان نیە، بەڵام پێویستە هەمیشە حیسابی ئەوە بکرێ کە کاتێك دێ، دەبڕدرێو کۆتایی پێ دێ!

هەڵبەتە لەم ڕۆژگارەدا لایەنی ماددیی ژیان زۆر زێدەڕۆیی تێدا دەکرێت، ئینسانیش بە تەنیا ناتوانێت بە پێچەوانەی ڕەوتی ڕۆژانەی ئەو خەڵکە بجووڵێتەوە، ئەگەر بۆ خۆشت بتوانی،ماڵو منداڵەکەتو دەوروبەرەکەت وا ناکەن، بە هەر حاڵ، دابو نەریت (عُـرْف) یەکێکە لە بنچینەکانی شەرع، یەکێك لە بنەماکانی هەڵهێنجانی حوکمی شەرعیی، بریتیە لە باو (عُـرْف)ی خەڵك، ئەوەی کە لەنێو خەڵکدا باوە، مادام پێچەوانەی دەقێکی شەرعیی نەبێ، زۆر ئاساییەو بە هەند وەردەگیرێ.

---

(ئەوانەی لەم ئایەتەدا باسکران سیفەتی بەرزی هاوەڵان بوون، ئەوەیش کە باسکرا وێنەی پاداشتیان بوو، جا سیفەتی هەر کەسێك وەك سیفەتی ئەوان بێ، ئەوا لە ریزی ئەواندا دەبێ).

١) (مَثَـلْ) یانی وەسف، وەسفو سیفەتی ئەوانە لە تەوڕاتدا ئاوا باسکراوە.

٢) لە تەوڕاتدا ئاوا وەسفکراون، وە تەوڕاتی ئێستا ئەوەی تێدا ماوە کە باسی پێغەمبەرێك دەکات – دیارە ئێستا گۆڕیویانە – پێغەمبەرێك دێ بانگەوازەکەی دنیا دادەگرێت، ئەوانەی کە لەگەڵیدان ئەوە سیفەتەکانیانە، ئێستاش ئەوە لە تەوڕاتدا هەیە.

شایانی باسیشە لەم ڕۆژگارەدا پشت بەخۆ بەستن لەڕووی ئابوورییەوە یەکجار شتێکی زەحمەتە، بەتایبەت کە لەلایەن ئەمریکاو دەستو پێوەندەکانیەوە سیاسەتێك پەیڕەو دەکرێ، کە پێی دەڵێن سیاسەتی وشککردنی سەرچاوەکان (سِيَاسَةُ تَجْفِيفُ الْمَنَابِعْ)، ئەم سیاسەتە لە دژی تەوژمی ئیسلامیی و لەژێر پەردەی (جەنگ لە دژی تیرۆر)دا پەیڕەو دەکرێ.

کە مەبەستیان پێ ی وشککردنی ئەو سەرچاوانەیە کە هاوکاری ماددیی لایەنە ئیسلامییەکانیان لێوە دەکرێ، کە بێگومان ئەمریکا ستەمێکی گەورەی کردوە لە دامو دەزگا خێرخوازییەکانیش، یانی بە بیانووی دژایەتیی کردنی ئەوانەی کە دژایەتیی ئەمریکا دەکەن، کە ناویشی لێناون تیرۆریست (إرهابي)، لەحاڵێکدا کە بۆ خۆی گەورەترین تیرۆر (إرهاب) پەیڕەو دەکاتو گەورەترین تیرۆریستە لەسەر ئاستی دنیا، کەچی لە پەنای ئەوەداو بە بیانووی ئەوەوە زۆر دژایەتیی ئەو دامەزراوەو کۆمەڵە (جمعية) خێرخوازییانە دەکات، کە مزگەوتیان دروست دەکردن، یان ڕێگەوبانیان دروست دەکردن، یان یارمەتی هەتیوو بێوەژنو لێقەوماوو هەژارو داماوو ئەوانەیان دەدا، ئێستا لە ترسی ئەمریکا، زۆر لە ولاتانو زۆر لە دەوڵەمەندانو پارەدارانو خێرخوازان ناوێرن هاوکاریی ئەو دامەزراوەو کۆمەڵە خێرخوازییانە بکەن، بۆ ئەوەی تۆمەتبار نەکرێن بەوەی کەوا ئەو پارەیە پاڵپشتی دارایی (تَمْوِيلْ)ی ئەو خەڵکانەی پێ دەکرێ، کە ئەمریکا خستوونیە خانەی تیرۆرەوە.

بۆیە بەڕاستی لەلایەکەوە مەسەلەی زوهدو سادە ژیانو کەم مەسرەفیی، شتێکی حەتمیی و پێویستە بۆ هەر لایەنێکی ئیسلامیی و، لەلایەکی دیکەشەوە هەبوونی پرۆژەی ئابووریی وەبەرهێنان (إِسْتِثْمَارِي)یش شتێکی پێویستە.

جارێك برایەكی خۆمان گوتی: مامۆستا، كاری ئیسلامیی‌و كاری سیاسیی كوا بە هەژاریی‌و بە سواڵ‌و صەدەقە دەكرێ؟ گوتم: ئەدی تەنیا بە دەوڵەمەندیی دەكرێ؟! لە ڕاستیدا كاری ئیسلامیی‌و پاكسازیی‌و چاكسازیی كردن لە كۆمەڵگادا بە هەژاریی باشتر دەكرێ، بە كەسانی سادە دەكرێ، بە كەسانێك كە بەڕاستی ئاتاج‌و نەدارن، چونكە تۆ تەماشای پێغەمبەران بكە عليهم الصلاة والسلام پەیڕەوو شوێنكەوتووانی پێغەمبەران، بەزۆری لەم جۆرە بوون، چەوسێنراوان (مُستَضعَفِين) بوون، دوژمنەكانیشیان هەمیشە خۆشگوزەرانەكان (مترفين)و دەست بڵاوەكان (مسرفين)و خۆ بەزلگرەكان (مستكبرين)و و ئەوانە بوون، بۆیە بەڕاستی خۆ ڕاهێنان‌و خەڵك ڕاهێنان لەسەر مەسەلەی دنیا بە كەمگریی (زُهـْدْ)و ژیانی سادە، زۆر گرنگە لە هەموو ئاستەكاندا، ئەوە یەك.

دوو: گرنگیدان بە پڕۆژە ئابوورییەكان، ئەگەر بەشێوەیەكی سادەش بێ، بەڕاستی گرنگە، نابێ هەر چاوەڕێ بكەی لە لایەنێكەوە شتێكت بۆ بێ، با بێ مەرجیش بێ، بەڵام نابێ هەر چاوت لەوە بێ، ئینسان بۆ خۆی دەبێ دەست بجوولێنێ.

وە پێویستە ئەو ڕاستییەش بزانرێ كە یارمەتی وەرگرتن لە هەرلایەك، دەوڵەت بێ، حیزب بێ، كەسایەتیی بێ، خێرخواز بێ، هەركەسێك بێ، مادام بەبێ مەرج‌و بەبێ بەرانبەر بێ، پێچەوانە نیە لەگەڵ لەسەر پێ‌ی خۆ وەستان‌و پارێزگاریی لە سەربەخۆیی خۆ كردن، مادام ئەو هاوكاریی‌و یارمەتییە لەسەر حیسابی لادانت لە بەرنامەو فیكرو سیاسەتت نەبێ، ئەگەر یارمەتیی بەو شێوەیە هەبێ زۆر ئاساییە، ئێستا بۆ وێنە: هەریەكە لە بزوتنەوەی حەماس‌و بزوتنەوەی جیهادی ئیسلامیی لە فەلەستین، كە بەس بۆ وێنە ئەم دووانە دێنینەوە، پێویستییان بە ئیمكانیەتی زۆر هەیە، لە بەرانبەر جوولەكەو ئەمریكادا قەراریان گرتوە، بەڵام من ئاگادارم كە زۆر

هاوکاریی دەکرێن، مادام ئەو هاوکارییە لەسەر حیسابی ئەوە نەبێ کە لە ئامانجەکانی خۆیانو بەرنامەی خۆیان لایانبدەنو سەربەخۆیی خۆیان بدۆڕێنن، هیچ غوباری لەسەر نیە، چونکە جاری وا هەیە ئامانجی تۆو ئامانجی ئەو لایەنەی هاوکارییت دەکات، یەك دەگرێتەوە، بۆ نموونە: دوژمنێکی هاوبەشتان هەیە، ئەویش دەڵێ: من بۆ خۆم ناتوانم ڕاستەوخۆ دژایەتیی بکەم، بەڵام تۆ وەرە ئەو کارە بکەو منیش هاوکارییت دەکەم، بۆ پێتوایە ئێستا تاڵیبان کە ئەمریکاو هاوپەیمانیی ناتۆیان بەگیرهێناوە، هەر بە تواناو ئیمکانیەتی خۆیانە؟! زۆر کەس هەیە دژی ئەمریکاو ئەو هێزانەیە کە ئێستا لە ئەفغانستانن، بەڵام ناتوانێ ڕووبەڕوو لەگەڵ ئەمریکادا بجەنگێ، دەچێ یارمەتیی تاڵیبان دەدا، کاتی خۆی ئەمریکا زۆری یارمەتی موجاهیدانی ئەفغانیی نەدا لە دژی ڕووسیا؟ ئەوە ئاشکرایە، جا ئەوانە لە ڕاستیدا هیچیان ناشەرعیی نین، بەڵام بە مەرجێك لەسەر حیسابی لادانی فیکریی‌و سیاسیی‌و دوورخستنەوەت لە ئامانجە شەرعییەکانت نەبێ.

## سێیەم: پاراستنی سەربەخۆیی فیکریی‌و سیاسی خۆو، ڕەتکردنەوەی هەر جۆرە وابەستەییەك:

سەربەخۆیی فیکریی، واتە: تۆ خۆت ئەو بەرنامەیەی کە بۆ خۆت داتناوە، چۆن لە دین تێگەیشتووی، چۆن لە واقیع تێگەیشتووی، دەتەوێ چی بکەی‌و چۆن بکەی لە ڕووی فیکرییەوە، وە لە ڕووی سیاسییەوە، دەتەوێ چۆن حەرەکەت بکەی‌و بجوولێی، هەڵوێستت چییە لەگەڵ ئەو حیزب‌و خەڵکانەی ئەو دەورووبەرە؟ ئەو سیاسەتە فیکریی‌و بەرنامە سیاسییەی کە بۆ خۆت داتناوە، دەبێ پارێزگاریی لێبکرێ و، لەژێر هیچ زەخت‌و فشارێکدا ئینسان نەهێڵێ لە بنەما سەرەکییەکانی لایبدەن، ئەگەر نا دابەزین لە شتی بچووك زیانی نیە.

وەك پێشتر باسمانكرد، پێغەمبەر ﷺ لە ئاشتەوایی (صُلْح)ی حودەیبیەدا لە هەندێك شتی بچووك تەنازولی كرد، كافرەكان گوتیان: با (رسول الله) نەنووسرێ‌و (بسم الله الرحمن الرحيم) نەنووسرێ، هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ ئەو شتانەی لەسەر دڵ قورس بوون، بەڵام لەسەر ئەو بیانوو گرتنانەی كافرەكان ئاشتەوایی (صُلْح)ەكەی تێك نەدایەوە، چونكە شتی بنەڕەتیی نین، وە رازیبوونیشی بە نەنووسرانیان لە رێككەوتنامەكەدا، مانای دەستبەرداربوونی نیە لێیان، بەڵام شتی بنەڕەتیی، دەبێ ئینسان بەهەر نرخێك بێ پارێزگاریی لێ بكات، وە قبووڵ نەكا هیچ جۆرە وابەستەییەكی هەبێ بۆ هیچ كەس‌و لایەنێك.

ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی لە خوا بەزیاد بێ ـ وەك باسكردنی نیعمەتی خواـ تا ئێستا لەگەڵ ئەوەی تووشی هەورازو نشێوی زۆر بووین، تووشی گرفتاریی زۆر بووین، بەڵام من وەك ئەمیری كۆمەڵی ئیسلامیی دەڵێم: تا ئێستا لە خوا بەزیاد بێ لە رووی فیكریی‌و سیاسیی‌و پاراستنی سەربەخۆیی خۆمانەوە، سوپاس بۆ خوا باشمان هێناوە، سەربەرزانە هێناومانە، هەر پڕوپاگەندەیەك‌و درۆو دەلەسەیەك كە لەو بارەیەوە دەگوترێت، لە راستیدا بچووكترین بەڵگەیان بەدەستەوە نیە، تەنها گومانی خراپ‌و لە پشت پەردەی رەشەوە تەماشاكردنە، بۆیە ئێمە یەقینی خۆمان بە گومانی خەڵكی نادەین و، لە خوای پەروەردگاریش ﷻ داواكارین بەردەوامان بكات‌و زیاتر ئیستیقامەتمان پێ ببەخشێ.

بەڵام دەبێ ئەوەش باش بزانین: پارێزگاریی لە سەربەخۆیی سیاسیی‌و فیكریی خۆ كردن، شتێكی ئاسان نیەو باجی گەورەی دەوێ، بەڵام هیچ جێگرەوە (بدیل)یشی نیەو، بە هەر نرخێك بووە پێویستە بهێنرێتەدی، وە ئێمە لەو پێناوەدا باجیشمان داوە، هەر بەبیرتان دێنمەوە: كاتی خۆی كە كۆمەڵی ئیسلامییمان راگەیاند، وەفدێكی كۆماری ئیسلامیی هاتن ـ وەك لە كتێبی (ئەشكەنجە و

زینـدان)یشدا باسم كـردوە ـ گوتیـان: لەبـەر ئـەوەی نـاوی (كۆمـەڵی ئیـسلامیی) تێكەڵكردن (إلتباس)ێكی هەیە لەگەڵ ناوی لایەنی شـوێنانی دیكـەدا، داوا دەكـەین هەر ناوی (بزووتنەوەی ئیسلامیی) لە خۆتـان بنـێن، وە گوتیـان: ئەگـەر ناوەكـەی بگۆڕنەوە بۆ (بزووتنەوەی ئیسلامیی)، ئێمە هاوكارییتان دەكەین‌و پشتتان دەگرین، ئەگەر نا ناتانناسین‌و مامەڵەتان لەگەڵدا ناكـەین، گـوتم: ئەگـەر ئـەمڕۆ لەبـەر ئێـوە ناوەكەی بگۆڕین، سبەی نێوەڕۆكەكەشی بۆ یەكێكی دی دەگۆڕین، لەبەرئەوە ئـەو ناوەمان لە خۆمان ناوە و، ئێوەش هیوادارین كە خۆمان چ ناوێكمان لە خۆمان ناوەو بە چ ناوەڕۆكێكەوەین، ئاوا مامەڵەمان لەگەڵدا بكەن، وە گوتمـان: سـەری خۆتـان مەیەشێنن، گوتیان: دەنا سنوور دادەخەین‌و واو وا دەكەین، گوتمـان: جـا كـەیفی خۆتانــە، وە ســەرەنجام نەچــووینە ژێربــاری ئــەو فــشارە، دوایــی بەشــێك لــە برینــدارەكانی ئێمــە لەســەر ســنوور لــەلای بازگــەكانی ئــەوان وەفاتیــان كــرد، ئامادەنەبوون بریندارەكانمان وەربگرن، بەڵام ئێمە لـە خـوا بـەزیاد بـێ تەنازولــمان نەكـرد و، دوایی ئەوان وازیان لـە هەڵوێـستەكەی خۆیـان هێنـاو هاتنـەوە لامــان، ئـەوەبوو دوایی لە گەرمەی دوای مووشەكبارانەكەی ئەمریكــادا لـە مانگــی (٣)ی (٢٠٠٣)دا قسەیان لەنێوان ئێمەو یەكێتی دا كرد، گوتیـان: با (كۆمەڵی ئیـسلامیی) لەوە زیاتر زەرەر نەكا، یـەكێتییش دیـاربوو ئامـادەبوون، ئـەوەبوو ئێمـە هێزەكـانی خۆمانمان لەوێ گواستەوە بۆ دەڤـەری پـشدەر، هـەروەها دوایـی كـە لێـرە (واتـە: هـەولێر) لە بارەگاكانی خۆمان دەركراین، دوایی لەولا (واتە: دەڤەری ســلێمانی) من‌و ژمارەیەك لە برایـان گیرایـن، پاش ئـەوە دیـسـان خـەڵكێكی زۆرمـان گـیرا، دوایی سوپاس بۆ خوا لەزیندانیش ئەمریكییەكان هەوڵی زۆریـان لەگــەڵ ئێمـەدا وا بكەن‌و وا بڵێن، گوتم: خۆتان ماندوو مەكـەن، وە بـە فـەزڵی خـواوە ڕاوەسـتاوو نەلەخشــاو بووین.

مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە توانیومانە پارێزگاریی لە سەربەخۆیی سیاسیی و فیکریی خۆمان بکەین و، باجمان لەسەری داوەو، لە داهاتووشدا خوا پشتیوان بێ هەر باجێکی بوێ دەیدەین، بەڵام دەستبەرداری سەربەخۆیی فیکریی و سیاسیی خۆمان نابین، هەڵبەتە ئەوەش لەگەڵ ئەوەی کە پێشتر باسم کرد، لە بنەمایەکی پێشتردا کە باسی ساچاندن و گونجان (مداراة)م کرد، بەبێ ئەوەی کە لە پرەنسیپ و مەبدەئەکانی خۆت لابدەی، تێکناگیرێ و ئەوە بازاڕێکی دیکەیەو ئەمەشیان بازاڕێکی دی.

# بنەمای دەیەم

## ئەرك سپاردن بە ئەندامان
## تەنیا لەسەر بناغەی:
## شایستەیی و لێهاتوویی

# بنەمای دەیەم

## ئەرك سپاردن بە ئەندامان تەنیا لەسەر بناغەی: شایستەیی و لێهاتوویی

ئەرك‌و كار بە خەڵك سپاردن لەسەر بناغەی شایستەیی (الكفاءة) و ڕەچاوكردنی هێزو دەستپاكیی (القوة والأمانة)و پارێزگاریی‌و زانیاریی (الحفظ والعلم)و خۆڕاگریی‌و بڕواپتەویی (الصبر واليقين)، وە ڕەچاونەكردنی هیچ مەسەلەیەكی دیكەی وەك: خزمایەتی‌و ناوچەگەرێتی‌و ناسیاوێتیی و هاومەشرەبیی و هاوتەمەنیی‌و ... هتد، وەك:

١- خوای كاربەجێ ﷻ لەسەر زمانی یەكێك لە دوو كچەكانی ئەو پیاوە بەتەمەنەی كە مووسا ﷺ ئاژەڵەكانی بۆ ئاودان، كە زۆر لە توێژەرەوان گوتوویانە (شوعەیب)ە ﷺ- فەرموویەتی: ﴿... يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ٢٦﴾ القصص، واتە: {... ئەی بابە! بە كرێی بگرە، باشترین كەسێك كە تۆ بە كرێی بگری (بۆ شوانیی) بەهێزی ئەمینداره}، واتە: مووسا ئەو دوو سیفەتەی هەردووك تێدابوون.

٢- هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ لەسەر زمانی یوسف ﷺ بە پادشای میسری فەرمووە: ﴿... ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥﴾ یوسف، واتە: (... من لەسەر عەمبارەكانی زەوی دابنێ، چونكە من

پـارێزەرو زانـام)، بـە زاراوەی ئـەمڕۆ واتـە: بـمکە بـە وەزیـری دارایـیو ئابـووریـی.

٣- وە خوای زانا و توانا ﷻ لە سیاقی چەند ئایەتێکدا کە باسی گەلی بەنی ئیـسرائیل دەکـات، فەرموویـەتی: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ السجدة، واتـە: (وە گێڕابوومـانن بـە پێشەوایانێك کە بە فەرمانی ئێمە ڕێنمـایی خـەڵکیان دەکـرد، لـە سۆنگەی ئەوەوە کە خۆیان ڕاگرتو بڕوایەکی پتەویان بە ئایەتەکانی ئێمە هەبوو).

٤- هەروەها خوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا ...﴿٥٨﴾﴾ النساء، واتـە: (بێگومـان خـوا فـەرمانتان پێـدەکات کـە سـپاردەکان بگەیەننە خەڵکی شایستەی خۆیان ...).

٥- هـەروەها خـوای پـەروەردگار ﷻ فەرموویـەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾﴾ الأنفـال، واتـە: (ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ناپـاکیی لەگـەڵ خـواو پێغەمبـەری خـوا مەکـەن، وە ناپاکـیی لـە سپاردەکانتـاندا مەکـەن، لەکـاتێکدا کـە دەزانـن -ناپاکیی کـردن چەند خراپـە -).

٦- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (مَنِ اسْتَعْمَلَ عَامِلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّ مِنْهُمْ أَوْلَى بِذَلِكَ مِنْهُ وَأَعْلَمُ بِكِتَابِ اللهِ وَسُنَّةِ نَبِيِّهِ ﷺ فَقَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَجَمِيعَ الْمُسْلِمِينَ) رواه الحاكم في المستدرك: (٧٠٢٣) وصححه، وروا‌ه البيهقي في السنن الكبرى: ٢٠١٥١، عن ابن عباس، واتە: (هەر کەسێك کاروباری مسوڵمانان بە کەسێك بسپێرێ، وە بشزانێ لەنێویاندا کەسێکی لەو شایستەتر هەیە بۆ ئەو کارەو، زاناترە بە

كتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەكەی، ئەوە خیانەتی لە خواو پێغەمبەری خواو هەموو بڕواداران كردوە).

٧- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا ضُيِّعَتِ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِذَا أُسْنِدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ) رواه البخاري: (٦٤٩٦) عن أبي هريرة، واتە: (هەركاتێك سپاردە زایە بوو چاوەڕێی قیامەتێ بكە -واتە: قیامەتی ئەو كارە و كۆتایی هاتنی -، - ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێ- گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! زایە بوونی سپاردە چۆنە؟ ئەویش فەرمووی: هەركات ئیش بە غەیری خەڵكی شایستەی خۆی سپێردرا، چاوەڕێی كۆتایی هاتنی ئەو ئیشە بكە).

چونكە بوونەوەر هەمووی قیامەتێكی هەیە و، هەموو شتێك لە خودی خۆیدا قیامەتێكی هەیە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾﴾ الأنعام، واتە: (خوا ئەو كەسەیە كە ئێوەی لە قوڕ دروستكردوە، پاشان بۆ هەر دروستكراوێك لە دروستكراوەكانی كاتێكی داناوە كۆتایی تێدا بێ، وە بۆ بوونەوەریش هەمووی كاتێك هەیە كە بە تێكڕایی كۆتایی دێ).

ئینجا دیارە بناغەو شێوازی دانانی بەرپرسانیش، لە هەموو حاڵەندا بریتییە لە راوێژ، چونكە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾﴾ الشورى، واتە: (... وە كاروباریان لەنێو خۆیاندا بە راوێژە ...)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿... وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ...﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران. واتە: (... وە لە كاروبار بەڕێوەبردندا راوێژیان پێ بكە ...).

## ڕوونکــردنەوە:

خوا پشـتیوان بێ، لە پێنج خاڵان دا ئەم بنەمای دەیەمە ڕوون دەکەینەوە:

### یەکـەم: خەسڵەتە بنەڕەتییەکـانی بەرپرسـیارێتـیی:

بۆ بەرپرسیارێتیی لە ئیسلامدا چەند خەسڵەتێکی بنەڕەتیی بە مەرج گـیراون، بـۆ کەسـانێك ئـەرك و بەرپرسـیارێتییان پـێ دەسـپێردرێ، وە بـەپێی ئـەوەی ئێمـە لـە ئایەتەکاندا هێنامانن، شەش سیفەتی بنەڕەتیی هەن، پێویستە لە کەسێکدا هـەبن کـە ئەرك و کاری مسوڵمانانی پێ دەسپێردرێ:

### ١، ٢/ هێزو دەستپاکـیی (الْقُـوَّةُ وَالأَمَـانَةُ):

ئەوەمان لەو ئایەتە وەرگرت کە یەکێك لە دوو کچەکانی پیاوە چاکەکە بە بابی گـــوت: ﴿... يَـٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ٢٦﴾ القصص، ئەویش – واتە: مووسا ـ ئەو دوو سیفەتەی هەردووك تێـدابوون: هێـز بۆ ئـەوەی کە بتوانێ ئیشـی پێ بکـات، ئەمینداریيش بۆ ئــەوەی کـە خیــانەتی لـێ نەکا، کە بێگومان ئەو دوو سـیفەتە زۆر گرنکـن.

وە هێزی پێویست بۆ هەر کارێك بەپێی سروشتی کارەکە دەگۆڕێ، بۆ وێنە: کاری فیکریی و زانستیی، هێزی داواکراو تێیـدا، بریتیـە لـەوە کـە ئـەو ئینسانە چاوکراوە بێ تێیدا و، زاناو شارەزا بێ و ئەهلی فیکرو ڕۆشنبیر بێ، بەڵام هێزی پێویست بۆ کاری سەربازیی ئەوەیە کە ئەو ئینسانە زاناو شارەزا بێ لـە تـاکتیکی جەنگیی و، لێزان و شەڕزان و ئازا بێ، وە هەروەها لە بواری ئابووریيدا سـیفەتی

بەمەرج گیراو، ئەوەیە کە لە کەسابەت بزانیٚ‌و بزانیٚ مـاڵ چـۆن پەیـدا دەکـریٚ‌و چۆن سەرف دەکریٚ.

### ٣، ٤/ پارێزگاریی و زانیـاریی:

کە ئەویشمان لە فەرمایشتی یوسف ﷺ وەرگرتوە کـە بـە پادشـای میـسری گوت: ﴿... ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾﴾ یوسـف. واتـە: بـمکە بە بەرپرسی عەمبـارو خەزێنەکان لەسەر زەمینـی میـسر، یـانی: بمکـە بـە بەرپرسی دارایی‌و ئابووریی، چونکە من پارێزەرم هـەر شـتێکم پـیٚ بـسپێردریٚ دەیپارێزم، وە زاناشم دەزانم چۆن هەڵسوکەوت (تصرف)ی تێدا دەکەم.

### ٥، ٦/ خۆڕاگـریی و بـڕوا پتـەویی (الـصـبـر والـيـقـيـن):

وەك زانایان گوتوویانە: (بِالصَّبْرِ وَاليَقِينِ تُنَـالُ الإِمَامَـةُ فِـي الدِّيــنِ)، واتـە: (بە خۆڕاگریی‌و بڕوا پتەویی پێشەوایەتیی لە دینداریيدا وەدەسـتدیٚ)، ئەویـشمان لەم ئایەتە وەرگرتوە کە خوا ﷻ دەربارەی بەنی ئیسرائیل (واتە: پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل‌و مشوورخۆرانی بەنی ئیسرائیل) دەفـەرمویٚ: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ الـسجدة، کەواتـە: بەرپرسێتیی پێویستی بەوە دەکات لەسەر ئەو ئیشە خـۆڕاگر بـی‌و، پەلـەپڕووزێی تێدا نەکەی‌و تەنگەتاو نەبی، دڵ گچکەو کەم حەوسەڵە نەبی، وە لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵتدان، بۆ کردنی ئەو کارە، دەبیٚ دیسان دڵ گەورە بی‌و لێبوردنت هەبیٚ، ئارامگرو پشوودرێژ بی، وە دەبیٚ ئەو ئینسانە خـاوەنی یـەقین بـیٚ بـەو بەرنامـەو ڕێبازەی خۆی کە لەسەری دەڕوا، چونکە یەقین بە مانای زانیارییەکی بیٚ‌گومـان دیٚ‌و، بە مانای ئیمانێکی بیٚ لەرەلەرو بیٚ دوو دڵیی‌و بیٚ دڵ لە دڵـدان دێت.

دەتوانین ئەم شەش سیفەتە: هێزو دەستپاكیی، پارێزگاریی و زانیاریی، خۆڕاگریی و بڕوا پتەویی، بە یەك وشە تەعبیریان لێ بكەین، كە بریتیە لە شایستەیی (الكفاءة)، ئەو ئینسانە شایستە بێ، واتە: خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ، كە ئەوانە بنەڕەتییەكانن، ئەو شەش سیفەتانەش هەر كامێكیان دەگونجێ لق و پۆپی دیكەیان لێبكەینەوە.

ئەوجار بێجگە لەم شەش خەسڵەتە بنەڕەتییانەش، نابێ هیچ شتێكی دیكە ڕەچاوبكرێ و بە مەرج بگیرێ، بۆ وێنە: خزمایەتیی و ناوچەگەرێتیی و ناسیاوێتیی و دۆستایەتیی و هاومەشرەبیی و ... هتد، لەبەرچاونەگیرێ، بلێی: ئەوە فیكری لە فیكری من نزیكە، سروشتی لە سروشتی من نزیكە ... وە هەروەها وێنەی ئەوانە، بۆچی؟ چونكە هەیە خزمە بەلام مەرج نیە بۆ ئەو كارە بەكەڵك بێ، هەروەها هەیە خەڵكی ناوچەكەی تۆیە، بەلام ئیشەكەت لێ تێكدەدا، وە هەیە دەیناسی بەلام سیفەتەكانی بەرپرسێتی تێدانین، وە هەیە هاومەشرەبی تۆیەو میزاج و سروشتی وەك هی تۆیەو لە مەسەلەیەك یان چەند مەسەلەیەكدا لە تۆ دەچێ، بەلام بەكەڵكی ئەو كارە نایە، بۆیە نابێ ئەوانە ڕەچاوبكرێن.

**دووەم: بەرپرسیارێتیی و كار پێ سپێردران سپاردە (أمانة)یەو لە ئەسڵدا هی خەڵك و كۆمەڵگایە بەگشتیی، پێویستە كەسانێك كە دەكرێنە دەمڕاست چاو وردبكەنەوە بزانن بە كێی دەسپێرن:**

هەر ئیش و كارێك لە بنەڕەتدا خاوەنەكەی خەڵك و كۆمەڵگایە بەگشتیی و، پێویستە كەسانێك كە دەكرێنە دەمڕاست چاو وردبكەنەوە ئەو ئەمانەت و سپاردەیە كە خاوەنە بنەڕەتییەكەی خەڵكە، بە كێی دەسپێرن، بۆچی؟ چونكە ئەگەر بێ و بە ئەهلی خۆی نەسپێرن، مانای وایە بە ناپاك (خائن) دادەنرێن بەرانبەر بە خوا ﷻ و بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ و بەرانبەر بە بڕواداران، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەم ئایەتەیە كە

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ... ﴿٥٨﴾﴾ النساء، بۆیەش دەڵێین: هەر بەرپرسیارێتییەك و هەر كارێك بەگشتی خاوەنەكەی خەڵكە، چونكە خوا ﷻ دواندن (خطاب) لەگەڵ بڕواداران هەموویاندا دەكات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ﴾، ئایا ئەو ڕاناوە (كُمْ) كێیە؟ مسوڵمانانن بەگشتی، ﴿أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾، كەواتە: خوا ﷻ بەگشتی فەرمان بە كۆمەڵگای مسوڵمان دەكات، كە سپاردەكان بە خەڵكی شایستەی خۆیان بسپێرن، بەڵگەش لەسەر ئەوە كە مەبەست لە (سپاردە) بە پلەی یەكەم بەرپرسیارێتیی و حوكمڕانیی و كاربەدەستێتییە، ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ لەو فەرمایشتەدا كە بوخاریی دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: {إذا ضُيِّعَتْ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟} ـ ئەبو هورەیرە دەڵێ ـ ئەویش بۆی ڕوونده‌كاتەوەو دەفەرموێ: (إذا أُسْنِدَ الْأَمْرُ) لە گێڕانەوە (رواية)یێكی دیكەدا دەفەرموێ (إذا وُسِّدَ الْأَمْرُ) هەردووكیان یەك مانایان هەیە، هەر كاتێك كار سپێردرا (إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ) بە غەیری خەڵكی شایستەی خۆی، چاوەڕێی قیامەت بكە ـ واتە قیامەتی ئەو كارە ـ، بەڵێ هەر ئیشێك سپێردرا بە خەڵكی ناشایستە، ئیشەكە سەری بە فەتارەت دەچێ، دروستكردنی بینایەك بە كەسێكی ناشیاو بسپێرە، سەقەتی دەكات، یان ئەوەتا دوای ئەوەی كە بەرزی دەكاتەوە دەڕمێ، یان بەكەڵك نایە، هەموو ئیشێك هەروایە، هەر ئیشێك بە غەیری خەڵكی شایستەی خۆی بسپێری، قیامەتی دێ، كەواتە لێرە مەبەست لە قیامەت، قیامەتی گەورە نیە، بەڵكو مەبەست قیامەتی ئەو كارەیە، وە پێغەمبەریش ﷺ زۆر بە گەورەیی باسی ئەو مەسەلەیە دەكات ـ كە لە خاڵی سێیەمدا باسی دەكەین ـ، كە ئیش سپاردن بە كەسێك شایستە نەبێ، لە كاتێكدا كەسێكی شایستە هەبێ، بە ناپاكیی (خيانة) لە خوا ﷻ و لە پێغەمبەری خوا ﷺ و لە بڕواداران، لەقەڵەمدەدرێ.

خوای پەروەردگار ﷻ دواندن (خِطَابْ) لەگەڵ ئیماندارناندا دەکات، دەفەرموێ:
﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾﴾ الأنفال، واتە: ئەو ئەمانەتو سپاردانەی کە هەتانن‌و لەنێوتاندان، ناپاکییان پێ مەکەن، کە دیارە خیانەت تێدا کردنیان ئەوەیە کە بە غەیری خەڵکی شایستەی خۆیان بسپێردرێن.

**سێیەم: پاش داندران‌و هەڵبژێردرانی حوکمڕان‌و کەسی یەکەمی کۆمەڵ‌و کۆمەڵگای مسوڵمانان، ئەو کەسەو هەر کەسێکی دیکە کە دەسەڵات (صلاحية)ی دانانی بەرپرس‌و کاربەدەستانی خوار خۆی هەیە، دەبێ بزانێ کە ئەو ئەرك‌و کارانە سپاردەن‌و بە کەسانی شایستەی خۆیانیان بسپێرێ:**

وەك ئایەت‌و فەرموودەکان بەگشتی دەیگەیەنن‌و، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش ﷺ بەتایبەت دەیگەیەنێ، کە دەفەرموێ: {مَنِ اسْتَعْمَلَ عَامِلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّ مِنْهُمْ أَوْلَى بِذَلِكَ مِنْهُ وَأَعْلَمُ بِكِتَابِ اللهِ وَسُنَّةِ نَبِيِّهِ ﷺ فَقَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَجَمِيعَ الْمُسْلِمِينَ)[1] رواه الحاكم في المستدرك:

---

١) هەروەها هەر لەو بارەوە ئەم فەرمایشتانەش هەن:

أ/ (عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ قَالَ: قَالَ أَبُوبَكْرٍ ؓ حِينَ بَعَثَنِي إِلَى الشَّامِ: يَا يَزِيدُ، إِنَّ لَكَ قَرَابَةً عَسَيْتَ أَنْ تُؤْثِرَهُمْ بِالْإِمَارَةِ وَذَلِكَ أَكْبَرُ مَا أَخَافُ عَلَيْكَ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ شَيْئًا فَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أَحَدًا مُحَابَاةً فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلَا عَدْلًا حَتَّى يُدْخِلَهُ جَهَنَّمَ وَمَنْ أَعْطَى أَحَدًا حِمَى اللَّهِ فَقَدْ انْتَهَكَ فِي حِمَى اللَّهِ شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ أَوْ قَالَ تَبَرَّأَتْ مِنْهُ ذِمَّةُ اللَّهِ ﷻ) رواه أحمد: (٢١)، والحاكم في المستدرك (٧٠٢٤)، وقال: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، وقال شعيب الأرنؤوط: ضعيف.

(٧٠٢٣) وصححه، ورواه البيهقي في السنن الكبرى: (٢٠١٥١)، عن ابن عباس، بۆ بەو كەسەی سپاردوە لەكاتێكدا لەو شایستەتریش هەیە؟ بێگومان یان لەبەر خزمایەتییە، یان لەبەر ناوچەگەرێتییە، یان لەبەر دۆستایەتییە، یان تەماعێكی تێیدا هەیە، یان ئومێدێكی دنیایی پێ هەیە، لەبەر بەرژەوەندییەكی تایبەتیو ناشەرعییە، لەبەر ئەوەیە، یانی كابرا ناچێ خەڵكی شایستە هەبێو بە خەڵكی ناشایستەی بسپێرێ، مەگەر لەبەر مەبەستێكی خراپ، هەمیشە ئامانجی خراپ لەڕێی ڕێبازو شێوازو ئامڕازی خراپەوە وەدەستدێ، وە ئامانجی چاك لە ڕێی شێوازو ئامڕازو ڕێبازی چاكەوە وەدەستدێ، یانی بە زۆریی وایە ئینسان ئامانجی باش بێ بیردەكاتەوە لە ڕێبازو شێوازو ئامڕازی باشیش، بۆ ئەوەی بەو ئامانجەی بگا، وە ئەگەر ئامانجی خراپیشی هەبێ، بێگومان بیر لە ئامڕازو ڕێبازی خراپ دەكاتەوە.

## چوارەم: قیامەتو كۆتایی هەر كارێك كاتێكە كە بابای ناشایستە وەئەستۆی دەگرێ:

وەك پێشتریش باسمانكرد، بەڵام لێرە هەر ویستوومە زیاتر تیشكی بخەمە سەر، وەك فەرموودەكەی: {إِذا ضُيِّعَتِ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ}(١) ڕوونیكردۆتەوە.

---

ب- {عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ وَلَّاهُ اللَّهُ ﷻ مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ شَيْئًا فَأَرَادَ بِهِ خَيْرًا جَعَلَ لَهُ وَزِيرَ صِدْقٍ فَإِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ} رواه أحمد: (٢٤٤١٤) (٢٤٩١٨)، والطبراني في المعجم الأوسط: (٤٢٤٠)، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح وهذا إسناد ضعيف.

١) (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ فِي مَجْلِسِهِ حَدِيثًا، جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحَدِّثُ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ فَكَرِهَ مَا قَالَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ، حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ السَّاعَةِ؟ قَالَ: هَا أَنَا ذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: إِذَا ضُيِّعَتْ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ؟ أَوْ قَالَ مَا إِضَاعَتُهَا؟

جا فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ ـ وەك جارێكیدیكەش باسمانكردوەـ دەبێ وەك پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی بووە، ئاوا لـێی تێبگەین، ئەگەر نا ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ئەگەر بە هەڵە لـێی تێبگەین، دوایی ستەم لـە پێغەمبەر ﷺ دەكەین، بەو مانایەی تێگەیشتن (فَهْمْ)ێك و شەیەكی پاڵدەدەینە لا، كە ئەو مەبەستی نەبووە، بۆ وێنە: هەندێك لە ڕوونكەرەوانی فەرموودە (شُرَّاحُ الحَدِيث) ئەوەیان بە قیامەتی گەورە لێكداوەتەوەو گوتوویانە: مەبەستی ئەوەیە یەكێك لە نیشانە بچووكەكانی قیامەت ئەوەیە كە ئیش بە غەیری ئەهلی خۆی بسپێردرێ! جا خۆ لەوەتی خوا ﷻ دنیای داناوە، ئەو حاڵەتە هەر هەیە! لەوەتی خوا ﷻ دنیای داناوە ستەم هەر هەیە و، كار بە خەڵكی ناشایستە هەر سپێردراوە، ئەدی چۆن دەتوانین بڵێین: ئەوە یەكێكە لە نیشانەكانی قیامەت؟! نەخێر، پێغەمبەر ﷺ تەنها مەبەستی لە قیامەت قیامەتی ئەو ئیشەیە، كۆتایی هاتنی هەر كارێك و قیامەتی هەر كارێك كاتێك دێ، كە بە كەسێكی ناشایستەو نا ئەهل و كەسێكی نەگونجاو بسپێردرێ، لەوكاتەدا ئەو كارە زایە دەبێ و لەنێودەچێ و سەری بە فەتارەت دەچێ و قیامەتی دێ، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە.

## پێنجەم: بناغەو شێوازی دانانی بەرپرسانی گەورەو بچووك بریتییە لە ڕاوێژ:

تاكە شێوازێك ئێمە بەدەستمانەوە بێ بۆ دانانی بەرپرسان، چ بەرپرسی گەورە چ بەرپرسی بچووك، چ بەرپرسی یەكەم، جا ناوی لـێ دەنێی خەلیفە، ناوی لـێ دەنێی سەرۆك كۆمار، سەرۆك وەزیران، سەرۆكی دەوڵەت، سەرۆكی حكوومەت، چ

قَالَ: إِذَا تَوَسَّدَ الْأَمْرَ غَيْرُ أَهْلِهِ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ) رواه أحمد: (٨٧٢٩) (٨٧١٤)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح وهذا إسناد حسن.

ئەوانی خوارتر، ئەوە بناغەی دانانی بەرپرسان بریتیە لە راوێژ، بە بەڵگەی فەرمایشتی خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾﴾ الشورى. (أمر) لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (الحالُ والشَّأْن)، واتە: (ئیشوكار)، وە لە بەكارهێنانی قورئان دا (أمر) زیاتر بۆ شتی سیاسیی و كۆمەلایەتیی بەكاردێت.

﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾﴾ الشورى، واتە: (كاروباری سیاسیی و كۆمەلایەتییان بە راوێژە)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿...وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ...﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران، خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (راوێژیان پێ بكە لە كاروباردا)، واتە: كاروباری سیاسیی و كۆمەلایەتیی و هەر ئیشێك كە دێتە رێیان، وەك: مەسەلەی جەنگ و ئاشتی. كەواتە: ئێمە بە دەقی ئایەتی خوای پەروەردگار ﷻ، ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سوورەتی (الشورى) و ئایەتی ژمارە (١٥٩)ی سوورەتی (آل عمران) بناغەو تاكە شێوازی دانرانی بەرپرسان و دیاریكردنیانمان بۆ دیاریكراوە، كە بریتیە لە راوێژ، ئینجا ئایا بەدیلی راوێژ چییە؟ ئەگەر مسوڵمانان بە راوێژ بەرپرسانی خۆیان دیاری نەكەن، جێدار (بدیل)یان چییە؟ یان دەبێ یەكێك خۆی فەرز بكات، یان دەبێ میراتیی بێ، لە بابەوە بۆ كوڕو لە كوڕەوە بۆ نەوە، یان دەبێ كێ دەسەلاتی هەبوو خۆی فەرز بكات، وەك بەداخەوە هەندێك لە زانایان لەبەر رۆشنایی واقیعی ئیستیبدادییانەو واقیعی زۆرە ملێیانەی كە بەسەر مسوڵماناندا فەرزكراوە، بنچینەیەكیان داناوە كە زۆر هەڵەیەو پێچەوانەی دەقەكانی قورئان و سوننەتە، بنچینەكەش ئەوەیە كە دەڵێ: (مَنِ اشْتَدَّتْ وَطْأَتُهُ وَجَبَتْ طَاعَتُهُ)، واتە: (هەر كەسێك دەسەلاتی زیاتر بوو، پێویستە بەقسەی بكرێ)، واتە: كێ دەسەلاتی هەبووو خۆی فەرزكرد، نابێ خەڵك لە قسەی دەرچێ! جا ئایا ئەوە وایە؟ هەموو ئایەتەكانی خوای پەروەردگار ﷻ لە قورئاندا دژی خۆ بە زلگران (مستكبرین) و

ستەمكاران (ظالمين)و خۆ فەرزكەران (مستبدين)ن، خوا ﷻ بە زەم باسی فیرعەون دەكاتو دەفەرمویٚ: ﴿... قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾﴾ غافر، واتە: (... فیرعەون گوتی: من هەر ئەو راو بۆچوونە بە چاك دەبینم كە پێتان دەڵێمو، من تەنها ڕێگای هیدایەتو ڕێنمونییتان نیشاندەدەم)، واتە غەیری قسەی من نابێت قسەی دیكە بكریٚ، خوای بەرزو مەزن بە زەمەوە باسی ئەو (فیرعەون)ە دەكاتو دەفەرمویٚ: ﴿... أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾﴾ هود، واتە: (... ئاگادار بن، نەفرەتی خوا لە ستەمكاران بیٚ)، هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿... لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة، واتە: (... پەیمانی من ناگاتە ستەمكاران)، واتە: ستەمكاران بەپیٚی دینو شەریعەتی من نابیٚ حوكمڕان بن، خوا ﷻ بە دەقی ئایەت وا دەفەرمویٚ، كەچی تۆ بەناوی دینەوە بڵیٚی: كیٚ دەسەڵاتی هەبوو پێویستە ئەو حوكمڕان بیٚ، ئەگەر وا بیٚ، نەدەبوایە مووسا عليه السلام لە قسەی فیرعەون دەرچووبا و، نە شدەبوایە ئیبراهیم عليه السلام لە قسەی نەمروود دەرچووبایە، وە نەدەبوو موحەممەد پێغەمبەری كۆتایی ﷺ لە قسەی ئەبو جەهل دەرچووبایە! بەڵام كە تۆ تەماشای ژیانی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام دەكەی، دەبینی ئەوە هەر پێغەمبەرانن لە نەمروودو فیرعەونو قاڕوونو ئەبو جەهلو تاغووتەكان ڕاپەریونو، بەرگرییان كردوە لە جەماوەری ستەمدیدەو بەشخوراوو ماف پێشێلكراو، كەواتە: ئەوە قسەیەكی پووچە، كە بەداخەوە زۆرێك لە مسوڵمانانیشی پیٚ گۆشكراون.

بەڵیٚ، جێگرەوە (بدیل)ی ڕاوێژ، ئەوە كە مسوڵمانان كاروباری خۆیان بە ڕاوێژ بەڕێوە ببەنو بەرپرس و كاربەدەستانیان بە ڕاوێژ دیاریی بكەن، بریتیە لە حوكمی

میراتیی، یاخود حوکمێکی ئیستیبدادیی، حوکمی میراتییش واتە: ئەو خەڵکە کە خوا ﷻ خولقاندوونیو ڕێزی لێناون، وەك مەڕو ماڵ دادەنرێن، وەك چۆن ئەگەر کەسێك مەڕو ماڵی هەبوو، مرد، مەڕو ماڵەکەی بۆ کێ بەجێ دەمێنێ؟ بۆ کوڕەکەی، کەواتە: ئەو خەڵکەش وەك مەڕو ماڵ دانراوە، بۆیە دەڵێن: یەکێك لە زانایان کاتی خۆی لە دەسەڵاتدارێکی میسریی ڕاپەڕی، گوتی: (إِنَّ اللهَ تَعَالَى خَلَقَنا أَحْرَارًا وَلَمْ يَخْلُقْنَا عَقَارًا، وَاللهِ لا نُوَرَّثُ بَعْدَ اليَوْمِ)، واتە: (خوا ئێمەی بە ئازاد خولقاندوە، ئێمە زەوی نین بە میرات بگیرێین، سوێند بە خوا لەمڕۆ بە دواوە، نابێ بە میرات بگیرێین)، جا لەڕاستیدا ئەوە مەنتیقی ئیسلامە، ئەمما ئەوەی دەڵێ: کێ دەسەڵاتی هەبوو دەستی ماچ بکە، هەرچی دەسەڵاتی هەبوو لە قسەی دەرمەچوو، وەك هەندێك بە ناوی سەلەفییەتەوە وا دەڵێن، ئەوە ڕاست پێچەوانەی ئایەتەکانی خوا ﷻو بەرنامە (منهج)ی پێغەمبەرانە عليهم الصلاة والسلام، وە لە ڕاستیدا ئەو جۆرە قسانە بۆ دەسەڵاتدارە سەرەڕۆو فیرعەونەکان، هێندە خۆشن، وەك ڕۆنی سەگیان لە جەستەی بدەی، زۆریان دڵ پێخۆش دەبێ، تۆ بە ناوی دینەوە خەڵکیان بۆ گێژو وڕ بکەی، خەڵکیان بۆ کەر بکەیو باری لێ بنێن، بڵێی: ئەوە خوا وای پێخۆشە، ستەمکار لەوەی پێ خۆشتر نابێ، زۆری پێ خۆشەو زۆر کەیفی پێ دێ. کاتی خۆشی دیارە مارکس شتێکی وای کەوتۆتە بەرچاو، کە گوتوویەتی: (دین تریاکی گەلانە)، هەڵبەتە قسەیەکی وای کەوتۆتە بەرچاو، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو دینی ئیسلامەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، ئەگەر لە حەقیقەتی خۆی لانەدرابێو (تحريف) نەکرابێ، دینی خوا ﷻ، شەریعەتەکانی خوا ﷻ، هەمیشە دژی ستەمکاران بوونو، لە خزمەت بەشخوراوو ستەملێکراواندا بوون، تەماشای هەموو ئایەتەکانی خوا ﷻ بکە، هەر وای دەبینی هەموو شوێنکەوتوانی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام کێن؟ خەڵکی بێ دەسەڵاتن، کە

زۆردارەکــان پێیــان گوتــوون: ســووكو نزمــەکانمان (أَراذِلُنــا)، چەوســێنراوان (مُسْـتَضْـعَفِيْن)و بەشخوراوەکان بوون، ئەدی دوژمنانی پێغەمبەران علـیهم الـصلاة والسلام کێن؟ خۆشگوزەرانەکان (متـرفين)و زێدەڕۆیی کەران (مسرفين)و خـۆ بـە زلگرەکان (مسـتكبرين) بوون.

خـوا ﷻ بـە لوتـف و کـەرەمی بـێ سـنووری خـۆی، خۆشەویـستی خـەڵکی چەوسێنراوەو بەشخوراوو داماومان لەدڵدا بـچەسپێنێو، بــمانپارێزێ لـەوەی کـە کەمو زۆر بەلای ستەمکارانو خۆ بەزلگراندا مەیل بکەین.

# بنەمای یازدەیەم

## پەیڕەوكردنی سیستەمی دامەزراوەكان و،دابەشكردنی ئەرك و كارەكان بەگوێرەی پسپۆڕیی و كارامەیی.

كاروبار بەڕێوەبردن بەپێی سیستەمی دامەزراوەكان (نظام المؤسسات)و دابەشكردنی ئەرك‌و كارەكان بەسەر تاكەكاندا، بەگوێرەی لێهاتوویی‌و پسپۆڕیی‌و شارەزایی‌و، دەستتێوەرنەدانی هیچ كەس‌و ئۆرگانێك لە كاروباری ئەوی دیكە، مەگەر لەسەر بنچینەی هاوكارییكردنی یەكدی، وەك:

١- خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ ﴾ الإسراء، واتە: {بڵێ: هەركەسە بەپێی سروشتی خۆی (یان بەپێی خۆی) كاردەكات، پەروەردگارتان زاناترە بەوەی كە ڕێی راستتری گرتوە}.

٢- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾ المائدة. واتە: (وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی، وە هاوكاریی

یەكدی مەكەن لەسەر گوناحو دەستدرێژیی، وە پارێز لە خوا بكەن، بێگومان خوا سزای توندە).

٣- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهُمْ فِي دِينِ اللَّهِ عُمَرُ، وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ، وَأَقْضَاهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَأَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلالِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، أَلا وَإِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ أَمِيناً وَأَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ) رواه ابن ماجه: (١٥٤)، وقال الألباني: صحيح. واتە: (بە بەزەییترینی ئۆممەتم بەرانبەر بە ئۆممەتم ئەبوبەكرە، وە بەهێزترینیان لە دینی خوادا عومەرە، وە بەشەرمترینیان عوسمانە، وە شارەزاترینیان لە دادوەرییدا عەلی یە، وە كەسێك كە لە هەمووان باشتر قورئان دەخوێنێ ئوبەی كوڕی كەعبە، وە زاناترینیان بە حەڵاڵو حەرام موعازی كوڕی جەبەلە، وە شارەزاترینیان لە میراتدا زەیدی كوڕی سابیتە، وە هەر پێغەمبەرێك ئەمینداریكی هەیەو ئەمینداری ئەم ئۆممەتە ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕڕاحە)، خوا لە هەموویان ڕازی بێ.

٤- هەروەها: (عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُنَزِّلَ النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ) أورده مسلم في مقدمة صحيحه. واتە: (لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕنەوە كە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێكردین كە خەڵكی لە شوێنو پلەی خۆیاندا دابنێین).

## ڕوونکـردنەوە:

ئینجا بێینــە سەر ڕوونکردنەوەی ئەو بنەمایە، لە سێ خاڵی کورتو پوختدا:

**یەکـەم: کاروبار بەڕێوەبردن بەپێی سیستەمی دامەزراوەکان:**

دیــارە مەبەســت لــەم قــسەیە ئەوەیــە کــە هــەر کــارە، ئۆرگــانو دامــەزراوە (مؤسسة)یەکی تایبەتی خۆی هەبێ، نەك هەموو ئیشو کارەکان وەك چێشتی مجێـور تێکەڵو پێکەڵ بکرێن، بـۆ وێنـە: کـاری ڕێکخـستن دامـەزراوەی خـۆی هـەبێ، ڕاگەیاندن بە هەمان شێوە، بانگـەوازو پـەروەردە، کۆمەڵایـەتیی، پەیوەندییـەکان، هــەروەها هــەموو توێژەکانیدیکــەش وەك: ئەنــدازیاران، قوتابیــان، ئافرەتــان، وەرزشوانان ... هتد، چونکە بەمشێوەیە هەرکەسە باشتر لە کاروباری خۆیدا سـەر ڕاستو شارەزا دەبێو پێیدا قووڵ دەبێتەوەو گەشەی پێ دەدات.

وە بە تەئکید هیچ کەسێك ناتوانێ لە هـەموو شـتێکدا شـارەزابێت، ئـەوەی کـە هەموو شتێك دەزانێ، تەنیا خوایە ﷻ.

دیارە لەم ڕۆژگارەشدا مرۆڤــ لـە بـواری دنیـاداریيو ئیداريیـدا زۆر بـەرەوپێش چووەو، زانست لقو پۆپی زۆری هاویشـتوەو، ناگونجێ مرۆڤـ لـە هـەموو شـتێك شارەزاو کارامەبێ، وە ناشگونجێ ئیشو کارەکان تێکـەڵو ئاوێتـە بـن، بـۆ وێنـە: وەختی خۆی مەشهوور بووە کە گوتوویانە مەلای دوازدە عیلم، کـە دوازدە جـۆرە زانست هەبوون، هەر کەسێك ئەو زانستانەی زانیـوە، وەك بڵـێی بۆتـە زانایـەکی مەوسووعیی، یانی لە هەموو ڕوویێکەوە شارەزابووە، دیارە ئەو کاتـە زانـست کـەم بووەو لقو پۆپی زۆری لێنەبۆتەوە، بەڵام ئێـستا هەر لە زانستێك پەنجا لقـی دیکـەی لێبۆتەوەو، ڕۆژ بۆ ڕۆژیش زانیاری لقو پۆپی دیکـەی لــێ دەبێتـەوە، بـۆ وێنــە:

گەردووناسیی، گەردووناسیی (علم الفلك) كاتی خۆی یەك لقی زانست بووە، بەڵام ئێستا هەر لەنێو گەردووناسییدا چەندان لق و پۆپی لێبۆتەوە، بەڵكو هەر فیزیا كە یەكێكە لە زانستەكانی گەردووناسیی، بۆ خۆی: فیزیای گەردیلەیی (الفیزیاء الذري)، فیزیای میكانیكیی، فیزیای نوێ ... چەندان لق و پۆپی لێ بۆتەوە، كیمیا بە هەمان شێوە، كەواتە: چار نیە دەبێ ئیشەكان بەپێی پسپۆڕیی و شارەزاییەكان، بەسەر چەند دامەزراوەیەكدا دابەش بكرێن، ئاوا لە ڕاستیدا ئیش و كارەكان ڕێكتر دەبن، هەڵبەتە ئێمە وێنەمان بە زانست هێنایەوە، بەڵام لێرەدا مەبەستمان پێی ئیشی ئیسلامیی و كاری ئیسلامیی و ئیدارییە.

## دووەم: دابەشكردنی كارەكان بەسەر تاكەكاندا بەگوێرەی لێهاتوویی و پسپۆڕیی و شارەزاییان:

ئەمیش دیارە شتێكی مەنتیقیی و ئاشكرایە، چونكە وەك عەلی كوڕی ئەبو تالیب ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ گوتوویەتی: (قِيمَةُ الْمَرْءِ مَا يُحْسِنُهُ) تاج العروس من جواهر القاموس، ج: (٣٤)، ص: (٢٣٢)، واتە: (نرخی مرۆڤ لەوەدایە كە بە باشیی دەیزانێ)، هەر بەڕاستی وایە، پیاوێكی زۆر چاك بێنە شتێكی پێ بسپێرە هی خۆی نەبێ، تێیدا سەركەوتوو نابێ و كەسایەتیی پێی دەشكێ، بەڵام وەرە ئیشێكی پێ بسپێرە، كە ئەو تێیدا سەركەوتوە، دەبینی تێیدا سەركەوتوو دەبێ و پێی بەرزدەبێتەوە، ئیشێكی پێ بسپێرە بە چاكیی ئەنجامی بدات جاری وا هەیە ئیشەكە لە خۆشی بچووكترە، مەرج نیە لە خۆی گەورەتر بێ، ئێستا من ئەمیری (كۆمەڵی ئیسلامیی)م، بەڵام هەندێك ئیش هەیە پێم بسپێردرێ تێیدا سەركەوتوو نابم، با لە منیش بچووكتر بێ، مەرج نیە مرۆڤ هەر لەبەر ئەوەی ئیشەكە لە خۆی گەورەترە تێیدا سەركەوتوو نەبێ، جاری وا ئیشەكە لە خۆی بچووكتریشە، بەڵام تێیدا

سەركەوتوو نابێ، چونكە تێیدا شارەزاو پسپۆڕ نیە، بۆیە بەڕاستی ئیش سپاردن بە خەڵك بەپێی پسپۆڕیی‌و شارەزایی زۆر گرنگە، كوردەواریی خۆشمان كە دەڵێن: (نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب)، ئەوانیش زانیویانە چیی دەڵێن، مرۆڤ پێویستە ئەو كارەی پێ بسپێردرێ كە لێی دەوەشێتەوەو دەتوانێ چاكی ئەنجام بدات، هەروەها پێشینان لەبارەی سپاردنی كار بە بابای ناشایستە گوتوویانە: (فیكە بە برای بێ لێو دەسپێرن!)، دیارە كەسێك لێوی نەبن فیكە (فیتوو)ی پێ ناكرێ!

ئینجا بێگومان هەر كەسێك كە خوا ﷻ دروستی كردوە، بە كەڵكی كارێك هەر دێ، خوا ﷻ هیچ كەسێكی دروست نەكردوە، بەكەڵكی هیچ شتێك نەیەت، هەر كەسێك تۆ بیگری بەكەڵكی شتێك هەر دێ، گرنگ ئەوەیە هەر كەسە ئەو ئیشەی پێ بسپێردرێ كە بۆی دەستدەدا.

هەروەك قسەیەكی خۆش بۆتان بگێڕمەوە: جارێك برایەكمان بە رەحمەتی خوا چووە لە شەڕی كەركوك (شەهید بوو)، خوا ﷻ پلەوپایەی بەرز بكاتەوە، پیاوێكی زۆر مسوڵمان‌و چاك‌و ساغ‌و پاك‌و بێگەرد بوو، كاتی خۆی لە نێو ئۆتۆمبیلێكدا كۆمەڵێك برا بووین، وەك بێتەوە یادم: مامۆستا (حەسەن بابەكر)و كاك (مەلا شەریف)ی رەحمەتی بوون، دوو سێیەكی دیكە بوون، باسی نەفەرێكیان كرد، باسی كەموكورتییەكانیان كرد، گوتیان: ئاواو ئاوایەو بەكەڵكی هیچ نایەت‌و ئەوانە، ئەو برایەش قسەیەكی جوانی كرد، گوتی: دەنا من رام جیایە، گوتیان: چۆن؟ گوتی: من دەڵێم بەكەڵكی شتێك هەر دێت، دەنا خوا ﷻ دروستی نەدەكرد!

وەڵامەكەی زۆر مەنتیقیی بوو، گوتی: مادام خوا ﷻ دروستی كردوە بەكەڵكی شتێك هەر دێت، جا دیارە هەر كەسە بەكەڵكی شتێك هەر دێت، بەڵام گرنگە تۆ ئەو شتەی بۆ بدۆزیەوە و، ئەو بوارەی بۆ بدۆزیەوە كە تێیدا سەركەوتوو دەبێ، كە ئەوەش ئەركی سەرشانی سەركردایەتییە، سەركردایەتیی دەبێ چاو وردبكاتەوەو

چاو بگێڕێ‌و تواناو ئامادەیی (إستعداد)ەكانی خەڵكی خۆی بزانێ، وە هەر كەسە كارێكی پێ بسپێرێ كە چاك دەتوانێ ئەنجامی بدات‌و تێیدا سەركەوتوو دەبێ، خوای پەروەردگار ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِ ...﴿٨٤﴾﴾.

توێژەرەوانی قورئان وشەی: (شَاكِلَتِهِ) بە زۆر شێوە مانایان لێداوەتەوە، هەندێكیان گوتوویانە: (عَلَى طَرِيقَتِهِ)، هەندێك گوتوویانە: (عَلَى سَجِيَّتِهِ)، هەندێكیدیكەیان گوتویانە: (عَلَى نَاحِيَتِهِ)، وە (رَاغِبُ الأَصْفَهَانِي) لەبارەی وشەی (شَاكِلَة)وە گوتوویەتی: (أَيْ عَلَى سَجِيَّتِهِ الَّتِي قَيَّدَتْهُ، وَذَلِكَ أَنَّ سُلْطَانَ السَّجِيَّةِ عَلَى الْإِنْسَانِ قَاهِرٌ حَسْبَمَا بَيَّنْتُ فِي الذَّرِيعَةُ إِلَى مَكَارِمِ الشَّرِيعَةِ، وَهَذَا كَمَا قَالَ ﷺ: كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ[1]) مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٤٦٢، ٤٦٣)، راغیبی ئەسفەهانیی وشەی (شَاكِلَة) بە (سَجِيَّة) لێكدەداتەوە، (سَجِيَّة) واتە: سروشت (فِطْرَة)، دەڵێ: {هەر كەسە بە شێوەیەك ڕەفتار دەكات‌و هەڵسوكەوت دەكات بەپێی ئەو سروشتەی كە بەستوویەتیەوە، (یانی: هەر كەسێك خوا ﷻ سروشتێكی پێداوە، (سَجِيَّة)و (طَبِيعَة)یكی پێداوە، وە ئەو سروشت‌و (سَجِيَّة) سنوورێك بۆ ئەو مرۆڤە دیاردەكات، جا قسەكەی جوانە، دەڵێ:) دەسەڵاتی سروشت (فِطْرَة)ی ئینسان لەسەر ئینسان زۆر بالادەستە، وەك لە كتێبی (الذَّرِيعَةُ إِلَى مَكَارِمِ الشَّرِيعَةِ)دا ڕوونم كردۆتەوە، وە ئەمەش وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەركەسە ئاسان دەكرێ بۆ ئەوەی كە بۆی دروستكراوە[2]، وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە}.

---

١) عن عمران قال: قلت: يا رسول الله، فِيمَ يَعْمَلُ العَامِلُون؟ قَالَ: (كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ)، رواه البخاري: (٧٥٥١).

٢) واتە: هەر كەسێك جۆرە ئیشێك دەكا، دڵی بەرەو شتێك وەردەچەرخێ، كە لەگەڵیدا دەگونجێ.

ئینجا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرموێ: {أَنْزِلُوا النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ} رواه أبو داود: (٤٨٤٢)، وقال الألباني: ضعيف. شایانی باسیشە ئەم فەرموودەیە (مسلم) لە سەرەتای (صحيح)ەكەیدا بە (مُعَلَّقْ)ی ئاوای هێناوە: {وَذُكِرَ عَنْ عَائِشَةَ رضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُنَزِّلَ النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ} صحيح مسلم- المقدمة ص: (٦)، واتە: (لە دایكی بەڕێزمان عائیشە دایكی ئیمانداران گێڕدراوەتەوە خوا لێی رازی بێ، كە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێكردین كە خەڵكی لە شوێنەكانی خۆیاندا دابنێین)، لە چ سیاق و مەقامێكدا دایكمان عائیشە خوا لێی رازی بێ ئەوەی گوتوە؟ بەسەرهاتێك هەیە ئەوە روون دەكاتەوە كە أبو داود هێناویەتی: {عَنْ مَيْمُونِ بْنِ أَبِي شَبِيبٍ رَحِمَهُ الله أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا مَرَّ بِهَا سَائِلٌ فَأَعْطَتْهُ كِسْرَةً، وَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ عَلَيْهِ ثِيَابٌ وَهَيْئَةٌ فَأَقْعَدَتْهُ فَأَكَلَ، فَقِيلَ لَهَا فِي ذَلِكَ، فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنْزِلُوا النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ} رواه أبو داود: (٤٨٤٢)، وقال الألباني: ضعيف، واتە: {مەیموونی كوڕی شەبیب[1] رەحمەتی خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە كە دایكمان عائیشە سواڵكەرێك بە لایدا تێپەڕیوەو پارچە نانێكی داوەتێ، دوای ئەو پیاوێكی دیكەی بە لادا تێپەڕیوە، بەرگ و پۆشاكێكی لەبەربووەو هەیئەتێك و قەدو قیافەیەكی هەبووە، فەرمووی لێ كردووەو دایینیشاندووەو خواردنیان بۆ داناوەو خواردوویەتی، پاشان بەڕێی كردوە، جا لەوبارەوە پرسیاری لێ كرا، (یانی بۆچی ئەویان پارچە نانێكی داوەتێ و بەڕێی كردوە، ئەوەشیان دایینیشاندو رێزی زیاتری لێ گرت؟) ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵكی لە شوێنی خۆیاندا دابنێن}، واتە: ئەوەی پێشتر سواڵكەرێك بوو هەر ئەوەندەی چاوەڕوانیی هەبوو، هەر چاوەڕێی پارچە نانێكی

---

١) مەیموون لە زمانی عەرەبیدا، واتە: پیرۆز، هەرچەندە لە زمانی كوردیدا ناوی ئەو ئاژەڵەیە كە دەیزانین.

دەكرد، چاوەڕێی شتێكی دەكرد بیدەمیٚو بڕوا، خوا دەزانیٚ ڕۆژانە چەندی وا دێن، دەكریٚ هەموویان دەعوەت بكەی؟ بەڵام ئەوەی دیكە بەرگو پۆشاكێكی لەبەردابووە، ڕەنگە ڕێبوارێك بووبیٚ یەكەم جاری بوو بیٚ، ئەوە ئەگەر بیٚو پارچە نانێكی بداتیٚ، بە سووكایەتیی پێكردن (إهانة)ی دەزانیٚ، دەڵیٚ: خۆ من سواڵكەر نیم، من ڕێبوارێكم ئەگەر پارەوە نانێكم بدەنیٚو تۆزیٚ ڕێزێكم لێبگرن، ئەوە دادەنیشم، ئەگەر نا هەر پارچە نانێكی بدەیتیٚو بەڕیٚی بكەی، ئەوە بە سووكایەتیی پێكردنی دەزانیٚ! چاوت لێیە؟ كەواتە: هەر كەسە دەبیٚ وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بكریٚ، چەند جوانە! هەر كەسەو لە شوێنی خۆیدا دابنریٚ، هەر كەسە بزانە بەكەڵكی چی دیٚو چ شتێك باش دەزانیٚو چ شتێكی باش لەبەر دەڕوا، ئەو ئیشەی پیٚ بسپێرەو لەو شوێنەدا دایبنیٚ، كەواتە: دەبیٚ ئێمە لە بواری كاری ئیسلامییدا هەر كەسەو وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بكەین.

**سێیەم: دەستوەرنەدانە كاری یەكدی مەگەر بەشێوەی هاوكاریی:**

بەڕاستی ئەمیش عەقڵو مەنتیق دەیخوازنو، زۆر گرنگە كە ئۆرگانەكانو دامەزراوەی نووسینگەكانو مەڵبەندەكانو دەزگایەكان، دەستوەرنەدەنە كاری یەكدی، كوردەواریی خۆمان لەوبارەوە پەندێكیان داناوە دەڵیٚ: (فلان كەس لە هەموو دیزان دەبێتە ئەسكویٚ). ئەسكویٚ یانی كەوچكی گەورە، كاتی خۆی هەبووە، بە كەوچكی داریان گوتوە، بەڵیٚ نابیٚ ئینسان خۆی لە ئیشی خەڵكی دیكە هەڵقورتێنیٚ.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ} رواه الترمذي: (٢٣١٧)، وابن ماجه: (٣٩٧٦)، وقال الألباني: صحيح. واتە: (لە چاك مسوڵمانەتیی ئینسان ئەوەیە كە شتێك پەیوەندیی پێوەی نیە، وازی لیٚ

بهێنێ)، واتە: خۆی تێ هەڵنەقورتێنێ، کە دیارە ئەمە زۆر شت دەگرێتەوە، عەرەب بەو جۆرە کەسانەی خۆ لە شتی هەڵدەقورتێنن، دەڵێن: (فُضُولِي)، کە بەڕاستی خۆ لە ئیش‌و کاری خەڵکەوە هەڵقورتاندن شتێکی خراپە، جا خۆ تێهەڵنەقورتاندن‌و دەستوەرنەدانە کاری یەکدی، زۆر گرنگە، بۆچی؟ بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە ئیشەکەی لێ تێکنەچێ، بەهۆی ئەوەوە کە هەرکەسێك هات‌و لێی ببێتە کارزان‌و وەستا، بۆ وێنە: کابانێك چێشتێکی لێدەنێ، بۆ خۆی خوێی تێدەکات، ئەگەر کچەکەی هەندێکی تێبکا و، میوانەکەیان هەندێکی تێبکاو بڵێ: ئەوە لەبیریان چووە، بێگومان دەبێتە خوێیاوك! وەك واقیعیش جاری وا بووە، چێشتی وا لێنراوە لەبەر سوێرییان نەخوراوە، چونکە دوو سێ کابان هەبوونە، هەر یەکەی هەندێکی خوێ تێکردوە، یان جاری وا هەیە چێشتەکە بێ خوێ دەردەچێ، لەبەرئەوەی هەرکامێکیان وادەزانێ ئەوەی دیکە خوێی تێکردوە.

دەڵێن کابرایەکی ڕەشۆکیی (عَوَام) هەبووە، گوتوویانە: بەڵگەت چییە لەسەر بوونی خوا ﷻ؟ گوتوویەتی: بەڵگەم ئاشی مام ئاودەلییە[1]، چونکە تا مام ئاودەل خۆی مابوو ئاشەکەی جوان دەگەڕا، بەلام لەگەڵ وەفاتی کردو کەوتە دەست کوڕەکانی، هەر یەکەیان خۆی لێ کردە وەستاو، ئاشەکە تێکچوو، واتە: خوای بەرزو مەزنیش هەیەو تەنهایەو بوونەوەر یەك وەستای هەیە، یەك مشوورخۆری هەیە، بۆیە وەك کاتژمێر دەگەڕێ‌و کەم‌و کوڕیی تێدا نیە، جا ڕاستە هەر ئیشێك بێ سەر بوو، یان سەری زۆر بوون، تێکدەچێ.

بەلام ئەوە ڕێگا ناگرێ لەوە کە ئۆرگانەکان‌و خەڵکە مشوورخۆرەکان هاوکاریی یەکدی بکەن، بێگومان بەشێوەی هاوکاریی حوکمەکەی جیاوازەو ناشبێتەهۆی بێ

---

١) مام ئاودەلێك هەبووە ئاشێکی هەبووە.

سەرەوبەرەیی و ناڕێكوپێكیی، مرۆڤ جاری وا هەیە ئیشێكی لەبەردەست دەچەقێ و بە تەنیا خۆی پێی هەڵناسووڕێ، قەیناكات ئەوانی دیكە هاوكاریی بكەن و دەستباری لەگەڵ بگرن، بەڵكو ئەوە چاكەو هەندێك جار پێویستیشەو ئایەتی خوا ﷻ جێبەجێ دەكەن، كە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿... وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ ...﴿٢﴾﴾ المائدة. واتە: (...وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەو پارێزكارییو، دەستبار بۆ یەكدی مەگرن لەسەر گوناهو شەڕفرۆشتن ...).

بەڵام ئەگەر بێو بەبێ ئاگاداری یەكدی بێو، هەر كەسە خۆی لە ئیشوكاری ئەوی دیكە هەڵقورتێنێو دەستی تێوەربدا، ئەوە ئیشەكە تێكدەچێ.

خوای پەروەردگار ﷻ لەو كەسانەمان بگێڕێ كە بەو شێوەیە بجووڵێینەوەو فەرمانو كارەكان ئەنجام بدەین، كە بۆ خۆی پێی خۆشەو بۆ دینەكەی قازانجەو بۆ مسوڵمانان باشە، بۆ ئەوەی هەم بەرەكەتو بەرهەمو پێزی دنیاییمان هەبێ و، هەم پاداشتی دوارۆژیشمان هەبێ.

# بنەمـای دوازدەیەم

**بێئـاگانەبوون لەو راسـتییە کە:**

**کۆمەڵی ئیسـلامیی کۆمەڵێکـە لە مسـوڵمانان و،**

**ئامرازێکـە بۆ خزمەتی ئیسـلام و مسـوڵمانان و،**

**هـەق و راسـتیی لەسـەر تـا پۆنەکـراوە.**

# بنەمـای دوازدەیـەم

## بێئاگـانەبوون لـەو راسـتییە کـە:

## کۆمـەڵی ئیسـلامیی کۆمەڵێکـە لە مسـوڵمانانو، ئامڕازێکـە بـۆ خزمـەتی ئیسـلام و مسوڵمـانـان و، هـەق و راسـتیی لەسەر تـا پۆنەکـراوە.

کۆمەڵی ئیسلامیی خۆی بە کۆمەڵێك لـە مـسوڵمانانو هۆكـار (وسـيلة)ێـك بۆ خزمەتی ئیسلامو مسوڵمانان دادەنێو، خـودی خـۆی ئامـانج نیـە، نـە پێـی وایـە مـسوڵمانانی تێـدا کـورت هەڵهـاتوونو، نـە پێـشی وایـە حـەقو راسـتیی لەسـەر تاپۆکـراوە، چـاکیی‌و خراپیـشی پەیوەسـتە بـە راددەی دینـدارییو پابەندیی بە شـەریعەتی خـوا وە، یان لـێ لادانـی، بـەڵام دەبـێ لـەو راسـتییەش دڵنیابین کە پابەندیی راست و دروست بە شەریعەتی خواوە بەبێ:

أ- چاك لێتێگەیشتنی شەریعەت "قوڕئان و سوننەت" و پێدا قووڵبوونەوەی.

ب- راست خوێندنـەوەی واقیـع و بـاش پـێ ئاشـنابوونیو تێـدا بەرچـاوڕوون بوونی، دەستەبەر نابێ.

وەك:

١- خـوای بەخـشندەو بـە بـەزەیی ﷻ فەرموویـەتی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ فـصلت، واتـە: (وە قـسەی کـێ لـە قـسەی کەسـێك چاکتـرە کـە بـەرەو لای خــوا بانگـەواز دەکـاتو، کردەوەی باش ئەنجام دەداتو دەڵێ: من لە مسوڵمانـانـم)؟

٢- هەروەها خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾ آل عمران، واتە: {وە با لەنێو ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن (یاخود ئێوە كۆمەڵێك بن)، بانگەواز دەكەن بۆ لای چاكەو فەرمان بە هەرچی شتی پەسندە دەكەنو ، ڕێگریی لە هەرچی شتی ناپەسندە دەكەن، هەر ئەوانەش سەرفرازن}.

٣- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢﴾﴾ المائدة، واتە: (... وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی، وە هاوكاریی یەكدی مەكەن لەسەر گوناهـ و دەستدرێژیی، وە پارێز لە خوا بكەن، بێگومان خوا تۆڵەی توندە).

٤- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ ...﴿١١٠﴾﴾ آل عمران. واتە: (ئێوە باشترین كۆمەڵن كە دەرهێنراونو پەیداكراون بۆ مرۆڤایەتیی، فەرمان بە شتە پەسندەكان دەكەنو ڕێ لە شتە ناپەسندەكان دەگرن، وە ئیمان بە خوا دێنن ...).

٥- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي ۖ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ یوسف، واتە: ﴿بڵێ: ئەمەیە ڕێبازی من كە لەبەر ڕۆشنایيو شارەزایی داو بە بەرچاوڕوونییەوە بانگەوازی خەڵك دەكەم بۆ لای خوا، خۆم و ئەوانەش كە شوێنم كەوتوون، وە پاكیی بۆ خوا (كە خەڵكی بۆ لای غەیری ئەو یان بە نەشارەزایی بانگ بكەم) وە من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم﴾.

## ڕوونکــردنەوە:

خــوا ﷻ پــشــتیوان بــێ ئێمــە لــە پێــنج خاڵـــدا ئــەم بنــەمای دوازدەیەمــە ڕوون دەکـــەینەوە:

### یـــــەك: کۆمەڵـــبوونی مـــسوڵمانانو هاوکـــاریی پێکەوەکردنیـــان، بـــۆ بانگــەوازو فەرمان بە چاکــەو ڕێگــریی لە خراپە، فــەڕزە:

فەڕزە مسوڵمانان کۆ بن، بۆچی کۆمەڵ بن؟ بە گشتی بۆ ئەوەی کە بتوانن دینــی خوا ﷻ بەرپا بکـــەن، چونکـــە خوا ﷻ فـــەرمانی پــێ کــردوە، وەك دەفــەرموێ: ﴿... أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ...﴿١٣﴾﴾ الـشوری، واتــە: (... دیــن بــەرپا بکەنو، تێیدا پەرتەوازە مەبن ...). وە بەشێك لە بەرپاکردنی دین، لە ســێ شــتاندا بەرجەستە دەبێ:

أ/ بانگــەواز: واتــە بانگــەوازی خــەڵك بــۆ ئیــسلام، ئیــسلام بــە عەقیــدەو بــە شــەریعەتیەوە.

ب/ وە فەرمان کردن بە چاکــە.

ج/ وە ڕێگرتن لە خراپــە.

ئەم ســێیە، خوا ﷻ وەك لە ئایــەتی ژمــارە (١٠٤)ی ســوورەتی (آل عمــران)دا فەڕزی کردوە لەسەر مسوڵمانان، کە دەبێ کۆمەڵێکـــیان لـەنێودا هـــەبن بــەو ســێ ئەرکە هەڵسن.

یـاخود کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ آل عمـران. ئەگـەر بڵـێین: وشەی: لە (مِـنْ) بۆ دابڕینی بەشێك (تبعيضي) نیە، چونکە (مِنْ) دەگونجێ (مِـنْ)ی (تبعيضية) بێ، واتە: لەنێو ئێوەدا با هەندێك هەبن، ئەم سێ ئەرکە ئەنجام بدەن، بەڵام دەشگونجێ بڵێین: (مِنْ)ی ڕوونکردنەوە (بيانية)یە، نەك بۆ دابڕینی بەشێك، کەواتە: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ﴾، واتە: (ئێوە کۆمەڵێك بن کە ئەم سێ سیفەتەتان تێدا هەبن).

بە هەردوو لێکدانەوە (تفـسیـر)ەکـان، لەسـەر مـسوڵمانان فـەرزە کەسـانێکیان لەنێودا هەبن، ئەم سێ ئەرکە ئەنجام بدەن:

أـ بانگەواز بۆ چـاکە (خیـر)، ﴿يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ﴾، چـاکەش هـەمووی لـە ئیسلامدایە، جا چ ڕاستەوخۆ ڕایگەیاندبێ، چ ناڕاستەوخۆ بیخـوازێ، وەك لە داهاتوودا زیاتر تیشکی دەخەینەسەر.

بـ ﴿وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾، (الْمَعْرُوف) ئەلیفو لام (أل)ی ناساندن (تعريف)ی لەسەرە کە مانای (جنس) دەگەیەنێ، ئینجا ئایا هەموو شتێکی چاكو پەسـند لەچیدایە؟ بێگومـان ئەوەیـە کـە شـەریعەت فـەرمانی پێکـردوەو، بێگومـان عەقڵیش هەموو شتێکی شەریعەت پەسند دەکات.

جـ ﴿وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ﴾، (الْمُنكَر)یـش ئـەلیفو لام (أل)ی (جـنس) ی لەسـەرە، شـتە ناپەسـندەکان چـین؟ ئەوانـەن کـە لەگـەڵ شـەریعەت تێکدەگیرێنو، بێگومان هەرچی شەریعەتیش ڕەفزی بکات، عەقڵو فیترەتی ساغو سەلیمیش ڕەفزی دەکەن.

كەواتە: لەسەر مسوڵمانان فەرزە ئەو سێ ئەركە ئەنجام بدەن: (بانگەواز بۆ لای چاكە كە ئیسلام سەرچاوەكەیەتی، فەرمان بە شتە پەسندەكان بكەن، ڕێ لە شتە ناپەسندەكان بگرن).

دوایـیش خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، واتـە: سەرفرازیی ئۆممەتی ئیسلام بەستراوەتەوە بە هەبوونی كۆمەڵێك (یان ئـەوەتا خۆیـان كۆمەڵێك بن) كە ئەو سێ ئەركە ئەنجام بدەن.

وە ئەگەر تەماشای واقیعیش بكەین، هەر وای دەبینین: كاتێك هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ وە نەوە (جیل)ەكانی دوای ئەوان، چونكە بەڕاستی بـانگی خـەڵكیان دەكرد بە قسەو بە كردەوە، بە زمانی حاڵو كردار، پێش زمانی قـسەو وتـار بـانگی خەڵكیان بۆ خێرو چاكە دەكـردو خـەڵكیان لـە دینـی خـوا ﷻ نزیـك دەخـستەوە، خەڵكیان بەرەو باوەشی ئیسلام بانگ دەكرد، تەماشا دەكەین هەم لە دنیادا سەرفرازو بەختەوەرو سەربەرز بوون، هەم لە دواڕۆژیشدا و، دیـارە سـەرفرازیی دواڕۆژیـش بەرهـەمی سـەرفرازیی دنیایـەو ئـەوەی لـە دنیـادا بـەهۆی شـوێنكەوتنی دینـەوە بەختەوەریی‌و سەرفرازیی بەدەست نەهێنابێت، لە قیامەتیش بەدەستی ناهێنێت‌و لێرە چیت چاندبێ، لەوێ ئەوە دەدوورییەوە.

وە كـە لێـرەدا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، واتـە: سەرفرازیی مسوڵمانان‌و بەختەوەرییان‌و سەركەوتنیان، بەستراوەتەوە بەوەوە كە ئەو سێ ئەركە ئەنجام بدەن.

هەروەها ئایەتی (٣٣)ی سووڕەتی (فصلت)یش كە دەفـەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٣٣﴾ فـصلت،

مانای وایە ئێمە لەسەرمان پێویستە كە باشترین قسە بكەین، وە دیارە كەسانێكیش باشترین قسە دەكەن، كە باشترین كەس بن.

هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ . . . وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾ المائدة.

دەتوانین زۆر دەقی قورئانو سوننەت لەسەر ئەوە بێنینەوە كە كۆمەڵ بوونی مسوڵمانانو هاوكاریی پێكەوە كردنیان بۆ بانگەواز كردنو فەرمان بە چاكە كردنو ڕێ لە خراپە گرتن فەڕزە، بەڵام بەوەندە ئیكتیفا دەكەین[1].

## دوو: خەڵك بانگكردن بۆلای خوا ﷻو لە خوا نزیك خستنەوەیان، گەورەترینو چاكترین كارە:

بە بەڵگەی هەردوو ئایەتی پێشوو، ئایەتی ژمارە (١٠٤)ی سوورەتی (آل عمران) كە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، كەواتە: شتێك ئینسان پێی سەرفرازو بەختەوەر بێو، پێی لە خەم بڕەخسێو بە مراد بگا، مانای وایە شتێكی زۆر گەورەیە.

---

١) چونكە ئێمە لە كتێبی: (ئیسلامو مسوڵمانەتییو كاری ئیسلامیی لەژێر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا)، بە درێژیی (تفصیل) باسی ئەو بابەتەمان كردوە، هەروەها نامیلكەیەكیشمان لەوبارەوە نووسیوەو چاپو بڵاویش كراوەتەوە بە ناوی: (كاری ئیسلامییو ڕەواندنەوەی تەمومژی چەند گومانو تۆمەتێك).

هەروەهـا ئایەتی ژمارە (٣٣)ی سوورەتی (فصلت)یش کە خـوای پەروەردگـار ﷻ تێیـدا دەفـەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾، کەواتە: دیارە بانگەواز بۆ لای خوا ﷻ گەورەترین کـارە.

**سـێ: هەرکەسێك قسـەکانی بـە کـردەوە تەرجەمـە نەکـات، هـیچ بـە هـیچ ناکات لە بواری کاری ئیسلامییدا:**

خوشك‌و برا خۆشەویستەکانم! زۆر گرنگە ئینسان ئاگای لە خۆی بێ‌و قسەیەك نەکا کە نەتوانێ بە کردەوە بەرجەستە (تجسید)ی بکـات، بۆچـی؟ چـونکە تـۆ ئـەو قسـەیە کە دەیکەی ئەگەر خەڵك بۆ شتێکی چاك بانگ دەکەی، مادام پێت چاکە لـە پێشدا بۆ خۆت ئەنجامی بدە، سەرەڕای ئەوە، لێکجیایی قسەو کردەوە، یەکێکە لـە نیشانە زەقەکانی خەڵکی دڵ نەخۆش‌و دوو ڕوو (منـافق)و دەغەڵ، کە خـوا ﷻ لە چەندان ئایەتی قوڕئانی بەپێزدا باسی کردوە، کە دەغەڵ (منـافق)ەکـان درۆدەکـەن، دوو ڕوون، لێرە شتێك دەڵێن‌و لەوێ شتێکی دیکە دەڵێـن، شتێك دەڵێن کـردەوەی پێناکـەن، بەتایبەتی لە سەرەتای سـوورەتی (الـصف)دا کـە دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾﴾، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە! بـۆ شـتێك دەڵـێن کـە کردەوەی پێ ناکەن؟ گەورەترین گوناهە لای خـوا کـە شـتێك بڵـێن کـردەوەی پـێ نەکەن). یەکێك بۆی هەیـە بڵێ: جا خۆ خـوا ﷻ لێرە بە ئیماندار نـاوی هێنـاون! بۆیە زانایان دوو تەفسیرو تەئویلیان بۆی هەیـە:

واتە: (ئەی ئەوانەی کە لەنێو ئیمانداراندان)، بە واتایەکی دیکـە، واتـە: (ئـەی ئەوانەی خۆتان بە ئیماندار ناساندوە).

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئەوانە بـە شـێوەیەکی جـوزئیی قـسەیان هـەبووە کـە پێچەوانەی کردەوەیان بووە، واتە: لە هـەموو شـتێکدا نـا، دەشـگونجێ مـسوڵمان گیرۆدەو گرفتار (مُبْتَلى) بێ بەوەوە، کاتێك کە ئیمانی لاواز دەبێ.

بەڵام ئەگەر بێو لە هەموو شتێکدا، یاخود لە ئەسڵی عەقیدەداو لە ئەسڵی دینـدا ئیعلانی مسوڵمانەتیی بکاتو کردەوەشی پێـچەوانە بـێ، ئـەوە دیـارە کـە دوو ڕوو (منافـق)ێکە ناوونیشان (عنـوان)ی ئیمان نایگرێتەوە، بەڵام دیارە ئەوانە لە هەنـدێك ئاکارو ڕەفتاردا بەو شێوەیەن.

جا بەڕاستی ئەوە کە ئینسان قسەکەی بـە کـردەوە تەرجەمـە بکـاتو لـە خۆیـدا بەرجەستەی بکات، زۆر گرنگە، بۆیـە خـوای بـەرزو مـەزن دەفـەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ...﴿٣٣﴾﴾ فصلت.

وە لە هەموو ئایەتەکانی (قوڕئـان)دا، لـە نزیکـەی (٦٠) شـوێن زیـاتر ئیمـانو کردەوەی چاك (الإيـمان والعمل الصالح) پێکـەوە هـاتوون، لێرەدا: ﴿دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾، واتـــە: (بانگــەواز بــۆ لای خــوا دەکــاتو کــردەوەی چــاك دەکات)، چونکە ئەگەر کردەوەی چاك نەکەیو هەر بە قسە خەڵك بۆ لای خوا ﷻ بانگ بکەی، بە کردەوە خەڵك لە دین دووردەخەیەوە، خەڵك بـە دەنگتـەوە دێـت، بەڵام کاتێك کە کردەوەکانت دەبینێ دەسـڵەمێتەوە!!

پێشینان لەو بارەوە پەندێك دەڵێن، هەڵبەتە ڕەنگە هەندێك کەس پەندەکەیان پـێ زەق بێ، بەڵام من پێموایە پڕ بە پێستی کەسانێکە کە دوورکوژی نزیـك خەسـارن،

قسەی جوانیان هەیە، بەڵام کردەوەیان وێرانە، کوردەواریی دەڵێن: (بە بۆنی کەبابەوە چووبوو، کە چوو کەر داغکردن بوو)! بێگومان کەریش داغ بکەی هەر بۆنی دێ، بۆیە کابرا وایزانیوە بۆنی کەبابە، بەڕاستی هەندێك کەس هەیە لە مەیدانی کاری ئیسلامییدایە، قسەی باش و بەجێیە، کە گوێ لە قسەی دەگری، دەڵێی: ئەوە دەبێ کێ بێ؟! ئەوە دەبێ چیی کردبێت؟ ئەوە دەبێ هەموو دنیای چاك کردبێت، بەڵام دوایی کە تەماشای دەکەی و لێی ورد دەبیەوە، نەخێر، دوورکوژی نزیك خەسارە! قسە جوانی کردەوە وێرانە، ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێرانە، خوای بەرزو مەزن پەنامان بدا، بەڕاستی دەبێ زۆر وریا بین.

## چوار: کۆمەڵ و لایەنێکی ئیسلامیی نابێ خۆی جیا لە مسوڵمانان حیساب بکات و خۆی لە مسوڵمانان جیابکاتەوە:

ئەویش خوای پەروەردگار ﷻ لە ڕستەی کۆتایی ئایەتی ژمارە (٣٣)ی سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾.

بێگومان قورئان هەتا لێی وردبیەوە، مانای زیاترت بەدەستەوە دەدا، ئێمە ئێستا زۆر چاك دەزانین بۆچی خوا ﷻ ئەو ڕستەیەی سێیەم: ﴿وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ی لە دوای ئەوە باسکردوە.

لە مەیدانی کاری ئیسلامییدا ئەگەر ئینسان لە خۆی وریا نەبێ، خۆی جیادەکاتەوە لە خەڵك، خۆی دادەبڕێ لە مسوڵمانان، خۆی جیادەکاتەوە لە میللەتەکەی خۆی و، سەرەنجام پەردەو نێوانێك دەخاتە نێوان خۆی و خەڵکەکەیەوەو، لەجیاتی ئەوەی خەڵك لێی بەهرەمەند بن، لێی دەسڵەمنەوە، وە

لەجیاتی ئەوەی لێی نزیك ببنەوە، لێی دووردەکەونەوە، بۆیە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾، چـونکە ئێمـە هەرچـەند کـردەوەی بـاش بکـەین، هەرچەند خەڵك بۆ لای خوا ﷻ بانگ بکەین و دڵسۆزیان بین، بـەڵام نـەك هـەر بـە قسە، بەڵکو نابێ هەر لە قەناعەت و دەروونیشماندا وابێ کە خۆمان پـێ لـە خـەڵك چاکتر بێ.

خۆ پێ چاك بوون خراپە، بەڵام ئەسڵی چاك بوون باشە، خوای بەرزو مەزن لـە باسی تەزکیەدا نەهی کردوە، لەوانەی بە قسە خۆیان تەزکیـە دەکـەن، دەفـەرموێ: ﴿... فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾﴾ النجم، واتە: {... جا (بە قسـە) تەزکیەی خۆتان مەکەن، ئەو – خوا ﷻ ـ زاناترە بەوەی پارێـز دەکات}، ئەگـەرنا لە شوێنی دیکە دەفـەرموێ: ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾ الشمس، واتە: (وە سوێند بە دەروونی مرۆڤـ و بەو زاتەی بە ڕێکـوپێکیی دروسـتی کـردوە، ئینجـا بـەدکاریی و پارێزکاریی بۆ ڕوونکـردەوە، بێگومـان سـەرفرازە ئـەو کەسـەی دەروونـی خـۆی پاککردەوە، وە بێگومان نائومێدە ئەو کەسـەی دەروونـی خـۆی ئـاڵوودەی گونـاەو تاوان کرد)، کەواتە بە کردەوە تەزکیەی خۆ کردن کارێکی باشـە، بـەڵام ئەگـەر بـە قسە خۆت تەزکیە بکەی و خۆت بە چاك نیشان بدەی، ئەوە نەهی لـێ کراوە.

هەروەها خوای بەرزو مـەزن دەفـەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ...﴿٤٩﴾﴾ النساء، واتە: (ئایا تەماشای ئەوانە ناکەی –جوولەکەو گاورەکانـ کە پاکانە بۆ دەروونی خۆیان دەکەن؟ بەڵکو خوا هـەر کەسـێك ویـستی لەسەربوو، بۆ خۆی دڵ و دەروونی پاك دەکاتەوە ...)، لەم ئایەتەدا مەبەسـتی پـێی

تەزکیەی بە کردەوە نیە، بەڵکو مەبەستی پێی ئەوانەیە کە بە قسە خۆیان چاك پێشاندەدەن‌وبە شان‌و باڵی خۆیان هەڵدەڵێن بە راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، کە ئەوە خراپە، بەڵام بە کردەوە خۆت چاك بکە، سەرفرازی.

جا ئێمە دەبێ وریابین خۆمان لە مسوڵمانان دانەبڕین، ئەگەر رەخنەو گلەییشمان لە مسوڵمانان، لە واقیعێك هەبێ، کە تێیدا دەژین، بەڵام هەر بەشێکین لە مسوڵمانان.

هەڵبەتە ناحەزانی ئیسلام‌و تەوژمی ئیسلامییش، زۆرجار ئەوە دەکەنە دەستەچیلەو بیانووی شەڕ پێ فرۆشتنی ئیسلامییەکان‌و تەوژمی ئیسلامیی، کە: ئەها هەر خۆیان پێ مسوڵمانەو خەڵکیان پێ مسوڵمان نیەو خۆیان جیادەکەنەوەو خۆ پەسندن! کە بەڕاستی ئەوە خراپەو ئێمە نەك لەبەرئەوەی خەڵکی عەلمانیی وا نەڵێن، بەڵکو هەر لەبەرئەوەی خوای بەرزو مەزن نەهی لێکردوە، کە ئێمە خۆمان لە مسوڵمانان جیابکەینەوە، نابێ خۆمان جیابکەینەوە، چونکە ئێمە هەر بەشێکین لە مسوڵمانان.

## پێنج: چاکیی‌و خراپیی بە کاکڵ‌و جەوهەری مسوڵمانەتییە، کە ئیمان‌و کردەوەی باشە، نەك بە ناوونیشان‌و رواڵەت:

تەماشا بکەن خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (١١٠)ی سوورەتی (آل عمران)دا روو لە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ... ﴿١١٠﴾﴾[1] آل عمران.

---

١) کە دیارە دوێنراوی یەکەم بەم ئایەتە، پێغەمبەر ﷺو هاوەڵە بەڕێزەکانی بوون -خوا لێیان رازی بێ-، بەڵام دوای ئەوانیش هەموو ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەگرێتەوە.

ئەو کاتەی من لە زیندانی ئەمریکاییەکان بووم، ڕۆژێك لەگەڵ ژمارەیەك لە بەرپرسانی ڕژێمی پێشوو وتووێژمان بوو، ئەوان گوتیان: جا خۆ هەر شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە دیارە عەرەب چاکترن لە غەیری عەرەب، چونکە ئەوە نیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ﴾؟ ئەوە هەر ئاشکرایەو هیچ گومانی تێدانیە کە عەرەب لە عەجەم چاکترن، منیش گوتم: نا، ئێوە تەماشای پێش ئایەتەکە بکەن و تەماشای پاش ئایەتەکە بکەن، ئەوکاتە دەزانن کە ئەو تێگەیشتنە بەدەستەوە نادا، گوتیان: چۆن؟ گوتم: سەرەتای ئایەتەکان هەمووی باسی ئیمانداران دەکات، وە دوایش دەفەرموێ: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ ...﴿١١٠﴾﴾ آل عمران، واتە: (ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ خەڵکی پەیداکراون، فەرمان بە شتە پەسندەکان دەکەن و ڕێگریی لە شتە ناپەسندەکان دەکەن و بڕوا بە خوا دێنن ...)، وەك دەبینین خوای کاربەجێ وەك ڕوونکردنەوەی هۆکارو پاساوی چاکتر بوونی ئۆممەتی ئیسلام، نافەرموێ: لەبەرئەوەی کە ئێوە عەرەبن، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو سێ سیفەتەتان تێدان، جا دیارە ئیمان بە خوا بناغەیە، بەڵام خوا ﷻ خستوویەتە دوایی، تاکو لێمان حاڵی بکات کە ئیمان کاتێك سەنگ و قورسایی و (إعتبار)ی هەیە، کە خاوەنەکەی وا لێبکا لەگەڵ شتی پەسند دابێت و دژی شتی ناپەسند بێ، جا گوتم هەر کەسێك ئەو سێ سیفەتەی تێدابن، ئا ئەوە باشترین کۆمەڵ (خَيۡرَ أُمَّةٍ)ە، جا عەرەبە، عەجەمە، کوردە، تورکە، فارسە... هتد، هەڵبەتە دوای ئەوەی کە بۆم ڕوونکردنەوە، سەلماندیان.

جا بەڕاستی ئەوە خاڵێكی زۆر گرنگە كە ئێمە بزانین چاكیی بە كاكڵو جەوهەری مسوڵمانەتییە كە ئیمانو كردەوەی باشە، یاخود پێچەوانەكەیەتی بۆ خراپیی، نەك بە ناوونیشان.

ئێمە پێمان دەڵێن: كۆمەڵی ئیسلامیی، نابێ هەر بڵێین: ئێمە ئیسلامیی نین؟ كەواتە: ئێمە لەبەرئەوەی كە ئیسلامیین، هەر چۆن بێ لە خەڵكی دیكە باشترین كە ناویان ئیسلامیی نیە!! ئەوە زۆر زۆر شتێكی هەڵخەڵەتێنەرە، هەر ئەو جۆرە بیروبۆچوونە هەڵەیەشە وای لە مسوڵمانان كردوە، كە زۆرجار دەست بە خۆیاندا بەردەنەوەو وای لە زۆر چینو توێژی مسوڵمانان كردوە، كە لە كردەوەی باش دوابكەون، بۆ وێنە: سەیدو شێخو ئەوانەی خۆیان بە خزمی پێغەمبەر ﷺ دەزانن، دەڵێن: جا خۆ بەچكە سۆنە فێری مەلەیە، مادام سەیدو شێخە، ئەوە هەر یەك ڕێ دەچێتە بەهەشت، یان شتێكی هەڵبەستراو دێنن دەڵێن: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: چاكەكان بۆخۆم دەیانبەمە بەهەشتێ -خزمە چاكەكانی پێغەمبەر ﷺ- ، خراپەكانیش بە پێغەمبەر ﷺ دەبەخشم! واتە: یەكیان لێ نامێنێ سەیدو شێخ بە چاكو خراپەوە هەموو بۆ بەهەشتێن! بەڵام كوا شتی وا لە كوێدا هەیە؟ ئەوە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ دەفەرموێ: {... وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ} رواه مسلم: (٢٦٩٩)، واتە: (... هەر كەسێك كردەوەی دوای بخا، ڕەچەڵەكی پێشی ناخا)، بەڵێ لەگەڵ خوا ﷻ هیچ نەسەبێك نیە جگە لە نەسەبی تەقوا، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ...﴿١٣﴾﴾ الحجرات. واتە: (... بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزكارترتانە ...)، كێ تەقوای زۆربێ، حورمەتی لە لای خوا ﷻ زۆرترە، دیارە ئەو بیرۆكە نەفامییە لەنێو زۆر لە گەلانی دنیادا هەیە، بۆ وێنە: لە هیندستان دا، هەتا لە كتێبی (كۆماری

ئەفلاتوون)یشدا هەیە، دەڵێ: خەڵکە فەیلەسووفەکان وەك زێڕ وان و، پادشـایەکان وەك زیو وانو، سەربازییەکان وەك ئاسن وانو، خەڵکی دیکەش وەك گـڵو لەتکـە گۆزەو شتی وا وایـە!

بەڵام لە راسـتیدا ئەوە هەمووی هەڵەیـەو، بـە ناوونیـشان کـەس چـاك نابێـت، بەڵکو بە نێوەڕۆك ئینسان چاك دەبێ، هەروەك بە ناوونیشان کەس خـراپ نابێـت، بەڵکو بە نێوەڕۆك ئینسان خراپ دەبێ.

خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (١٧٧)ی سوورەتی (البقـرة)دا کـە بـە ئایـەتی (البِـرّ) ناسـراوە، دەفـەرموێ: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾، واتـــــــە: {چاکەو چاکەکاریی هەر ئـەوە نیـە روو بکەنـە رۆژهـەڵاتو رۆژئـاوا، بـەڵکو چاکەو چاکەکاریی راستو دروست ئەوەیە کە بڕوا بێنن بـە خـواو رۆژی دوایـیو فریشتەکانو کتێب (ی خوا)و پێغەمبەرانو، لەوماڵو دارایییەش کە خۆشـتاندەوێ ببەخشن بە خزمانو منالانی هەتیوو نەدارانو رێبوارانی بێ خەرجییو سوالکەرانو کۆیلەکان، وە نوێژ بکـاتو زەکـات بـداتو، وەفـادار بـن بـۆ پەیـمانێك ئەگـەر دایانو، ئارامگر بن لە ناخۆشییو نەدارییو لە کاتی رووبەڕووبوونەوەدا، ئا ئەوانـە راستگۆیەکانو، هەر ئەوانەشن پارێزکاری راسـتەقینە}، لەم ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن حەڤدە سیفەت باس دەکات، پێنجیان دەربارەی بیروباوەڕ (عقیـدة)، شەشیان

دەربارەی دەستگرتن و هاوكارییكردنی خەڵك لە لایەنی ماددیی‌یەوە، ئینجا دێتەسەر باسی نوێژو ڕۆژوو، ئینجا دێتەسەر باسی ئەمەكداریی (الوفاء)، پاشان دێتەسەر باسی ئارامیی و خۆڕاگریی (الصبر)، دوایی دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾، واتە: (ئا ئەوانە ڕاست دەكەن لە مسوڵمانەتییاندا، وە ئەوانەش پارێزكارن)، سەرەتاكەشی دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾، واتە: (چاكە ئەوە نیە ڕوو بكەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)، واتە: چاكە شتی ڕواڵەتیی و ڕووكەشیی نیە، بەڵكو: چاكە جەوهەرو كاكڵە.

ئێمە دەبێ زۆر لەوە وریابین، هەر لەبەرئەوەی پێمان دەڵێن: ئیسلامیی، پێمان وانەبێ بەوە لە هەموو ئاوان دەپەڕینەوە، چونكە بەڕاستی ناوونیشان هیچ بۆ ئینسان ناكا، ئەوەی كە ئینسان چاك دەكات یان خراپی دەكات، كردەوەو نێوەڕۆك و جەوهەرە.

# بنەمای سێزدەیەم

## کۆمەڵی ئیسلامیی
## هاوکارییکردنی تێکڕای مسوڵمانان
## بۆ هێنانەدی ئاما نجە شەرعییەکان،
## بە پێویست دەزانێ.

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

# بنەمـای سـێزدەیـەم

## كۆمـەڵی ئیسـلامیی هاوكاریـیكردنی تێكـڕای مـسـوڵمانان بـۆ هێنانـەدی ئامانجـە شـەرعـیـیەكان، بە پێویسـت دەزانێ.

كۆمەڵی ئیسلامیی لەسەرخۆی بە پێویست دەزانێ كە ئـەركی دۆستایەتیی و برایـەتیی لەگـەڵ تێكـڕای مـسـوڵمانان – بـەپێی توانـا - جێبـەجێ بكـاتو، بـۆ هێنانــەدی ئامانجــە پێویــستو پەســندەكان هاوكارییــان بكــات، بــە هــەموو كەسایەتیی و مەشرەبو توێژو كۆمەڵو تەوژمەكانیانەوە، مادام لەسەر بناغـەی ئیمانو عەقیـدەو لە بازنەی ئیسلامدا لەگەڵی یەك بگرنەوە.

وە هەوڵــیش دەدا هــەم لــە ئامۆژگــارییو پێــشنیارو ڕەخنــەكانیان بەهرەمەند بێو، هەم بەپێی تواناش ڕێڕوونییـان بكـاتو، كـەمو كووڕیـەكانیان چارەسەر بكات، وە لەسـەر بناغـەی خاڵە هاوبەشـەكان (النقـاط المشتركة) هەڵسوكەوتیان لەگەڵ دەكاتو، مەگـەر لـە كـەشو هـەوای دۆسـتانەو وتوویـژی هێمنانەو زانستییانەدا، ئەگەرنا بەهیچ جۆرێك وردە بابەتـە خیلافییـەكانیان لەگـەڵ ناورووژێنـێو، لـەكاتی مـشتومڕو تێكگیـرانیـشدا بـە ڕەوشـتی بـەرزو جـوانی مـسوڵمانانەو لەسـەر بناغـەی ئـەم فەرمایـشتەی خـوا ﷻ مامەڵـەیان لەگـــەڵ دەكـــات: ﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَۚ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾﴾ المؤمنون. واتە: (بە كام ڕەفتار و كردەوە كە چاكترە، خراپە پاڵ پێوەبنێ، ئێمـە

زانـاترین بـەوەی كـە ئـەوان باسـی دەكـەن)، چـونكە بێگومـان ئـەو شـێوازە كـە لەگەڵ خەڵكی نامسـوڵماندا پێویست یان پەسـند بێ، دیارە لەگەڵ مـسوڵمانان پێویستـتـرو پەسـندترە. چونكـە:

١- خــوای كاربــەجێ ﷻ فەرموویــەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ... ﴿٧١﴾ ﴾ التــوبة، واتــە: (وە بڕوادارانــی پیــاوو بڕوادارانــی ئــافرەت هەندێكیان پشتو پەنـاو مشوورخۆری هەندێكیانن ...).

٢- هەروەها خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ... ﴿١٠﴾ ﴾ الحجــرات، واتــە: (بەڕاسـتی بـڕواداران بـرای یەكـدین، یـان خوشـكو بـرای یەكدین، یان خوشكی یەكدین ...).

٣- وە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا۟ ٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ... ﴿٥٣﴾ ﴾ الإسـراء. واتە: (وە بە بەندەكانم بڵـێ: كام قسەی چاكە ئەوە بڵێن، چونكە شەیتان نێوانیان تێكدەدا ...).

ئینجـا لەوبارەشــەوە پێغەمبــەر ﷺ فەرمایــشتی زۆرن، ئەمــەش چـەند فەرمایشتێك لەوبارەوە:

٤- (عَـنْ مُعَـاذِ بْـنِ جَبَـلٍ قَـالَ: سَـمِعْتُ رسُـولَ اللَّـهِ ﷺ يَقُـولُ: قَـالَ اللهُ ﷻ: الْمُتَحَابُّونَ فِي جَلَالِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمْ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ) رواه الترمـذي: (٢٣٩٠)، وقـال: حـسن صـحيح، وقـال الألبـاني: صـحيح، واتـە: (موعــازی كــوڕی جەبــەل – ڕەزای خــوای لـــێ بــێ - دەڵــێ: گوێــم لــە پێغەمبـەری خـوا بـوو ﷺ دەیفـەرموو: خـوای بـەرزو مـەزن فەرموویـەتی: ئەوانەی لەبەر شكۆمەندیی مـن یەكـدییان خۆشـدەوێ، چـەند دوانگەیـەكی نووریـنـیان هەن –لە قیـامەتدا- كە پێغەمبـەرانو شـەهیدان خۆزگـەیان پـێ دەخوازن)، واتە: بەنسبەت ئەو كردەوەیانەوە.

٥- هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {(الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا)، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ} رواه البخاري: (٢٤٤٦) واللفظ له، ومسلم: ٢٥٨٥، عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه. واته: (بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوار وایە، هەندێكی هەندێكی مەحكەم دەكات، وە پەنجەكانی خستەنێویەك).

٦- وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى) رواه البخاري: (٦٠١١)، ومسلم: (٢٥٨٦) واللفظ له، عن النعمان بن بشير رضي الله عنه. واته: (وێنەی بڕواداران لە یەكدی خۆشویستنیانو بەزەیی بەیەكداهاتنەوەیانو سۆزو پەرۆشییان بۆ یەكدیدا، وەك جەستەیەك وان، كە ئەگەر ئەندامێكی ناساغ بوو، هەموو جەستە بە شەونخوونییو تا لێهاتن بەشداریی دەكات).

## ڕوونكـردنـەوە:

ئەم بنەمـای سـێزدەیەمە لە پێنج خـاڵـدا ڕوون دەكەینـەوە:

### یـەك: دۆسـتايەتیی‌و برايـەتیی مـسولْمانان قوولْتـرین‌و پتـەوترین دۆستايەتیی‌و برايەتییە:

ئەو ئايەتـە بەپێـزە كە خوای كاربەجـێ ﷻ تێیدا فەرمـوويـەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ...﴿١٠﴾﴾ الحجرات، (إِنَّمَا) لە زمانی عەرەبیدا پێ‌ی دەگوترێ: (أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات)، واتە: (ئامرازی كورت هەڵهێنان‌و چەسپاندن). واتـە: ئـەو (إِنَّمَا)یـە كاتێك دەچێتەسەر ڕستەیەك، ئەو حوكمەی كە دێ دەیچەسپێنێ بۆ ئـەو كەسـە یـان ئـەو كۆمەڵـەی دیـاریكراون، وە لەوانیـشدا كـورتی هەڵـدێنێ، واتـە: بەشـی كەسیدیكەی لـێ نـادا، كەواتـە: خـوای پـەروەردگار ﷻ كـە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ...﴿١٠﴾﴾ الحجرات، واتـە: (بەڕاستی هەر بڕواداران بـران)، یـانی برای ڕاستـەقینە، یاخود بەڕاستی بڕواداران هەر بران، واتە: ناگونجێ بڕوادار بـن‌و برا نەبن، چونكە (إِنَّمَا)یەكە دەگونجێ بچێتەسەر (إِخْوَةٌ)، دەشـگونجێ بـچێتەسەر (ٱلْمُؤْمِنُونَ)، واتە: بڕواداران هەر بـران، واتـە: ناگونجـێ ئینسان ئیمانـدار بـێ‌و برايەتیی نەكات لەگەڵ ئیمانداراندا، كە لێرەدا مەبەست پێ‌ی برايەتیی ڕاستەقینەیە، وەك دوايی باسی دەكەین، ئەگەرنا جۆرە برايەتیی دیكەش هـەن، هـەروەها ئايـەتی ژمارە (٧١)ی سووڕەتی (التوبة) كـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ

أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍ ...﴾، (أَوْلِيَـاء) كۆی (وَلِي)یە، (وَلِي)یش واتە: (دۆستو پشتیوان، خۆشەویست، سەرخەر، یارمەتیدەر، نزیك) هەموو ئەم مانایانە دەگرێتەوە.

كەواتە: هیچ كەس لە ئیماندار نزیكتر نیـە، لە براو خوشكی ئیمانداری.

ئینجـا وشـەی (إِخۡوَةٌ) لـە زمـانی عەرەبیـدا كۆیـەو، بـۆ پیـاوانو بـۆ ئافرەتـان بەكاردێ، وەك وشەی (قَـوْم)، وشەی (جَمَـاعَة)، وشەی (نَفَـر)، ... ئەوانە ناوی كۆ (إسم جمـع)ن، بۆ هەردوو ڕەگەزەكە (پیـاوو ئـافرەت) بـەكاردێن، هەرچـەندە عادەت وایە خەڵك هەر دەڵـێ: (أَيَّتُهَـا الإِخْـوَةُ وَالأَخَـوَات)، بـەڵام كـە گوتـت: (إِخْـوَة) ئافرەتانیش دەگرێتەوە، بەڵگەشمان هەر لە قورئاندا لەسەر ئەوە كە وشـەی (إِخْـوَة) ئافرەتـانیش دەگرێتـەوە، ئەوەیـە كـە خـوای زانـا ﷻ لـە ئایـەتی كۆتـایی سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿... وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ ...﴿١٧٦﴾﴾[1]، واتە: (...ئەگـەر ـ ئەوانـەی كە میرات دەگـرن لە بێ وەجاغـ برا بن یان خوشكو برا بن لە پیاوانێكو ئافرەتانێك، ئەوا بـۆ نێرینـە هەیـە دوو هێندەی مێیینە ...). كەواتە (إِخۡوَةٌ) هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ دەگرێتەوە.

كەواتە: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ﴾، واتە: (بڕواداران برای یەكـدین، خوشـكو بـرای یەكـدین، وە بـە نـسبەت ئافرەتانیـشەوە هـەر ئـەوان خوشـكی ڕاسـتەقینەی یەكدین).

---

١) واتـە: ئەگەر ئەوانەی میراتیـان دەگرت لە (الْكَلاَلَةِ)، (كَلاَلَةِ) واتە: (بێ وەجاغ)، كەسێكە نـە ئەسڵی هەبێ (وەك: دایكو بابو باپـیرو داپیرو ...)، نـە فـەرعی هـەبێ (وەك: كـوڕو كـچو كوڕەزاو كچەزاو ...).

پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی برایەتیی مسوڵمانانو دۆستایەتییانو نزیکییان، زۆر شتی فەرمووە، بۆ وێنە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ، قِيلَ: مَا هُنَّ يَا رسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَشَمِّتْهُ، وَإِذا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ) رواه مسلم: (٢١٦٢)، واتە: (ئەبو هورەیرە – خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەش شتن، گوترا: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەگەر لە ڕێگا پێیگەیشتی سڵاوی لێ بکە[١]، وە ئەگەر بانگی کردی وەڵامی بدەوە[٢]، وە ئەگەر ڕاوێژی پێ کردی، چی دڵسۆزییە بۆ ئەوو چی بۆ ئەو چاکە پێی بڵێ[٣]، وە ئەگەر پژمیو سوپاسو ستایشی خوای کرد، تۆش داوای بەزەیی خوای بۆ بکە[٤]، وە ئەگەر نەخۆش بوو، سەردانی بکەو لێی بپرسە[٥]، وە ئەگەر وەفاتیشی کرد شوێنی بکەوەو لە دوای جەنازەکەی بڕۆ بۆ بە خاك سپاردنی).

باسی ئەوەمان کرد کە برایەتیی ڕاستەقینە بەڕاستی لەنێو ئەهلی ئیمانداپە، ئەدی ئایا جۆرە برایەتیی دیکەشمان هەن؟ بەڵێ، بەڵگەشمان چەند ئایەتێکی قورئانە، ئەوە بۆیە وا دەڵێم، چونکە جاری وا هەیە خەڵکە ئیسلامییەکەی ئێمە ئەگەر گوتت:

---

١) هەوڵ بدە تۆ پێشتر سڵاوی لێبکەی.

٢) مەرج نییە دەعوەتت بکا بۆ نانخواردن، هەر ئەگەر بانگی کردی، کارێکی پێت هەبوو، وەڵامی بدەوە.

٣) وشەی (النُّصْحْ) بە مانای دڵسۆزیی دێ، بە مانای مشوور لێ خواردن دێو بە مانای ئامۆژگاریی نایێ، بەڵام ئامۆژگارییش بەشێکە لە دڵسۆزیی (النُّصْحْ).

٤) کە ئەو پژمیو گوتی: (الحَمْدُ لله)، تۆش پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ الله).

٥) هەڵبەتە هەر تەنیا لێپرسینیش نیە، بەڵکو ئەگەر چیشی پێ کرا بۆی ئەنجام بدا، چونکە بۆیە دەچێتە لای هاوکاریی بکا.

برایانی عەلمانیی، برایانی شیوعیی، برایـانی مەسـیحی، برایـانی جوولەكـە ...، وا دەزانێ لە دین دەرچـووی! بێگومـان ئـەوە وانیــە، ئێمـە بـەگوێرەی عـورفو بـاو زۆرجار وایە، بەوان دەڵێین: برادەر، بەڵام لە ڕاسـتیدا ئەگـەر بـشڵێین: بـرا، هـیچ ئیشكالی شەرعیی تێدا نیـە، چونكە برایەتیی دینیی هەیـەو برایەتیی دنیـاییش هەیـە، برایـەتیی دینیـیو عەقیـدەیی هەیــەو برایەتیــی نەتــەوەییو نـەژادییش هەیــە، بـا تەماشای ئەم ئایەتانە بكەیـن:

خوای بەرزو مـەزن دەفـەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾﴾ الأعراف، واتە: (وە ڕەوانەمان كرد بۆ لای گەلی عـاد هــوودی برایـان، فـەرمووی: ئـەی گەلەكـەم! خـوا بپەرسـتن، جگـە لـەو پەرستراوێكی دیكـەتان نیــە، جـا ئایـا خۆتـان ناپـارێزن؟)، مانـای وایـە خوایـان نەپەرستووەو چووە پێیان بڵێ: خوا بپەرستن، وە دوایی بەقسەشیان نەكردووەو خوا ﷻ لەناوی بردوون، لەگەڵ ئەوەشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: بۆ لای گەلـی عـاد هـوودی برایانـمان نارد، بۆچی برایـان بووە؟ چونكە لە نەژادو ڕەچەڵەكدا برایـان بووە.

لە سوورەتی (الشعراء)دا خوای پەروەردگار ﷻ باسی ژمارەیەك لـە پێغەمبـەران علیهم الـصلاة والـسلام دەكـات: نـووحو هـوودو سـاڵحو لـووط، بـۆ هـەموویان دەفـەرموێ: برایەكـەیان، دوایـی كـە دەگاتـە سـەر (أصـحاب الأيكـة)، چـونكە شوعەیب لە گەلـی مەدیەن بووە، شوعەیب عليه السلام بۆ لای دوو (گەل)ان نێـردراوە:

أ/ بۆ لای مەدیەن كە لەوان بووە، خوای بەرزو مەزن دەفـەرموێ: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ ... ﴿٨٤﴾﴾ الأعراف، واتە: (وە ڕەوانەمان كرد بۆ لای مەدیەن شوعەیبی برایان، فەرمووی: ئەی گەلەكەم! خوا بپەرستن، جگـە لەو پەرستراوێكی دیكەتان نیە ...).

ب/ وە بۆلای (أصحاب الأيكة)[1]ش نێردراوە، بەڵام لەوان نەبووە، لەوێدا خوا ﷻ كە باسی ئەوە دەكات: ﴿كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٧٦ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٧٧﴾ الشعراء، واتە: (خاوەنانی باخە گەورەكە پێغەمبەرانیان بە درۆ خستەوە، كە شوعەیب پێیانی فەرموو: ئایا پارێز –لە خوا- ناكەن؟). لەوێ نافەرموێ: (إِذ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ شُعَيْبٌ)، لە هەموو ئایەتەكانی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿أَخَاهُمۡ﴾، واتە: (برایەكەیان)، بەڵام لەوێ بۆچی نافەرموێ: برایەكەیان؟ چونكە لەوان نەبووە، واتە: مەبەست لەو (أُخُوَّة)ە، (أُخُوَّة)ی ڕەچەڵەكیی (نَسَبِي)یە.

كەواتە: ئەوە برایەتیی ڕەچەڵەكیی (نَسَبِي)و برایەتیی نەتەوەیی (قَوْمِي)یە و، برایەتیی دیكەش هەیە، برایەتیی ئایدیۆلۆژیی و فیكرییش هەیە.

بە بەڵگەی ئەم ئایەتە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ٦٧﴾[2] الزخرف، واتە: (ئەوانەی لە دنیادا یەكدییان زۆر خۆشویستوە، لە قیامەتدا هەموو پێكەوە دەبنە دژ، جگە لە پارێزكاران)، كەواتە: دەگونجێ لە دنیادا خەڵك لەسەر زۆر شتی دیكەش برایەتیی و نزیكیی و پەیوەستەگییان پێكەوە هەبێ، بەڵام بەهێزترین و ڕاسترین برایەتیی، برایەتیی ئیمانییە.

---

١) الأيكة: یانی درەختی گەورەو چڕ، یاخود باخێكی گەورە بووە.

٢) (أَخِلَّاء) كۆی (خَلِيل)ە، (خَلِيل) هەر لە بنەڕەتدا لە (أَخ)یش بەهێزترە، یانی كەسێك كە: (مَنْ تَخَلَّلَتْ مَحَبَّتُهُ قَلْبَهُ)، واتە: (خۆشەویستییەكەی تێكەڵ بە دڵی بووە)، چۆتە نێو دڵ و هەناویەوە.

با لێرەدا قسەیەكی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە: جارێك كاك حەمەی حاجی مەحمود تەلەفۆنی كرد گوتی: مامۆستا، گوتم: بەڵێ، گوتی: پێم خۆشبوو برایانی ئێوەو برادەرانی ئێمە كۆبوونەوەیەكیان كردبایە، منیش گوتم: زۆرباشە، ئینجا بە پێكەنینەوە گوتم: كاكە حەمە، خۆ دەشتوانی تۆش بە هی خۆت بڵێی برایانی ئێمەش، گوتی: من وامزانی ئێمە هەر دەبێ بڵێین برادەر، چونكە جەنابت هەموو جار دەڵێی برادەرانی سۆشیالیستو زەحمەتكێشو برایانی ئێمە، گوتم: ئاخر ئەوە بەنسبەت خۆمانەوە پێیان دەڵێین برا، بەڵام بە نسبەت ئەوانەی ئێوەوە برای تۆشن، ئاساییە.

جا هەندێك خەڵكی خۆشمان وا حاڵی بووە، وادەزانێ كە دروست نیە بە خەڵكی دیكە بڵێین برا، كە واش نیە، لەڕاستیدا برایە، هەرنەبێ براتە لە مرۆڤایەتی (بشرية)دا، هەرنەبێ لە ئادەمو حەوا پێكدەگەینەوەو هیچ ئیشكالی تێدا نیە، هەڵبەتە ئەوە لە حاڵێكدا كە ئەو كەسە خۆی بە مسوڵمان نەزانێ، یان بە بەڵگەی ڕوونو ڕاشكاو نامسوڵمانێتییەكەی ئیسپات بووبێ، ئەگەرنا وێڕای برایەتیی نەتەوەییو نەژادییو، برایەتیی عەقیدەییو ئایینیشیان هەیە.

## دوو: مسوڵمانان دەبێ مایەی بەهێزبوونی یەكدی بن:

پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان مسوڵمانانی وێناكردوەو دەفەرموێ: {(الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا)، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ} رواه البخاري: (٢٤٤٦ و ٦٠٢٦)، جا ئەوەش بەڕاستی دەیەوێ تا ئینسان دەروونی خۆی وا لێدەكات كە لەگەڵ ئیمانداراندا ئاوابێو بێ فەرق بێ لەگەڵیان، بە قازانجو خۆشییان دڵی خۆشبێو، بە ناڕەحەتییو ناخۆشییشیان دڵی سەغڵەت بێ، بەبێ فەرقو جیاوازیی، بەبێ تێخوێندنەوەی ئینتیمای سیاسییو ڕێكخراوەیی،

ئامادەبێ بۆ هەمووان دڵسۆز بێ‌و هاوكاریان بێ، ئەوە بەڕاستی خۆ ڕاهێنانی دەوێ‌و ئیش لەسەر خۆ كردنی دەوێ‌و، ئینسان وا بە ئاسـانیی ئـەوەی بـۆ فەڕاهـەم نایـێ، ئەگەر ئینسان زۆر لە خۆی وریا نەبێ، ئەو مەسەلەی حیـزب‌و ڕێكخـراوە خـاڵێكی سەلبیی هەیە، ئەویش ئەوەیە كە دەمارگیرییەك پەیـدادەكات، مرۆڤــ پـێ‌ی خۆشـە كۆمەڵەكەی خۆی لە هەموو چاكەیەكی هەبێ، بەڵام ڕەنگە چاكەی بۆ خەڵكی دیكە پێ خۆش نەبێ، كە ئەوە نابێ وابێ، با پێـت خۆشـبێ خـەڵكی خـۆت بـاش بـێ، ئەوەی كە لە بازنەیەكدا كۆبوونەتـەوە، بـەڵام دەبـێ ئـەو خۆشـیی‌و چـاكەیەت بـۆ ئەوانیدیكەش پێ خۆشبێ، چونكە لە بازنەیەكی فراوانتردا لەگەڵ ئەوانیش هەر پێك دەگەیەوە، كە بریتیە لە بازنەی برایەتیی ئیسلامیی‌و ئیمانیی، كـە ئێمـە لـەم بنـەمای سێزدەیەمەدا باسی لێوە دەكەین.

وە لە فەرموودەیەكی دیكـەدا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: {الْمُسْـلِمُ أَخُو الْمُـسْلِمِ لَا يَخُونُهُ وَلَا يَكْذِبُهُ وَلَا يَخْـذُلُهُ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَـى الْمُـسْلِمِ حَـرَامٌ: عِرْضُـهُ وَمَالُـهُ وَدَمُـهُ ...) رواه التـرمذي: (١٩٢٧)، وقـال: حـسن غريـب[1]، وقـال الألبـاني: صحيح. واتە: (مسوڵمان برای مسـوڵمانە، {هەروەها بـە نـسـبەت ئافرەتانیـشـەوە خوشك‌و بران، یان خوشكن}، ناپاكیی لەگـەڵ ناكـا، وە درۆی لەگـەڵ ناكـا، وە پـشتی بـەرنادا لـە كـاتی تەنگانـەدا، هـەموو شـتێكی مـسوڵمان لەسـەر مـسوڵمان قەدەغەیە: كەڕامەت‌و ئابڕووی، وە ماڵ‌و سامانی، وە خوێنی ...). دیارە مەرج نیە مەبەستی لە كەڕامەت‌و ئابڕووی تەنیا لایەنی نـاموس بـێ، چـونكە (عِـرْض) لـە زمـانی عەرەبیـدا واتـە: كەسـایەتیی‌و كەڕامـەت، كـە دیـارە خێزانـی ئینـسان‌و

[1] وە لە فەرموودەیەكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَنَاجَشُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَلَا تَدَابَـرُوا وَلَا يَبِعْ بَعْضُـكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْـضٍ وَكُونُـوا عِبَـادَ اللَّهِ إِخْوَانًا الْمُسْـلِمُ أَخُو الْمُسْـلِمِ لَـا يَظْلِمُـهُ وَلَا يَخْـذُلُهُ وَلَا يَحْـقِرُهُ التَّقْـوَى هَـاهُنَـا وَيُشِـيرُ إِلَـى صَدْرِهِ ثَـلَاثَ مَرَّاتٍ، بِحَسْـبِ امْرِئٍ مِنْ الشَّـرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَـاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُـهُ وَمَالُـهُ وَعِرْضُهُ} رواه مسلم: (٢٥٦٤).

هاوسەری، یاخود كچیو خوشكی ئەوانە بەشێكن لە (عِـرْض)، دەنا وشـەی (عِرْض) واتە: كەسایەتییو ئیعتیبارو ناوبانگ (سـمعة)و كەرامەتی ئینسان.

**سێ: مسوڵمانان دەبێ هەست بە خۆشییو ناخۆشیی یەكدی بكەن:**

تەماشا بكەن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی چەند جوان وێنا كردوە، كە دەفەرموێ: {مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى} رواه البخاري: (٦٠١١)، ومسلم: (٢٥٨٦) واللفظ له، عن النعمان بن بشير رضي الله عنه، بێگومان ئەوە دیارە ئەگەر ئینسان ددانی بێشێ، هەموو ئەندامەكانی ئارامیان لێ هەڵدەگیرێ، چاوی ئازاری هەبێ، هەموو ئەندامەكانی نارەحەت دەبن، هەروەها هەر ئەندامێكی بێشێ، هەموو ئەندامەكانی دیكە ئازار دەچێژن، چونكە هەموویان بەیەكەوە پەیوەستن، ئێمەش دەبێ بۆ یەكدی ئاوا بین.

پاشان پێغەمبەر ﷺ كە مسوڵمانان بە ئەندامانی جەستەیەك دادەنێ، واتە: دەبێ هەر كامێكیان ئیشێك بكاتو مەرج نیە هەموویان یەك ئیش بكەن، بۆوێنە: ئێستا سەر رۆڵێك دەبینێ، لەنێو سەریشدا چاو رۆڵێك دەبینێ، هەر كامێك لە گوێ، لووت، زمان، هەتا لە دەستدا پەنجەكان هەر پەنجەی رۆڵی خۆی دەبینێ، مسوڵمانانیش دەبێ ئاوا ئیشەكان لەنێوان خۆیاندا دابەش بكەن، هەر كەسە ئەو ئیشە بكات كە چاكی لێدەزانێو ئەو كارە بكات كە بۆی دەكرێ ئەنجامی بدا، وە دەبێ هەست بە ئازارو خۆشییو ناخۆشیی یەكدی بكەن.

لە فەرمایشتی دیكەدا هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ} رواه البخاري: (١٣)، ومسلم: (٤٥)، واتە:

(یەكێك لە ئێوە ئیمان ناهێنێ، تاكو ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برای موسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێ)، ئیمان ناهێنێ، واتە: ئیمانی تێرو تەواو (كامل)ی نیە، ئەگەرنا دەگونجێ كابرا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برای موسوڵمانی پێی خۆش نەبێ، بەڵكو جاری وا هەیە مسوڵمان ئیرەیی (حَسَد)ی هەیە، پێی ناخۆشە ئەو خێرو قازانجە بۆ برایەكەی بچێ، لێرەدا ناتوانی بڵێی ئیمانی نیە، بەڵام دەڵێین ئیمانێكی چاكی نیە.

بەڕاستی سەنگی مەحەكی ئیمان، مەسەلەی برایەتیی و هەڵسوكەوت (معاملة)و خووڕەوشت (أخلاق)ە، لەگەڵ خەڵك، ئەگەر دەتانەوێ تەرازووتان بەدەستەوە بێ و ئیمانی خۆتانی پێ هەڵسەنگێنن، تەماشا بكەن لەگەڵ خەڵك چۆن ڕەفتار دەكەن؟ ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە، بۆ ئەوانیش پێت خۆشە؟ وە ئەوەی بۆ خۆت پێت ناخۆشە، بۆ ئەوانیش پێت ناخۆشە؟ ئایا بە خۆشییان دڵ خۆشی و بە ناخۆشییان دڵ ناخۆشی؟ بۆیان دڵسۆزی؟ بۆیان بە پەرۆشی؟ ... هتد، بەوە ئینسان لە خۆی حاڵی دەبێ ئیمانەكەی چەندە، نەك تەنیا بە نوێژی زۆرو ڕۆژووی زۆر!

## چوار: برایەتیی و دۆستایەتیی و یەكدی خۆشویستن لەبەر خوا ﷻ پایەیەكی بەرزی هەیە:

مەسەلەی دۆستایەتیی و برایەتیی ئەوەنیە بڵێی: شتێكە ئەگەر بیكەم چاكەو، ئەگەر نەشیكەم، ئەوە مادام ئیمان و عەقیدەو نوێژو ڕۆژووو تاعەتی خۆم هەیە، تازە من تەواو! نا، با تەماشای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بكەین كە دەفەرموێ: {لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ} رواه مسلم: (٥٤)، وأبو داود: (٥١٩٣)، وابن ماجه: (٦٨)، والترمذي: (٢٦٨٨)، عن أبي هريرة رضي الله عنه، وصححه الألباني،

واللفظ لأصحاب السنن، واتە: (ناچنە بەهەشت تا ئیمـان نەهێنـن، ئیمانیش ناهێنن تا یەکدیتان خۆشنەوێ، شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن یەکدیتان خۆشبوێ؟ سـڵاو لە یەکدی کردن بڵاوبکەنەوە). واتە: سـەردانو هاموشـۆی یەکـدی بکـەن، ئـەوە هۆکارێکە بۆ خۆشەویستی پەیدابوون، کەواتە: پێغەمبـەر ﷺ بەهەشـتی قەدەغـە کـردوە لـە کەسـێك ئیمـانی نـەبێ، وە ئیمانیـشی قەدەغـە کـردوە لـە کەسـێك خۆشەویستیی نەبێ لەگەڵ خوشكو برایـە مـسوڵمانەکانیدا!! دیـارە پێغەمبـەر ﷺ ئەوەنیە بڵێی زێدەڕۆیی (مبالغـة)ی کـردوەو، شـێواز (أسـلوب)ێکـی سـۆزداری (عاطفي)ی بەکارهێناوە، بەڵکو مادام پێغـەمبەر ﷺ بیفەرموێ، ئەوە ڕێكو ڕاست وایە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر ئیمانت هـەبێ، چـۆن ئـەو بـراو خوشـکانەی خـۆت خۆشناوێ کە خوا ﷻ یان خۆشدەوێ؟ ناگونجێ، کەسێك کە ئیمانی بە عەلمانییەت هەیە، عەلمانییەك لەوسەری دنیاوە بێ، خۆشیدەوێ، کەسێك ئیمانی بە هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك) هەیە، هاوبەش بۆ خوا دانەر (مُشْرِك)ێك لەوسەری دنیاوە بـێ، خۆشـیدەوێ، بـە خۆشـیی دڵخۆشـەو بـە ناخۆشییـشی دڵناخۆشـە، جێگـای سەرسوڕمانە تۆ ئیمانت هەبێو ئیماندارانت خۆشنەوێ، کـە خۆشـت نەویـستن، دیارە ئیمانت نیە، وە بە ئەندازەی خۆشویستنو ڕێزو دڵسۆزیی و بەتەنگەوە بوونـت بۆ مسوڵمانان، ئیمانت تەواوە، ئەوە با چاکی لـێ وردبینەوە!

ئینجا تەماشای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بکـە کـە دەفـەرموێ: {الْمُـسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ وَمَنْ فَـرَّجَ عَنْ مُسْـلِـمٍ كُرْبَـةً فَرَّجَ اللَّهُ بِهَا عَنْـهُ كُرْبَـةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَـنْ سَـتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} رواه البخاري: (٢٤٤٢)، مسلم: (٢٥٨٠)، واتـە: (مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێناکاتو تەسلیمیشی ناکا، وە هەر کەسێك بە کاری برایەکییەوە ماندوو بێو بۆی جێبەجێ بکات، خوا ﷻ کارەکەی بۆ جێبەجێ

دەکات، وە هەر کەسێك خەمێك لە مسوڵمانێك بڕەوێنێ، خوا ﷻ بەو خەم ڕەواندنە، خەمێك لە خەمەکانی ڕۆژی قیامەتی لێ دەڕەوێنێ، وە هەر کەسێك کەم و کوڕیی مسوڵمانێك بپۆشێ، خوا ﷻ لە قیامەتێ دەیپۆشێ)، واتە: نە بۆخۆی ئامادەیە مافی پێشێل بکات، نە لەکاتێکدا کەسێکیش بیەوێ مافی پێشێل بکات پشتی بەربدا، جا ئەوە زۆر زەحمەتە، زوڵمی لێ نەکەی، بە هەر حاڵ، مرۆڤ دەتوانێ زوڵمی لێ نەکات، بەڵام تەسلیمی دوژمنی نەکەی، ئاسان نیە، بۆ وێنە: ئێستا ئەگەر مسوڵمانان لە بەرانبەر مسوڵمانانی فەلەستین دا بەگشتیی و هی کەرتی غەززە بەتایبەتی، بێ هەڵوێست بن، مانای وایە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە ڕەفتاریان کردوە، بەڵێ ستەمیان لێ ناکەی، بەڵام تەسلیمیان دەکەی، کەچی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ}، واتە: (ستەمی لێ ناکات و تەسلیمیشی ناکا)، واتە: لە بەرانبەر دوژمنەکەیدا بێ دەنگ و بێ هەڵوێست نابێ، جا ئەگەر بە دوعایەکی خێریش بێ، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بێ هەڵوێست نەبێ، دوایی دەفەرموێ: هەر کەسێك کاری مسوڵمانێك جێبەجێ بکات، خوا ﷻ کاری دەسازێنێ و بۆی جێبەجێ دەکات، وە ئەگەر خەمێکی سەر مسوڵمانێك لاببا، خواش ﷻ لە خەمەکانی ڕۆژی قیامەتی بۆ دەڕەوێنێ، چەند گەورەیە! وە هەر کەسێك کەم و کوڕیی مسوڵمانێك بپۆشێ و لێی نەکاتە هەڵلا، ئەوە خوای بەبەزەیی ﷻ لە قیامەتێ دەیپۆشێ، شت لەوە گەورەتر هەیە؟! ئەوە بەڕاستی پایەیەکی گەورەیە، کەواتە: با ئێمە پێمانوانەبێ هەر بەو نوێژو ڕۆژووو تاعەتە کەسییانەی کە دەیانکەین، لە ئاوێ دەپەڕینەوە، ئەو پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی و برایەتیی و سۆزو بەزەیی و بەرگریی لە یەکدی کردن و پشتی یەکدی گرتن و هاوکاریی پێکەوەکردنەش، زۆر پاداشتی گەورە گەورەیان هەیە.

وە لە فەرمووده قودسییەكەدا كە پێشتر هێنامان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوا ﷻ دەفەرموێ: {الْمُتَحَابُّونَ فِي جَلَالِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمْ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ} رواه الترمذي: (٢٣٩٠)، وقال: حسن صحيح، وقال الألباني: صحيح. واتە: {ئەوانەی كە لەبەر شكۆو بالآیی خوا یەكدییان خۆشدەوێ، لەسەر چەند دوانگەیەكی نوورینن (لە قیامەت، لە بەهەشت)، پێغەمبەرانو شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن}، جا یەكێك بۆی هەیە بڵێ: جا پلەیەك هەیە لە پلەی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و شەهیدان بەرزتر؟ تاكو پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و شەهیدان خۆزگەی پێ بخوازن؟ زانایان دەڵێن: دەگونجێ هەندێك كەس لەسەر كردەوەیەكی تایبەت، پاداشتێكی بدرێتەوە كە هی زۆر لەو بەرزتر ئەو پاداشتەی نەبێ، یاخود مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لێرەدا (دیارە فەرموودەكەش قودسییە، خوا ﷻ دەفەرموێ و، پێغەمبەر ﷺ لێی دەگێڕێتەوە) ئەوەیە كە ئەوانە لەسەر ئەو یەكدی خۆشویستنە لەبەر خوا ﷻ پلەیەكیان پێدەدرێ كە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام كە لە هەموو كەس گەورەترن، وە شەهیدانیش كە لە هەموو كەس پایە بەرزترن، حەز بەو شوێنەیان دەكەن، وە مەرج نیە ئەو شوێنەیان نەبێ، یانی پلەیەكی هێندە بەرزیان هەیە.

## پێنج: باشترین هۆكاری پاراستنی دۆستایەتییو برایەتیی:

ئێمە چۆن دۆستایەتییو برایەتیی خۆمان بپارێزین لەگەڵ مسوڵمانانا بەگشتیو، لەنێو خۆماندا بەتایبەتی؟ بە سێ شتان دەگونجێ ئینسان باشترین هۆكاری دەستەبەركەری پاراستنی دۆستایەتییو برایەتیی فەراهەم بێنێت:

### ١- هاوكارییكردنی یەكدی لەسەر خاڵ و ئامانجە هاوبەشەكان:

ئەو شتانەی كە ئامانجی هاوبەش و خاڵی هاوبەشن و لەسەریان یەكدەنگین، هاوكاریی یەكدی بكەین، وەك گوتوویانە: (نَتَعَاوَنُ فِيمَا اتَّفَقْنَا عَلَيْهِ)، واتە: (هاوكاری یەكدی دەكەین لەوەدا كە لەسەری كۆكین)، ئەوەش خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ...﴿٢﴾﴾ المائدة، واتە: (وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی، وە هاوكاریی یەكدی مەكەن لەسەر گوناەو دەستدرێژیی ...)، چاكەكاریی هەر شتێكە بۆ خەڵك باش بێ و، پارێزكاریی هەر شتێكە بۆ خوا ﷻ جێگای ڕەزامەندیی بێ، دیارە بە چاكەكاریی خەڵك ڕازی دەكەی و، بە پارێزكارییش خوا!

### ٢- تەحەممولكردنی جیاوازییەكانی یەكدی:

بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە كە دەبێ مسوڵمانان جیاوازیی یەكدی تەحەممول بكەن؟ بەڵگەمان ئەوەیە كە خوای پەروەردگار ﷻ مرۆڤەكانی جیا جیا خوڵقاندووەو میزاج و بۆچوونیان جیایە، بۆیە خوای بەدیهێنەر ﷻ لە قورئاندا باسی دڵ پێكەوە جۆشدران دەكات، بەڵام باسی عەقڵ پێكەوە جۆشدران ناكا، دەفەرموێ: ﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ...﴿٦٣﴾﴾ الأنفال، بەڵام نافەرموێ: (وَأَلَّفَ بَيْنَ عُقُولِهِمْ)، چونكە دەگونجێ دڵەكان پێكەوە بن، بەڵام ناگونجێ عەقڵەكان یەك جۆرە بیركردنەوەیان هەبێ، وە ئەگەر دڵەكان پێكەوە جۆشبدرێن، ئەوە جیایی بیركردنەوەكان نەك زەرەری نیە، بەڵكو دەبێتەهۆی دەوڵەمەندیی و فراوان بوونی ئیسلام.

تۆ تەماشا بكە ئێمە ئێستا كە ژیاننامەی هاوەڵان دەخوێنینەوە – خوا لێیان رازی بێ ـ، ئەبو بەكر رایەكی هەبووە، عومەر رایەكیدیكەی هەبووە، ئەگەر ئێستا هەر یەك را هەبووایە، شتەكە بۆ ئێمە تەسك دەبوو، بەڵام ئەگەر بووە دوو را، سێ را، چوار را، شتەكە بۆ ئێمە فراوان دەبێ، بۆیە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز –ڕەزای خوای لێ بێ- دەڵێ: (مَا سَرَّنِي لَوْ أَنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ لَمْ يَخْتَلِفُوا، لِأَنَّهُمْ لَوْ لَمْ يَخْتَلِفُوا لَمْ تَكُنْ رُخْصَةٌ)[1]، واتە: (من دڵخۆش نەدەبووم ئەگەر هاوەڵانی موحەممەد ﷺ راجیاییان نەبووایە، چونكە ئەگەر ئەوان راجیاییان نەبووایە، ئێستا بۆ ئێمەش روخسەتو فراوانیی نەدەبوو)، واتە: پێمخۆشە كە راجیاییان هەبووە، بۆچی؟ چونكە شتەكە فراوان بووە بۆیان، با وێنەیەكتان بۆ بێنمەوە[2]: ئەبو بەكر – خوا لێی رازی بێ ـ لە كاتێكدا كە خەلیفە بوو، مووچەی وەك یەك دەدایە خەڵكی، یانی بەرزیی و نزمیی نەدەخستە نێوان خەڵك لە مووچە پێداندا، بەڵام عومەر –خوا لێی رازی بێ- تەماشای كردو بە ئەبو بەكری گوت: ئەوە بۆچی وەك یەكیان دەدەیتێ؟ بۆچی ئەوەی چەند ساڵە مسوڵمان بووەو ئەوەی دوێنێ مسوڵمان بووە، وەك یەكیان دەدەیتێ؟ ئەبو بەكر – خوا لێی رازی بێ- گوتی: پاداشتی مسوڵمانەتییەكەیان لە قیامەتێ وەردەگرنەوە، بەڵام ئەوە ژیانە، ژیانیش هەموویان پێویستیانە، ئاوا باشترە، كەچی عومەر – خوا لێی رازی بێ ـ لە سەردەمی

---

١) تفسير روح المعاني للآلوسي، ج: (٤)، ص: (٢٤).

٢) نَظَرَ عُمَرُ أَبَا بَكْرٍ حِينَ سَوَّى بَيْنَ النَّاسِ فَقَالَ: أَتُسَوِّي بَيْنَ مَنْ هَاجَرَ الْهِجْرَتَيْنِ وَصَلَّى إِلَى الْقِبْلَتَيْنِ، وَبَيْنَ مَنْ أَسْلَمَ عَامَ الْفَتْحِ خَوْفَ السَّيْفِ؟ فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا عَمِلُوا لِلَّهِ، وَإِنَّمَا أُجُورُهُمْ عَلَى اللَّهِ، وَإِنَّمَا الدُّنْيَا دَارُ بَلَاغٍ لِلرَّاكِبِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَا أَجْعَلُ مَنْ قَاتَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَنْ قَاتَلَ مَعَهُ". الأحكام السلطانية للماوردي، ص: (٣٠٩).

خیلافەتی خۆیدا ئەو یاسایەی گۆڕیو گوتی: ئەوەی شەڕی لە دژی پێغەمبەر ﷺ کردوە، وەك ئەوەی تەماشا ناکەم کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ جەنگی کردوە، عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- بەرزیی و نزمیی خستە نێوان مووچەکانیانەوە، هەرچەندە لە ژیاننامەی عومەردا هاتوە کە لە کۆتاییی تەمەنیدا پەشێمان بووەوەو گوتی: ڕایەکەی ئەبوبەکر باشترە، چونکە وردە وردە چینایەتیی پەیدابوو، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەردووکی دەرفەتو بوار (مجال)ی تێدا هەیە، ئێستا ئەگەر مسوڵمانان بڵێن: ئەوەیان ئیش پێدەکەین، یان ئەویدیکەیان ئیش پێدەکەین، مەجالی تێدا هەیە.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستیش ئەوەنیە کە ئێمە بتوانین کارێکی وا بکەین هەژاریی و دەوڵەمەندیی نەهێڵین، چونکە ئەوە سوننەتی خوایە ﷻ، تۆ وەك یەك مووچەیان پێ بدە، یەکێکیان بە دوو سێ ڕۆژان هەمووی سەرف دەکات، هەر بۆ خۆشی نازانێ چی لێدەکات، ئەویدیکە کارو کەسابەتی پێ دەکاتو زۆری دەکات، دیسان هەر ئەو دەوڵەمەندتر دەبێ، جاری وا هەیە بابێك میرات وەك یەك دەداتە کوڕەکانی، بەڵام دوایی یەکێکیان زۆر دەوڵەمەند دەبێو ئەویدیکەیان لە کەسابەت نازانێو هەژار دەبێ، بە هەر حاڵ، مەسەلەی ڕزقو ڕۆزیی ئەوەنیە هەموو هۆکارەکانی دیاربن، هەندێك هۆکاری پەنهانیشی هەن، کەواتە تەحەممول کردنی جیاوازییەکانی یەکدی پێویستەو بێ ئەوە ناتوانین پێکەوە بژین.

جا ئەگەر تەماشای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بکەین کە دەفەرموێ: {مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى} رواه البخاري: (٦٠١١)، ومسلم: (٢٥٨٦) واللفظ له، عن النعمان بن بشير رضي الله عنه، کەواتە: ئەندامەکان

(أعضاء)ی جۆراوجۆرن، یەك جەستە لە چەند ئەندامێك پێكدێت، ئەو ئەندامانە وەك گوتمان هەر كامێكیان ئیشی خۆی هەیە، كاری هەریەكەیان لە هی ئەوەیدیكە جیایە، كەچی هەمووشیان پێكەوە تەبان، ئایا چاو لەگەڵ لووت هیچ كێشەی هەیە؟ دەست لەگەڵ لاق هیچ ناتەبایی هەیە؟ ئەو ئەندامانە هیچ ناكۆكییان پێكەوە نیە، هەموویان هاوكاری یەكدین و، لە یەكدیش جیان و هەریەكەیان كارێكی جیای هەیە.

مسوڵمانانیش دەبێ ئاوابن، وە دەبێ جیاوازییەكان بقۆزنەوە بۆ هاوكارییان، چونكە ئەوەی بە چاو دەكرێ، بە دەست ناكرێ، وە ئەوەی بە دەست دەكرێ، بە لاق ناكرێ، وە ئەوەی بە زمان دەكرێ، بە گوێ ناكرێ، بەڵام هەر كامێكیان لە بواری خۆیدا دەتوانێ هاوكار بێ بۆ ئەویدیكە، مسوڵمانانیش دەبێ وابن.

**٣- هەڵبژاردنی چاكترین وشەو تەعبیرو دەستەواژەو شێواز لە كاتی قسەو وتووێژو هەڵسوكەوتدا:**

خوای بەرزو مەزن بۆ هەڵسوكەوت (تعامل) كردن لەگەڵ كافراندا دەفەرموێ: ﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَۚ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾﴾ المؤمنون، واتە: (بە چاكترین شێوازی قسەو رەفتار، قسەو هەڵوێستی خراپی وان پاڵپێوەنێ، ئێمە باشتر دەزانین بەوەی ئەوان دەیڵێن و وەسفی تۆی پێ دەكەن). ئەوە لەگەڵ كافراندا دەبێ وا بكەی، ئەدی لەگەڵ مسوڵماناندا؟! بۆیە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ ٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ يَنزَغُ بَيۡنَهُمۡۚ ...﴿٥٣﴾﴾ الإسراء، واتە: (وە بە بەندەكانم بڵێ: كامە قسەی چاكە ئەوە بڵێن، بێگومان شەیتان نێوانیان تێكدەدا ...)، واتە: ئەگەر

لەگەڵ یەكدیدا شێوازی جوانو دەستەواژەی جوان بەكاربێنین، بێگومان ئەوە ڕێگرییەكی زۆرچاكە لە تێكچوونی دۆستایەتییو برایەتیی، جاری وایە كەسێك بە وشەیەكی ناڕێكو بە دەربڕینێكی بریندارکەر، دڵی كەسێك دەیەشێنێ، كە ئەگەر بێو هەر ئەو مانایە بخاتە قاڵبێكی دەربڕینی جوانەوەو بە شێوەیەكی جوان بیخاتەڕوو، دڵی بەرانبەرەكەی ناڕەحەت نابێ. هەڵبەتە ئینسان دەبێ حەق بڵێ، بەڵام دەبێ حەقەكەش بە شێوەیەكی حەق بڵێ، خوای بەرزو مەزن دەربارەی قورئانی بەڕێز دەفەرموێ: ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَ ...﴿١٠٥﴾﴾ الإسراء، واتە: (ئێمە ئەم قورئانەمان لەسەر بناغەی ڕاستی دابەزاندووەو، وە بەشێوەیەكی ڕاستو بۆ چەسپاندنی ڕاستییش دابەزیوە ...).

خوای پەروەردگار ﷻ لەو كەسانەمان بگێڕێ كە هەمیشە لەگەڵ یەكدیدا حەق بڵێین بە دڵسۆزیی، بەڵام حەقەكەش بە شێوەیەكی حەقو چاك بڵێین، بە شێوەیەكی وا بێ كە لە ئاستی بەرزی ئیسلامو، دۆستایەتییو برایەتیی ئیمانییو ئیسلامییماندا بێ.

# بنەمای چواردەیەم

## خۆ بژاركردنی ئەندامان لە خووە خراپ و پەستەكان و، خۆ ڕازاندنەوەیان بە ئاكارو ڕەوشتە جوان و پەسندەكان.

خۆ بژاركردنی یەك یەكی ئەندامانی كۆمەڵ لە خووو خدە پەستەكان (الرذائل) و خۆ ڕازاندنەوەیان بە خەسڵەتە بەرزو پەسندەكان (الفضائل)و، هەڵسوكەوت كردنیان لەگەڵ تێكڕای خەڵكیدا بەپێی ئەدەبو ڕەوشتە بەرزو جوانەكانی ئیسلامو، خۆپاراستن لە هەرجۆرە ئەزیەتدانو زیان گەیاندنێك بە خەڵكی، بە دڵو زمان و ئەندامەكانی دیكەو، كۆششكردن بۆ سوود پێگەیاندنیان، بە دڵو زمانو دەستو ماڵو سامان، وەك:

١- خوای بەخشەر ﷻ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤﴾ الأعلى. واتە: (بەڕاستی سەرفرازە كەسێك كە خۆی تەزكیە كردوە)، واتە: خۆی پاكو چاك كردوە.

٢- هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ٢٠ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ٢١ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ

سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾﴾ الرعـد، واتـە: (ئایا كەسێك كـە دەزانـێ ئـەوەی لـە پەروەردگارتـەوە بـۆ تـۆ دابـەزێنراوە، حەقـە، وەك ئـەو كەسـە وایـە كـە كوێرە؟ بێگومـان تـەنیا خـاوەن عـەقڵان بیردەكەنـەوەو پەنـد وەردەگـرن، ئەوانـەی كـە پـەیمانی خـوا بـەجێ دێـنن‌و پەیمانی پتەو ناشكێنن، وە ئەوانـەی كـە ئـەوەی خـوا فـەرمانی پـێ كـردوە، بگەیەندرێ، لە پەیوەندییەكان دەیگەیەنن، وە لە پـەروەردگاریان دەترسـن‌و لـە لێپرسـینەوەی خـراپ دەترسـن، وە ئەوانــەی كـە لەبـەر ڕەزامەنـدیی پەروەردگاریان خۆڕادەگرن‌و نوێـژ بەرپادەكـەن‌و، لـەوەی كـە پێمانـداون بـە پەنهانیی‌و بە ئاشكرا دەبەخشن، وە بە هەڵوێسـت‌و قسـەی چـاك هـی خـراپ پاڵ پێوەدەنێن، ئا ئەوانە سەرەنجامی مەنزڵگـای دوارِۆژیان بۆ هەیە).

٣- هـــەروەها خـــوا ﷻ فەرموویـــەتی: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾﴾ الأعراف، واتە: (ئەوەی كە ئاسانە وەریبگرە و فەرمان بـە چاكە بكە و پشت لە نەفامان بكە)، واتە: پشتگوێیان بخە.

٤- پێغەمبـەریش ﷺ فەرموویـەتی: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَاجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ) رواه البخـاري: (١٠) واللفـظ لـە، ومسلم: (٤١)، عن عبدالله بن عمرو بن العاص، واتە: (مـسوڵمان كەسـێكە كـە مسوڵمانان لە زمان‌و دەستی سـەلامەت‌و پارێزراو بن، وە كۆچـكەر كەسـێكە واز لە شـتێك بێنـێ كە خوا قەدەغـەی كردوە).

٥- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ} رواه البخـاري: (١٣)، ومـسلم: (٤٥)، عـن أنـس بـن مالـك، واتە: (یەكێك لە ئێوە ئیمـان ناهێنـێ، تـاكو ئـەوەی بـۆ خـۆی پێـی خۆشـە، بۆ برایەكەیشی پێـی خۆشـنەبێ).

## روونكـردنەوە:

خـوا یاریـدەدەر بـێ، ئێمـە لـە پێـنج خاڵــدا ئـەم بنەمایـە دەتوێژینـەوەو روون دەكەینــەوە:

**یەك: ئەدەبی بەرزو رەوشتی پەسندو جوان، تایبەتمەندیترین نیشانەو ئیمتیازی خەڵكی ئیسلامییە لەگەڵ سەرجەم خەڵكیدا و، هەركات ئیمانو عەقیدە دامەزراوو خواپەرستیی راستو ساغ بوو، مسۆگەر رەوشتو ئەدەبیش بەرزو جوان دەبێ:**

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە كە هەر كاتێك عەقیدە دامـەزراو بـوو، وە خواپەرسـتیی راستو ساغ بوو، رەوشتیش بەرزو جوان دەبێ، ئـەم دوو ئایەتـە بـەپێزەی خـوای پــەروەردگارە ﷻ كــە دەفــەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾﴾ إبـراهيم واتە: (ئایا سەرنج نادەی چۆن خوا وێنەیەكی هێناوەتەوە! وشەیەكی پاكو چاك وەك درەختێكی پاكو چاكو بەردارە، كـە رەگوریـشەكەی چەسـپاوە لـە زەویـداو لـقو پۆپەكانیشی بەرزبوونەتەوە بەرەو سەرێ، لە هەموو كاتێكدا بە ئیزنی پـەروەردگاری بـەرو میوەكـەی دەردەكـات[1]، ئـاوا خـوا وێنـە دێنێتـەوە بـۆ خـەڵكی، بۆئـەوەی بیربكەنەوەو پەندوەربگرن).

---

١) واتە: هەمیشە میوەدارو بەرهەمدارە.

لێرەدا خوا ﷻ سێ شتی لە درەخت باسكردوە، هەڵبەتە درەخت وێچوێندراوە (مُشَبَّهٌ بِهَا)یەو (كَلِمَةً طَيِّبَةً) بە درەخت چوێندراو (مُشَبَّه)ە، كە لەسەر رای زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە (كَلِمَةً طَيِّبَةً) وشەی تەوحیدە (لا إلهَ إلاّ الله)، واتە: (بێجگە لە خوا ﷻ هیچ پەرستراو نین)، وشەی تەوحید ئەو (كَلِمَةٌ طَيِّبَةٌ)یە كە خوا ﷻ بە درەختێكی بەرداری دەچوێنێ، جا درەختە بەردارەكە خوا ﷻ سێ شتی لێ باس دەكات: (أَصْلْ)و (فَرْعْ)و (أُكُلْ)ەكەی، (أَصْلْ)ەكەی دیارە رەگوڕیشەكەیەتی و، (فَرْعْ)ەكەی دیارە لقو پۆپو گەڵاكەیەتی، وە (أُكُلْ)ەكەشی بەرو میوەكەیەتی.

جا ئایا چۆن بەراورد دەكرێ لەنێوان پێكهاتەكانی مسوڵمانەتییو خوا بەیەكگرتن (توحید)و پێكهاتەكانی ئەو درەختەدا، ئاوا بەراورد دەكرێ، كە ئیسلامەتییش سێ بەشی سەرەكییە:

١/ ئیمانو عەقیدەیە كە لە عەقڵو دڵدا جێگیردەبێ، وەك چۆن رەگوڕیشەی درەختەكە بە زەویدا بڵاودەبێتەوەو دەچەسپێ، ئیمانو عەقیدەش لە عەقڵدا وەك تێگەیشتن، وە لەدڵدا وەك قەناعەت پێهێنانو قبوولكردن جێگیردەبێ، هەروەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ ...﴿٢٢﴾﴾ المجادلة، واتە: (...ئەوانە خوا ئیمانی لەدڵدا نووسیون ...)، هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿... وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ ...﴿١٤﴾﴾ الحجرات، واتە: (... وە جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵەكانتانەوە ...).

٢/ وە پاشان پابەندیی و ئیلتیزام بە ئیسلامەوە، لە جێی لقو پۆپەكانە، كە ئەو پابەندییەش لەسەر ئەندامە رواڵەتییەكانی ئینسان دەردەكەوێ.

٣/ وە دوایین بەشی مسوڵمانەتییش بریتیە لە ئاكارو رەوشتی بەرزو پەسندو جوان، هەروەك چۆن درەخت ئەگەر رەگو ریشەكەی باش چەسپیبێ‌و، قەدو لق‌و پۆپ‌و گەڵایەكانی ساغ بن‌و، بەرداریش بێ، بە تەئكید میوەش دەردەكـات، بەهـەمان شێوەش ئەگەر ئینسان بەڕاسـتی ئیمـان‌و عەقیدەكـەی چەسـپابێ‌و، عیبـادەت‌و تاعەتەكەی بۆ خوا راست بێ، ئەخلاق‌و ئاكارو رەوشتیشی بەرزو پەسند دەبێ.

كەواتە: ئەوە خاڵێكی زۆر گرنگە كە ئێمە بزانین تایبەتمەندیترین‌و سـەرەكییترین نیشانەی ئینسانی مسوڵمان‌و كۆمەڵگای مسوڵمان، بریتیە لە ئاكارو رەوشتی بـەرزو پەسندو جوان، ئەگەرنا هەموو كەس دەتوانێ قسەی چاك بكـات‌و رواڵـەتی جـوان پێشان بدا، بەڵام بەڕاستی رەوشتی جوان‌و ئاكاری بـەرزو پەسـند (الفـضائل) تـەنیا ئیمانداران دەتوانن هەتا سەر لە خۆیانیاندا بێننەدی.

هەڵبەتە بابای بێ ئیمانیش دەتوانێ لە هەڵوێستێكدا راستگۆبێ یان بەخـشندەبێ، بەڵام هەموو رەوشتە بەرزو جوانەكان‌و هەتا سەر بەس لە ئیمانەوە پەیدادەبن.

**دوو: خـووو رەوشـتی بـەرزو پەسـند هـەڵقوڵاوی نەفـسی تەزكیـەكراوە(١)و گۆزە چـی تێـدابێ ئـەوەی لێ دەڕژێ. بـۆ نموونـە: خۆشویـستن (حـب)و بەخشین (عطاء)و رق لێبوونـەوە (بغض)و دەست گرتنـەوە (منـع):**

بەڵگەمان لەسەر ئەوە ئەو فەرموودەیەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا دەفـەرموێ: {مَنْ أَحَـبَّ للهِ، وَأَبْغَـضَ للهِ، وَأَعْطَـى للهِ، وَمَنَـعَ للهِ: فَقَـدْ إِسْـتَكْمَلَ الإِيــمَانَ} رواه

---

١) خووڕەوشتی بەرزو پەسند لە چییەوە پەیدادەبێ؟ كێ دەتوانێ خـۆی بـە خووڕەوشـتی بـەرزو پەســند بڕازێنێتــەوە؟ كەسـێك كــە خــاوەنی نەفـسی تەزكیــەكراو بێ، بۆچی؟چــونكە وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (گۆزە چیی تێدابێ ئەوەی لێدەڕژێ)، وە عەرەبیش دەڵێن: (وَكُلُّ إِنَاءٍ بِالَّذِي فِيهِ يَنْضَحُ)، واتە: (هەر دەفرێك چی تێدابێ، كە خوارت كردەوە هەر ئەوەی لێدەڕژێ).

أبوداود: (٤٦٨٠) عن أبي أمامة، وصححه السيوطي والألباني، واتە: (هەر کەسێك لەبەر خوا خەڵکی خۆشبوێ، وە لەبەر خوا خەڵك ببووغزێنێ، وە لەبەر خوا ببەخشێ، وە لەبەر خوا دەست بگرێتەوە، ئەوە ئیمانەکەی تەواوە).

تەماشادەکەین پێغەمبەر ﷺ خۆشویستن‌و بوغزاندنی پێش خستوون، ئینجا دوایی بەخشین‌و نەبەخشین، چونکە ئینسان ئەگەر کەسێکی خۆشویست، ئینجا ئەو خۆشویستنەی پاڵی پێوەدەنێ کە هاوکاریی بکات‌و پێی ببەخشێ، وە ئەگەر رقی لە کەسێك هەڵسا، ئینجا ئەو رق‌و بوغزە وای لێدەکات، کە پێی نەبەخشێ‌و هاوکاریی نەکا.

کەواتە: هەموو کردەوەکان ریشەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ دەروون (نَفْس)، جا ئەگەر دەروونەکە تەزکیەکراوو پاك‌و چاك بێ، ئەوە مسۆگەر کردەوەو رەوشت‌و رەفتارو ئاکاری پاك‌و چاکی لێ پەیدادەبێ، دەروونی تەزکیە نەکراویش هەر کردەوەو رەوشت‌و رەفتاری لە قەدەر خۆی لێ پەیدادەبێ.

کەواتە: ئەگەر بمانەوێ ئاکارو هەڵسوکەوت‌و رەوشتمان بەرزو پەسندو جوان بکەین، پێشتر دەبێ خەم لە نەفسەکەمان بخۆین‌و تەزکیەی بکەین، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤﴾ الأعلى، واتە: (بەڕاستی سەرفرازە ئەوەی کە خۆی پاك‌و چاك کرد).

وشەی (تزكية): کە لە (زَكى، يَزْكُو، زَكاةً وَتَزْكِيَةً) هاتوە، بە مانای (نَمَا) دێ، واتە: گەشەی کرد، وە بە مانای (طَهُرَ) دێ، واتە: پاك بۆوە، وە بە مانای (صَلَحَ)ش دێ، واتە: چاك بوو، مانای وایە وشەی (تزكية) لە یەك کاتدا سێ مانایان دەگرێتەخۆی: پاك بوون و، چاك بوون و، گەشەکردن، کە دیارە نەفس بە ئیمان‌و خواناسین‌و خۆشویستنی خوا ﷻ‌و بەندایەتیی کردن بۆ خوا ﷻ، پاك دەبێ‌و

چاك دەبێ‌و گەشەدەكات، وەك خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ الرعد، واتە: (ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو بە یادی خوا دڵیان دادەمرکێ‌و ئۆخژنی بۆ دێ‌و ئارام دەگرێ، ئاگادار بن! تەنیا بە یادی خوا دڵەكان ئارام دەگرن)، بەڵێ، دڵی ئینسان، لایەنی مەعنەویی ئینسان، تەنیا بە پەیوەندیی لەگەڵ خوادا ﷻ ئۆخژنی بۆ دێ‌و ئارام دەگرێ، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (الفجر)دا ئینسانی ئیماندار دەدوێنێ‌و دەفەرمویٚ: ﴿يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾﴾، واتە: (ئەی نەفسی ئارامگرتوو![1] بگەڕێوە بۆ لای خاوەن‌و پەروەردگارت، تۆش ڕازی‌و خواش لێت ڕازی)

## سێ: نۆ خەسڵەتی بنەڕەتیی بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ خوا ﷻ‌و خەڵكدا بەڵگەو نیشانەی ئیمان‌و عەقڵن:

خوای پەروەردگار ﷻ لە ئایەتەكانی (١٩ ـ ٢٢)ی سوورەتی (الرعد)دا، نۆ خەسڵەتی سەرەكییمان بۆ دەخاتەڕوو، كە ئینسان‌و خەڵكی مسوڵمان دەبێ بەپێی ئەو نۆ خەسڵەتە سەرەكیی‌و بنەڕەتییە، مامەڵە لەگەڵ خوا ﷻ‌و لەگەڵ خەڵكی خوادا بكات، وە ئەو نۆ خەسڵەتە خوای پەروەردگار ﷻ داینـاون بە بەڵگەو نیشانەی ئیمان‌و عەقڵ، واتە: هەر كەسێك ئەو نۆ سیفەتەی تێدابن، هەم ئیمانی هەیەو هەم عاقڵە، بەڵگەشمان ئەوەیە كە خوای بەرزو مەزن ئایەتەكان ئاوا دەست پێدەكات:

﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ

١) كە بەهۆی یادی خواو ئیمان بە خواو بەندایەتیی بۆ خواوە ئارامی گرتوە.

يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ
وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟
ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى
ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾﴾ الرعد، كە پێشتر مانام كردن.

بەڵێ كەسێك بزانێ ئەوەی لەلایەن خواوە ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزێنراوە، هەقە، مانای وایە ئیمانی پێ ی هەیەو ئیماندارە، وە پێچەوانەكەی ئینسانی كوێرە، واتە ئەو كەسەی دەركی ئەو حەقیقەتە ناكاتو پەی پێ ی ناباو ئیمانیشی پێ ی نیە.

كەواتە: ئەو نۆ سیفەتەی كە باسیان دەكات، هی كەسێكە كە ئیمانی هەیە، عاقڵێتییەكەش لەكوێدایە؟ لەو شوێنەدا كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾. كەواتە: ئەوانەی ئەو نۆ سیفەتەیان تێدان هەم خاوەنی ئیمانن و، هەم خاوەن عەقڵن.

(أَلْبَابْ) كۆی (لُب)ە، (لُب)یش واتە: كاكڵ، لە زمانی عەرەبیدا لەبەرئەوە بە عەقڵ دەگوترێت كاكڵ، چونكە وەك چۆن خەڵك لەبەر كاكڵەكەی گوێز دەكڕێ، نەك لەبەر توێكڵە قرپۆكەكەی، گوێزی قرپۆك و بێ كاكڵ كەس نایەوێ، ئینسانیش بە عەقڵەوە ئینسانە، بە ئەندازەی ئەوەی كە عەقڵی هەیەو بەكاریدێنێ، ئینسانەو ڕێزی هەیە، ئەگەرنا ڕێزو حورمەتی خۆی لەدەستدەدا، بۆیە خوا ﷻ ئەوانەی بێ بڕوان وەك ماڵات و ئاژەڵ تەماشایان دەكات، دەفەرموێ: ﴿... وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾﴾ محمد، واتە: (... وە ئەوانەی كە بێ بڕوان، ڕادەبوێرن و دەخۆن وەك چۆن ئاژەڵ و ماڵات دەخوات، وە سەرەنجامیشیان ئاگرە).

جا ئەو نۆ سیفەتە ئەمانەن:

١- وەفاداربوون بە پەیمانی خوا (وفاء بعهد الله):

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: (ئەوانەی کە وەفادارن بە پەیمانی خواو، پەیمانی خوا بەجێ دێنن)، پەیمانی خوا ﷻ چییە؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ ...﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف، واتە: (کاتێك پەروەردگارت لە پشتی ئادەمزادەکان وەچەکەیانی وەرگرتو پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: با، شایەدییمان دا ـ لەسەر ئەوەـ[1] ...).

توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان لەسەر ئەم ئایەتە کردوە، بەلام ئەوەی کە دێتە زەینەوەو لەلای من مانایەکی پەسندو راستە، ئەوەیە کە خوا ﷻ لێرەدا دەیەوێ تێمان بگەیەنێ کە هەموو ئینسانێکی وا خوڵقاندوە بیناسێ، وە دان بە پەروەردگارێتی خوا ﷻو بەدیهێنەرێتی خوا ﷻدا بێنێ بۆخۆی، وە سەرەنجام دەبێ هەر ئەو پەروەردگارەش بپەرستێو بەندایەتیی هەر بۆ ئەو پەروەردگارە بکات.

ئا ئەوە پەیمانێکە خوا ﷻ لە هەموو ئینسانێکی وەرگرتوە، هەموو ئینسانێکی وا خوڵقاندوە بیناسێو بزانێ پەروەردگاری کێیە؟ وە بەڵگەش لەسەر ئەوە زۆرنو، کێ زۆر کافرە کە لێی بقەومێو دەستی لە هەموو پنچکان ببڕێ، بەبێ ئەوەی کە رۆژێك لە رۆژان باسی خوا ﷻی کردبێ، یاخود هاواری لە خوا ﷻ کردبێ، یەکسەر هاوار دەکاتە خوا ﷻ، وەك خوا ﷻ لە قورئاندا بۆمانی باسدەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوۡجٞ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ

---

١) واتە: شایەدییان دا لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ پەروەردگاریانە.

ٱلدِّينَ ...﴿٣٢﴾﴾ لقمان، خوا ﷻ باسی هاوبەش بۆ خوا دانەران (المشركين)و بێبڕوایان (الكافرين) دەكات و دەفەرموێ: (وە كاتێك كە شەپۆلێكی دەریا[1] وەك سێبەر[2] دایپۆشین، لە خوا دەپاڕێنەوەو گەردنكەچیی خۆیانی بۆ ساغ دەكەنەوەو، بێجگە لە خوا كەسیدی ناناسن ...)، ئەوەی خوا ﷻ دەیفەرموێ وایە، هەموو ئینسانێك كە دەستی لە هەموو پنچكان دەبڕێ، هاواردەكاتە خوا ﷻ، كەواتە ئەوە ئەو پەیمانەیە كە خوا ﷻ لە خەڵكی وەرگرتوە (وەفا بە پەیمانی خوا ﷻ).

## ٢- هەڵنەوەشاندنەوەی ئەو پەیمانە پتەوە (عدم نقض الميثاق):

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ﴾، واتە: (وە پەیمانی پتەو ناشكێنن)، میثاق: پەیمان (عَهْدْ)ێكە سوێندی لەسەر خورابێ و تەئكیدی لەسەر كرابێتەوە، هەڵیناوەشێننەوە.

وەفا پێ كردن شتێكەو، هەڵنەوەشاندنەوەشی شتێكی دیكەیە، پێیەوە پابەندن و هیچ شتێكیش ناكەن پێچەوانەی ئەو پابەندییە بێ.

---

١) دەریا زۆر بە سامە، بەتایبەتی كە ئەو كەشتییە دەكەوێتە نێو شەپۆلان و دەبێتە گێژەڵووكەو بای بەهێز ئەو كەشتییە زلە دێنێ و دەبا، ئێمە لە ساڵی (١٩٩٨)دا لە (ماڵتا)وە چووین بۆ (بنغازی)ی لە لیبیا، كەشتییەك حەوت قات بوو دەوری (٣٠٠٠) سێ هەزار كەسی دەبرد، لە سەری گەڕانەوەماندا بایەكی زۆر بەهێز لێیداین، وەك دەڵێن خەڵك ڕۆحی گەیشتبووە سەری لووتی، ئەو بەرگەی كە بە حیساب بۆ ڕزگاركردنە دابەشیان كرد و، خەڵكەكە لەبەریانكرد بۆ ئەوەی كە ئەگەر كەشتییەكە نقوم بوو خۆمان فڕێ بدەینە نێو دەریا، ئەو كەشتییە زلە وەك تەختە دارێكی بچووك ئەو شەپۆڵە گەمەی پێ دەكرد، ئاوا ڕۆدەچوو دەمانگوت تازە ڕۆیشت، بەم لایدا دەكەوت دەمانگوت بەولایدا دەكەوێ، ئەمجارە بەولایدا دەهاتەوە.

٢) كە شەپۆڵی زۆر گەورە دێ، وەك شاخ سێبەرت لێ دەكا، دڵی ئەو شەپۆلە تازە حیسابم تەواودەكات!

**٣- گەیاندنی پەیوەندییەکان (صلة العلاقات):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾، واتە: (وە ئەوانەی کە ئەوەی خوا فەرمانی پێ کردوە بگەیەندرێ لە پەیوەندییەکان، دەیگەیەنن)، جا ئایا مەبەست لە گەیاندنی ئەو پەیوەندییانەی کە خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە بگەیەنرێن، چییە؟!

هەندێك لە زانایان ئەوەیان بە پەیوەندیی خزمایەتیی لێکداوەتەوە، بەڵام چەمك‌و واتای ئایەتەکە لەوە فراوانترەو، هەم گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیەنێ‌و، هەم چاکە کردن لەگەڵ دایك‌و باب دەگەیەنێ‌و، چاکە کردن لەگەڵ ماڵ‌و منداڵ‌و دەرو دراوسێ‌و لێقەوماوان‌و میوان‌و، لەگەڵ هەموو کەس دەگەیەنێ، هەموو ئەو پەیوەندییانەی خوا ﷻ فەرمانی پێکردوون کە دەبێ بگەیەندرێن، هەموو ئەو پەیوەندییانە دەگەیەنن، سەرنج بدەن: پێشێ خواپەرستیی، ئینجا خەڵك دۆستیی‌و چاکە کردن لەگەڵ خەڵك.

**٤- ترسان لە پەروەردگار (خشية الرب):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ﴾، واتە: (وە لە پەروەردگاریان دەترسن)، ترسانێك کە بە گەورەگرتنی لەگەڵدابێ، توێژەرەوان‌و شارەزایانی زمان دەڵێن: وشەی (خَشْيَة) ترسێکە کە بە گەورەگرتن‌و مەزن گرتن (تعظيم)ی لەگەڵدا بێ، بەڵام وشەی (خَوْف) ئەوەی لەگەڵدا نیە.

**٥- ترسان لە لێپرسینەوەی خراپ (خوف سوء الحساب):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ﴾، واتە: (وە لە لێپرسینەوەی خراپ دەترسن)، لێپرسینەوەی خراپ ئەوەیە کە ئینسان وەڵامی پرسیارەکانی خوای پەروەردگار ﷻی پێ نەبێ.

**٦- خۆڕاگـریی لەبەر خـوا (الصبـر في الله) ﷻ:**

جاری وا هەیە کەسێك خۆڕادەگرێ لەسەر شتێك، چونکە لە پێـچەوانەکەی دەترسێ، وە جاری وایە خۆڕادەگرێ، لەبەرئەوەی تەماعکارییەکی هەیە، بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ﴾، واتە: (وە ئەوانـەی کە لەبەر ڕەزامەندیی پەروەردگاریان خۆڕادەگرن)، نەك لەبـەر تـەماعێك، یـان لەبەر زەرەرێك، بەڵکو هەر بۆئـەوەی خـوا ﷻ لێیـان ڕازی بـێ، خـۆڕادەگرن لەسەر ئەوەی کەسێك نەفامییان لەگەڵ دەکات، یاخود حەقێکی دەفەوتێ، یـان لەسەر تاعەت خۆڕادەگرن، لەسەر موسیبەت خۆڕادەگرن، لە بەرانبەر خراپەی خراپەکاراندا خۆڕادەگرن، هەمووی دەگرێتەوە.

**٧- نوێژ بەرپاکردن (إقـامة الصــلاة):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، واتە: (وە نوێژ بەرپـادەکەن).

**٨- بەخشین بە پەنهـانیی و بە ئاشکرا (الإنفـاق سـراً وعـلانية):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾، واتە: (وە لەوەی کە پێمانداون بە پەنهانیی و بە ئاشکرا دەبەخشن)، ئەگەر پێویـست بـە پـەنهانیی بکات بە پەنهانیی دەبەخشن، جاری واش هەیە ئەگەر پێویست بکات بە ئاشکرا ببەخشن بە ئاشکرا دەبەخشن، جا هەندێك کەس لێرەدا مـشتومڕێکی بـێ جـێ دەکەنو دەڵێن: ئایا بـە پـەنهانیی باشـترە یـان بـە ئاشـکرا؟ یـەکێك دەڵـێ: بـە ئاشکرا، یەکێکی دیکە دەڵێ: بە پەنهانیی، بەڵام ئەوە پێویست ناکـا، خـوا ﷻ دەفەرموێ: بە ئاشکراش ببەخشنو بە پـەنهانییش، وە لـە ڕاسـتیدا بـە ئاشـکرا بەخشین، یان بە پەنهانیی بەخشین، دەگەڕێتەوە سەر حاڵـەتی جیاجیـا، جـاری

وایە وا باشە بە ئاشکرا ببەخشین و، جاری واش هەیە بە پەنهانیی بەخشین باشترە، لێقەوماوێك دێ روو لە کۆمەڵێك دەکات دەڵێ: یارمەتییەکم بدەن، هاوکارییەکم بکەن، تۆ ئەگەر لەو کاتەدا لە خۆت رابیینیی و نیەتت باش بێ و بە ئاشکرا ببەخشی، خەڵك چاو لە تۆ دەکات و ئەو بە ئاشکرا بەخشینە باشترە، وە لێرەدایە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ ...} رواه مسلم: (١٠١٧) واللفظ له، والنسائي: (٢٥٥٤)، وابن ماجه: (٢٠٣)، واتە: (هەر کەسێك لە ئیسلامدا رێیەکی باش بشکێنێ، جا ـ دوای ئەو کار بەو رێبازە بکرێ ـ، بە قەدەر خێرو چاکەی ئەو کەسەی بۆ دەنووسرێ کە کاری پێدەکات، بێ ئەوەی هیچ لە خێرو چاکەیان کەمبێتەوە ...).

کەی پێغەمبەر ﷺ ئەو فەرموودەیەی فەرموو[1]؟ کۆمەڵێك عەرەبی دەشتەکیی هاتنەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، کە هەژاریی و نەداریی بە نێو

---

١) عَنِ الْمُنْذِرِ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي صَدْرِ النَّهَارِ، قَالَ: فَجَاءَهُ قَوْمٌ عُرَاةٌ حُفَاةٌ مُجْتَابِي النِّمَارِ أَوِ الْعَبَاءِ مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ عَامَّتُهُمْ مِنْ مُضَرَ، بَلْ كُلُّهُمْ مِنْ مُضَرَ، فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ ﷺ لِمَا رَأَى بِهِمْ مِنَ الْفَاقَةِ فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ...﴿١﴾﴾ النساء، إلى آخر الآية: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾، والآية التي في الحشر: ﴿وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ...﴿١٨﴾﴾ الحشر، تَصَدَّقَ رَجُلٌ مِنْ دِينَارِهِ، مِنْ دِرْهَمِهِ، مِنْ ثَوْبِهِ، مِنْ صَاعِ بُرِّهِ، مِنْ صَاعِ تَمْرِهِ "حتى قال" وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ. قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ بِصُرَّةٍ كَادَتْ كَفُّهُ تَعْجِزُ عَنْهَا، بَلْ قَدْ عَجَزَتْ، ثُمَّ تَتَابَعَ النَّاسُ حَتَّى رَأَيْتُ كَوْمَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَثِيَابٍ، حَتَّى رَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَتَهَلَّلُ كَأَنَّهُ مُذْهَبَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: {مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا} رواه مسلم: (١٠١٧).

چاوانیانەوە دیاربوو، زۆر رووتو رەجاڵ بـوون، پێغەمبـەر ﷺ دەموچـاوی موبارەکی تاریك داهاتو زۆری پێناخۆش بوو کە ئەوانـەی بـەو جـۆرە بینـی، ئیدی یـەکێك یارمەتیـدان، خەڵکیدیکـەش لـە دوای ئـەو هاوکارییـان کـردنو یارمەتییانـدان، جـا پێغەمبـەر ﷺ رووی موبـارەکی وەك پارچـە مانگێـك درەوشایەوە[١]، لەو حاڵەتەدا ئەو فەرموودەیەی فەرموو.

واتـە: هـەر کەسـێك هـەنگاوێکی خێـر بنـێو رێیـەکی بـاش بـشکێنێ و، خەڵکیدیکە چاوی لێبکەن، پاداشـتی ئەوانیـشی هەیـەو لـە هـی ئـەوانیش کـەم نابێتەوە، هـەتا رۆژی قیامـەت چـەند کەسـیدیکە ئـەو چـاکەیە بکـەن بـەهۆی ئەوەوە، بە قەدەر هەمووان پاداشتی هەیە، بێ ئەوەی کە لـە هـی ئـەوانیش کـەم بێتەوە، هەروەها بە نسبەت خراپەشەوە هەروایە.

**٩- پاڵپێوەنانـی هەڵوێـستو قسەی خـراپ بـە هـی چـاك (درء السيئة بالحسنة):**

خـــوا ﷻ دەفـــەرموێ: ﴿وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ﴾، واتـــە: (وە بـــە هەڵوێستو قسەی چاك هی خراپ پاڵ پێوەدەنێـن).

ئەو نۆ سـیفەتە، خوا ﷻ کەسانێکی پێ وەسـفکردوون کـە ئـەهلی ئیمـانو ئەهلی عەقڵن.

---

١) جا هەندێك خەڵکی نەشارەزا لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: ئەوە بەڵگەیە لەسـەر رەوایـی داهێنراوی چاك (البدعة الحسنة)، نا، ئەوە هیچ پەیوەندی بە داهێنراوەوە نیە.

**چوار: كەم چاوەڕوانیی لە خەڵك‌و، چاكەكاریی‌و، چاوپۆشیی، سێ بنەڕەتی گەورەی ڕەوشت بەرزیی‌و مامەڵەی جوانن لەگەڵ خەڵكیدا:**

خوشك‌و برا خۆشەویستەكان! ئەو سێ بنەڕەتە:

١/ ئینسان چاوەڕوانیی لە خەڵكی نەبێ، یان چاوەڕوانیی كەم بێ.

٢/ چاكە بكات بێ ئەوەی تەماشای خەڵك بكات، داخۆ چاكە دەكەن یان نا؟ هەر بۆخۆی لە زاتی خۆیدا چاكەكار بێ.

٣/ چاوپۆشیی بكات لە كەم‌و كوڕیی خەڵكی.

هەر كەسێك ئەو سێ سیفەتەی تێدابن، بەڕاستیی دەتوانێ ڕەوشتی بەرزو جوان لە خۆیدا بێنێتەدی، بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكیدا.

ئەم سێ سیفەتەشمان لەم ئایەتە بەپێزە وەرگرتوون: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾﴾ الأعراف، واتە: (ئەوەی ئاسانە لە خەڵك وەریبگرە، وە فەرمان بە چاكە بكە، وە پشت لە نەفامان بكە)، وشەی (العفو) وایان لێكداوەتەوە: (أي ما يَسْهُلُ قَصْدُهُ وَتَنَاوُلُهُ)، واتە: (ئەوەی دەگونجێ بە ئاسانیی بكرێتە ئامانج و، بە ئاسانی ئینسان دەستی دەیگاتێ).

(إبن كثير) لەوبارەوە گوتوویەتی: (قَالَ بَعْضُ الْعُلَمَاء: النَّاسُ رَجُلان: فَرَجُلٌ مُحْسِنٌ فَخُذْ مَا عَفَا لَكَ مِنْ إِحْسَانِهِ وَلا تُكَلِّفْهُ فَوْقَ طَاقَتِهِ وَلا مَا يُحْرِجُهُ، وَإِمَّا مُسِيءٌ فَمُرْهُ بِالْمَعْرُوفِ، فَإِنْ تَمَادَى عَلَى ضَلالِهِ وَاسْتَعْصَى عَلَيْكَ وَاسْتَمَرَّ فِي جَهْلِهِ فَأَعْرِضْ عَنْهُ فَلَعَلَّ ذَلِكَ يَرُدُّ كَيْدَهُ) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير ص: (٥٢١)، واتە: (هەندێك لە زانایان گوتوویانە: خەڵك دوو جۆرە پیاون: یەكێكیان چاكەكارە، ئەوەی كە بە ئاسانیی لە چاكەی ئەو دێتە دەستت وەریبگرەو

شتێكی لێ داوامەكە كە لە توانایدا نەبێ، یان سەغڵەتی بكات، یاخود خراپەكارە، تۆ فەرمانی پێ بكە بە چاكە، جا ئەگەر لەسەر گومڕایی خۆی بەردەوام بووو لێت عاسێ بووو بەردەوام بوو لەسەر نەفامیی خۆی، ئەوە پشتی تێبكە بەڵكو پیلانەكەی هەڵبوەشێنێتەوە).

ئەوە زۆر شتێكی گرنگە، هی وا هەیە زۆر خەڵكی سەغڵەت دەكات، شتێكیان لێ چاوەڕوان دەكات كە لە توانایاندا نیە، ئەو كەسەش لە رووددا دەمێنێ، بۆیە خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كردووە كە بڵێ: ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ (٨٦)﴾ ص، واتە: (بڵێ: من هیچ كرێتان لێ داوا ناكەم، وە من تەكلیفیشتان ناخەمە سەر). واتە: تووشی سەغڵەتیی و ئیحراجییتان ناكەمو، هیچ چاوەڕوانییەكم لێتان نیە.

## پێنج: بەبێ خۆپاراستن لە زیانگەیاندن بە خەڵكو بۆ دڵسۆزبوونیان، مرۆڤ نابێتە مسوڵمانو بڕواداری تێرو تەواو:

ئەمە لەوەوە وەردەگرین كە پێغەمبەر ﷺ زۆر بە روونیی و راشكاویی دەفەرموێ: {الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَاجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ} رواه البخاري: (١٠) واللفظ له، ومسلم: (٤٠) عن عبدالله بن عمرو بن العاص. كەواتە: كەسێك بە زمان زیان بە مسوڵمانان بگەیەنێو ئازاریان بداتو، بە دەست ئازاریان بدا، پێناسەی مسوڵمانی تێرو تەواو نایگرێتەوە، ئەوە بۆ مسوڵمانێتی، بۆ ئیمانداریتییش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ} رواه البخاري: (١٣)، ومسلم: (٤٥)،

عن أنس بن مالك. وه بە پێچەوانەشەوە، چی بۆ خۆی پێی ناخۆشە بۆ ئەویش پێ ی ناخۆش بێ، ئینجا بەو ئیماندارە لە قەڵەم دەدرێ كە خوا ﷻ دەیەوێ.

لێرەدا پێویستە تۆزێك ئەوە ڕوونبكەینەوە، (إبن حجر القسطلاني) كە یەكێكە لەو كەسانەی شەرحی (صحيح البخاري)یان كردوە، لە ڕاڤەكردنی ئەم ڕستەیەدا: {لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ}[1] دەڵێ: (ويُحْتَمَلُ أن يكون قوله –لِأَخِيهِ– شاملاً للذمِّيِّ أيضاً بأن يحب له الإسلام مثلاً)[2]، واتە: (دەگونجێ وشەی –لِأَخِيهِ، واتە: بۆ برایەكەشی ـ، نامسوڵمانێكیش بگرێتەوە كە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژی، بۆ وێنە چۆن ئیسلامەتیی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ ئەویش پێی خۆشبێ).

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كە وشەی (أَخْ) لە بەكارهێنانی زانایاندا و لە بەكارهێنانی فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوادا ﷺ، تایبەت نیە بە برای دینییەوە، چونكە كابرای نامسوڵمان (الذمي) برای دینیی نیە، دوایی (القسطلاني) بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (ويؤيده حديث أبي هريرة: ... وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُسْلِمًا) رواه الترمذي: (٢٣٠٥) واللفظ له، وابن ماجه: (٤٢١٧)، وقال الألباني: حسن. واتە: (وە ئەو فەرموودەیەی كە ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە پشتگیریی دەكات، كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ... وە بۆ خەڵكت خۆشبوێ ئەوەی بۆ خۆت خۆشتدەوێ، دەبیتە مسوڵمان)، دەفەرموێ: خەڵك، نەك مسوڵمانان، واتە: چی بۆ خۆت پێت چاكە، بۆ هەموو خەڵكی پێت چاك بێ، ئەوجار دەبیتە مسوڵمانی چاك.

---

١) رواه البخاري: (١٣)، ومسلم: (٤٥).

٢– موسوعة فتح المُلْهِم بشرح صحيح الإمام مسلم، الشيخ شبير أحمد العثماني، ج: (١)، ص: (٥٩٤).

هەروەها ئەم فەرموودەیەش: ﴿عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلَ أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ أَفْضَلِ الإِيمَانِ، قَالَ: "أَنْ تُحِبَّ للهِ، وَتُبْغِضَ للهِ، وَتُعْمِلَ لِسَانَكَ فِي ذِكْرِ اللهِ"، قَالَ: وَمَاذَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: "وَأَنْ تُحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ وَتَكْرَهَ لَهُمْ مَا تَكْرَهُ لِنَفْسِكَ﴾ رواه أحمد: (٢٢١٣٢) (٢٢٤٨٣) واللفظ له، والبيهقي في شعب الإيمان: (٥٧٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره، واتە: (لە موعازی كوڕی جەبەل دەگێڕنەوە كە لە پێغەمبەری خوا ﷺی پرسی دەربارەی چاكترین جۆرە ئیمان هێنان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەیە كە لەبەر خوا خەڵكت ـ واتە خەڵكی باش ـ خۆشبوێ، وە لەبەر خوا ڕقت لە خەڵك ـ واتە خەڵكی خراپ ـ ببێتەوە، وە زمانت لە یادی خوادا بەكاربێنی، موعاز گوتی: وە بە چیدیكەش ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ باشترین ئیمانم بۆ دروست دەبێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وە بۆ خەڵكت خۆشبوێ، چ شتێك بۆ خۆت حەزت لێیە، وە بۆ خەڵكیت نەوێ، چ شتێكت بۆ خۆت ناوێ).

ئینجا ئایا ئەگەر لەبەر خوا ﷻ خەڵكت خۆشبوێ، كێت خۆشدەوێ؟ بێگومان خەڵكی باش و چاكەكارو ڕاست و ساغ و مسوڵمانت خۆشدەوێ، وە ئەگەر لەبەر خوا ﷻ ڕقت لە خەڵكی بێتەوە، ڕقت لە كێ دەبێتەوە؟ ئەوانەی كە خوا ﷻ ڕقی لێیان دەبێتەوە.

هەر لە (قسطلاني)ەوە هاتوە: (قال علي القاري في شرحه: قوله (للناس) يحتمل التعميم، ويحتمل التخصيص بالمؤمنين) موسوعة فتح المُلْهِم بشرح صحيح الإمام مسلم، الشيخ شبير أحمد العثماني، ج: (١)، ص: (٥٩٤)، واتە: (عەلی قاریی كە یەكێكە لە زانایان دەڵێ: فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ (للناس) دەگونجێ بۆ گشتاندن بێ و، دەشگونجێ تایبەت بێ بە بڕوادارانەوە}.

كۆتـایی توێژینـەوەمان دەربـارەی ئـەم بنـەمای چـواردەیەمە بـەم فەرموودەیـەی پێغەمبەر ﷺ دێنین كە دەفەرموێ: {خَيْـرُ الأَصْـحَابِ عِنْـدَ اللهِ خَيْـرُهُمْ لِـصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الجِيـرَانِ عِنْدَ اللهِ تَعَالَى خَيْـرُهُمْ لِجَـارِهِ} رواه التـرمذي: (١٩٤٤)، وقـال: حسن غريب، وصححه الألبــاني، واتـە: (باشــترین هـاوەڵ لـەلای خـوای بـەرزو مەزن، باشترینیانە بۆ هاوەڵەكەی، وە باشترین دراوسێ لەلای خوای بەرزو مەزن، باشترینیانە بۆ دراوسێیەكەی)، دوو مسوڵمان كـە دەبنـە هـاورێ، یـان دراوسـێ، كامەیان بۆ ئەویدیكە باشتربێ، ئەویان لەلای خوا ﷻ باشترە، ئینجا باشـیی ئەوەیـە كە لە دڵەوە بۆی باش بێ، بە زمان لەگەڵی باش بێ، بە ماڵ لەگەڵی بـاش بـێ، بـە دەست لەگەڵی باش بێ، بە هـەموو شـێوەیەك بـاش بـێ، ئینجــا ئایـا كـێ لەگـەڵ خەڵكی بـاش دەبێ؟ لە راسـتیدا باشیی لەگەڵ خەڵك، بەرهـەمی راسـتییە لەگــەڵ خوا ﷻ، بۆیە مسوڵمان هەتا ئیمانەكـەی كـامڵترو پتـەوتربێ، لەگـەڵ خەڵكییـشدا باشترو بۆیان بەكەڵكو سوودتر دەبێ.

# بنەمـای پازدەیـەم

## خزمەتکـردنی خـەڵك و

## هـەوڵدان بۆ بەختـەوەرکردنیـان،

## بەشـێکە لـە خـوا پەرسـتیی.

# بنەمـای پـازدەیـەم

## خزمەتكـردنی خـەڵك و هەوڵدان بـۆ بەختـەوەركـردنـیان، بەشـێكـە لـە خـوا پەرسـتیی :

كۆمەڵی ئیسلامیی پێشكەشكردنی هەر جۆرە خزمەتگوزارییەك بە خـەڵكو كۆمــەڵگا لــە هــەموو بوارەكــانی: فەرهــەنگیی‌و كۆمەڵایــەتیی‌و ئــابووریی‌و سـیاسیی‌و... هتــددا، بـە فەرمانبـەریی خـوا (طاعة الله) دادەنـێ‌و، لـەوبوارەدا بەجۆرێك قۆڵـی خزمەتگوزاریی هەڵدەماڵێ، كە هیچ كـەس‌و لایـەنێك نـەتوانێ موزایــەدەی خــەڵك دۆســتیی‌و نیــشتمانپەروەریی‌و خزمەتگــوزاریی بەســەردا بكـات، چونكە:

١- خـوای بـە بـەزەیی و بەخـشەر ﷻ فەرموویـەتی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ فـصلت، واتـە: (وە قسەی كـێ چاكتــرە لـە هـی كەسـێك كـە خـەڵك بـۆ لای خـوا بـانگ بكـاتو كردەوەی چـاك ئەنجـام بداتو بڵـێ: من لە مسوڵمانانم).

٢- هــەروەها خـــوا ﷻ فەرموویـــەتی: ﴿... وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ...﴿٨٣﴾﴾ البقــرة، واتـە: (... وە قـسەی بـاش لەگـەڵ خـەڵكی بكـەن‌و شــتی بـاش بـە خەڵكی بڵـێن ...).

٣- دیسان خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ البقرة. واتە: (وە لە ڕێی خوادا ببەخشنو بەدەستی خۆتان خۆ مەفەوتێننو چاكەكاربن، بێگومان خوا چاكەكارانی خۆشدەوێ).

٤- وە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱرْكَعُوا۟ وَٱسْجُدُوا۟ وَٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٧٧﴾﴾ الحج. واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕكووع ببەنو كڕنووش ببەن - بۆ خوا -، وە پەروەردگارتان بپەرستنو چاكە بكەن، بەڵكو سەرفراز بن).

٥- هەروەها خوای بەدیهێنەر ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة، واتە: (خوا لێتان قەدەغە ناكات كە چاكە بكەنو ببەخشن بە كەسانێك كە لەسەر دین لەگەڵتان ناجەنگنو، لە نیشتمانتانو لە ماڵو حاڵتان وەدەرتان نانێن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێ).

٦- پێغەمبەری خواش ﷺ كاتێك كە لەبارەی باشترین كەس پرسیاری لێكرا، فەرمووی: (مَنْ طَالَ عُمُرُهُ، وَحَسُنَ عَمَلُهُ) رواه الترمذي: (٢٣٣٠) وقال: حسن صحيح، والحاكم: (١٢٥٦)، وقال: صحيح على شرطهما وأقره الذهبي، وأحمد: (١٧٨٥٠) وقال الألباني: صحيح، وقال الهيثمي: إسناده جيد، واتە: (- باشترین كەس- ئەوەیە كە تەمەنی درێژ بێو كردەوەی باش بێ).

٧- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {الـمُؤْمِنُ يَـأْلِفُ وَيُؤْلَفُ، وَلا خَيْـرَ فِـيمَنْ لا يَـأْلِفُ، وَلا يُؤْلَـف، وَخَيْـرُ النَّـاسِ أَنْفَعُـهُمْ لِلنَّـاسِ) رواه الطبـراني فـي الـمعجم الأوسـط: (٥٧٨٧)، والدارقطنـي عـن جـابر بـن عبدالله، وقال الألبـاني فـي السلسلة الـصحيحة: حـسن صحيح، واتـه: (ئیمانـدار خەڵـكی هۆگـری خـۆی دەكـاتو هۆگـری خەڵـكیش دەبـێ، وە خێر لەو كەسـەدا نیـە كـە نـە بتوانـێ خەڵـكی هۆگـری خـۆی بكـاتو، نـە بۆخۆی هۆگری خەڵكی بـێ، وە باشـتـرینی خـەڵكی سـوودبەخـشتـرینیانە بۆ خەڵكی)، كەواتە: كێ لە هەموو كەس باشـتـرە؟ ئەو كەسـە كـە سـوودی بۆ خەڵكی زیاترە.

وە پێـشـەوا (ئـەبو حامیـدی غەزالـی)یـش گوتوویـەتی: (إِذَا أَحَـبَّ اللَّـهُ عَبْـدًا، أَكْـثَـرَ حَـوَائِجَ الخَلْـقِ إِلَيْـهِ)[1]، واتـــە: (ئەگـــەر خـــوا بەندەیـــەكی خۆشـویست، وادەكات خەڵك زۆر ئیـشیان تێـی بكەوێ)، تـاكو ئیـشیان بـۆ جێبـەجێ بكـاتو، خێری بگـاتێ.



١) الـمقصد الأسنى في شرح أسـماء الله الحسنى لأبي حامد الغزالـي، دراسـة وتـحقيق: محمـد عثمـان الخُشْـت، النـاشـر: مكتبة الفرقـان – القاهرة، ص: (٨٠).

## ڕوونکـردنەوە:

ئەم بنەمـایە لە شـەش خاڵـدا ڕووندەکەینـەوە:

### یەکەم: خزمەتکـردنی خەڵكو سـوودمەندکردنیان، عیبادەتو تاعەتـە:

خزمـــەتکردنی خـــەڵكو ســـوودمەندکردنیانو بەختـــەوەرکردنیانو قـــازانج پێگەیاندنیان، بە عیبادەتو تاعەت لە قەڵەمدەدرێ، عیبادەت بە مانـا فراوانەکـەی، لە ئەسڵی زمانی عەرەبیداو، لە بەکارهێنانی قورئانو سـوننەتدا، وە بـە تاعـەت لـە قەڵەمدەدرێن، لەکاتێکدا کە چەمکی وشەی: عیبادەت تایبەت بکەین بەو شتانەوە کە لەنێوان بەندەو خوا ﷻدا دەبن، وەك نوێژو ڕۆژووو نەزرو زیکرو دوعاو ... هتـد، ئـەو کاتـە دەڵـێین بـە تاعـەت لـە قەڵەمـدەدرێن، ئەگـەرنا لـە ئەسـڵی بـەکارهێنانی (قورئـان)دا، وشـەی عیبـادەت هـەموو چـالاکییەکانی ئینـسان دەگرێتـەوە، چ پەیوەندییان بە خوا ﷻوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەبێ، کەواتە: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ۝٥٦ ﴾ الـذاريات، واتـە: (جینو مرۆڤم تەنها بۆ ئەوە دروستکردوون، بـمپەرستن)، ئـەوە مانـای وا نیـە بـە تەنیا هەر خەریکی نوێژو ڕۆژووو زیکرو پاڕانەوە بن، چونکە ئەگەر پەرسـتن هـەر ئەو شتانەبێ، دەبووایە خەڵکی هەر خەریکی ئەوانەبووایـە، چـونکە مـادام خـوای بەرزو مەزن ئێمەی بەس بۆ عیبادەت کردن خوڵقاندبێ، ئەگەر عیبادەت تـەنیا هـەر نوێژو ڕۆژووو زیکرو پاڕانـەوە بووایـە، دەبووایـە هـەر خـەریکی ئـەوە بووینایـە، چونکە خوا ﷻ بۆ ئەوە دروستی کردووین، بەڵام نا، عیبادەت هـەر ئەوەنـدە نیـە، بەڵکو عیبادەت یانی ملکەچیی بۆ خوا ﷻ، ئینجا ئەو کەسەی نوێژدەکات، بۆ خوا

ﷻ ملكەچە، وە ئەو كەسەی كە ماڵیش دەبەخشیێ لەبەر خوا ﷻ، هەر بۆ خـوا ﷻ ملكەچـە، وە ئـەو كەسـەی خـەڵك بـۆ لای ئیـسلام بـانگ دەكـات، بـۆ خـوا ﷻ ملكەچە، وە كەسێك فەرمان بە چاكە دەكات‌و ریێ لە خراپە دەگریێ، هەر بـۆ خـوا ﷻ ملكەچە، بۆیە وادەكات، چونكە خوا ﷻ وای پێخۆشە، وە ئـەو كەسـەی كـە جەنگ‌و جیهاد دەكات‌و فیداكاریی لە پێناوی دینی خوا ﷻدا دەكات، بـۆ خـوا ﷻ ملكەچە، وە ئەو كەسەی كە خەباتی سیاسیی دەكات، یـان لـە بـواری ڕاگەیاندنـدا كاردەكات، یان لە بواری كۆمەڵایەتییدا كاردەكات ... هتـد، لـە هـەر بوارێكـدا، مادام بەو نیازە بیكا كە پیێ لە خوا ﷻ نزیك بێتەوەو، بۆیە بیكات چونكە خوا ﷻ وای فەرمووە، ئەوە هەر لە بازنەی عیبادەتدایە.

جا ئەگەر بمانەویێ بەڵگە بێنینەوە لەسەر ئەوە كە خزمەتكردنی خـەڵك عیبـادەت‌و تاعەتە، زۆر بەڵگە هەن، هەر لەو دەقانەدا كە پێشتر هێنامانن:

**١/ گوتنی قسەی باش‌و كردنی كاری باش، خوا ﷻ فەرمانی پێكردوون:**

خوای پـەروەردگار ﷻ دەفـەرمویێ: ﴿... وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ...﴿٨٣﴾﴾ البقـرة، هــەروەها: ﴿... وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ البقــرة، لــە ئایەتەكەی یەكەمدا دەفەرمویێ: (... قسەی چاك بـە خـەڵكی بڵـێن ...)، لـەوی دیكەدا دەفەرمویێ: (... چاكە بكەن، خوا چاكەكارانی خۆشدەویێ).

كەواتە: خـوا ﷻ فـەرمانی كـردوە بـە چـاكە گـوتن‌و چـاكە كـردن، دەبـیێ قسەشمان چاك بیێ‌و كردەوەشمان چـاك بـیێ، لەگـەڵ كـیێ دا؟ لەگـەڵ خەڵكیـدا بەگشـتی‌و، تایبەتی نەكردوە بە مسوڵمانانەوە، بەڵكو دەفـەرمویێ: چـاكە بكـەن لەگەڵ هەر كەسێكدا.

**٢/ چاكەكردن بە گشتی، فەرمانی پێكراوەو سەرفرازیی پێوە بەستراوە:**

خـــوای بـــەرزو مـــەزن دەفــەرموێ: ﴿... وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۝٧٧﴾ الحج، واتە: (... وە چاكە بكەن بەڵكو سەرفراز بـن)، دوای ئەوەی فەرمان خوا دەكات بە ركووع بردنو سەجدە بردنو عیبـادەت كـردن بـۆ خوا ﷻ، پاشان فەرمان بە چاكەكردن دەكات، خوای بەرزو مەزن دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۝٧٧﴾ الحج.

**٣/ خـــوا ﷻ رایگەیانــدوە كــە چــاكەكاران و بەخــشەرانی خۆشــدەوێ، دەفەرموێ:**

خـــوای پـــەروەردگار ﷻ دەفــەرموێ: ﴿... وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝١٩٥﴾ البقرة، وە فەرموویەتی: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ۝٨﴾ الــممتحنة. واتە: (... بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێ).

هەڵبەتە وشەی (الْمُقْسِطْ) دەشگونجێ بە مانای دادگەر (عادل) بێ، بەڵام لـەم ئایەتەدا بە مانای بەخشەر دێ، نەك بە مانای دادگـەر ـدوایـی روونـی دەكەینـەوە لەبەرچی ـ.

**٤/ سوود بە خەڵك گەیەنەران خۆشەویستی خـوان ﷻ:**

وەك پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (وَأَحَبُّهُمْ إِلـى اللهِ أَنْفَعُــهُمْ لِعِيَـالِــهِ)، واتە: (وە خۆشەویـسترینی خەڵك لەلای خوا، ئەوەیانـە كـە بـۆ خـەڵكی خـوا سوودبەخشترین بێت).

وه شێخ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي)ش دەڵێ: (وَإِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا يَسَّرَ لَهُ الأَسْبَابَ، وَهَوَّنَ عَلَيْهِ كُلَّ عَسِيرٍ، وَوَفَّقَهُ لِفِعْلِ الْخَيْرَاتِ وَتَرْكِ الْمُنْكَرَاتِ، وَأَقْبَلَ بِقُلُوبِ عِبَادِهِ إِلَيْهِ بِالْمَحَبَّةِ وَالْوِدَادِ)[1]، واته: (ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆشویست، هۆکارەکانی بۆ ئاسان دەکات، وه هەموو زەحمەتییەکی لەسەر سووك دەکات، وه سەری دەخات بۆ کردنی چاکەکانو وازهێنان له خراپەکان، وه ڕووی دڵی خەڵکی لەو دەکات به خۆشەویستیو هۆگری).

**٥/ باشترین کەس سوودبەخشترینیانە بۆ خەڵك :**

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ} رواه الطبراني في المعجم الأوسط: (٥٧٨٧)، والدارقطني عن جابر بن عبدالله، وقال الألباني في السلسلة الصحيحة: حسن صحيح، واته: (چاکترینی خەڵکی سوودبەخشترینیانە بۆ خەڵك).

ئەوە ئاشکرایە کە خزمەتکردنی خەڵكو سوود پێگەیاندنیان تاعەتێکەو عیبادەتێکە وەك شەونوێژو ڕۆژوو، چۆن زەکاتو حەج عیبادەتە، ئەویش ئاوا عیبادەتە.

**دووەم: بانگەواز بۆلای خوا ﷻو کردەوەی باشو خۆ لە ڕیزی مسوڵماناندا حیسابکردن، سێ هۆکاری گرنگی چاکتر بوونن لە لای خوا ﷻ:**

ئایەتەکانی قورئان هەمیشە دەبێ بە وردیی سەرنجیان بدەینو پێکیانەوە ببەستین، ئینجا زیاتر لە نهێنییەکانیان تێدەگەین، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ

---

١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، ٢٣٥.

أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ فصلت، واتە: (وە قسەی کێ چاکترە[1] لە هی کەسێك کە بانگەواز بۆ لای خوا دەکات و، کردەوەی باش ئەنجام دەداو، دەڵێ: من لە مسوڵمانانم).

دیارە، کەسێك خاوەنی چاکترین قسە بێ، بۆ خۆشی چاکترین کەسە، چونکە (گۆزە چیی تێدابێ ئەوەی لێدەڕژێ)، بەڵێ لە ڕاستیدا کەسێك باشترین قسە دەکات، کە باشترین کەس بێ، بەزۆریی وایە، هەرچەندە جاری وایە بابای خراپیش قسەی باش دەکات.

کەواتە باشترین کەس کێیە لە تەرازووی خوادا ﷻ؟ ئەوەیە کە ئەو چەند سیفەتەی تێدابن:

## ١ـ خەڵك بۆ لای خوا ﷻ بانگ بکات، نەك بۆ لای خۆی، یان بۆ لای حیزب:

خەڵك بانگکردن بۆ لای خوایە ﷻ، وە ئەگەر حیزبیشی هەیە، حیزبەکەشی بۆ خوایە ﷻ، چونکە حیزب هۆکار (وسیلة)یە، بەڵێ مرۆڤی خواناس و باش، خۆی ناکاتە تەوەر (قُطْبْ) خەڵك بە دەوری خۆیدا بسووڕێنێتەوە، بەڵکو خۆیشی و خەڵکیش بەدەوری ڕەزامەندیی خوادا ﷻ دەسووڕێنەوە، ئێمە دەچین لە کەعبە بە دەوریماڵی خوادا ﷻ دەخولێینەوە، ئەوە یانی با مسوڵمانان بزانن، کە دەبێ لە بوون (وجود)دا تاکە زاتێك شایستەی ئەوەبێ مرۆڤەکان بە دەوری ڕەزامەندییدا بخولێنەوە، تەنیا خوایە ﷻ.

---

١) خوای پەروەردگار بەشێوەی پرسیارکردن وا دەفەرموێ، ئەم جۆرە پرسیارکردنە پێی دەگوترێ: پرسیارکردنی نکووڵیی لێکردن (الإستفهام الإنكاري)، وە پرسیاری نکووڵیی کردن، ئەوەیە کە وەڵامەکەی لەنێو خۆیدایە، بۆ نموونە: ئەگەر گوتم: ئەوە ئاو نیە؟ چاوەڕێ ناکەم یەکێك بڵێ: با، ئەوە ئاوە، ئەوە دیارە ئاوە!

ئنجا دیارە خوای پەروەردگار ﷻ لەسەر زەوی نیەو، ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى، واتە: (... هیچ – کەس و- شتێك وەك ئەو –خوا ﷻ- نیە، وە ئەویش بیسەری بینەرە)، بەڵام ڕەمزێکی داناوە لەسەر زەوی، ڕەمزە بۆ ئێمە بۆیە بە دەوری ئەوێدا دەخولێینەوە، کە سووڕانەوە (طواف) تەنیا بە دەوری کەعبەدا عیبادەتە، ئەگەرنا سووڕانەوە (طواف) بە دەوری هیچ مزگەوتێکی دیکەدا عیبادەت نیە، بەڵکو داهێنراو (بِدْعَة)و سەرپێچیی (مَعْصِيَة)یەو لەسەری قەرزاردەبینەوە، خولانەوە بە دەوری گۆڕدا، ئەوە هەر هیچ، هەتا خولانەوە بە دەوری گۆڕی پێغەمبەریشدا ﷺ نابێ، تەنیا سووڕانەوە بە دەوری ماڵی خوادا ﷻ، ئەویش ئەو ماڵەی کە لەوێیە، ئەگەرنا مزگەوتی مەدینەش نابێ بە دەوریدا بخولێیتەوە، مزگەوتی قودسیش نابێ بە دەوریدا بخولێیتەوە، ئەوە مانای ئەوەیە مسوڵمان دەبێ یەك شت هەبێ‌و یەك ئامانج هەبێ بە دەوریدا بخولێتەوە، وەك چۆن پەپوولە بە دەوری چراو ڕووناکییدا دەگەڕێ‌و دەسووڕێتەوە.

**٢ـ کردەوەی باش ئەنجامدان:**

هەر قسەیەکی باش مۆری کردەوەی پێوەنەبێ وەك پارەی قەڵبە، کەس وەریناگرێ، کەسێك وەستای قسان بێ بەڵام کۆڵەواری دەستان بێ، قسەی باش بکات، بەڵام کردەوەی خراپ بێ، ڕواڵەت جوان بێ، بەڵام نێوەڕۆك وێران بێ، هیچ نیە، دوور کوژی نزیك خەسار بێ، لە دوورەوە جوان بێ، بەڵام دوایی کە وەنزیك دەکەوێ هیچی لە باراندا نەبێ، ئەوە هیچ نیە، عەلی کوڕی ئەبو تالیب ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ کە وەسفی پێغەمبەر ﷺ دەکات، لە

وەسفیدا دەڵێ[1]: (مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ)، واتە: (کەسێك کە کتوپڕ پێغەمبەری خوای بینیبوایە ﷺ سامی لێدەکرد -واتە: شەرمی لێدەکرد-، بەڵام ئەگەر لەگەڵی تێکەڵ ببووایەو ناسیبای، خۆشیدەویست)، ئەوە گرنگە کە لە نزیکەوە لەگەڵ مرۆڤ تێکەڵ بی خۆشتبوێ، نەك لە دوورەوە، کوردەواریی خۆمان جوان دەڵێن: (دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە). لە دوورەوە بڵێی داخۆ دەبێ چ کەسێك بێ، بەڵام کە لێی نزیك کەوتیەوە بڵێی ئەوە هیچ نیە، کە لەگەڵی تێکەڵ بووی‌و لە نزیکەوە ناسیت خۆشتبوێ، ئەوە سەنگی مەحەکە.

**٣ـ خۆ جیاکردنەوە لە مسوڵمانان زۆر خراپە:**

خۆ جیاکردنەوە لە مسوڵمانان چەند جۆرێکی هەیە:

أ/ جۆرێکی ئەوەیە ئینسان بڵێ: (من شتێکم‌و ئەو خەڵکە شتێکی دیکەیە)، زۆرجار کە میوانم دێ جاری وایە گەرمایە بە کراسێکی نیو قۆڵ لەگەڵیان دادەنیشم، دەڵێن: مامۆستا جار جار شتی واش لەبەردەکەی؟ دەڵێم: بەڵێ، هەر لەو ڕۆژانە سەرۆك عەشیرەتێك هاتبوو، گوتم: کاکە ئەگەر زووتر

---

١) (قَالَ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﵁ وَهُوَ يَنْعَتُ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: ... أَجْوَدُ النّاسِ كَفًّا، وَأَجْرَأُ النَّاسِ صَدْرًا، وَأَصْدَقُ النَّاسِ لَهْجَةً، وَأَوْفَى النَّاسِ ذِمَّةً، وَأَلْيَنَهُمْ عَرِيكَةً، وَأَكْرَمَهُمْ عِشْرَةً، مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ، وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ، يَقُولُ نَاعِتُهُ: لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ مِثْلَهُ ﷺ) الرحيق المختوم، ص: (٥٤٨)، واتە: (عەلی کوڕی ئەبو تالیب وەسفی پێغەمبەر ﷺ دەکات‌و دەفەرموێ: ... لە هەموو کەس دەست بەخشندەترو سینە ئازاترو ڕاستگۆترو وەفادارتر بۆ وادەو بەڵێن و، لە سروشت‌و ئاکاردا نەرمترو لە تێکەڵاویی کردندا بەڕێزتر بوو، ئەوەی ڕاستەوخۆ بیبینیبووایە سامی لێ دەکرد، وە ئەوەی تێەڵی ببووایەو ئاشنای بووایە خۆشیدەویست، وەسفکاری دەڵێ: نە لە پێش ئەو کەسێکی وام بینیوە و، نە لە دوای ئەویش کەسێکی وامبینیوە).

زانیبام دەهاتی خۆم دەپێچایەوەو خۆم حازر دەكرد، گوتی: بۆچی مامۆستا ئەوەش لەبەردەكەی جار جار؟ گوتم: بەڵێ، بەڵام نەبادا تەڕەفی بەرانبەر وای لێ حاڵی بێ، گرنگیی پێنادەم، بۆیە خۆم دەپێچایەوە، گوتی: نەخێر ئەوە مانای وایە خۆ بە كەمگر (متواضع)ی، منیش گوتم: من زۆرجار قسەیەك دەكەم دەڵێم: خوایە، هیچ كاتێك وامان لێنەیێ پێمانوابێ بەكەڵكی نێو خەڵكی نەماوین‌و بەكەڵكی نێو خەڵكی نایەین‌و دەبێ بچین لەنێو بورجێكی عاجییدا بژین، بێگومان ئەوە حاڵەتێكی زۆر خراپە، كە خۆت پێ لە خەڵكی زیادبێ‌و پێتوابێ بەكەڵكی نێو خەڵكی نەماوی!!

ب/ حاڵەتێكی دیكە ئەوەیە كە خەڵكێك دابڕێ، كۆمەڵەكەی خۆت دابڕێ‌و پێتوابێ كە ئەو خەڵكەی دیكە بە هیلاك چووە، جارجار ئەو تۆمەتە بۆ ئیسلامییەكان دەكرێ، وە بە تەئكید ڕەنگە ئێمەش جارجار خەڵكی وەها كرچ‌و كاڵمان هەبێ، كە هەر لەبەرئەوەی ناوی لەخۆ ناوە ئیسلامیی، یان پێی دەگوترێ: ئیسلامیی، پێیوابێ هەر تەنیا بە ئیسلامیی بوون لە خەڵكی چاكترە، كە بێگومان وانیە! هەروەك تەنیا لەبەرئەوەی كابرا مەلایە لە خەڵكی چاكتر نیە، هەر لەبەرئەوەی كە پێی دەگوترێ: حاجی لە خەڵكی چاكتر نیە، وە هەر لەبەرئەوەی كە پێی دەگوترێ: سەیدو شێخ لە خەڵكی چاكتر نیە، دەبێ بە كردەوە چاكتر بێ، بە كردەوەی چاك ئینسان چاك دەبێ، ئەمما نەسەب‌و ڕەچەڵەك‌و وەجاخ‌و بنەماڵەو لەقەب‌و ئەوانە هیچیان دادی ئینسان نادەن، نە لە دنیاو نە لە قیامەتدا، لە ڕاستیدا ئینسان بە كردەوەو ڕەفتاری باش، باش دەبێ.

بەڵێ ئەم سێیە، سێ هۆكاری گرنگی چاكتر بوونن لەلای خوا ﷻ و، دەبێ ئاگامان لێیان بێ.

**سێیەم: نامسوڵمان بوونی خەڵك، ڕێگرنیە لە چاكە لەگەڵ كردنیان:**

ئەوەش خاڵێكی گرنگە، لەبەرئەوەی خەڵك نامسوڵمانە مانای ئەوەنیە كە چاكەیان لەگەڵدا نەكەی، دەتوانین زۆر بەڵگان لەوبارەوە بێنینەوە:

١- خوای بەرزو مەزن دەربارەی بێ بڕوایانو هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانو چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵدا كردنیان، دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة، پێشتر باسمانكرد كە مەبەست لە (ٱلْمُقْسِطِينَ) لێرەدا بەخشەرانن، نەك دادگەران، چونكە (ٱلْمُقْسِطِينَ) لە (قورئان)دا بە مانای دادگەرانیش هاتوە، بەڵام لێرەدا بە مانای بەخشەرانە، بە بەڵگەی ئەوە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: (لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ ...)! جا دادگەریی هیچ كاتێكو هەرگیز نەهی لێناكرێو قەدەغە ناكرێ، بەڵكو هەمیشە دادگەریی چاكەیە (فضیلة)ە، لەگەڵ دۆستو لەگەڵ دوژمن، لە جەنگو لە ئاشتیدا، بەڵام بەخشین وانیە، ئایا دروستە بە كەسێك ببەخشی كە دژایەتی دینت دەكاتو دەستدرێژیی دەكاتە سەر دینو ژینت؟ بێگومان نەخێر، نابێ پێی ببەخشی، بەڵام ئایا دەبێ لەگەڵی دادگەر بی یان نا؟ بەڵێ هەر دەبێ لەگەڵی دادگەر بی، بە بەڵگەی ئەوە كە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾﴾ المائدة، واتە: (... با رق هەڵسانتان لە كەسانێك واتان لێ نەكا كە نادادگەر بن، دادگەریی بكەن، ئەوە لە پارێزكاریی نزیكترە، وە

پارێز لە خوا بكەن، بێگومان خوا شارەزایە بەو كارانەی دەیانكەن)، بەڵێ دەبێ دادگەر بین لەگەڵ كافرو مسوڵمان، لەگەڵ دۆستو دوژمن، لە حاڵەتی جەنگو ئاشتیدا، كەواتە: مەبەست لە (ٱلْمُقْسِطِينَ) بەخشەرانە، واتە ئەوانەی كە هەند (قِسْطْ)ێك لە ماڵی خۆیان دەبەخشن.

٢- خوای دادگەر ﷻ بەگشتی دەفەرموێ: ﴿... وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ البقرة، دیاری نەكردوە لەگەڵ كێ چاكە بكەین، بەگشتی دەفەرموێ چاكە بكەن، واتە لەگەڵ خەڵك، ئیدی مسوڵمانو كافری لێك جیانەكردۆتەوە.

٣- هەڵوێستی یوسف عليه السلام بەڕاستی بەڵگەیەكی بەهێزە لەو بوارەدا، چونكە لە میسر بێجگە لە خۆی مسوڵمانێكی دیكەی لێ نەبووەو هەموویان كافر بوون، بە بەڵگەی ئەوە كە دوو هاوەڵەكەی ـكە دیارە زۆر لێی نزیك بوونـ كاتێك دوو خەون دەبینن‌و دەچن بۆ لای یوسف عليه السلام خەونەكانیان بۆ لێكبداتەوە، دوایی كە گفتوگۆ (مناقشة)یان لەگەڵدا دەكات، دەفەرموێ: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم ...﴿٤٠﴾﴾ یوسف، واتە: (ئەی دوو هاوەڵەكەی بەندیخانەم! ئایا چەند پەروەردگارێكی جیاجیا باشترن، یان پەروەردگاری تاكی ملپێكەچكەر – كە زاتی خوایە ﷻ ـ؟ ئەو بتانەی كە جگە لەو دەیانپەرستن، شتێك نین جگە لە ناوانێك كە خۆتانو باب‌و باپیرانتان ناوتان لێناون –كردووتانن بە پەرستراو ـ...). وە پادشاش كە خەون دەبینێ، دیارە هەر پادشایەكی كافر بووە و، لە میسردا بێجگە لە یوسف عليه السلام

مسوڵمانێكی دیكەی لێنەبووە، بەڵام یوسف عليه السلام لە ئەنجامی لێكدانەوەی خەونی پادشادا نەخشەیەكی ئابووریی پازدە ساڵیی دادەنێ، بۆ دەربازكردنی خەڵكی میسر لە گرانیی و قاتو قڕیی و برسێتییەك كە دێتەڕێیانو حەوت ساڵان دەخایەنێ، نەخشەیەكی پازدە ساڵیی دادەنێ: حەوت ساڵ كشتوكاڵ بكەنو پەزمەندەی بكەنو هەڵیبگرن، حەوت ساڵی دیكە گرانیی دێ، دوایی ساڵی پازدەیەم هەرزانیی و خۆشگوزەرانیی دێ.

یوسف عليه السلام ئەو نەخشە ئابوورییە پازدە ساڵییە دادەنێ، بۆ دەربازكردنی خەڵكی میسر لە برسێتی، لە حاڵێكدا كە بێجگە لە خۆی مسوڵمانێكی دیكەی لێ نیە، كەواتە چاكەكردن لەگەڵ ئینسانەكاندا بەگشتی، شتێكی پەسندە.

چی لەوە خۆشترە ئینسانی مسوڵمان چاكەی لە چاوی هەموو كەسێكدا هەبێ؟

٤- وە فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە زۆرن، كە نەك هەر چاكەكردن لەگەڵ نامسوڵمانان، بەڵكو چاكەكردن لەگەڵ ژیاندارانو ئاژەڵانیش هەر خێرو چاكەیەو مایەی پاداشتەو، هەروەك بە پێچەوانەكەشی، زیانگەیاندن بە ژیاندارانو ئاژەڵانیش خراپەو مایەی سزاو جەزرەبەیە، بۆ نموونە دوو لەو فەرمایشتانە دێنینەوە:

أ/ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: {بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا، فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ قَدْ بَلَغَ مِنِّي. فَنَزَلَ الْبِئْرَ، فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِيَ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنَّ لَنَا فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ لأَجْرًا؟ فَقَالَ: فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ} رواه البخاري: (٢٣٦٣)، ومسلم:

(٢٢٤٤)، واته: (لەكاتێكدا پیاوێك به ڕێیەكدا دەڕۆیشت كه تینوێتی تینی بۆ هێنابووو سەغڵەتی كردبوو، بیرێكی دۆزیەوە، دابەزیـە نێـو بیرەكـەو ئـاوی خواردەوە پاشان هاتەدەر، سەگێكی بینی زمانی دەركێشابووو لـە تینوێتییـان زمانی له زەوی دەخـشاندو گڵـی دەخـوارد، كابرایەكـە ـ لـە دڵـی خۆیـدا ـ گوتی: ئەو سەگە تینوو بووە بە ئەندازەی ئەو تینوێتییەی بۆ من هاتبوو، بۆیـه دووبارە دابەزیەوە نێو بیرەكەو خوففەكەی[1] خۆی له پێ كردەوەو پڕی كـرد لە ئاو و، بـە دەمییـەوە گرتـی هـەتا هاتـەوە سـەرێ، وە لـەو ئـاوەی كـە لـە خوففەكەدابوو دایە سەگەكە، خـوای پـەروەردگاریش سوپاسـی كـردو لێـی خۆشبوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! لە ئاژەڵو ژیاندارانیش پاداشـتمان بۆ هەیە؟ فەرمووی: لە هەموو خـاوەن جگـەرێكی تـەڕدا پاداشـت هەیـە)، واته: هەر شتێك كه خوێنی هـەبێو ژیانـدار بـێ، چـاكەی لەگەڵـدا بكـەی پاداشتت هەیە، ئەوە بە نسبەت چاكەكردن لەگەڵ ئاژەڵانیش.

ب/ هەروەها خراپەكردنیش لەگەڵ ئاژەڵاندا سزای هەیە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِـرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَـتْ، فَـدَخَلَتْ فِيهَـا النَّارَ، لاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَسَقَتْهَا، إِذ حَبَسَتْهَا، وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِـنْ خَـشَاشِ الأَرْضِ} رواه البخاري: (٣٤٨٢)، ومسلم: (٢٢٤٢)، واللفظ لـه، واتـه: (ئافرەتێك سزادرا لەسەر پشیلەیەك كە بەستبوویەوە هەتا مـرد، بـەو هۆیـەوە ئافرەتەكە چووە ئاگرەوە، نە خواردنو ئاوی پێدا، نە ڕێی پێدا لە خـشـپو خاڵی زەوی بخوا، خوای پەروەردگار لەسەر ئەوە سزای دا).

---

١) (خُـف)، واته: گۆرەوی ئەستووری لە چەرم دروستكراو.

## چوارەم: خزمەتكردنی خەڵك و سوود پێگەیاندنیان گشتگیرەو هەموو جۆرەكان دەگرێتەوە:

كە دەڵێین: خزمەتكردنی خەڵك و سوود گەیاندن بە خەڵك لە هەموو روویەكەوە، هەر شتێك كە خەڵك پێویستی پێ بێ و سوودی لێ وەربگرێ و لێی بەهرەمەند بێ دەیگرێتەوە، بۆچی؟ چونكە:

١ـ جارێ وشەی (إحسان) كە دەفەرموێ: (وَأَحۡسِنُوٓاْ)، واتە: (چاكە بكەن)، گشتییەو هەموو چاكەیەك دەگرێتەوە.

٢ـ هەروەها وشەی (أَن تَبَرُّوهُمۡ) دیسان گشتییەو هەموو چاكەیەك دەگرێتەوە.

٣ـ وە وشەی: (وَعَمِلَ صَٰلِحٗا)، واتە: (كردەوەی باش ئەنجامدەدا)، كردەوەی باشیش هەمووی دەگرێتەوە.

٤ـ هەروەها: (وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾)، واتە: (وە چاكە بكەن بەڵكو سەرفراز بن)، دیسان ئەویش گشتییە.

٥ـ وشەی (نَفْع)یش كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ} رواه الطبراني في المعجم الأوسط: (٥٧٨٧)، والدارقطني عن جابر بن عبدالله، وقال الألباني في السلسلة الصحيحة: حسن صحيح، یان كە دەفەرموێ: {وَأَحَبُّهُمْ إِلَى اللهِ أَنْفَعُهُمْ لِعِيَالِهِ}، وشەی (نَفْع)یش كە بە مانای (سوود)ە، ئەویش گشتییە.

## پێنجەم: خەڵکی ئیسلامیی کە بە هاندەری خوا ڕازیکردن خزمەت دەکەن، هیچ کەس پێشیان ناکەوێتەوە:

بەڕاستی ئەگەر ئێمەی ئیسلامیی حەقی خۆمان بدەینە دینداریی و مسوڵمانێتییەکەمان، هیچ کەس لە چاکەکارییدا پێشمان ناکەوێتەوە، بۆچی؟ چونکە خەڵك کە چاکە دەکات لەگەڵ خەڵکی، چاوەڕوانی شتێکی لێ دەکات، خەڵك چاکە دەکات بە هاندەرێکی خودیی (ذاتي)، یان لەبەرئەوەی دەیەوێ خەڵك مەدح و ستایشی بکات، یانی حەتمەن هاندەرەکەی لە چوارچێوەی دنیادایە، بەڵام ئینسانی ئیماندارو مسوڵمان هاندەرەکەی لە چوارچێوەی دنیادا نیە، بەڵکو پەیوەندی بە خوا ﷻو قیامەتەوە هەیە، بۆیە هاندەر (دافع)ەکەی زۆر بەهێزەو هیچ چاوەڕوانییەکیش لە خەڵك ناکات و، ئەگەر هەر چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بکات و، خەڵکیش نەك هەر پاداشتی نەدەنەوە، بەڵکو خراپەشی لەگەڵدا بکەن، ساردی ناکاتەوە، بۆچی؟ چونکە ئەو هیچ چاوەڕوانییەکی لێیان نەبووە و، بۆ ئەوە چاکەی لەگەڵدا نەکردوون کە چاکەی لەگەڵدا بکەنەوە، بەڵکو چاکەی لەگەڵدا کردوون وەك ئەرکێکی سەر شان، وەك عیبادەتێك و تاعەتێك بۆ خوا ﷻ، جا ئەوە پاڵنەرێکی زۆر بەهێزەو وا لە ئینسان دەکات قەت ساردنەبێتەوە، تۆ تەماشای پێغەمبەران بکە علیهم الصلاة والسلام لەو هەموو ئارامگریی (صَبْر)و بەرگەگرتن (تَحَمُّلْ)ەیان، ئایا لەبەرچی وا بوون؟ چونکە لەبەر خوا ﷻ چاکەیان لەگەڵ خەڵکدا کردوەو خەڵکیان بانگ کردوە، ئیدی هەرچەندە ئازاریانداون و ڕووبەڕوویان بوونەتەوەو، هەرچەندە قسەیان پێ گوتوون و ئەزیەتیانداون، ئەوە ساردی نەکردوونەتەوە، بۆچی؟ چونکە ئەو چاکە کردنەیان لەگەڵ خەڵك لەبەر خەڵك نەبووە، بەڵکو لەبەر خوا ﷻ بووە.

**شەشـەم: خەڵـكی ئیسلامیی هیـچ چاوەڕوانییەكیان لە خەڵك نیە:**

ئەوەش چەندین ئایەتی خوای پەروەردگار دەیگەیەنن، بۆ وێنـە:

١ـ خوای بەرزو مەزن دەفەرمویٚ: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾﴾ الإنـسان، خـوای پەروەردگار ﷻ ستایشیان دەكاتو دەفەرمویٚ: (خواردنێك كە خۆشیاندەویٚ، دەیدەن بە هەژارو هەتیوو دیل، تەنها لەبەر ڕەزامەندیی خوا –بۆ ئـەوەی خـوای پەروەردگار ڕووی لەگەڵمان خۆش بیٚ- ئەو خواردنەتان پێدەدەین، نە پاداشتێكی مادديیمان لێتان دەویٚو نە سوپاسكردنێكی بە دەمییش)، دیارە ئینسان ئەو جۆرە خواردنەی خۆشدەویٚ كە زۆری پێویست بیٚ، یان زۆری برسی بیٚ، ئەو جۆرە خواردنانەی زۆر خۆشدەوێن، ئەگەرنا كەسێك خواردنێكی لیٚ زیادبیٚ، زۆر بە خەمییەوە نیە، بەڵام خواردنێك كە خۆشیاندەویٚو دڵیان پێوەیەتی، لەبەرئەوەیـە كە پێویستییان پێیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا دەیدەن بە هەژارو هەتیوو دیل، كە دیـارە هەژارو هەتیوەكە ڕوون نیە داخۆ مسوڵمانن یـان كـافر؟ چـونكە بـە موتڵـەقیی فەرموویەتیو بەگشتی هێناونی، بەڵام دیلەكە هەردەبیٚ نامسوڵمان بیٚ، دیلێـك كە لە دەستی مسوڵماناندا بیٚ، دیارە كافرە.

٢ـ هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ بە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمویٚ: ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾﴾ ص، واتـە: (پێیـان بڵـیٚ: هـیچ كـریٚو پاداشتتان لـیٚ داواناكەم، وە هیچ ئەركو قورسایيو بارگرانییشتان ناخەمە سـەر شـان)، چـەند خۆشـە ئینـسان خـۆی بـەو ڕەوشـتە بەرزانـە بڕازێنێتـەوە، لـە هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ خەڵكداو سێبەری خۆی گران نەكاتو چـاوەڕوانیی لە خەڵك نەبیٚ.

وە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە كە: {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِي قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ دُلَّنِي عَلى عَمَلٍ إِذَا أَنَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اللهُ وَأَحَبَّنِي النَّاسُ، قَالَ: إِزْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبُّكَ اللهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ} رواه ابن ماجه: (٤١٠٢) عن سهل بن سعد الساعدي رضي الله عنه، وصححه الألباني، واتە: (لە سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدیی دەگێڕنەوە كە گوتوویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! كارێكم پێ بڵێ كە ئەگەر بیكەم خوا خۆشیبوێم و خەڵكیش خۆشیان بوێم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دنیا بە كەم بگرە خوا خۆشیدەوێی، وە ئەوەی كە لە دەستی خەڵكیدایە بە كەمی بگرەو چاوت لێی نەبێ خەڵك خۆشیاندەوێی)، بەڵێ، هەر كەسێك تەماعی لەوەدا هەبوو كە لە دەستی خەڵكیدایە، ڕێزو حورمەتی دادەبەزێ، بەڵام ئەگەر بێ منەت بوو لەوەی لە دەستی خەڵكیدایەو چاوی تێنەبڕیو بە لایەوە گرنگ نەبوو، لەلایان بەڕێزدەبێ، ئەو خەسڵەتە چەند گرنگە بۆ ئەهلی ئیمان! بە تایبەتی بۆ ئەهلی زانست (أهل العلم)، زۆرجار مامۆستایانی ئێمە، زانایانی ئیسلام كە لەلای خەڵك ئیعتیباریان نامێنێ، لەبەرئەوەیە كە چاویان لە دەستی خەڵكە، بۆیەش خوای بەرزو مەزن وای بە پێغەمبەری ئێمە ﷺو سەیدو سەروەرو پێشەواو سەرمەشقی ئێمە، فەرمووە: ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾﴾ ص، واتە: (پێیان بڵێ: هیچ كرێو پاداشتتان لێ داواناكەم، وە هیچ ئەركو قورسایيو بارگرانییشتان ناخەمە سەر شان)، بەڵكو باری گرانیان لەگەڵ دەستدەداتێ و، باری سەرشانیان سووك دەكات.

خوای پەروەردگار ﷻ یارمەتیمان بدات كە خۆمان بەو ڕەوشتە بەرزو جوانانە بڕازێنینەوە، بۆ ئەوەی كە لە ئاستی (ئیسلام)دا بینو، بتوانین خەڵكی خوا ﷻ بەرەو دینی خوا ﷻ بێنین.

# بنەمای شازدەیەم

## ئەنجامدانی ئەرکی: بانگەوازو، فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەو، پاکسازیی و چاکسازیی کردن لە کۆمەڵگادا:

کۆمەڵی ئیسلامیی بانگەواز بۆ ئیسلام و هەموو شتێکی چاكو سوودبەخشو، فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە (الدعوة إلى الإسلام والخير والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) بە ئەركو کاری هەرە گرنگو سەرەکیی خۆی دەزانێ، چ لەنێوخۆیو چ لەگەڵ دەوروبەریدا.

هەروەها کاردەکات بۆ گۆڕینو پاکسازییو چاکسازیی کۆمەڵگا لە هەموو بوارەکاندا، هەتا بەتەواویی دێتەسەر ڕێبازو ژێر سایەی شەریعەت، چونکە:

١- خوای تاك و پاك ﷻ فەرموویەتی: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾﴾ النحل. واتە: (بانگەواز بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و ئامۆژگاریی باش و بە چاکترین شێواز وتووێژیان لەگەڵدا بکە، بێگومان پەروەردگارت زاناترە بەوەی کە لە ڕێبازی وی لایداوەو، زاناتریشە بەوانەی کە ڕێی ڕاستیان گرتوە).

٢- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾ آل عمران. واتە: (با لەنێو ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن بانگەواز بكەن بۆ چاكەو، فەرمان بكەن بە هەموو شتێكی پەسندو، ڕێگریی بكەن لە هەموو شتێكی ناپەسند، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن).

٣- هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾ الجاثية، واتە: (پاشان تۆمان لەسەر بەرنامەیەك دانا لە ئایینی خۆمان، جا شوێنی بكەوەو، بە شوێن ئارەزووی ئەوانە مەكەوە كە نازانن).

٤- وە هەروەها خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿... فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ ...﴿٤٨﴾﴾ المائدة. واتە: (... دەجا حوكمیان لەنێواندا بكە، بەوە كە خوا ناردوویەتە خوارێ، وە بەدوای ئارەزووەكانیان مەكەوە و لامەدە لەو حەقەی بۆت هاتوە، بۆ هەر كامێكتان – بۆ هەر كام لە ئۆممەتان- بەرنامەو ڕێبازێكی تایبەتییمان داناوە).

## ڕوونكـردنەوە:

خوا ﷻ پشتیوان بێ، لە شەش خاڵ دا ئەم بنەمای شازدەیەمە ڕوون دەكەینەوە:

**یەكەم: بانگەوازكردن بۆ ئیسلام، ئامانجی هەرە گەورەو گرنگی كۆمەڵو جموجۆڵە ئیسلامییەكانەو، سەرجەم كارو چالاكییەكانی دیكە لە بازنەی كاری ئیسلامییدا ڕۆڵی هۆكارو ئامراز دەبینن، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە سەرەكییە:**

خوشكو برایانی بەڕێز!

ئەوە خاڵێكی زۆر گرنگە كە ئێمە بزانین بانگكردنی خەڵك بۆ لای خوا ﷻ، واتە: بۆ لای ڕێبازی خوا ﷻ، جا خوا ﷻ هەردوو تەعبیرەكەی بەكارهێناوە، لە شوێنێكدا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ...﴿٣٣﴾﴾ فصلت، واتە: (وە قسەی كێ لە هی ئەو كەسە چاكترە كە بانگەواز دەكات بۆ لای خوا ...)، وە لە شوێنێكی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ...﴾ النحل، چونكە خەڵك بانگكردن بۆ لای خوا ﷻ واتە: بۆ لای ڕێبازی خوا ﷻ، بۆ لای بەرنامەی خوا ﷻ، بۆ لای ئایینی خوا ﷻ.

ئا ئەمە ئامانجی هەرە گەورەو گرنگی كاری ئیسلامییە، واتە: ئامانجو مەبەستی كۆتایی كاری ئیسلامیی لە چوارچێوەی دنیادا، ئەوەیە كە ئێمە هەڵسین بە لە خوا ﷻ نزیك خستنەوەی خەڵك، وە وا بكەین خەڵك بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ بكەن، ئەوە كە خەڵك بەپێی بەرنامەی خوا ﷻ بەڕێوەبچێ لە ژیانی تاكییو خێزانییو كۆمەڵایەتییو سیاسیی دا، ئا ئەوە ئامانجی كاری ئیسلامییە، وە هەر چالاكییەك كە

ئەنجامدەدرێ بۆ ئەوەیە كە ئەو ئامانجە بەدی (تحقیق) بێ، هەمووی دەبێتەوە بە هۆكارو ئامڕاز.

واتە: ئێمە كە دوایی لە رووی راگەیاندنەوە كاردەكەین، لە رووی كۆمەڵایەتییەوە، كاری سیاسیی و دبلۆماسیی دەكەین، هەمووی بۆ ئەوەیە خەڵك لە خوا ﷻ نزیك بخرێتەوە، خەڵك بەندەی خوا ﷻ بێ و بۆ خوا ﷻ صوڵحاو بێ، خەڵك بەپێی شەریعەتی خوای پەروەردگار ﷻ ژیان و گوزەرانی خۆی بەڕێوەببا، پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هەموویان ئەوە ئامانجی سەرەكییان بووە، بۆیەش هەر بەوە دەستیان پێكردوە: خوای پەروەردگار ﷻ لەسەر زمانی هەر كام لە نووح و هوودو ساڵح و شوعەیب علیهم الصلاة والسلام ئەم رستەیە دووبارە دەكاتەوە: ﴿... يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ...﴾ الأعراف، ئایەتەكانی: (٥٩، ٨٥، ٧٣، ٦٥)، واتە: (... ئەی گەلەكەم، خوا بپەرستن، بێجگە لەو پەرستراوێكیدیكەتان نیە ...)، ئەوە قسەی هەموو پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بووە، سەرەتاو كۆتایی كارەكەیان بریتی بووە لەوە، كە خەڵك بكەن بە بەندەی خوا ﷻ، وە خەڵك بۆ بەندایەتی كردن بۆ خوا ﷻ و پەرستنی خوا ﷻ هانبدەن و بانگی بكەن.

كەواتە: ئەوەی كە هەندێك خەڵك ـ بەتایبەتی لەم رۆژگارەدا ـ دەیڵێن: كە ئەوەی بانگخواز بێ ناتوانێ كاری سیاسیی بكات و، ئەوەش كە كاری سیاسیی دەكات با بانگخواز نەبێ و، كاری بانگەوازو كاری سیاسیی لەیەكدی جیابن، ئەوانە بەڕاستی لە ئەصڵی مەبەست حاڵی نەبوون، چونكە كاری سیاسیی و دبلۆماسیی و هەڵبژاردن و، چالاكی كۆمەڵایەتیی و فیكریی و ئەوانە هەموویان ئامڕازن، وە خەڵك بۆ لای خوا ﷻ بانگكردن، ئا ئەوە لە راستیدا ئامانجە، بەڵێ: كاری سیاسیی ئامڕازە، ئەمما خەڵك بۆ لای خوا ﷻ بانگكردن ئامانجە، دیارە هیچ

كاتێكیش هۆكارو ئامانج تێكناگیرێن، تـاكو بڵـێین: ئـەوەی ئەمـەیان دەكـات، بـا ئەوەیان نەكا، بەڵكو وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەموو ڕێ دەچنەوە بانـە)، یان دەڵێن: (ڕاوی دەڵـەك لەبـەر كەوڵەكەیـەتی)، لەڕاسـتیدا هـەر جموجۆڵێـك كـە خەڵكی ئیسلامیی ئەنجامی دەدا، هەمووی دەبێ بۆ ئەوەبێ كـە خـەڵك لـە خـوا ﷻ نزیكبێتەوەو بەندەی خوا ﷻ بێ‌و، بۆ خوا ﷻ صوڵحاو بێ، جـا كـاری سیاسـیی دەكات، كاری دبلۆماسیی دەكـات، چـالاكی كۆمەڵایـەتیی ئەنجامـدەدا، دەرس‌و دەور دەڵێتەوە، هەرچی دەیكا، دەبێ ئەوە ئامانجی بێ.

**دووەم: بانگەواز بۆ چاكە (الخير) كە (راغب الأصفهاني) بـە: (مَـا يَـرْغَـبُ فِـيهِ الْـكُـلُّ)[1] پێناسەی كردوە، هەرچەندە لەگەڵ بانگەواز بـۆ ئیـسلام لەیەك نزیكن، بەڵام یەك نین:**

ئەم ئایەتە: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ آل عمـران، زۆرجـاران ئـاوا تەفـسیر كراوە[2]: (با كۆمەڵێك لەنێو ئێوەدا هەبن خەڵك بانگ بكەن بۆ ئیسلام ...)، یـانی: (خَيْر) واتە: (ئیسلام)، بەڵام وانیە، چونكە خوا ﷻ دەیتـوانی بفـەرمویێ: (وَلْـتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْإِسْلامِ)، كە فەرموویەتی: (خَیْـر)، دیارە وشەی (خَيْر) جیایە لە وشەی (ئیـسلام)، بـەڵێ، هـەموو خێـرو چـاكەیەك لـە ئیـسلامدایە و، ئیـسلام بەشـێوەیەكی ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ سەرچـاوەی هـەموو چـاكەو خێـرو خۆشییەكە، بەڵام وشەی (ئیسلام) مەفهووم‌و واتایەكی تایبەتی هەیە، كە بریتیە لەو

---

١) واتە: ئەوەی كە هەموو لایەك بۆی تامەزرۆو ئارەزوومەندن‌و حەزی لـێ دەكەن.

٢) خۆیشم لە هەندێك كتێبمدا وامكردوە! بەڵام ئەوە لێرە ڕاستم كردەوە.

ئایینەی خوا ﷻ ناردوویەتی، مەرج نیـە هەموو چـاكەیەك هـەمووی وەحـی دەقـی لەسەر كردبێ، بەڵام وشەی (خَیْـر) مەفهوومو واتایەكی دیكـەی هەیـەو فـراوانترو گشتگیرە، (خَیْـر) واتە: چاكەو هەر شتێكی باش كە ئینسان ئارەزووی دەكات.

واتە: وەحی بەگشتی خەڵكی بۆ چاكە بانگكردوەو هانیـداون، بـەڵام هەنـدێك چاكە هـەن كـە خـەڵك بـە عـەقڵو ئـەزموونو بـەو فیترەتـەی كـە خـوا ﷻ پـێی بەخشیون، دەتوانن دەركیان پێ بكەن، دیارە بە دڵنیایی‌یەوە ئیسلام بێجگە لە چـاكە فەرمان بە هیچ شتێكی دیكە ناكات و، خەڵك بۆ هـیچ شـتێكی دیكـە بـانگ ناكـا، بەڵام وشەی (خَیْـر) لە ڕوویەكی دیكەوە مەفهوومەكەی فراوانترە لە ئیسلامو هەموو شتێكی باشو بەسوود دەگرێتەوە، چ سەرچاوەكەی ئیسلام بێ –كە مەبەست پـێی (قورئانو سوننەت)ە ـ وە چ غەیری ئیسلام بێ، بەو مانایە كە هەندێك شتی چـاكو بە سوودو بە كەڵك هەیە، كە عەقڵی سەلیمو فیترەتی ساغو ئـەزموونو زانـست لـە هەموو بوارەكاندا پەی پێ دەبەنو، مەرج نیە وەحی خاڵی تێدا خستبێتە سەر پیـت، لەبەرئەوە كە لـە مـەودای عـەقڵو فـیترەتو ئـەزموونی بەشـەردایە، بۆوێنـە: ئـەو تەكنۆلۆجیایەی دەیبینینو بۆتە مایەی بەختەوەری بەشەر، ئەگەر بەشەر بۆ مەبەسـتی چاكە بـەكاری بێنـێ، ئـەو هـەموو ئـامێرو ئامرازانـە كـە دروسـتكراون، هـەر لـە دروستكردنی ئۆتۆمبیلەوە بگرە، تا تێكـڕای جۆرەكـانی ئـامرازی سـواربوون، لـە كەشتی نێـو دەریـاو فڕۆكـە، وە پاشـان تـەكنۆلۆجیای مـەدەنیی دیكـە، بەتایبـەتی تەكنۆلۆجیای زانراوەكان (تكنولوجيا الـمعلومات)، هـەموو ئەوانـە وەحـی دەسـتی ئینسانی نەگرتوە فێریانی بكات، بەڵام خوا ﷻ ئەو توانایەی داوە بە ئینسان، كـە بـە عەقڵو فیترەتو ئەزموونی خۆی بگاتە داهێنانی ئەو شتانە، كە ئەوانەش هـەموویان دەچنەوە نێو بازنەی خێرو چاكە، كەواتە: كە ئایەتەكە دەفەرموێ: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ ...﴿١٠٤﴾﴾ آل عمـران، وێڕای ئەوەی كـە دەبـێ خـەڵك بـانگ

بكرێ بۆ ئیسلام، كە بە دڵنیاییەوە ئیسلام وەك گوتم بێجگە لە چاكە، خەڵك بۆ هیچ شتێكی دیكە بانگ ناكا، بەڵام وێڕای ئەوە هەر شتێكی دیكەش كە بەسوودو بە كەڵك بێ بۆ خەڵك، ئەو ئایەتە دەیگرێتەوە، كە دەبێ ئێمە خەڵكی بۆ ڕێنمایی بكەین‌و، یەكدی بۆ ڕێنمایی بكەین‌و، فێری یەكدی بكەین‌و، یەكدی لێ شارەزا بكەین.

**سێیەم: فەرمان بە چاكەو ڕێگرتن لە خراپە لە ڕووی ڕیزبەندیی زەمەنیی (الترتيب الزمني)و گرنگییەوە، پاش بانگەواز دێ‌و، ئەركێكی یەكجار گەورەو گرنگی مسوڵمانانە:**

بۆچی؟ چونكە تۆ تا یەكێك بانگ نەكەی بۆ لای ئیسلام‌و بە دەنگتەوە نەیەت، ناتوانی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەی لەگەڵدا ئەنجام بدەی، واتە: كەسێك كە لە بنەڕەتدا جارێ ئیسلامی قبووڵ نەكردبێ، وەك ئیمان‌و عەقیدە، پاشان وەك شەریعەت پێیەوە پابەند نەبووبێ، تۆ ڕێت نیە كە بڵێی: ئەوە مەكە خراپەو ئەوە بكە چاكە، پێشێ دەبێ ئیسلامی قبووڵ كردبێ، ئینجا دوایی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەی لەگەڵدا ئەنجام دەدەی، وە فەرمان بە چاكەو ڕێگرتن لە خراپە، دەگونجێ بە شێوەی تایبەت ئەنجام بدرێ‌و دەشگونجێ بەگشتی، واتە: دەگونجێ كۆمەڵێك لە مسوڵمانان خۆی بۆ تەرخان بكەن، وە دەشگونجێ كە هەر كامێك لە مسوڵمانان لە زاتی خۆیدا ئەنجامی بدا، بۆ هەردووك لەو دوو شێوازەش بەڵگەمان هەیە:

بەڵگەی ئەوە كە كۆمەڵێك لە مسوڵمانان خۆیان تەرخان بكەن‌و پسپۆڕ بن لە ئەنجامدانی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەدا، لەنێو كۆمەڵگای مسوڵماناندا، ئەو ئایەتەیە كە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ...﴿١٠٤﴾﴾ آل عمران، وەك پێشتریش

باسمانکرد، ئەگەر (مِـنْ) لێرەدا بۆ بەشـێك (تَبْعـِيضْ) بـێ، ئـەوە ئـەم ئایەتـە ئـاوا تەفسیر دەکرێ: (وە با لـەنێو ئێـوەدا کۆمـەڵێك هـەبن، بانگـەواز دەکــەن بـۆ لای چاکەو فەرمان بە هەرچی شتی پەسندە دەکەنو، ڕێگریی لە هەرچی شتی ناپەسـندە دەکەن ...). کەواتـە: ئـەم ئایەتـە هـەم پێکهێنـانی ڕێکخـراوە مەدەنییـەکانو هـەم پێکهێنانی ڕێکخراوە سیاسییەکانیشی لێ دەفامرێتەوە، دیارە لە مێژووی ئیسلامو لـە دەوڵەتی ئیسلامییدا، کۆمەڵێکی دیاریکراو هەبوون بۆ ئەنجامدانی فەرمان بە چـاکەو ڕێگریی لە خراپە و، ناوێکی تایبەتیی بۆ کارەکەیان داناوە بە ناوی (الحِـسْبَة)[1] واتـە: فەرمان بە چاکە کردنو ڕێگریی لە خراپە کردنو حیساب کردنی پاداشتەکەی لەلای خوا ﷻ، کۆمەڵێکی دیاریکراو هەبوون ئەو ئەرکەیان ئەنجامـداوە، بـە نێـو بـازاڕو شوێنی کارو کەسابەتدا گەڕاون و، هەر کەسێك چاکەیەکی فەرامۆش کردبێ، یان خراپەیەکی کردبێ، ئاگاداریان کردوونەوە، هەریەکە بە شێوازی خۆی.

وە بەڵگـەی ئـەوەش کـە وێـڕای ئـەوەی دەگونجـێ کۆمـەڵێکی تایبـەت لـەنێو مسوڵمانانـدا هەبن، ئەو ئەرکە ئەنجام بدەنو لەلایەن دەسەڵاتی شەرعییەوە دانـرابن، وێڕای ئەوە دەشگونجێ هەر کەسێك لە زاتی خۆیشیدا ئەو ئەرکـە ئـەنجام بـدا، ئـەو ئایەتەیە کە خوای بەرزو مـەزن دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ...﴿٧١﴾﴾ التوبـة، کە ئـەوەش دیارە بە گشتی فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ ﴾، واتە: (وە هەموو پیـاوانی ئیمانداراو هەموو ئافرەتانی ئیمانـدار هێنـدێکیان دۆسـتو پـشتیوانی هێنـدێکیانن، فەرمان بە چاکە دەکەنو ڕێ لە خراپە دەگرن لەنێو خۆیاندا ...).

---

١) مانای پاراستنو خەڵات، هەروەها حیسابکردنی پاداشت لەلای خوا ﷻ، دەگەیەنێ.

فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ لەبارەی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەوە زۆر زۆرن، ئێمە دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

یەکێکیان ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {وَالَّذِي نَفْسي بِيَدِهِ، لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْ عِنْدِهِ ثُمَّ لَتَدْعُنَّهُ فَلاَ يَسْتَجِيبُ لَكُمْ} رواه الترمذي: (٢١٦٩)، وقال: حديث حسن، وصححه الألباني، واتە: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە[1]، دەبێ فەرمان بە شتە پەسندەکان بکەنو ڕێگریی لە شتە ناپەسندەکان بکەن، ئەگەرنا نزیکە خوا لەلایەن خۆیەوە سزایەکتان بۆ بنێرێ، پاشان بێگومان هەرچەندە لێی بپاڕێنەوە وەڵامتان نەداتەوە).

ئەم فەرمایشتە هەڕەشەیەکی گەورەی تێدایە بۆ مسوڵمانان، کە پێغەمبەر ﷺ سوێند دەخوا بە خوا ﷻ، دەفەرموێ: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە)، واتە: سوێند بە خوا ﷻ، چونکە ئەو ڕۆحەی خوا ﷻ خستوویەتە جەستەی ئینسانەکانەوە، بەس بە خواش ﷻ دێتەوە دەرێ، ئیدی شتێکی بێ جێیە ئینسان لە غەیری خوا ﷻ بترسێ بۆ مردن، چونکە ئەو ڕۆحە هەر بەدەست خوایە ﷻ، خوا ﷻ خستوویەتە نێو جەستەی ئینسانو هەر بە خواش ﷻ دێتەوە دەرێ، ئەگەر هەرچی هۆکاری مردنی دنیایە، هەمووی کۆبێتەوە لە دەوری ئینسان، بەڵام خوا ﷻ نەیەوێ ئەو ئینسانە بمرێ، نامرێ، وە ئەگەر هەرچی هۆکاری دنیاشە کۆبێتەوە، نەیەڵێ ئینسان بمرێ و، خوا ﷻ بیەوێ بمرێ هەر دەمرێ.

---

١) پێغەمبەر زۆر جار بەم شێوە (صیغە)یە سوێندی خواردوە، چونکە بەڕاستی گیانی مرۆڤەکان بەدەست بوون، یەکێکە لە سیفەتە گەورەکانی خوای پەروەردگار ﷻ.

جا پێغەمبەر ﷺ سوێند دەخوا بە خوا ﷻ، دەفەرمویٚ: (دەبیٚ فەرمان بە شتە پەسندەكان بكەن‌و ڕیٚ لە شتە ناپەسندەكان بگرن، ئەگەرنا زۆر نزیكە خوا سزاتان بۆ بنێریٚ، وە هەرچەندە زۆر بپاڕێنەوە وەڵامتان نەداتەوە)، كەواتە: ڕێزو قەدری مسوڵمانان لەلای خوا ﷻ، بەوەوە بەستراوەتەوە كە فەرمان بەو شتانە بكەن كە شەریعەت بە پەسندی داناون و، ڕیٚ لە شتە ناپەسندەكان بگرن، هەتا ئەو كاتە، خوا ﷻ بەدەمیانەوە دیٚ‌و دوعا و پاڕانەوەكانیان گیرا دەكات.

وە بەڕاستیش خوشك‌و برایانی خۆشەویست!

كەسێك خوای پەروەردگار ﷻی لەلا بەرزو بەڕێز بیٚ، كەسێك ڕێزو حورمەت‌و سام‌و هەیبەتی خوا ﷻی لە دڵدابیٚ، ڕێزو حورمەتی شەریعەتی خوا ﷻی لە دڵدابیٚ، دەبیٚ هەوڵ بدات هەرچی خوا ﷻ فەرمانی پیٚ كردوە لە شەریعەتەكەی ئەو، بیچەسپێنیٚ‌و، هەرچی خوا ﷻ ڕیٚی لیٚ گرتوە لە شەریعەتەكەیداو بە ناپەسندی داناوە، هەوڵ بدات لایبەریٚ‌و نەیهێڵیٚ، ئەگەرنا ئەو دەعوایەی لیٚ ناسەلمێندریٚ بڵیٚ: خوایە! تۆ زۆرم لەلا گەورەو بەرزو بەڕێزی، بەڵام گویٚ نادەمە شەریعەتەكەشت! خوایە تۆم زۆر لەلا گەورەو بەرزو بەڕێزی، بەڵام ئەو شتانەی تۆ بە پەسندت داناون‌و فەرمانت پیٚ كردوون، هەرچەندە خەڵكی فەرامۆشیان كردوون‌و پشتگوێیان خستوون، بەڵام من فەرمانیان پیٚ ناكەم، وە ئەو شتانەی كە تۆ ڕێت لیٚ گرتوون‌و بە خراپ‌و ناپەسندت داناون، هەرچەندە خەڵك دەیانكا، بەڵام من گوێیان پیٚ نادەم! لە ڕاستیدا ئەو دەعوایەی ناسەلمێندریٚ.

هەروەها لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَاسْتَطَاعَ أَنْ يُغَيِّرَهُ بِيَدِهِ فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ} رواه ابن ماجه: (٤٠٣١)، وقال الألباني: صحيح. وفي رواية: (وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ)، واتە: (هەر كامێك لە ئێوە

شتێکی ناپەسندی بینی با بە دەست –بە هێز- بیگۆڕێ، جا ئەگەر نەیتوانی با بە زمانی بیگۆڕێ، جا ئەگەر نەیتوانی با بە دڵی پێی ناخۆش بێ، وە ئەوەش لاوازترینی جۆری ئیمانە)، وە لە ریوایەتێکدا هاتوە: (لە دوای پێناخۆشبوونی دڵەوە، بە قەدەر دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان بوونی نیە)، واتە: کەسێك بە دڵیش رقی لە خراپە نەبێ، ناگونجێ بڵێ: ئیماندارم، بە دەست پێی ناگۆڕدرێو بە زمانیش دژی ناوەستێ، بەهەر حاڵ بەڵام تەنانەت بە دڵیش رقی لێی نەبێ، مانای وایە بە قەد دەنکە خەرتەلەیەك ئیمانی نیە.

کەواتە: بە دڵ پێناخۆش بوون هەر دەبێ هەبێ، ئەگەرنا مانای وایە ئیمان لە دڵی ئەو ئینسانەدا نیە.

## چوارەم: فەرمان بە چاکە کردنو رێگریی لە خراپە کردن، حیکمەتو وردەکاریی زۆری دەوێ:

هەڵبەتە ئێمە دەتوانین بە پوختییو بە گوشراویی ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەین لەو بوارەدا، ئەگەرنا بەڕاستی فەرمان کردن بە چاکەو رێگرتن لە خراپە، باسێکی وردو قووڵی دەوێو هەروا شتێکی سادە نیە.

جا من دە خاڵم نووسیون کە پێویستن بۆ کەسێك بیەوێ فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپە ئەنجام بدا، کە وەك گوتم بەبێ ئەوە ئینسان بە ئیماندار لە قەڵەم نادرێ، جا چ بە دەست بێ، چ بە زمان بێ، چ بە دڵ بێ، دەبێ بە شێوەیەك لە شێوەکان هەڵوێستت لە بەرانبەر شتە پەسندەکاندا هەبێ، وەك پشتگیریی و فەرمان پێ کردن، وە هەڵوێستت لە بەرانبەر شتە ناپەسندەکاندا هەبێ، وەك دژ وەستانەوەو هەوڵدان بۆ لابردنو بەرەنگاربوونەوە:

**١- بەبێ زانیاریو شارەزایی ئەو ئەرکە بەڕێوەناچێ:**

کەسێك زانیاریی نەبێ بە شتی پەسند (معروف)و، شتی ناپەسند (منكر)و، شارەزایی بە کەسەکانو واقیعو هەلو مەرجەکانیان نەبێ، دیارە ناتوانێ ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات.

جا شارەزایی یەکەم بە شتە پەسندەکانو شتە ناپەسندەکان، دەبێ بزانین چ شتێك پەسندە لە رووی شەریعەتەوە، تا فەرمانی پێ بکەین، وە چ شتێك ناپەسندە تاکو رێی لێبگرین.

وە شارەزایی دووەم بە کەسەکانو بەو واقیعو هەلو مەرجەی کە تۆ دەتەوێ ئەو ئەرکەی تێدا ئەنجام بدەی، ئینجا بۆچی دەبێ زانیاریمان هەبێ؟ چونکە خۆ تۆ نابێ هەر لە خۆتەوە یەخەی خەڵکی بگریو بڵێی: ئەو شتە بکەن، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئاخر بۆچی ئەنجامی بدەم؟ تۆ دەڵێی: لەبەرئەوەی پەسندە، ئەوەتا خوا ﷻ وای فەرمووەو پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە، چونکە زانینی ئەوە کە ئەو شتە پەسندە، یان ناپەسندە، بەس لە وەحییەوە دەزاندرێ.

ئینجا لێرەدا ئەوە فەرزێکی دینییەو، هەرچەندە هەندێکی بە عەقڵ دەزاندرێ، بەڵام هەر شتێك بە شەرع نەزاندرێو شەریعەت بە پەسندی دانەنابێ، بۆت نیە فەرمانی پێ بکەیو خەڵکی پێوە پەیوەست (مُلْزَمْ) بکەی، وە هەر شتێك شەریعەت بە ناپەسندی دانەنابێ، بۆت نیە خەڵکی لێ قەدەغە بکەی، مادام تۆ وەك دین ئەوە ئەنجام دەدەی، ئەگەرنا هەرچی راست بۆوە دەڵێ: بە عەقڵی من ئەوە پەسندەو دەبێ بیکەی، وە بە عەقڵی من ئەو شتە خراپەو دەبێ نەیکەی، مانای وایە دەبێتە ئاژاوەو کەس بە کەسیی (فَوْضَى).

بەڵام ئەو شتانەی کە بە عەقڵو ئەزموون چاکییو خراپییانمان بۆ دەردەکەوێ لە بوارەکانی ئیداریی، پیشەسازیی، کشتوکاڵ ... هتددا مادام دەسەڵاتی

شەرعیی وڵاتو كۆمەڵگا یاسایان پێ دەربكاتو بڕیاریان لەسەر بدات، ئەوە لەسەر خەڵكی پێویستە پێیانەوە پابەند بن، مادام بەرژەوەندیی خەڵكو كۆمەڵگا لەوەدابێ، بۆ نموونە: یاساكانی هاتوچۆ (قوانین المرور).

بەڵێ هەر كەسێك ئەركی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە ئەنجام بدا، دەبێ شارەزای شەریعەت بێ، بۆ ئەو شتەی كە فەرمانی پێ بە خەڵك دەكات، یاخود لە خەڵكی قەدەغە دەكات، ئەگەرنا مەرج نیە هەموو شەریعەت شارەزابێ.

**٢- فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە لە شتی ڕاجیایی هەڵگردا ناكرێ، بەڵكو پێویستە پەسند (معروف)و ناپەسند (منكر)ەكان، زانایان لەسەریان پێكهاتبن و یەكدەنگ بن كە ئەو شتە پەسندە یان ناپەسندە:**

دیارە وشەی (المعروف)و (المنكر)یش هەر ئەوە دەگەیەنن و زانایانیش لەسەر ئەوە یەكدەنگن، ئینجا (المعروف) واتە: ئەو شتانەی كە زانراوە پەسندن و، (المنكر)یش واتە: ئەو شتانەی كە زانراوە ناپەسندن، چونكە هەردووكیان ئەلیف لام (أل)ی تەعریفیان لەسەرە، واتە: زاندراوە كە ئەو شتە پەسندەو ئەو شتەش ناپەسندە.

بۆ وێنە: كردنی پێنج نوێژە فەرزەكان، ئەوە دیارە دەزانین شتێكی پەسندە، خواردنەوەی شەراب دەزانین شتێكی ناپەسندە، هەروەها لەو جۆرە شتە زانراوانە بن كە ناكۆكیی و ڕاجیایی زانایانیان لەسەر نەبێ، زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن و دەڵێن: ئەو شتانەی كە ڕاجیاییان لەسەرە، شوێنی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە نین، بۆ وێنە: پێچە (نِقَابْ)ی ئافرەتان، لەبەرئەوەی زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن دەموچاوو هەردوو دەستی ئافرەت عەورەت نین و، ئافرەت بۆی هەیە دەموچاوو هەردوو دەستی دیاربن، بۆیە ئەگەر ئافرەتێك دەموچاوو دەستی

دیاربوون، هیچ کەس بۆی نیە بە ناوونیشانی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە لەو ئافرەتە هەڵپێچیءو بڵێ: دەبێ دەموچاوت داپۆشی، چونکە تەنها کەمێك لە زانایان دەڵێن: دەموچاوی ئافرەت عەورەتەو ئافرەت مولزەمە بەوەی دەموچاوی داپۆشێ، بەڵام زۆربەیان دەڵێن[1]: عەورەت نیە، هەر شتێکیش ڕاجیایی تێدابوو، فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەی تێدا ناکرێ، ئەگەرنا ئەگەر وا نەڵێین، دەبێ بڵێین: هەر زانایەك بۆخۆی ڕایەکی هەبوو، با جیاش بێ لە ڕای زانایانی دیکە، بۆی هەیە لە خەڵکی هەڵپێچێ، بەوەش دنیا دەبێتە فەوزاو گێژاو.

## ٣- ڕەچاوکردنی ئەدەبو ڕەوشتی بەرز، بۆ کەسێك کە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە دەکات:

ئەو کەسەی فەرمان بە چاکە دەکاتو ڕێگریی لە خراپە دەکات، دەبێ ئەدەبو ڕەوشتێکی بەرزو جوانی هەبێو شێوازێکی جوان بەکاربێنێ، خوای کاربەجێش ﷻ فەرموویەتی: ﴿أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾ البقرة، واتە: (ئایا فەرمان بە خەڵکی دەکەن بە شتی چاکەو خۆتان لەبیردەچێتەوە، وە ئێوە کتێبی خوا ـتەوراتـ دەخوێننەوە؟ ئایا ئێوە نافامن)؟ هەڵبەتە ڕووی دواندن (خطاب) لە جوولەکەکانە، بەڵام هەموو دواندنەکانی قورئان هەر وان، هەرچەندە خوای پەروەردگار ﷻ لەکاتی

---

١) بڕوانە: (ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەت دا)، وە (چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت دا)، وە (سروشتو پایەکانی خێزانو مەسەلەی چەند ژنیی لە تەرازووی عەقڵ و وەحی دا)، کە لە هەموویاندا ڕای زۆربەی زانایانمان لەوبارەوە بە بەڵگەوە خستۆتەڕوو.

دابەزاندنی ئایەتەکاندا رووی دواندنی لـە کۆمـەڵێکی دیـاریکراو کردبـێ، بـەڵام حوکمەکە خەڵکی غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە.

ناگونجێ تۆ شتێکی پەسند بە خـەڵکی بڵـێی، بـەڵام بۆخـۆت نەیکـەی، وە رێی شتێکی ناپەسندیان لـێ بگری، بەڵام لە خۆتدا هەبێ.

هەروەها زانایان گوتوویانە: (أُؤْمُرْ بِالْمَعْـرُوفِ بِالْمَعْـرُوفِ، وَانْـهَ عَنِ الْمُنْكَـرِ لا بِالْمُنْكَرِ)[1]، واتە: (فەرمان بەچاکە بکـە بەچاکیی، وە رێ لە خراپـە بگـرە، بەڵام نەك بە خراپیی)!

**٤- پێویستە ریزبەندیی لە چاکەو خراپەکاندا رەچاوبکرێو، هاوسەنگیی لەنێوان زیـانو قازانجەکـاندا بکرێو، هـەر خراپەیـەك خراپەیەکی وەك خۆی یان گەورەتری بێتەوە جێو، هەر چاکەیەك چاکەیەکی وەك خۆی یان گەورەتری نەیەتەوە جێ، نابێ دەستکاریی بکرێ:**

ئەوە مەسـەلەیەکی تۆزێـك وردەو لـە کـاتی فـەرمان بـە چـاکەو رێگریـی لـە خراپـەدا، دەبـێ ریزبەنـدیی چـاکەو خراپـەکان رەچـاوبکرێ، وە هاوسـەنگیی لەنێوان قازانجو زیاندا بکرێ، بۆوێنـە: تۆ دەتـەوێ خراپەیـەك لابـەری، دەبـێ تەماشای بکەی ئەو خراپەیەی لایدەبەی خراپەیەکی وەك خۆی دێتەجێ، یـاخود لە خۆی گەورەتر؟ ئەگەر وایە دەستی لــێ مـەدە، بـۆ وێنـە: کەسـێك غەیبـەت دەکات، تۆ دەبێ تەماشا بکەی بەهۆی ئـەوە کـە تـۆ دەڵـێی: غەیبـەت مەکـە،

---

١) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: {جَـاءَ أَعْرَابِيٌّ فَبَـالَ فِي طَائِفَةِ الْمَسْجِدِ، فَزَجَرَهُ النَّـاسُ، فَنَهَـاهُمْ النَّبِـيُّ ﷺ، فَلَمَّـا قَضَى بَوْلَهُ أَمَـرَ النَّبِيُّ ﷺ بِـذَنُوبٍ مِـنْ مَـاءٍ فَأُهْرِيــقَ عَلَيْـهِ}، رواه البخـاري: (٢٢١) واللفظ له، ومسلم: (٢٨٤)، واتە: (عەرەبێکی خێڵەکیی هات لە لایەکی مزگەوت میـزی کـرد، خەڵکیش تێـیان خـوڕی، پێغەمبــەریش ﷺ نـەهی لێکــردن، کاتێــك میزەکـەی تـەواوکرد پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد سەتڵێك ئاویان پێداکرد).

یاخود ڕێی لێ دەگری، دەبێ تەقدیر بكەی، ئایا بەهۆی ئەو ئامۆژگاریی و ڕێگرتنەی تۆ، ئەو ئینسانە زیاتر تووشی غەیبەت نابێ؟ وە یاخود وێڕای غەیبەت بوختانێكیش بەو كەسە ناكات كە غەیبەتی دەكات؟ ئەگەر بزانی خراپتردەبێ، دەبێ دەستی لێنەدەی، هەروەها هەر چاكەیەك كە فەرامۆش كراوە، تۆ دەتەوێ فەرمانی پێ بكەی، دەبێ تەماشا بكەی ئایا بەهۆی ئەو چاكەوە خراپەیەك كە گوناهی لە چاكەی چاكەكە زیاتربێ نایەتەدی؟ یاخود بەو هۆیەوە چاكەیەكی گەورەتر لەبەین ناچێ؟ ئەگەر وابێ دەبێ دەستی لێنەدەی.

لێرەدا با وێنەیەك بێنمەوە بۆ ئەوەی شتەكەتان زیاتر بۆ روون بێتەوە: ڕۆژێك (إبن تيمية)[1] ڕەحمەتی خوای لێبێ كۆمەڵە خەڵكێكی لەگەڵدادەبێ، بەلای كۆمەڵێك لە تەتەرو مەغۆلییەكاندا تێپەڕدەبن كە خەریكی شەڕاب خواردنەوەن، ئەوانیش دەڵێن: با بچین نەیەڵین شەڕاب بخۆنەوەو لێیان تێكبدەین، دەڵێ: لێیانگەڕێن، دەڵێن: ئەدی نەچین فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەیان لەگەڵدا بكەین؟ دەڵێ: نەخێر لێیانگەڕێن، چونكە ئەوان ئێستا سەرگەرمی شەڕاب خواردنەوەو سەرخۆشیین، ئەگەر سەرخۆش نەبن دەچن دزیی دەكەن‌و ڕێگریی دەكەن‌و خەڵكی دەكوژن، هەر سەرخۆش بن سەلامەترە، یانی خراپەی سەرخۆشییەكەیان بۆ خۆشیان‌و بۆ خەڵكیش كەمترە لەوەی كە سەرخۆش نەبن،

---

١- قال ابن القيم: (إنكارُ المُنكرِ أربعُ درجاتٍ: الأولى: أن يزُولَ ويخْلُفه ضِدُّه، الثانية: أن يَقِلَّ وإن لم يزَلْ بِجُملتِه، الثالثة: أن يخْلُفَه ما هو مثلُه، الرابعة: أن يخْلُفَه ما هو شرٌّ منه، فالدَّرجتان الأوليان مشروعتان، والثالثةُ موضعُ اجتهادٍ، والرَّابعةُ مُحرَّمةٌ). إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج: (٣)، ص: (٧).

وقال: (وَسَمِعْتُ شَيْخَ الْإِسْلَامِ ابْنَ تَيْمِيَّةَ قَدَّسَ اللَّهُ رُوحَهُ وَنَوَّرَ ضَرِيحَهُ يَقُولُ: مَرَرْتُ أَنَا وَبَعْضُ أَصْحَابِي فِي زَمَنِ التَّتَارِ بِقَوْمٍ مِنْهُمْ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ، فَأَنْكَرَ عَلَيْهِمْ مَنْ كَانَ مَعِي، فَأَنْكَرْتُ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ لَهُ: إنَّمَا حَرَّمَ اللَّهُ الْخَمْرَ لِأَنَّهَا تَصُدُّ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنْ الصَّلَاةِ، وَهَؤُلَاءِ يَصُدُّهُمْ الْخَمْرُ عَنْ قَتْلِ النُّفُوسِ وَسَبْيِ الذُّرِّيَّةِ وَأَخْذِ الْأَمْوَالِ فَدَعْهُمْ). إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج: (٣)، ص: (٧).

ئینجا رەنگە مەترسیی ئەوەشی بووبێ کە ئەوان بـچن نەیـەڵن شـەڕاب بخۆنـەوەو لەگەڵیان بەشەڕبێن و سەرەنجام تووشی زیانیان بکـەن. کەواتـە: لابردنـی خراپـە دەبێ زۆر عاقڵانەو وردبینانەبێ و هاوسەنگیی تێدا رەچاوبکرێ، ئەوە نیـە بڵـێی هەر چۆنێکی بێ، با من ئەو خراپەیە لابەرم و با دنیای لەسەر کاول بـێ! چـونکە کاتی خۆی شتی وا بووەو ئێستاش ئەوانەی بە کرچ و کاڵیی لە دین تێگەیشتوون، دەڵێن: جا چۆن دەبێ لێبگەڕێین لە بازاڕ ئەوە هەبێ، یان ئەو نەفەرە ئاوا بکـات؟ دەچێ لەگەڵی دەکاتە هەرایەك، جاری وا هەبووە کـابرا لەسـەر ئـەوەی شـەڕابی خواردۆتەوە کوشتوویەتی، کە دیارە ئەگەر حوکمی (شەریعەتی ئیسلام)یـش لـە ئارادا هەبێ و دەوڵەتی ئیسلامییش هەبێ سزایەکەی چل قەمچییـە، یاخود هەشـتا قەمچییـە لای زۆرییەکەی، بەڵام کوشـتن سـزای شـەرعیی ئـەو کەسـە نیـە کـە شەڕاب دەخواتەوە، یان کەسێك دزیی دەکات سزایەکەی کوشتن نیە.

**٥- فـەرمان بـە چـاکەو رێگریـی لـە خراپـەش لـە جێبـەجێ کردنـی سـزا شەرعییەکان جیـایە، چونکە هەموو کەس بۆی هەیە فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپە ئەنجام بدات، بە مـەرجێك مەرجـەکانی تێـدابن، بـەڵام جێبەجێکردنی سزا شەرعییەکان، تەنیا مافی دەسەڵاتی شەرعییە:**

ئەوەش خاڵێکی زۆر گرنگە، تۆ دەبینی کۆمەڵێك کەس شەڕاب دەخۆنـەوە، تەنها بۆت هەیە ئەگەر بزانی خراپتر ناقەومێ، بچی نەیەڵی شـەڕابەکە بخۆنـەوە، بەڵام بۆت نیە بڵێی: وەرن هەریەکەی چل یاخود هەشـتا قەمچیـشتان لێبـدەم، ئەوە ئیشی تۆ نیە، ئەوە ئیشی دەسەڵاتی شەرعییە، لەبەرچی؟ چونکە رەنگـە تـۆ پێتوابێ شەڕابە، کەچی ئەوان بۆوێنە: بیبسی کـۆلا بخۆنـەوە، لەبەرئـەوە شـەرع دووربینە، شەرع دەڵێ: دوایی هەر کەسێك رقی لە کەسێك بوو دەچێ بیـانووی پێ دەگرێ و دەیداتە بـەر قەمـچییان، کاکـە ئـەوە چـییە؟ دەڵـێ: ئـەوە شـەڕابی

خواردۆتەوە، بۆیە دەڵێ: جێبەجێ كردنی سزا شەرعییەكان دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ دەسەڵاتی شەرعیی، دەسەڵاتی شەرعییش داوای سەلماندن (إثبات) دەكاتو، دەبێ بەڵگەی لەسەر هەبێ، یان بۆ خۆی دانی پێدا بێنێ، یان دوو شاهێدت هەبن، جگە لە زینا كە دەبێ چوار شاهێدت هەبن.

**٦- پێویستە ئەو خراپەیە (منكر)ەی كە لادەبردرێ بیندراوو زانداراو بێ، نەك لەڕێی سیخوڕیی (تَجَسُّسْ)و پشكنینەوە پەی پێ برابێ:**

بۆچی؟ چونكە سیخوڕیی كردن بەسەر مسوڵمانانەوە حەرامە، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تَجَسَّسُوا ...﴿١٢﴾﴾ الحجرات، واتە: (... وە سیخوڕیی بەسەر یەكدییەوە مەكەن ...)[١].

دیارە سیخوڕیی كردن (تَجَسُّسْ) وەك (تَحَسُّسْ) وایە، ئەویش ئەوەیە كە تۆ هەست رابگری بە شێوەیەك كە ئەو كەسە هەست پێ نەكا، چاودێریی بكەیو كەمو كوڕییەكەی بزانی، ئەوە حەرامە، بەڵكو لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە: {لَوِ اطَّلَعَ فِي بَيْتِكَ أَحَدٌ وَلَمْ تَأْذَنْ لَهُ، خَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، مَا كَانَ عَلَيْكَ مِنْ جُنَاحٍ} رواه البخاري: (٦٨٨٨) واللفظ له، ومسلم: (٢١٥٨)، واتە: (ئەگەر كەسێك لە كەلێنی دەرگای ماڵەكەتەوە بە بێ ئیزنی تۆ تەماشای ماڵەكەت بكات، ئەگەر وردە بەردێكت تێگرتو چاویت كوێر كرد، گوناهبار نابی).

---

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (لاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَجَسَّسُوا وَلاَ تَحَسَّسُوا وَلاَ تَنَاجَشُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا) رواه مسلم: (٢٥٦٣)، واتە: (ئێرەیی بە یەكدی مەبەنو یەكدی مەبوغزێننو جاسووسیی مەكەنو هەست لە یەكدی رامەگرن، وە لە موزایەدەدا بۆفریودان نرخ زیاد مەكەن، وە ئەی بەندەكانی خوا پێكەوە برابن).

وە پاشان فەرمایشتەكەی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرموێ: {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا}، واتە: (هەر كەسێك لە ئێوە خراپەیەكی بینی)، ئیدی نەك هەر كەسێك بە گومان بڵێ: لەوانەیە ئێستا فڵانە كەس لە ماڵی خۆیدا ئەو كارە بكاتو بچێ لێی بەژووربكەوێ، یاخود بە شێوەیەك كە بۆخۆشی هەستی پێ نەكات بچێ سیخوڕیی بەسەرەوە بكات بزانێ داخۆ خراپە دەكات یان ناكا، ئا ئەوە قەدەغەیەو، دەبێ خراپەیەكی بینراوو زانراو بێو لەبەرچاو بێ، ئینجا ئەو خراپەیە نەهی لێ دەكرێو ڕێی لێ دەگیرێ.

**٧- دەبێ ڕیزبەندیی لە شێوازەكانی لابردنی ناپەسند (منكر)و چەسپاندنی پەسند (معروف) لە ئاسانەوە بۆ قورس بچێ، نەك بە پێچەوانەوەو، مادام بەقسە لابچێ پێویست بە دەست ناكا:**

واتە: كەسێك خراپەیەك دەكات، تۆ دەزانی ئەگەر بە قسە پێی بڵێیو ئامۆژگاریی بكەی، دەستی لێ هەڵدەگرێ، پێویست ناكات بڵێی: دەبێ هەر بە هێز لایبەرم، لەبەرئەوەی فەرموودەكە دەڵێ: {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ}، چونكە فەرمایشتەكەی پێغەمبەر ﷺ لە بەرزترەوە بۆ خوارتر دەچێو شێوازی پلەپلەیی لە نزمەوە بۆ سەرێمان پێشان نادا، ئەگەرنا مادام خراپەیەك بە قسەیەكی خۆش لابچێ، پێویست ناكات هێزی لێ بخەیە كار، بەڵكو جاری وایە بە چاو لێكردنێكو هێما بۆ كردنێك، بابای خراپەكار دەست لەو خراپەیە هەڵدەگرێ و، پێویست ناكات هەر قسەشی لەگەڵ بكەی، وە ئەگەر بە قسەی نەرم دەستی لێ هەڵبگرێ، پێویست ناكات قسەی توندی لەگەڵ بكەی، وە ئەگەر بە قسەی توند دەستی لێ هەڵبگرێ، پێویست ناكات لێی ڕابسێی زللەیەكی لێبدەی، وە ئەگەر بە لێڕاسانێك دەستی لێ هەڵبگرێ، پێویست ناكات زللەیەكی بە كردەیی لێبدەی ... وە هەروەها.

**٨- ئەوەی هێزو (دەستی) لە تواناد‌ا نەبوو (قسە)و (دڵ) بۆوی نیشانەی ئیمان لاوازیی نین، هەرچەندە ڕواڵەتی فەرمایشتەكە وا دەگەیەنێ:**

تەماشا بكەن خوشك‌و براياني خۆشەويست!

فەرمايشتەكاني پێغەمبەر ﷺ دەبێ زۆر وردبينانە لێيان حاڵي بين، ئەگەرنا دوايي بە شێوەيەك لە فەرمايشتي پێغەمبەر ﷺ تێدەگەين، كە شايستەی پێغەمبەر ﷺو فەرمايشتە بەرزەكاني نيە.

پێغەمبەر ﷺ لەو فەرمايشتەيدا كە دەفەرمویێ: {... فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ} رواه مسلم: (٤٩)، وە لە ريوايەتەكەيديكەدا دەفەرمویێ: {وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ} رواه مسلم: (٥٠)، واتە: (... جا ئەگەر نەيتواني با بە زماني بيگۆڕێ، جا ئەگەر نەيتواني با بە دڵي پێی ناخۆش بێ، وە ئەوەش لاوازتريني ئيمانە)، وە لە ريوايەتەكەيديكەدا: (وە لە دواي پێناخۆشبووني دڵەوە، بەقەدەر دەنكە خەرتەلەيەك ئيمان بووني نيە)، ئەوە بۆ كەسێكە تواناي هەبێ بە دەست بيگۆڕێ، بەڵام هەر بە دڵ ئيكتيفا بكات، يان تواناي هەبێ بە زمان بيگۆڕێ، بەڵام هەر بە دڵ ئيكتيفا بكات، بابايەكي ئاوا ئيمانەكەی بێهێزە، بەڵام تۆ بە بازاڕي هەولێرو سلێماني‌و دهۆك‌و بازاڕەكانيديكەی عێراقدا دەڕۆی، شەڕاب داندراوە، كە شتێكي حەڕامەو دەفرۆشرێ، كابرا خۆی بە مسوڵمان دەزانێ‌و شەڕابيش دەفرۆشێ، لە حاڵێكدا كە ناتواني نە بە دەستيش دوكانەكەی پێ دابخەی‌و، نە بە زمانيش دەرفەتت هەيە بڵێی: شەڕاب مەفرۆشە، جا ئايا ئەوە ماناي وايە تۆ بێهێزترين ئيمانت هەيە؟ نەخێر، بۆچی؟ چونكە لەو حاڵەتەدا تۆ توانات هەر ئەوەندەيەو ئەوە بۆ كەسێك بێهێزترين ئيمانە، كە بە دەست‌و بە زمان بتوانێ لايبەرێ، بەڵام بەس بە دڵ ئيكتيفا بكات، وەك كەسێك كە خۆی بە

حكوومەتو دەسەڵاتدار دەزانیٚ، ئایا ناتوانیٚ بڕیارێك دەربكاو بڵیٚ: نابیٚ شەڕاب بفرۆشریٚ؟ با، ئایا ناتوانیٚ پۆلیسان بنێریٚو بڵیٚ: شەڕاب مەفرۆشن؟ با، بۆ ئەوەیان ئەگەر بەس بە دڵ پیٚی ناخۆش بیٚ، ئەوە بێهێزترین ئیمانی هەیە، بەڵام ئەگەر بە دڵیش پیٚی ناخۆش نەبیٚ، ئەوە فڕی بەسەر ئیمانو مسوڵمانێتیەوە نیە، بەڵیٚ ئەگەر بڵیٚ: بە دڵ پێمناخۆشە بەڵام دەسەڵاتم نیە، كە ڕاستیش ناكا، ئەوە دەگونجیٚ بڵێین: لاوازترین ئیمانی هەیە، بەڵام بۆ منو تۆی مسوڵمان كە بۆمان ناگونجیٚ نە بە دەست ڕیٚی لێبگرینو نە بە زمانیش، مەرج نیە بێهێزترین ئیمانمان هەبیٚ.

بۆیە ئەوەم ڕوونكردەوە تاكو كەس لە خۆی نەكەوێتە گومانەوەو بڵیٚ: دیارە هەموومان بێهێزترین ئیمانمان هەیە! ئەو هەموو شەڕابە دەفرۆشریٚو هیچیشمان نە بە دەست پێمان لادەچیٚو نە بە زمانیش پێمان دەگۆڕدریٚ، كەواتە بێهێزترین ئیمانمان هەیە!! نا، مەرج نیە لە هەموو حاڵاندا وابیٚ، بەڵكو ئەوە بۆ كەسێكە توانای هەبیٚ، بۆچی دەڵێین: توانامان نیە؟ خۆ من دەتوانم بچم بڵێم: بێنە ئەو دەڕابەی دادەوە، دەتوانم یەك دوو جار وا بكەم، دەتوانم بچم پاسەوانەكانم ببەم سیٚ چوار لەو شەڕابفرۆشانە بدەینەبەر لیسان، بەڵام ئایا واقیعەكەی پیٚ دەگۆڕدریٚ؟ وە پاشان چی دێتە جێگا؟ لەوانەیە دواتر بچن لە ڕقی ئەوە، دوكانەكەی زۆر بۆ گەورەتر بكەن، مانای وایە مونكەڕەكەی پیٚ لانەچوو، بەڵكو مونكەڕێكی گەورەتری هاتە جێگا، یان من دەتوانم بچم بە ڕیز بە دوكانی شەڕابفرۆشەكان پێدابچم، هەرچەندە ئێمە نموونەمان بە شەڕابفرۆشەكان هێنایەوە، ئەگەرنا شتی لە شەڕاب فرۆشتن زۆر خراپتر هەیە، كوشتن هەیە، زینا هەیە، ستەم هەیە، خراپەكارییو بەدڕەوشتیی (فساد) هەیە، بەڵام بەهەرحاڵ نموونەكەمان وا هێنایەوە، دەتوانین بە دوكانەكاندا بڕۆین هەریەكی وتارێكیان بۆ

بدەم، بەڵام ئایا واقیعەكەی پێ دەگۆڕدرێ؟ تۆ دەبێ تەماشا بكەی ئەگەر مەزەنەی ئەوەبوو كە پێی دەگۆڕدرێ دەبێ بیكەی، بەڵام ئەگەر مەزەننەی ئەوەبوو كە پێی ناگۆڕدرێ، نایكەیو ماناشی وا نیە كە ئیمانەكەت بێهێزە، یاخود بێهێزترین ئیمانت هەیە، بۆچی؟ چونكە پێتوایە پێی ناگۆڕدرێ، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾﴾ الأعلى، واتە: (ئامۆژگاریی بكە، ئەگەر زانیت ئامۆژگاریی سوودی هەیە)، ئەدی ئەگەر بزانی سوودی نیە؟ بەخۆڕایی خۆت ماندوو مەكە.

**٩- بەبێ هەڵوێستی دەروونیی لە بەرانبەر شتی پەسندو ناپەسند (معروف و منكر)دا، ئیمان بوونی نیە:**

بەبێ هەڵوێستی دەروونییو قەلبیی لە بەرانبەر مەعرووفو مونكەردا، واتە: هەڵوێستی ئیجابیی لە بەرانبەر مەعرووفدا، كە حەزی پێ بكەیو پێتخۆشبێ بچەسپێ، وە هەڵوێستی سەلبیی لە بەرانبەر مونكەردا، كە پێتخۆشبێ لابچێ، بەبێ ئەو هەڵوێستە ئیمان بوونی نیە، كە ئەوە بەبێ فەرمایشتەكەی پێغەمبەریش ﷺ، هەر بە عەقڵ دیارەو كەسێك بە دڵ پێی خۆش نەبێ چاكە هەبێو بە دڵ رقی لە خراپە نەبێ، ئەوە دیارە ئیمانی نیە، ئەو دڵەی كە ئیمانی تێدابێ، وا لە خاوەنەكەی دەكات لەگەڵ چاكەیەكدا بێ كە لە ئیمانەوە هەڵدەقوڵێ، وە دژی خراپەیەك بێ كە دژی ئەو ئیمانەیە، بەڵێ هەر كەسێك هەڵوێستی ئیجابیی بەرانبەر بە شتە پەسندەكان نەبێ، كە شەریعەت فەرمانی پێ كردوون، وە بە دڵ هەڵوێستی سەلبیی بەرانبەر بە شتە ناپەسندەكان نەبێ، ئەوە مانای وایە ئیمانی نیە، فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر روونە كە دەفەرموێ: {... وَلَيْسَ وَرَاءَ ذلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ} رواه مسلم: (٥٠)، واتە: (لە

دوای پێناخۆشبوونی دڵ بۆ شتی ناپەسند، بـە قـەدەر دەنکـە خەرتەلەیـەك ئیمـان بوونی نیە).

**١٠- هەرچـەندە دروسـتە دەسـتەیەکی دیـاریکراو فـەرمان بـە چـاکەو ڕێگـریی لە خراپە (حِسْـبَة) ئەنجام بدەن، بەڵام ئەوە مانای وا نیە کە ئەرکێکی گشـتی نیـە :**

چونکە خوای بەرزو مەزن بە گشتی ئیماندارانی پیـاوو ئافـرەتی بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە وەسف کـردوە، دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ...﴿٧١﴾﴾ التوبـة، کە پێشتر چەند جارێك مانامان کردوە، بەڵام بێگومان ڕێـژە (نِـسْبَة)ی پێویـست بـوونی: (ئەرکی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە) پەیوەندییـەکی ڕاسـتەوانە (طَـرْدِي) لەگەڵ تواناو بۆلوانی تاکەکان دا هەیـە.

**پێنجـەم: پابەنـدکردنی کۆمەڵگـا بـە شـەریعەتەوە، بەرهـەمی بانگـەوازو فـەرمان بـە چـاکەو ڕێگریـی لـە خراپەیـە، نـەك بـەکارهێنانی هێـزو فـشار! چـونکە پابەنـدیی بـە شـەریعەتەوە بـەزۆر نـاکرێ و قـەوارەی ئیسلامییش بە بەکارهێنانی هێز دانامەزرێ[1]:**

پابەندکردنی کۆمەڵگا بە شەریعەتەوە، واتـە: بـانگکردنی خـەڵك بـۆ لای خـوا ﷻ، خەڵك کردن بە بەندەی خـوا ﷻ، بەرهـەمی بانگـەوازو فـەرمان بـە چـاکەو

١) وەك بە درێژی لە زنجیرە ئالقەکانی بەرنامەی سەرنج (ئیـسلام و دەوڵەتـداریی و حـوکمڕانیی)دا باسمانکردوە.

ڕێگرتن لە خراپەو باقی جموجۆڵو چالاكییەكانە، نەك بەرهەمی بەكارهێنانی هێزو فشار خستنەسەر خەڵك، بۆچی؟ چونكە خەڵك بەزۆر پابەند ناكرێ بە شەریعەتەوە، كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (بە زۆر كەسێك بنێری بۆ مازووان، لە داری هەڵناڕوانێ)، كابرایەك بە تۆبزیی پێی بڵێی: دەبێ بچی مازووانم[1] بۆ بێنی، كابرا بە زۆری بنێری بۆ ئەو شاخە تەماشای دار مازووەكان ناكاتو دێتەوە دەڵێ: یەك مازوویان پێوەنەبوو!

بەڵێ پابەندیی بە شەریعەتەوە بە زۆر ناكرێ، گوتیان: مامۆستایەك زۆر تەكلیفی لە یەكێك كردبوو نوێژێ بكات –دیارە كابرایەكی دنیایی بووە- ئەویش گوتبووی: مامۆستا ناتوانمو نایكەمو قەناعەتم پێی نیە، ئەویش گوتبووی: نا، ئاخر هەردەبێ لەبەر خاتری من بیكەی، نوێژی نیوەڕۆ بووە، ئەویش دایبەستبوە نوێژو گوتبووی: نیەتم وایە نوێژی نیوەڕۆ دەكەم چوار ركات بۆ مامۆستا مەلا فلان كەس! مامۆستاش گوتبووی: لێیگەڕێو هەر مەیكە، ئاوا خۆشت كافر دەكەی.

كەواتە: لە راستیدا پابەندیی بە شەریعەتەوە بە زۆر ناكرێ، چونكە مسوڵمانەتیی هەڵقوڵاوی قەناعەتو دڵو دەروونی ئینسانەو بە زۆر ناكرێ، جا هەر لە نوێژەوە بیگرە تا هەر شتێكی دیكە، بۆیە پابەندكردنی خەڵك بە شەریعەتەوە، دەبێ لە میانەی بانگكردنیانو، تێگەیاندنیانو، رۆشنبیركردنیانو، فەرمان بە چاكەو ڕێگرتن لە خراپەدا بێ، نەك لە میانەی بەكارهێنانی هێزدا، چونكە بەداخەوە ئێستا هەندێك لایەنی ئیسلامیی وایان لە مێشكدایە، كە ئەگەر دەسەڵاتمان هەبوو خەڵك هەمووی دەبێتە مسوڵمانی باش، نەخێر وا نیە، چونكە ئەگەر دەسەڵاتیشت هەبێ، ئەوپەڕی خەڵكی دەكەیە دووڕوو (منافق)!! بەڵكو دەبێ لە دینیان تێبگەیەنیو لە دەروونەوە

١) مازوو: ئەوەیە كە بۆ پێستە خۆشكردن (دَبَاغ) بەكاردەهێنرێ.

بیانگۆڕی، ئەگەرنا بە بەكارهێنانی زۆر، ئەوپەڕی دەیانكەیە مونافیق، چییان لێدەكەی؟ دەچێتە مزگەوت بەڵام نیەتی بۆ خوا لێ ناهێنێ، دەڵێ بەڕۆژووم، بەڵام لە ماڵێ خواردن دەخوا، ئینجا ئەوە بوو بە چی؟ وەك چۆن لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا، ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ كە سەراپا ڕەحمەتو بەزەیی بووە، مونافیق هەبوون، ئەوانەی كە بەرژەوەندییان لەوەدابوو كە كوفری خۆیان پەنهان بكەن، ئەگەرنا خۆ پێغەمبەر ﷺ زۆری لە كەس نەدەكرد، بڵێ: من مسوڵمانم، بەڵام بەرژەوەندییان لەوەدا بوو، دەیانگوت با خۆمان هەر بە مسوڵمان پێشان بدەین، بوون بە چی؟ بوون بە مونافیق، لە كافر خراپترو، زەرەرو زیانیشیان لە كافران زیاتر بوو، بۆیە سزای مونافیقانیش لە هی كافران توندترە، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ...﴿١٤٥﴾﴾ النساء، واتە: (بێگومان دووڕووەكان لە چینی هەرە خوارەوەی ئاگری دۆزەخ دان ...). كەواتە: بەكارهێنانی فشارو زۆرو هێز بۆ فەرزكردنی ئیسلام بەسەر خەڵكدا، خەڵك ناكاتە مسوڵمان، بەڵكو لە كوفری ئاشكراوە دەیانبا بۆ كوفری پەنهان، ئەویش بریتییە لە حاڵەتی نیفاقو دووڕوویی، هەروەها كیانو دەوڵەتی ئیسلامییش لە ڕاستیدا بە زۆرو بە فشارو بە هێز بنیاتناندرێ، بەڵێ بە هێز بەرگریی لێدەكرێ، بەڵام بە هێز بنیاتناندرێ، بەڵكو دەبێ بە بانگەوازو تێگەیاندنو هۆشیاركردنەوەی خەڵكو قەناعەت پێهێنانیان، كۆمەڵگا بگۆڕدرێو كیانو قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامیی دابمەزرێ، پێغەمبەری ئێمە ﷺ وایكردوە[1].

---

١) وەك لە: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ) و، (ئیسلامو مسوڵمانەتیی‌و كاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا) و، زنجیرە وتاری: (ئیسلامو دەوڵەتداریی‌و حوكمڕانیی)دا، ڕوونمان كردۆتەوە.

## شەشەم: كۆمەڵگای مسوڵمان وەك چۆن بە دروشمەكان (الشعائر) دەناسرێ، بە بەرنامەكانیش (الشرائع) دەناسرێ:

وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ...﴿٤٨﴾﴾ المائدة، واتە: كۆمەڵگای مسوڵمان هەر ئەوە نیە نوێژی تێدا بەرپابكرێ‌و ڕۆژووی تێدا بگیرێ‌و، نوێژی جەژنەكان‌و یادی خوا ﷻ‌و بانگ‌و قامەت‌و ...هتدی تێدا ئەنجام بدرێن، بەڵكو كۆمەڵگای مسوڵمان وێڕای بەرپاكردنی دروشمەكان (شعائر)[1]، دەبێ بەرنامەكان (شرائع)یشی تێدا پیادەبكرێن، ئەوجار ئەو كۆمەڵگایە بە مسوڵمان لە قەڵەم دەدرێ، هەروەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ...﴿٤٨﴾﴾ المائدة، هەروەها دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ...﴿٢١﴾﴾ الشورى، واتە: (یاخود ئەوانە هاوبەشانێكیان بۆ خوا داناون، كە بەرنامەیان بۆ داناون، لە شتێكدا كە خوا مۆڵەتی پێنەداوە ...).

(شرائع)یش واتە: بەرنامەكانی ژیان، چاكەو خراپەو حەڵاڵ‌و حەرام لە هەموو بوارەكانی حوكم‌و سیاسەت‌و ئابووریی‌و كۆمەڵایەتیی‌و جەنگ‌و ئاشتیی‌و ... هتددا.

---

١) خوای پەروەردگار ﷻ لە قورئاندا وشەی (شعائر)ی بەكارهێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾﴾ الحج، واتە: (ـ كاروباری حەج وەك بۆتان ڕوونكرایەوە ـ بەوشێوەیە، وە هەر كەسێك دروشمەكانی خوا بە بەرز بگرێ، ئەوە لە پارێزكاریی دڵەكانەوەیە).

# بنەمـای حەڤدەیـەم

بەکـارهێنانی هـێز بۆ بەرگریکـردن

لە دیـن و ژیـنی کۆمـەڵگـا،

لە کـات و شـوێنی خۆیـدا و،

بە مەرجـە شـەرعییـەکانـەوە.

# بنەمـای حـەڤدەیـەم

## بەكارهێنانی هـێز بۆ بەرگریكـردن لە دیـن و ژینـی كۆمـەڵگا، لـە كـات و شـوێنی خۆیـدا و، بە مـەرجە شـەرعییەكانەوە:

كۆمەڵی ئیسلامیی هەبوونی هێزو هۆكارەكانی لە كاتی گونجاوو پێویستدا، بە مافی شەرعیی‌و بگرە بە ئەركی سەرشانی دەزانێ‌و، لەپێناو پارێزگاریی لێكردنی پیرۆزییەكان (مقدسات)ی ئیسلام‌و حورمەتەكان (حرمات)ی مسوڵمانان‌و خاك‌و نیشتماندا بەكاریدێنێ، بەپێی بنچینە شەرعییەكان‌و، ڕەچاوكردنی هاوسەنگیی لەنێوان بەرژەوەندیی‌و خراپە (المصلحة والمفسدة)دا، چونكە:

١- خـوای زاڵ‌و كاربەجێ ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ ...﴿٦٠﴾﴾ الأنفال. واتە: (وە بۆیان -بۆ كافران و بۆ دوژمنانتان- ئامادە بكەن ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز و وڵاخی بەستراوە، دوژمنی خوا و دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن، وە كەسانێكیش جگە لە دوژمنە بەرچاوەكان كە ئێوە نایانزانن، بەڵام خوا دەیانزانێ ...). واتە: با هێزتان هەبێ تاكو دوژمنانی پەنهان و ئاشكرا لێتان بترسن و تەماعتان تێ نەكەن.

٢- وە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ٣٩ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠﴾ الشورى. خوا ﷻ لە سیاقێكدا كە باسی سیفەتی ئیمانداران دەكات دەفەرموێ: (وە ئەوانەی كاتێك دەستدرێژییان كرایە سەر، تۆڵە دەستێننەوە، وە سزای هەر خراپەیەك خراپەیەكی وەك خۆیەتی، كەسێكیش لێبوردن بكاتو چاكسازیی بكات پاداشتی لەسەر خوایە، بێگومان خوا ستەمكارانی خۆشناوێ).

٣- هەروەها خوای كاربەجێ ﷻ فەرموویەتی: ﴿... فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤﴾ البقرة. واتە: (... هەر كەسێك دەستدرێژیی كردە سەرتان، وەك دەستدرێژیی كرانە سەرتان لەلایەنی ویەوە، ئاوا دەستدرێژیی بكەنەوە سەر و بەرپەرچی بدەنەوە، وە پارێز لە خوا بكەن، وە بزانن خوا لەگەڵ پارێزكارانداێە).

٤- پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ وێنە: فەرموویەتی: {لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي قَائِمَةً بِأَمْرِ اللَّهِ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ أَوْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ عَلَى النَّاسِ} رواه البخاري: (٣٦٤١) ومسلم: (١٠٣٧) واللفظ له، واتە: (بەردەوام كۆمەڵێك لە ئۆممەتی من – دەستەیەكی كەم لە كۆمەڵی[1] فراوانی من- فەرمانی خوا جێبەجێ دەكەن، نە ئەوانەی پشتیان بەردەدەن زیانیان پێدەگەیەننو، نە ئەوانەش كە دژایەتییان دەكەن، هەتا فەرمانی خوا دێ – هەتا دنیا كۆتایی دێ-، لەو كاتەشدا ئەوان بەسەر خەڵكەوە باڵادەستن).

---

١) چونكە ئوممەت بە مانای كۆمەڵ دێ.

٥- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَنْ يَبْرَحَ هَذَا الدِّينُ قَائِمًا، يُقَاتِلُ عَلَيْهِ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ) رواه مسلم: (١٩٢٢)، واتە: (ئەم ئایینە بەردەوام بە راوەستاویی دەمێنێتەوە، کۆمەڵێك لە مسوڵمانان لەپێناویدا دەجەنگن، هەتاکو قیامەت دێ).

## ڕوونکـردنەوە:

ئەم بنەمایەش لە پێنج خـاڵـدا ڕوون دەکەینەوە:

**یەکەم: هەرچەندە جەنگو جیهاد بە مانا تایبەتییەکەی (کە بریتیـە لـە جـەنگ)[1] لـە بنەڕەتـدا ئـەرکی دەوڵـەتی ئیـسلامییە، بـەڵام وەك حاڵـەتی هـەڵاواردنو لەکـاتی نـەبوونی دەوڵـەتدا، مـسوڵمانان لەسـەریان پێویسـتە بەگـوێرەی توانـا بـەرگریی بکـەن:**

---

١) ئەگەرنا مانای فراوانی جیهاد بریتیە لە بەکارهێنانی هەموو هەوڵو توانایەك لەپێناوی ڕازیکردنی خوا ﷻدا، بۆیە وشەی (جهاد) وەك چۆن لە ئایەتە مەدینەیی (مـدني)ەکانـدا هـاتوە، لـە ئایەتـە مەککەیی (مکي)ەکانیشدا هاتوە، بەڵام وشەی (قتال) کە بەس بە مانـای (جـەنگ)ە، تـەنیا لـە ئایەتـە مەدینـەیی (مـدني)ەکانـدا هاتوە، کەواتـە: وشـەی (جهـاد) هـەم مانـای جـەنگ (قتـال) دەگرێتەوەو، هەم مانای غـەیری (قتـال)یـش دەگرێتـەوە، بـۆ وێنـە: خـوای پـەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٦﴾ العنكبـوت، واتـە: (هەر کەسێك تێکۆشا ئەوە بۆ خۆی تێدەکۆشێ – قازانجەکەی بۆ خۆیەتی ـ وە خوا دەوڵەمەندو بێ نیازە بەرانبەر بـە جیهانییـان)، مـرۆڤ لـەپێناوی خـوا ﷻدا تێدەکۆشـێ، بـەڵام خـۆی لێـی بەهرەمەندە، خوا ﷻ لێی بەهرەمەند نابێو کەس ناتوانێ سوودێك بە خـوای پـەروەردگار ﷻ بگەیەنێ.

هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ ...۝٧٨﴾ الحـج، واتە: (لەڕێی خوادا وەك بۆ خوا شـایسـتەیە تێبکۆشن ...).

بەکورتی: وشەی (جهاد) لە سووڕەتە مەککەیی (مکي)ەکانـدا، بـە مانـای هەوڵـدانو خـۆ ماندووکردنو تێکۆشان هاتوە، وە جاری واش هەیە وشەی (جهـاد) بە مانا تایبەتییەکەی هاتوە کە جەنگو کوشتار دەگەیەنێو بەو مانایەش تەنیا لە سووڕەتە مەدینەییەکاندا هاتوە.

هەرچەندە جەنگ‌و جیهاد (بە مانا تایبەتییەكەی) لە بنەڕەتدا ئەركی دەوڵەتی ئیسلامییە، بە بەڵگەی ئەوە كە لە قۆناغی مەككەدا ڕێ نەدرا بە مسوڵمانان هێز بەكاربێنن، بەڵكو لە قۆناغی مەدینەدا ڕێگایان پێدرا.

لە (سیرة ابن هشام)دا هاتوە[1] لەكاتی باسكردنی پەیمانی دووەمی عەقەبەدا: (فَقَالَ لَهُ الْعَبّاسُ بْنُ عُبَادَةَ بْنِ نَضْلَةَ: وَاَللَّهِ الَّذِي بَعَثَك بِالْحَقّ إنْ شِئْتَ لَنَمِيلَنَّ عَلَى أَهْلِ مِنَى غَدًا بِأَسْيَافِنَا؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ "لَمْ نُؤْمَرْ بِذَلِكَ وَلَكِنْ ارْجِعُوا إلَى رِحَالِكُمْ)، واتە: (عەبباسی كوڕی عوبادەی كوڕی نەزڵە پێی گوت: سوێند بەو خوایەی كە تۆی بە حەق ناردوە ـ ئەی پێغەمبەری خواـ ئەگەر ئیرادە بكەی‌و پێت چاك بێ، بەیانی بە شمشێرەكانمان لەگەڵ ئەو موشریكانەی كە لە مینا كۆبوونەتەوە ڕووبەڕوو دەبینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمانمان بەوە پێ نەكراوە –واتە: جەنگ كردنـ، بەڵكو بگەڕێنەوە بۆ لای بنەو بارگەكانتان)، بەڵێ لە قۆناغی مەككەدا مسوڵمانان ڕێیان لێگیرابوو كە چەك‌و هێز بەكاربێنن، وەك خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ

---

١) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: كَانَ أَوّلَ مَنْ ضَرَبَ عَلَى يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْبَرَاءُ بْنُ مَعْرُورٍ، ثُمَّ بَايَعَ بَعْدُ الْقَوْمُ.

فَلَمَّا بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَرَخَ الشّيْطَانُ مِنْ رَأْسِ الْعَقَبَةِ بِأَنْفَذِ صَوْتٍ سَمِعْتُهُ قَطّ: "يَا أَهْلَ الْجَبَاجِبِ" –وَالْجَبَاجِبُ: الْمَنَازِلُ– هَلْ لَكُمْ فِي مُذَمّمٍ وَالصّبَاءِ مَعَهُ قَدْ اجْتَمَعُوا عَلَى حَرْبِكُمْ؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذَا أَزَبّ الْعَقَبَةِ هَذَا ابْنُ أَزْيَبَ.

قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: وَيُقَالُ ابْنُ أُزَيْبٍ "أَتَسْمَعُ أَيْ عَدُوّ اللَّهِ، أَمَا وَاَللَّهِ لَأَفْرُغَنّ لَك".

قَالَ: ثُمّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ "ارْفَضّوا إلَى رِحَالِكُم". قَالَ: فَقَالَ لَهُ الْعَبّاسُ بْنُ عُبَادَةَ بْنِ نَضْلَةَ: وَاللَّهِ الّذِي بَعَثَك بِالْحَقّ إنْ شِئْت لَنَمِيلَنّ عَلَى أَهْلِ مِنَى غَدًا بِأَسْيَافِنَا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ "لَمْ نُؤْمَرْ بِذَلِكَ وَلَكِنْ ارْجِعُوا إلَى رِحَالِكُمْ" قَالَ فَرَجَعْنَا إلَى مَضَاجِعِنَا، فَنِمْنَا عَلَيْهَا حَتّى أَصْبَحْنَا. (السيرة النبوية لابن هشام، ج: (٢)، ص: (٢٣١).

ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ...﴿٧٧﴾ النساء، واتە: (ئایا تەماشای ئەوانە ناكەی كە پێیان گوترا: دەست بگێڕنەوەو چەكو هێز بەكارمەهێنن، بەڵام نوێژ بەرپابكەنو زەكات[1] بدەن؟...).

بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە كە لە قۆناغی مەدینەدا ڕێ درا بە مسوڵمانان هێز بەكاربێنن؟ بەڵگەمان ئەم ئایەتە بەپێزەیە كە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ الحج، واتە: (مۆڵەت درا بۆ ئەوانەی كە جەنگیان لەگەڵدا دەكرێو ستەمیان لێ كراوە، وە بێگومان خوا لەسەر یارمەتیدانیان بە توانایە)، (أُذِنَ) واتە: مۆڵەت درا، كەواتە: پێشتر مۆڵەتو ئیزن نەبووە كە هێزو چەك بەكاربێنن، ئینجا ئەمە لێی وەردەگیرێ كە ئەسڵ ئەوەیە مسوڵمانان دەوڵەتو قەوارەیەكیان هەبێ ئەوجار جەنگو جیهاد بكەن، جەنگو جیهادیش بۆ بەرگریی كردنە لەو قەوارە ئیسلامییە و، بۆ بەرگریی كردنە لە بانگەوازی ئیسلامیی كە ڕێی لە بەردەمدا تەختو ئاچووغ بێ، ئەسڵەكەی وایەو پێغەمبەر ﷺ وایكردوە، وە مەنتیقی عەقڵو واقیعیش ئەوە دەخوازێ، وەك عەرەب دەڵێن: (ثبِّتْ الْعَرْشَ ثُمَّ انْقُشْ)، واتە: (تەختەكە دامەزرێنە ئەوجار نەخشو نیگاری لێ بكە)، مەعقوول نیە تۆ جارێ سەر زەمینەكە هی خۆت نیە و، قەوارەو دەسەڵاتت نیە، خەڵكەكەت بۆ ساغ نەبۆتەوە، بچی دەوڵەت ڕابگەیەنی! وەك ئەوانەی ناویان لەخۆ نابوو: (دەوڵەتی ئیسلامیی عێراق).

---

١) زۆر لە زانایان پێیانوایە مەبەست لە زەكات لێرەدا، پاككردنەوەی دەروون (تزكية النفس)ە.

خۆی دەوڵەت دەبێ سێ بنەمای هەبێ:

أـ سەر زەمینێكت هەبێ هی خۆت بێو دەسەڵاتت بەسەریدا هەبێو كۆنترۆڵت كردبێ.

ب ـ خەڵكێك هەبێ تۆیان قبووڵ بێ وەك دەسەڵات.

جـ ـ بەرنامەیەكیشت هەبێ كە پیادەی بكەی.

بەڵام تۆ خەڵكت نەبێو خاكت نەبێو دەسەڵاتت نەبێ، دەوڵەتی چی بۆ بابم؟! ئەوە دەبێتە خەونو خەیاڵ، هەر بووە خەونو خەیاڵیش، جا زۆر عەجایبە، ئێستا هەر جارەی وەزیرێكیان دەگیرێ، ئەوە وەزیری بەرگرییان گرت، وەزیری كشتوكاڵیشیان گرت! ئاخر كاكە وەزیری چی؟ بەڕاستی ئینسان زۆر نارەحەت دەبێ كە دەبینێ ئەو شتانە بەناوی ئیسلامەوە دەكرێن، پێغەمبەر ﷺ كەی دەوڵەتی ڕاگەیاند؟ كاتێك كە چوو بۆ مەدینەو مسوڵمانان هاتن بەیعەتیان پێدا و، بە براگەورەی خۆیان لە قەڵەمیاندا و، باوەشیان كردەوە بۆ بانگەوازو پەیامو بەرنامەكەی، ئەوجار دەوڵەتی دامەزراند، چونكە لەوێ دەیتوانێ شەریعەتی خوای پەروەردگار ﷻ پیادە بكات، بەڵام تۆ كون بە كون خۆت بشاریەوەو بشڵێی: من دەوڵەتم هەیە، ئاخر تۆ دەوڵەتت لە كوێ هەیە؟ ئەوە چ وەزیرێكە كون بە كون خۆی بشارێتەوەو لە حەشارگەدا بیگرن؟! بەڕاستی ئەوە شتێكی زۆر بێ مانایەو كارەسات (مصیبة)ێكە دەبێ (إِنَّا لِلَّهِ)[1]ی بۆ بڵێین.

---

١ـ مەبەست لەو ئایەتەیە، كە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ البقرة، واتە: (ئەوانەی كە تووشی نەهامەتییەك دەبن دەڵێن: ئێمە هی خواینو، سەرەنجامیش هەر بۆ لای وی دەگەڕێینەوە).

بەڵێ وەك گوتم بنەڕەت (أصل) ئاوایە، جەنگ‌و جیهاد دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی پێی هەڵسێ، بەڵام وەك حاڵەتی هەڵاواردن (إستثناء)و لەكاتی نەبوونی قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامییدا، مسوڵمانان لەسەریان پێویستە بەگوێرەی توانا بەرگریی بكەن لە دین‌و ژین‌و ناموس‌و ماڵیان‌و، بەهۆی نەبوونی دەوڵەتەوە ئەو ئەركەیان لەسەر لاناچێ، دیارە هێز بەكارناهێنن بۆئەوەی دەوڵەتی ئیسلامیی دابمەزرێنن، بەڵام بۆ وێنە: دەبێ هێز بەكاربێنن بۆئەوەی بەرگریی بكەن لە خاكی خۆیان، ئەگەر خاكەكەیان داگیركرا، وە بەگشتی بەرگریی لەخۆ كردن هەمیشە هەر هەیە، بەڵێ ناگونجێ تۆ هێز بەكاربێنی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی‌و، لە ڕاستیدا ئەوە ڕێگای سروشتی‌و ئاسایی دامەزراندنی دەوڵەت نیە.

بەڵام لەولاوە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿... فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ ...﴿١٩٤﴾﴾ البقرة، وە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾﴾ الشورى، كە دیارە ئەم ئایەتە لە سووڕەتی (الشورى)یە و، سووڕەتی (الشورى)ش لە مەككە دابەزیوە، كەواتە خوای پەروەردگار ﷻ هەر لە مەككەوە مسوڵمانانی وا ڕاهێناوە كە دەستدرێژیی قبووڵ نەكەن‌و مل كەچ نەكەن بۆ خەڵكی ستەمكار، بەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی بە چەك‌و بە هێز ڕووبەڕوویان مەبنەوە، بەڵام لەولاوە خوای پەروەردگار ﷻ ئاوا مسوڵمانانی پەروەردە كردوە، بۆچی؟ بۆئەوەی كاتێك پێویست بوو بۆ ئیسلام دەست بدەنە چەك، ئامادەبن‌و گیانی بەرهەڵستیی كردن‌و بەرەنگاریی‌و فیداكارییان هەبێ، ئەگەرنا كەسانێك هەر لە سەرەتاوە وا فێركرابن، كە ئەگەر هەمووشیان سەربڕن وەك مریشكی مەسلەحە، هەر سەر نەوی بكەن، دوایی كە پێویستیشت بێ، هەر ئامادەنابن هیچت بۆ بكەن!

سەرنج بدەن ئەمە زۆر گرنگە: لە قۆناغی مەككەدا بە كردەوە پێغەمبەر ﷺ ڕێی نەدەدا هاوەڵانی بەڕێزی چەك بەكاربێنن و دەیفەرموو: مۆڵەت نیە، ئەوان دەیانگوت: با بەكاری بێنین، ئەو دەیفەرموو: نەخێر فەرمانمان پێ نەكراوە، بەڵام وەك پەروەردەكردن خوای كاربەجێ ﷻ مسوڵمانانی وا پەروەردەدەكرد، كە گیانی فیداكاریی و بەرخۆدان و خەبات و جیهادیان تێدا هەبێ، بۆئەوەی كە هەر كاتێك پێویست بووو هەل و مەرجەكە ڕەخسا، ئامادەبن!

**دووەم: بێگومان هێز و هۆكارەكانی هێز سەرەنجام ئامڕاز (وسیلة)ن و، نابێ بكرێنە ئامانج (هدف)، دیارە ئامڕازیش لەكاتی پێویست و گونجاوی خۆیداو، لەپێناو ئامانجی شەرعییدا بەكاردێ، كە بریتیە لە پاراستنی پیرۆزییەكانی ئیسلام و حورمەتەكانی مسوڵمانان و خاك و نیشتمان:**

ئەمەش خاڵێكی گرنگە: ئەو شتانەی ئیسلام وەك هۆكارو ئامڕاز دایناون، دەبێ وریابین نەیانكەینە ئامانج، كاتی خۆی كە ئێمە چەكمان پێبوو، دوایی ئەوە بوو هەل و مەرجێك بەسەرداهات، مەكتەبی عەسكەرییمان هەڵوەشاندەوەو چەك و بنكەو بارەگاكانمان نەمان، هەندێك لە برایانی خۆمان پێیانوابوو كە تەنازولمان لە ئیسلامەتیی كردووەو دەیانگوت: مامۆستا! ئەوە چۆن وادەبێ؟ ئەوە تەنازولەو ئێمە پاشەكشەمان كردوە! نەخێر كاكە پاشەكشەمان نەكردوە، چونكە ئەگەر ئێمە پاشەكشەمان كردبێ دەبێ بڵێین: پێغەمبەری خواش ﷺ لە ئاشتەوایی حودەیبییە (صُلْحُ الحُدَيْبِيَة)دا كە ڕێكەوتننامەیەك لەگەڵ هاوبەش دانەرەكاندا ئیمزا دەكات، كە هەتا دە ساڵی دیكە لە دژی یەكدی شەڕ نەكەن، دەبێ بڵێین: ئەویش وازی لە جەنگ و جیهاد هێنابوو؟! نەخێر.

مەسەلەی هێزو بەکارهێنانی، ئـامڕازە، ئامـانج نیـە، ئامـانج ئەوەیـە کـە دەبـێ هەمیشە هەتبێ، بەڵام ئامڕاز مەرج نیە هەمیشە هەتبێ، ئامڕازو هۆکار بۆ بەدیهێنانو جێبەجێ کردنی ئامانجە و، ئەگـەر ئامانجەکـە پـەکی لەسـەر ئـەو ئـامڕازە کـەوت، بەکاری دێنین، بەڵام ئەگەر پەکی لەسەری نەکەوتو پێویستی بە ئـامڕازێکی دیکـە بوو، ئەوکاتە دەبێ دەست لەو هۆکارە هەڵگریو هۆکارێکی دیکە بـەکاربێنی، کـە ئامانجەکە پێویستی پێیەتی.

وە لەڕاستیدا هەمیشە ئامانجە گـرنگو بنەڕەتییـەکان نـەگۆڕو چەسـپاون، بـەڵام ئامڕازو هۆکارەکان لە حاڵو هەلو مەرجێکەوە بۆ حـاڵو هـەلو مـەرجێکی دیکـە گۆڕانیان بەسەردادێ، ئەو ئامڕازە دوێنێ باشبووە، بەڵام بەکەڵکی ئەمڕۆ نایێ، بـۆ وێنە: لەڕووی بڵاوکردنـەوەی زانسـتو بانگـەوازەوە، کـاتی خـۆی ئـەو هـەموو هۆکـاری ڕاگەیاندنـەی ئێـستا لەبەردەسـتی ئێمـەدا هـەن، ئایـا لەبەردەسـتی زانـا پێشووەکانماندا هەبوون؟ نەخێر، ئەوان ئامڕازی سـادەیان بـەکاردەهێنا، حەلەقـەی دەرسیان هەبوو، وتاریان هەبوو، کۆمەڵـە خـەڵکێك گوێیـان لـێ دەگـرتن، بـەڵام ئێستا ڕادیۆو تەلـەفزیۆنو کـەناڵی ئاسمـانییو کۆمپیوتـەرو ئینتـەرنێتو ڕۆژنامـەو گۆڤار هەیە، ئەمانە کاتی خۆی هیـچیان نـەبوون، وە هـەروەها لـە هـەر بـوارێکی دیکەدا تۆ دەبێ تەماشـابکەی: ئـەو هـەلو مەرجـەی تـۆ، چ هۆکـارو ئـامڕازێکی بەکەڵك دێ؟ یاخود ئەو ئامانجـەی تـۆ هەتـە، کـە ئامانجـە سـەرەکییەکەت خـەڵك بانگکردنە بۆ لای خوا ﷻ، خەڵك لە خوا ﷻ وەنزیك خستنو پەیوەستکردنیانە بـە شەریعەتی خواوە ﷻ، تۆ دەبێ تەماشابکەی لەو هەلو مەرجەی تۆدا، چ ئامڕازێك کاریگەرترە بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە؟ دەبێ ئـەوەیان بـەکاربێنی، ئایـا وا باشـە ئێمـە ئێستا بچینەوە ئەو شاخو داخانەو بارەگامان لەوێ هەبێو خۆمان بکەینـە نیـشانە بـۆ موشەکەکانی ئەمریکا و، حزبە عەلمانییەکانیش ناوو ناتۆرەمان بەدوا بخەنو، پەردەو

نێوان بكەوێتە نێوانی خۆمانو میللەتەكەمان و، خەڵكەكەمان زیاتر سەرگەردان بكەن، ئایا ئەوە باشە؟ نەخێر بە دڵنیاییەوە باش نیە، بەڵام ئەدی ئەگەر ڕۆژێك هات وای پێویست كرد ئێمە دەست بدەینەوە چەك، لێمان قەدەغەیە؟ نەخێر، خۆ ئەو ئایەتانەی باسی جەنگو جیهاد دەكەن نەسخ نەبوونەتەوە، بەڵام دەڵێین ئێستا ڕوو لە ئێمە ناكەن، چونكە زەمینەی جێبەجێكردنیان بۆ ئێمە ڕەخساو نیە.

وەك چۆن خەلیفەی دووەمی پێغەمبەر ﷺ عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺو ئەبو بەكردا خوا لێی ڕازی بێ دەیاندایە دڵڕاگیراوان (المؤلفة قلوبهم)، كۆمەڵێك خەڵكی زلە زلەی ئەشراف، خەڵكی بەدەرەوەو سەرۆك عەشیرەت بوون، كاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ دیاریی دەدانێ تاوەكو شەڕو خراپەیان لە ئیسلام دووربخاتەوە، دوایی ئەبو بەكریش خوا لێی ڕازی بێ لە سەردەمی خۆیدا هەر دەیدانێ، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، كە دەوڵەتی ئیسلامیی هێزو دەسەڵاتی پەیداكردو بێ منەت بوو، لێی گرتنەوەو گوتی: كاتی خۆی ئیسلام دەسەڵاتی كەمبووەو دەوڵەتی ئیسلامیی بێهێز بووە، لەبەرئەوە پێویستییمان بە دڵڕاگرتنی ئێوەبوو، بەڵام ئێستا بارودۆخ گۆڕاوە[1]!

---

١ـ (فبعد انتصار المسلمين على هوازن سنة (٨) هـ أعطى الرسول بعض رؤساء القبائل، فأعطى مائة بعير لكل من أبي سفيان بن حرب، وابنه معاوية، وحكيم بن حزام، والحارث بن كلدة، والحارث بن هشام، وسهيل بن عمرو، وحويطب بن عبد العزى، والعلاء بن جارية الثقفي، وعيينة بن حصن، والأقرع بن حابس التميمي، ومالك بن عوف النصري، وصفوان بن أمية، وأعطى –دون المائة– رجالاً من قريش منهم: مخرمة بن نوفل الزهري، وعمير بن وهب الجمحي، وهشام بن عمرو، وسعيد بن يربوع، وعدي بن قيس، وآخرون، ويبدو أن عطاء الرسول ﷺ للعباس بن مرداس لم يكفه، فعاتب الرسول ﷺ بأبيات من الشعر، فقال ﷺ لأصحابه: إذهبوا به فاقطعوا عني لسانه، فأعطوه حتى رضي، فكان هذا قطع لسانه الذي أمر به رسول الله)، منهج عمر بن الخطاب في التشريع، ص: (١٥٠).

(واستمر إعطاء المؤلفة قلوبهم من الأموال حتى وفاة الرسول ﷺ، وفي خلافة أبي بكر جاء رجلان منهم إلى الخليفة، وطلبا منه أرضاً قائلَيْنِ: إن عندنا أرضا سبخة ليس فيها كلأ ولا منفعة، فإن

جا ئایا عومەر خوا لێی رازی بێ ئەو ئایەتەی لەکارخست؟ وەك ئەوانەی گومانی خراپی پێ دەبەن، کە شیعەکانن دەڵێن: عومەری کوڕی خەتتاب ئایەتێکی خوای لەکارخست! نەخێر وانیە، بەڵام عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێ چاك لە شەریعەت حاڵی بوو، گوتی: هەل‌و مەرجی جێبەجێ کردنی ئەم ئایەتە ئێستا نیە و، هەر کاتێك هەل‌و مەرجی دووبارە بوویەوە، جێبەجێی دەکەینەوە، هەر کاتێك ئیسلام پێویستی بەوەبوو دڵی خەڵکی رابگرین، دووبارە ئەوانەی کە بە پارە شەڕو خراپەیان لەکۆڵ مسوڵمانان دەبێتەوە، شەڕەکەیان لەکۆڵ مسوڵمانان دەکەینەوە، بەڵام ئێستا ئیسلام پێویستی بەوە نیە.

هەروەها مەسەلەی دەست بڕین، عومەر خوا لێی رازی بێ لە ساڵی برسێتی (عام الرمادة)[1]دا سزای دەست بڕینی راگرت، گوتی: ئەگەر خەڵك دزیشیان کرد دەستیان مەبڕن، بۆچی؟ گوتی: چونکە ئێمە ناتوانین کێشەی برسێتیی خەڵك چارەسەر بکەین، کە ناتوانین تێریان بکەین، ناشبێ ئەگەر کەسێك لە برسان دزیی بکات، یان مەزەننەی ئەوە هەیە لە برسان دزیی کردبێ، ئێمە دەستی بېڕین، نەك لەبەرئەوەی ئایەتەکە پەکدەخرێ، بەڵکو لەبەرئەوەی ئایەتەکە زەمینەی جێبەجێ کردنی رەخساو نیە.

---

رأيت أن تعطيها لنا، فكتب لهما كتابا بذلك –وليس في القوم عمر– فانطلقا إليه ليشهد لهما، فلما سمع عمر ما في الكتاب تناوله من أيديهما، وتفل فيه فمحاه، وقال لهما: إن رسول الله ﷺ كان يتألفكما، والإسلام يومئذ قليل، وإن الله قد أغنى الإسلام وأعزه اليوم، فاذهبا فاجهدا جهدكما كسائر المسلمين، فالحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر، فرجعا إلى أبي بكر متذمرين وقالا مقالة سيئة، فوافق أبو بكر عمر على ما فعله ورجع إليه. فقالا له: الخليفة أنت أم عمر؟! قال أبوبكر: هو إن شاء). منهج عمر بن الخطاب في التشريع ص: (١٥١– ١٥٢).

١) عن عوف بن الحارث عن أبيه قال: سمي ذلك العام عام الرمادة لأن الأرض كلها صارت سوداء فشبهت بالرماد وكانت تسعة أشهر. (طبقات ابن سعد، ج: (٣)، ص: (٣١٠).

جا ئایەتەکانی جەنگ‌و جیهادیش هەروان، خوشك‌و برا خۆشەویستەکان! ئایەتەکانی جەنگ‌و جیهاد هەر هەن، بۆ وێنە: لە فەلەستین زەمینەی جێبەجێ کردنیان ڕەخساوە، چونکە دوژمنێك هەیەو خاکی مسوڵمانانی داگیرکردوە، لە شوێنێکی دیکە زەمینەی ڕەخساوە، بەڵام لێرە کە زەمینەی ڕەخساو نەبوو، مانای وا نیە ئێمە لە ئایەتەکان پەشیمان بووینەتەوە، بەڵکو هەرکاتێك زەمینەی جێبەجێ کردنی ئایەتەکان ڕەخسا، لەسەر سەرو چاویان دادەنێین‌و دووبارە جێبەجێیان دەکەینەوە، خوا پشتیوان بێ.

**سێیەم: ڕەچاوکردنی بنچینە شەرعییەکان‌و هێنانەدی بەرژەوەندیی کە لە: دوورخستنەوەی زیانەکان‌و ڕاکێشانی سوودەکان (دَفْعُ الْمَضَارِّ وَجَلْبُ الْمَنَافِعْ)دا بەرجەستەیەو، سەنگی مەحەك‌و تەرازووی بەکارهێنانی هێزە، لەبەرئەوە پێویستە لە مەسەلەی بەکارهێنانی هێزدا زۆر وردبینانەو دووربینانە ڕەچاوبکرێ:**

بەرژەوەندیی (المصلحة) زانایان ئاوا پێناسەیان کردوە: (دَفْعُ الْمَضَارِّ وَجَلْبُ الْمَنَافِعْ)، واتە: (دوورخستنەوەی زیانەکان‌و، هێنانەپێشی قازانجەکان)، ئینجا سەنگی مەحەکی بەکارهێنانی هێز بریتیە لە هێنانەدی بەرژەوەندیی، جا دەبێ تەماشابکەین: ئەگەر ئەو بەرژەوەندییە بەوە دێتەدی کە هێز بەکاربێنین، هێز بەکاردێنین، بەڵام ئەگەر بزانین ئەو بەرژەوەندییە نەك بەوە نایەتەدی، بەڵکو بەوە لەدەستدەچێ، دەبێ بەکاری نەهێنین، چونکە ئێمە بڕیارمان نەداوە ئامرازەکان هەمیشە بەدەستمانەوە بن، بەڵکو بڕیارمانداوە کە ئامانجەکانمان هەمیشە لەبەرچاو بن، بەڵام ئامراز، ئەگەر زانیمان خزمەت بەو ئامانجە دەکات بەکاریدێنین‌و، کە زانیمان خزمەتی پێناکا، جارێ لەوێ دایدەنێین، یان دەیگۆڕین بە ئامرازێکی دیکە.

**چوارەم: لە بواری بەكارهێنانی هێزو پەنا پێبردنیدا، چەند دەستەو كۆمەڵێك لە مسوڵمانان دووچاری زێدەڕۆیی (إفراط) بوونو خاڵی ڕەشی زۆریان هێناوەتە سەر ئیسلامو مسوڵمانان :**

بەداخەوە دەڵێین : ـ پێشتریش ئاماژەم پێدا ـ بەناوی جەنگو جیهادەوە تۆ بێنی لە چایخانەیەك، یان لە تازیەخانەیەك، یان لە چێشتخانەیەك، یان لە بازاڕێكدا، كە ئۆتۆمبێلێكی ئەمەریكییەكان یان دوو سەربازی ئەمەریكی بەوێدا تێپەڕدەبن، لەگەڵ دوو كافران پەنجا مسوڵمانیش بكوژی، وە جاری وا هەیە دوژمنەكە هەر بە بەریش ناكەوێ، ئایا ئەوە لە شەرعدا جێگەی دەبێتەوە؟ نەوەڵڵا، زانایانی ئیسلام دەڵێن : ئەگەر بەهۆی كوشتنی سەد كافرەوە بزانی مسوڵمانێك دەكوژرێ، دەبێ خۆت بپارێزی، نەك لە پەنای كوشتنی كافرێكدا سەد مسوڵمانیش بكوژی!

ئینجا هەندێك لەوانەی لە بواری جەنگو جیهادو لەو مەیدانەدا كاردەكەن، مەسەلەیەكی شەرعیی هەیە، لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا تێكەڵیان كردوە، ئەویش بریتیە لەوە كە پێی دەگوترێت : (التَّتَـرُّسْ)، واتە : (خەڵك كردنە قەڵغان)، دەڵێ : ئەگەر هاتو دوژمنانی ئیسلام مسوڵمانانێكیان كردە قەڵغانو، بەپێش خۆیان دانو وردە وردە دەیانهێنانو، تۆش هیچ چارەت نەبوو، بۆ وێنە : كاتی خۆی شارەكان هەموویان قەڵا بوونو شوورەیان هەبووە، مسوڵمانانیان بەپێش خۆیان داوەو بۆخۆشیان لە پشتیانەوە، كە دیارە ئەگەر كابرا تیر یان هەر شتێك باوێ، سەرەتا بە مسوڵمانەكان دەكەوێ، لەو حاڵەتەدا زانایان زۆربەیان یان هەموویان بە دروست (جائز)یان داناوە، مادام بەهۆی ئەوەوە دوژمن زەفەرت پێ بەرێو ئەگەر بزانی ئەو مسوڵمانانەی بۆ كافرەكان كراون بە پەرژینو چەپەرو قەڵغان، نەیانكوژی بۆئەوەی

كافرەكانیش بكوژی، قەڵاكەت لێ دەگرن‌و شارەكەت لێ داگیردەكەن، دروستە ئەوانە بكوژی، بۆچی؟ چونكە ئەوەندە مسوڵمانە كە دیلن ڕەنگە دوایی كافرەكان هەر بشیانكوژن، جا تۆ ئەگەر بە ناچاریی ئەو مسوڵمانانە بكوژی‌و كافرەكان بشكێنی، باشترە لەوەی بۆئەوەی ئەو چەند مسوڵمانە سەلامەت بن، كافرەكان بێن قەڵاكە بگرن‌و دوایی ئێوەش بكوژن‌و ئەوانیش بكوژن، هێندێك فیدای هەمووان بكرێن باشترە، نەك لەبەر خاتری هێندێكان هەموویان بكوژرێن‌و بكرێنە بەڵاگێڕ[1]، بێگومان ئەمە شتێكی مەنتیقییە، بەڵام ئەمە جیایەو ئەوەش جیایە تۆ بێی لە پەنای ئەوەدا كە دەستت لە كافرێكی گیردەبێ، بێنی مسوڵمانان خەڵتانی خوێن بكەی‌و قەتلْ عامیان بكەی، بەڕاستی ئەوە شتێكی بێ مەعنایە و، زۆر ناشەرعییە، وە بۆ زانیاریشتان بەپێی ئەو زانیارییەی بەمن گەیشتوە، ڕێكخراوی قاعیدە بۆخۆیان لەوبارەوە پێداچوونەوەیان كردوەو چاویان بەخۆدا گێڕاوەتەوەو، بۆیان دەركەوتوە كە بەڕاستی هەر لە بنەڕەتدا كارەكەیان لەسەر بناغەی شارەزایی قووڵ لە شەریعەتدا نەبووە، بەڵام بەڕاستی بەهۆی ئەو بۆچوونە هەڵەیەوە، ئەوانیش‌و باقی ئەو ڕێكخراوانەی دیكەش زەرەری زۆریان داو، ڕووی گەشی مسوڵمانانیش ناشیرین بوو، هەروەها ئەوەی كە لە وڵاتە ئەوروپییەكاندا ڕوویدا، بۆ نموونە: لە شوێنێكی وەك بەریتانیا ئەو شەمەندەفەرانەی بەژێر زەویدا دەڕۆن، خەڵك ئاگای لە هیچ شتێك نیە تۆ لەوێ یان لە شوێنێكی دیكەدا دەیتەقێنیەوە، یان خەڵك بێئەوەی بزانن چ خەبەرە! بە فڕۆكەوە بەو بورجانەیان دادان، بەڕاستی ئێمە نابێ بەشێوەیەكی سۆزداریی

---

١) بەڵام بابای تیرو تفەنگ‌و چی‌و چی هاوێژ، دەبێ نیەتی شكاندنی كافرەكان بێ و، ئەگەر هیچ بواریشی هەبێ، نابێ هیچ مسوڵمانێك بكوژێ و، بەپێی توانا دەست بپارێزێ.

(عاطفي)انە بڵێین: مادام ئەوەی كردوویەتی مسوڵمانەو، ئەوەی لە دژی كراوە ئەمریكایەو، ئێمەش رقمان لە دەوڵەتی ئەمریكایە[1] و مسوڵمانانیشمان خۆشدەوێن، كەواتە هەرچی مسوڵمان بیكا لە دژی ئەمریكا هەر چاكە، نەخێر ئەوە حوكمێكی سۆزدارییەو ئێمە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ تەرازووی شەریعەت، چونكە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ...﴿١٠﴾﴾ الشورى، واتە: (وە هەر شتێك تێیدا كەوتنە راجیایی، حوكمەكەی بگێڕنەوە بۆ لای خوا ...)، بزانن قورئان چی دەفەرموێ ئەوە بكەن، جا قورئان دەفەرموێ: ﴿... مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ...﴿٣٢﴾﴾ المائدة، واتە: (... هەر كەسێك نەفسێك بێ خەتا بكوژێ، بێ ئەوەی كوژراوەكە كەسی كوشتبێ، یان خراپەكاریی[2] لە زەویدا كردبێ، وەك ئەوە وایە هەموو خەڵكی كوشتبێ ...)، نەشیفەرمووە مسوڵمان بێ یان كافر بێ، هەر نەفسێك بێ خەتا بیكوژی، وەك ئەوە وایە هەموو خەڵكی سەر زەویت كوشتبێ، مادام بە حەق نەبێو، لە تۆڵەی ئەوەدا نەبێ كە خراپەكاریی (فساد)ی كردوە لە زەویداو ئاژاوەو پەشێویی ناوەتەوە.

---

١) دیارە مەبەستیش لە دەوڵەتی ئەمریكا ئەو رژێمەیە كە خراپەكاریی و ستەم دەكات، نەك خودی ئەمریكا (یان هەر شوێنێكی دیكە) وەك خەڵك و وڵات.

٢) وەك رێگریی و پەشێوی نانەوە.

**پێنجەم: لە كاردانەوەی ئەو كۆمەڵو تاقمانەدا تەوژمێكی دیكەی پێچەوانە دروست بووە، كە هەستیاریی (حساسیة)ی زۆری بەرانبەر بە چەكو هێزو جەنگو جیهاد هەیە[1]، بەلام بێگومان هەركام لە (إفراط)و (تفریط) هەڵەن‌و پێچەوانەی سروشتی ئۆممەتی ئیسلامییە:**

ئەوەی پێشێ تێپەڕاندن (إفراط) بوو، ئەمەش بەزایەدان (تفریط)ە، هەمیشە تێپەڕاندن‌و بەزایەدان هەردووكیان هەر خراپن، ئێمە نابێ دەستكاریی شەریعەتی خوای پەروەردگار ﷻ بكەین، نابێ هیچی لێ كەم بكەینەوە لەبەر خاتری كەسانێك، یان بەهۆی لێ ترسانیان كە لە عەقڵیانەوە ناچێ، یان قبووڵیان نیە، هەروەك نابێ زیادەشی بخەینەسەر، لە رقی خەڵكی‌و وەك كاردانەوە بەرانبەریان، شەریعەت چۆنە، پێویستە ئاوا وەریبگرین.

جارێك لە چاوپێكەوتنێكدا پرسیارم لێ كرا، مامۆستا جەنابت توندڕەوی یان نەرمڕەوی؟ گوتم: هیچیان نیم، گوترا: ئینجا چۆن؟ ئینسان یان دەبێ توندڕەو بێ یان نەرمڕەو، گوتم: نا، من شەرعڕەوم، شەرع گوتی: توند بە توند دەبم، گوتی: نەرم بە نەرم دەبم.

لە حەقیقەتدا ئێمە نابێ بڵێین: هەر توند دەبین، لە شوێنێكدا كە پێویستی بە نەرمیی بكات، تۆ هەر توندبی هەڵەیە، لە شوێنێكیشدا پێویستی بە توندیی بكات، تۆ هەر نەرم بی، ئەویش هەڵەیە، خوای بەرزو مەزن بە هەردوو وەسفەكان وەسفی

---

١) هەتا هی وا هەیە دەڵێن هەموو ئەو ئایەتانەی باسی جەنگ‌و جیهاد دەكەن، لە نوێژیشدا هەر نایانخوێنێ! داماوە هەستیاریی پێیان هەیە! یان تاكو تاوانبار نەكرێ بەوەی بڕوای بەوە هەیە رۆژێك لە رۆژان جیهاد بكا! دەڵێ: با ئێستا ئایەتەكان نەخوێنم نەوەك گومان ببەن‌و بڵێن دیارە ئەویش بەتەمای جیهادە، ئەوە ئێستا هیچ، بەلام لە داهاتوودا رەنگە بیكات!!

پێغەمبەر ﷺ دەکات، بۆ یەکەمیان دەفەرمویَ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ ...﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: (جا بەهۆی میهرەبانیی خوا وەیە کە تۆ نەرمو نیان بووی لەگەڵیاندا، وە ئەگەر قسە ڕەقو دڵڕەق بای، لە دەورت دەتەکینەوە ...)، وە لە شوێنێکی دیکەداو لەبارەی پێویست بوونی زبریی‌و توندییەوە لە شوێنی خۆیدا، دەفەرمویَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ ...﴿٧٣﴾ ﴾ التوبة، واتە: (ئەی پێغەمبەر! جەنگ بکە لەدژی بێ بڕوایان‌و دووڕووەکان‌و توندوتیژ بە لەگەڵیان ...)، وە لە شوێنێکی دیکەدا هەردووك وەسفەکان بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ـ خوا لێیان ڕازی بێ ـ کۆدەکاتەوەو دەفەرمویَ: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ ...﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح، واتە: (موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە ئەوانەش کە لەگەڵیدان، توندوتیژن لەسەر بێ بڕواکان، لەنێوان خۆشیاندا بە بەزەیی‌و دڵنەرمن ...).

وە خوای کاربەجێ ﷻ لە بواری هەڵسوکەوتدا، دەفەرمویَ: ﴿... وَأَحْسِنُوٓا۟ ...﴿١٩٥﴾ ﴾ البقرة، واتە: (... وە چاکە بکەن ...)، هەروەها دەفەرمویَ: ﴿... وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ...﴿٨٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: (... وە قسەی چاك لەگەڵ خەڵکی بکەن ...)، بەڵام لە بواری ڕووبەڕووبوونەوەدا دەفەرمویَ: ﴿... وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ ...﴿١٢٣﴾ ﴾ التوبة، واتە: (... وە با دوژمنانتان زبرییتان پێوە ببینن ...)، کەواتە: هەر شتەو لە کاتی خۆیدا، وەك کوردەواریی دەڵێن: (کەنگرو ماست بە وەختی خۆی)، واتە: هەر شێوازە لە کاتی خۆیدا.

وە خوای بەرزو مەزن ئاوا پێناسەی ئۆممەتی ئیسلام دەكات، دەفەرموێ:
﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ...﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: (وە ئاوا ئێوەمان گێڕاوە بە كۆمەڵێكی میانجیی[1]، تاوەكو ببنە شایەد بەسەر خەڵكەوە ...)، پێغەمبەر ﷺ وشەی (وَسَطْ)ی بە (عَدْلْ) تەفسیر كردوە: (وَالوَسَطُ العَدْلُ)[2]، دەفەرموێ: (وَسَطْ) واتە: (عَدْلْ: دادگەر)، (عَدْلْ)یش لە (تَعَادُل)ەوە هاتوە، واتە: هاوسەنگ، نە تێدەپەڕێنن و نە كورتی دێنن، خەتی نێوەڕاست دەگرن، نە بە ڕاستداو نە بە چەپدا لانادەن.

دیارە مەسەلەی بەكارهێنانی هێزو چەك وەك هۆكارو ئامرازێك، لێكۆڵینەوەی زیاتری دەوێ، بەڵام ئێمە لێرەدا بەم ئەندازەیە ئیكتیفا دەكەین‌و، هیوادارم ئەو چوار پێنج نامیلكەیەی كە كاتی خۆی لەوبارەوە نووسیومن‌و خوا یاربێ، بەم زووانە هەموویان لە دووتوێی كتێبێك دا دووبارە چاپ دەكەینەوە، مایەی بەرچاو ڕوونییەكی باش بن لەو بوارەدا.

---

١) (وَسَطْ) واتە: باشترین، یاخود خەتی نێوەڕاست، نە بەمەلادا لادەدەن نە بەولادا، نە تێدەپەڕێنن نە كورتی دێنن.

٢) (عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُدْعَى نُوحٌ، فَيُقَالُ: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُدْعَى قَوْمُهُ، فَيُقَالُ: هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: مَا أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ وَمَا أَتَانَا مِنْ أَحَدٍ، فَيَقُولُ: مَنْ شُهُودُكَ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ، قَالَ: فَيُؤْتَى بِكُمْ تَشْهَدُونَ أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ، فَذَلِكَ قَوْلُ اللهِ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ...﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، وَالْوَسَطُ: العَدْلُ) رواه الترمذي: (٢٩٦١) واللفظ له، وابن ماجه: (٤٢٨٤)، قال الترمذي: حسن صحيح، وصححه الألباني.

# بنەمـای هـەژدەیەم

## جەختکـردنەوە لەسـەر هێنـانەدی
## ئامانجـە شـەرعییـە باڵایەکان و،
## خۆپاراسـتن لە سـەرگەرمبوون
## بە مەسـەلە لاوەکـییەکانەوە

## بنەمای هەژدەیەم

### جەختکردنەوە لەسەر هێنانەدی ئامانجە شەرعییە بالآیەکان و، خۆپاراستن لە سەرگەرمبوون بە مەسەلە لاوەکییەکانەوە:

کۆمەڵی ئیسلامیی لەم قۆناغەدا، جەخت لەسەر هێنانەدی ئامانجە شەرعییە بالآیەکان (تحقيق الأهداف الشرعية العليا) دەکاتەوەو، خۆی لە گیروگرفتە گچکەو لاوەکییەکان دەپارێزیو، زیاتر سەرگەرمی پەروەردەکردنی بنکەیەکی ئیسلامیی پتەو و دامەزراوو، بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵكو کۆمەڵگا دەبێ بە ڕاستییەکانی ئیسلامو، ئامادەکارییو زەمینەسازیی بۆ هێنانەکایەی کۆمەڵگاو قەوارەی ئیسلامیی.

شایانی باسیشە کە فەرمانڕەوایەتیی خوای بەرز (حاكمية الله تعالى) کە بەشێکە لە پەروەردگارێتییو پەرستراوێتیی خوا (ربوبية الله وألوهيته) ﷻ تەنیا کاتێك وەك پێویست لە ژیانو گوزەرانی کۆمەڵگادا بەرجەستە دەبێ، کە بەرنامە (شريعة)ەکەی لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانیاندا پیادەبکەن، وەك:

١- خوای زانای پەنهانو ئاشکرا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ

ﭐلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ النحل، واتە: (وە بەڕاستی لە هەموو كۆمەڵگایەكدا ڕەوانەكراوێكمان ناردوە، پێمان گوتوە پێیان بڵێ كە: تەنیا خوا بپەرستن ﷻو خۆتان لە تاغووت دووربگرن، جا هەیانبووە خوا ﷻ ڕێنمایی كردوەو هەشیانبووە گومڕایی بەسەردا چەسپیوە، بە زەویدا بڕۆنو سەرنج بدەن سەرەنجامی بە درۆ دانەران چۆن بووە)، واتە: ئەوانەی كە پێغەمبەرانی خوا علیهم الصلاة والسلام یان بە درۆ داناوە.

٢- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾ البقرة. واتە: (تۆبزیی كردن لە ئاییندا نیە، ڕێی ڕاستو ڕێی چەوت - یاخود سەر ڕاستییو سەرگەردانیی -، لێكجیابوونەتەوە، جا هەر كەسێك كوفر بە تاغووت بكاتو ئیمان بە خوا بێنێ، ئەوە دەستی بە قوڵفەی هەرە پتەو و قایمەوە گرتوە، كە پچڕانی بۆ نیە، وە خوا بیسەری زانایە).

٣- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ یوسف. لەسەر زمانی (یوسف) عليه السلام دەفەرموێ: (... بێگومان حوكم[1] تەنیا هی خوایە، فەرمانی كردوە كە جگە لەو نەپەرستن، - یانی: تەنیا ئەو بپەرستن- ئا ئەوەیە ئایینو بەرنامەی ڕێكو ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن).

١) حوكم بە مانای بەرنامەدانان.

٤- وە هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢١﴾﴾ الشورى، واتە: {یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن کە لە ئایین بەرنامەیەکیان بۆ دادەنێن، (یان چەند یاسایەکیان بۆ دادەنێن) کە خوا مۆڵەتی پێنەداوە، وە ئەگەر ئەوە نەبووایە کە خوا بڕیاری یەکلاییکردنەوەی دواخستوە بۆ دوارۆژ، ئەوە لەسەر ئەو هەڵوێستە دادوەرییان لە نێواندا دەکرا، وە بێگومان ستەمکاران ئازارێکی بە ئێشیان هەیە (لە دوارۆژدا)}.

## ڕوونكـردنەوە:

لە چوار خـــاڵ دا تیشك دەخەینەسەر ئەم بنەمـــایە :

**یەكـــەم: بێگومـــان ڕیزبەنـــد (ترتیـــب) كردنـــی ئامانجـــە شـــەرعییەكان[1] بـەپـێی بـارودۆخ و هـەل و مەرجـە جیاوازەكـان و، بـەگوێرەی گرنگیـی و بایەخ و ئەولەویەتیان، شتێكی ڕوون و بێ چەندوچوونە، هەم لـە ڕووی عەقڵیی و هەم لە ڕووی شـەرعییەوە:**

بەڵێ بە دڵنیاییەوە ئامانجە شەرعییەكان هەموویان لە یەك ئاستدا نـین ، گـرنگتریـان هەیەو ، گرنگیان هەیە ، گەورەتریان هەیەو ، گەورەیان هەیەو خوارتریـان هەیـە ، وە دیارە هیچ عاقڵێكیش ناچێ هەتا گرنگتر لـەوێ بـێ ، خـۆی بـە گرنگـەوە سـەرقاڵ بكات ، وە وەك كوردەواریی دەڵێن : ( هیچ كەس بۆ دەستەسـڕێك قەیـسەرییەك بـە سووتان نادا ) ! ئەمە شتێكە هەم بەڵگە شەرعییەكان (نَقْـلْ) دەلالەتی لەسـەر دەكـەن و هـەم عەقڵیش ، كە هەڵبەتە هەندێك جار شتێك كە عەقڵ دەلالەتی لەسـەر بكـات ، شەریعەت دەقی لەسەر ناهێنـێ ، بۆچـی؟ چـونكە حەواڵـەی عـەقڵی دەكـات ، بـۆ وێنـە : خوا ﷻ بە خەڵكی نافـەرموێ : دەسـتی خۆتـان مەخەنـە نێـو ئـاگر ، وە بـە خەڵكی نافەرموێ : خۆتان لە شوێنی زۆر بڵندەوە فـڕێ مەدەنـە خـوارێ ، بۆچـی؟ چونكە بە عەقڵ دیارە كە خراپەو زیانی هەیە ، بەڵكو وەك بنەما (مبـدأ)ێكـی گـشتی دەفـــەرموێ : ﴿... وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ...﴿١٩٥﴾﴾ البقــرة ، واتـــە : (... وە

---

1) واتـە لە گرنگـترەوە بۆ گرنـگ.

بەدەستی خۆتان خۆ مەفەوتێنن ...)، بەلاَم ڕوونكردنەوەی وردەكارییەكان (جزئیات)ی ئەو بەدەستی خۆ خۆ فەوتاندنە، بۆ عەقڵ لێدەگەڕێ.

لێرەدا بەڵگەیەك لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە بە نموونە دێنینەوە، كە ئامانجە شەرعییەكان ڕیزبەندییان تێدا هەیەو، هەموویان لە یەك ئاستدا نین و، پێویستە كامەیان گرنگترە ئەویان پێشبخرێ، ئەمیش ئەو فەرموودەیە: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ قَالَ: إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبَادَةُ اللَّهِ ﷻ، فَإِذَا عَرَفُوا اللَّهَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذَا فَعَلُوا فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِذَا أَطَاعُوا بِهَا فَخُذْ مِنْهُمْ وَتَوَقَّ كَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ} البخاري: (١٤٥٨)، ومسلم: (٣١) واللفظ له، واتە: (عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ كاتێك موعازی كوڕی جەبەل[1] دەنێرێ بۆ یەمەن پێی دەفەرموێ: تۆ دەچیتە لای كەسانێك كە خاوەن كتێبن[2]، با یەكەمین شتێك كە تۆ ئەوانی بۆ بانگ دەكەی، بریتی بێ لە پەرستنی خوای زاڵی خاوەن شكۆ ﷻ ـ خواپەرستیی ـ، جا ئەگەر خوا ﷻیان ناسی، هەواڵیان پێبدە كە خوا ﷻ لە شەوو ڕۆژێكیاندا پێنج نوێژی لەسەر فەرزكردوون، جا ئەگەر ئەوەیان كرد، هەواڵیان پێبدە كە خوا ﷻ زەكاتی لەسەر فەرزكردوون، لە دەوڵەمەندەكانیان وەردەگیرێو بۆ هەژارو نەدارەكانیان سەرف دەكرێ، ئینجا ئەگەر فەرمانبەرییان

---

١) موعاز یەكێك بووە لە هاوەڵانی شارەزاو خاوەن زانستی شەرعیی.

٢) واتە: پێشتر كتێبی ئاسمانییان لەدەستدا هەبووە، ئەو كاتە خەڵكی یەمەن بە زۆریی نەسڕانیی بوون، جا نازانم ئەگەر ئەو كاتە جوولەكەشی لێبووبن.

كرد، بۆ ئەوەش لێیـان وەربگرەو خۆت بپارێزە لەو جۆرە ماڵو سـامانەیان كـە زۆر لەلایان خۆشەویسـتە[١]).

تەماشـادەكەین پێغەمبـەر ﷺ ڕیزبەنـدیی دادەنـێ بـۆ موعـاز، پێـشێ وەك لـەم ڕیوایەتەدا هاتوە باسی خواپەرستیی دەكات، لە ڕیوایەتی دیكەدا سەرەتا باسی خـوا بەیەكگرتن دەكات، هەڵبەتە خوا بەیەكگرتنیش وەك ئیمانو عەقیدە هـەر دەچـێتەوە نێو پەرستش (العبادة)ەوە بۆ خوا ﷻ، بەلاَم لەوێدا وەك عەقیدە دەفەرموێ، بانگیان بكە بۆ ئیمان بە خوا ﷻ، بۆ ئیمان بە یەكتایی (وحدانیة)ی خوای پەروەردگار ﷻ، دوای ئەوە ئینجا دەفەرموێ، بانگیان بكە بۆ كردنی پێنج نوێـژە فـەڕزەكان، كـە بـە تەئكید مەبەستیشی لە خواپەرستی (عبادة الله) هەر زیاتر لایەنی ئیمانو عەقیدەكەیە، ئەگەرنا خۆ هەر كام لە پێنج نوێژە فەڕزەكانو زەكاتیش هەر عیبـادەتن، دوای پێـنج نوێژە فەڕزەكان، ئینجا باسی زەكات دێتەپێش، چونكە هەتا خوا ﷻ نەناسن چـۆن بە قسەی بكەن؟ وەك دەفەرموێ: (... فَـإِذا عَرَفُـوا اللَّـهَ فَـأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّـهَ فَـرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ ...)، هەڵبەتـە ئـەوان خوانـاس بـوون بـە شێوەی ڕواڵەتیی وەك دینی نەسڕانیی، كەواتە یانی ئەگـەر خـوا ﷻیـان ناسـی بـەو شێوە ناسینەی كە خوا ﷻ دەیەوێت، ئەویش ئەوەیە كە لـە قوڕئانـدا بەرجەسـتەیەو خوای پەروەردگار ﷻ پێغەمبەری كۆتایی خۆی ﷺ پێ شارەزا كردوە.

كەواتە: پێویستە ڕیزبەندیی لـە ئامانجەكانمانـدا هـەبێ، بۆیـە ئێمـە گوتوومانـە: كۆمەڵی ئیسلامیی دەبێ لـەم قۆناغـەدا جـەخت بكاتـەوە لەسـەر هێنانـەدی ئامانجـە شەرعییە بالاَیەكان.

---

[١]) واتە: مەچۆ وەك زەكات كامە ماڵی باشە ئـەوەیان لێـوەربگری، بـەڵكو لـە باشـی بـاشو لـە خراپی خـراپ، یاخود ڕێژەیەكی میانگـیر بگرە.

**دووەم: پـــەروەردەكردنی بنكەیـــەكی ئیـــسلامیی پتـــەوو دامـــەزراوو، بەرچـاوڕوونكردنەوەی خـــەڵك‌و كۆمەڵگــاكەمان بــە ڕاستییەكــانی ئیسلام، گرنگتـرین ئامانجی ئەم قۆناغـەن :**

بەڵـێ من پێموایـە ئەم دوو ئامانجە، هەموو كارو چـالاكییەكانی دیكـەو هـەموو وردە ئامانجـەكانی دیكـە لـەخۆ دەگـرن، چـونكە بـەبێ ئـەو دوو كـارە زەمینـە بـۆ پاكــسازیی‌و چاكــسازیی كۆمــەڵگا نارەخــسێ، چــۆن؟ ئایــا هــەتا كۆمــەڵێكی پەروەردەكراو كە ئیسلام‌و ئیمان‌و ئیحسان لە خۆیاندا بەرجەستە بكەن، كـە خـەڵك ببیینێت، بەبێ ئەوە وەك پێویـست بانگـەوازی ئیـسلامیی دەگاتـە گـوێی خـەڵك؟ دەڵێین: نەخێر، چونكە بەڕاستی قسەی بەتەنیا بڕشـتی نیـە، بـەڵام كاتێـك خـەڵك كردەوە دەبینێت، زمانی كردەوە زمانێكی پەتیی‌و پاراو (فَصِيح)ە و، هەموو كـەس تێیدەگا، بۆیە ئەگەر ئێمـە بـمانەوێ باسی پارێزكاریی (تَقْـوَى) بۆ خەڵكی بكـەین، وەرن با تەقـوا لە خۆماندا بەرجەسـتە بكەین‌و خەڵك ببیـنێت، ئـاوا خـەڵك باشتر لێی حاڵی دەبێ، تەقوا یـانی چـی؟ بـۆ نـموونە: باسـی خۆپاراسـتن لـە حـەرام‌و شوبهەكان (الوَرْعْ) دەكەی، تۆ بە كردەوە لە هەڵسوكەوتتدا وا بـە، ئیـدی خـەڵك دەزانێ وەرع یانی چی؟ باسی خۆ بەكەمگریی (التَّوَاضُـعْ) بۆ خەڵكی دەكەی، وەرە تۆ بە كردەوە لە هەڵسوكەوتتدا خۆ بەكەمگربـە، خـەڵك تێـدەگا خـۆ بەكـەمگریی‌و خاكیی بوون یانی چی؟ هـەروەها باسـی دادپـەروەریی (عدالــة) دەكــەی، باسـی ســـۆزو بــــەزەیی‌و، خووڕەوشــــتە بـــەرزو جوانـــەكان‌و، ڕاســـتگۆیی‌و، دەستپاكیی‌و...هتـد، بەهەمان شێوە لە خۆتیاندا بەرجەستە بكە.

كەواتە: پەروەردەكردنی بنكەیەكی ئیسلامیی پتەوو دامەزراو، مەبەستمان پـێ‌ی ئەوەیە كە خەڵكێكی مسوڵمانی دامەزراو بن بـە ڕەگ‌و ریـشە، ئـەوە بناغـەی كـارو بانگەوازی ئیسـلامییە، ئـەوە یەك.

پاشان هەر بەوەندەش کار تەواونابێ کە خەڵکێکی باش و دانسقەو بژاردە پەروەردە بکرێن و باربهێندرێن، بەڵکو پێویستە هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا کار بکەین لەسەر بەرچاو روون کردنەوەی خەڵك و کۆمەڵگا، بەرچاویان روونبکەینەوە بە راستییەکانی ئیسلام، بۆچی؟ چونکە ئەو کۆمەڵە ئیسلامییە بژاردە پەروەردەکراوە، پێویستی بە کەش و هەواو فەزایەك هەیە تێیدا ئیش بکات، کە ئەو فەزاو کەش وهەوایەش ئەوەیە ئەو خەڵك و جەماوەرە، بەرچاویان روون بێ و بزانن ئەو کۆمەڵە کێن و چییان دەوێ؟ وە ئەو راستییانەی ئیسلام چین، کە ئەوانە دەیانەوێ خەڵکیان بۆ بانگ بکەن و، لەسەریان پەروەردەیان بکەن؟

ئینجا بێگومان گرنگترین و گەورەترین بناغە کە دەبێ بنکەیەکی ئیسلامیی لەسەر پەروەردە بکرێ، وە گەورەترین راستییش کە دەبێ بەرچاوی کۆمەڵگای پێ رۆشن بکرێتەوە، بریتیە لە خوا بەیەکگرتن ﷻ و خۆ لە طاغوت دوورگرتن (توحيد الله واجتناب الطاغوت)، وەك خوای کاربەجێ ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ...﴿٣٦﴾ ﴾النحل، سەرنج بدەن نەمگوتوە: خوا بە یەك زانین ﷻ، چونکە (تَوْحِيدْ) واتە: خوا بەیەکگرتن ﷻ، واتە: تۆ بە کردەوەیەك کە لە عەقڵ و دڵەوە سەرچاوە دەگرێ و، بە زمان تەعبیری لێ دەکرێ، بەڵام بە کردەوە بەرجەستە دەکرێ، بیسەلمێنی کە خوای پەروەردگار ﷻ وەك چۆن تاکە بەدیهێنەرو تاکە خاوەن و تاکە پەروەردگارە، تاکە پەرستراویشتە.

ئازایەتیی ئەوە نیە تۆ خوا ﷻ بە تاکە بەدیهێنەر بزانی، چونکە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان (المشركين)یش هەروابوون، وەك خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَهُمۡ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ ...﴿٨٧﴾ ﴾ الزخرف، واتە: (وە

ئەگەر لێیان بپرسی: کێ بەدیهێناون؟ بێگومان دەڵێن: خوای بەرزو مەزن ...)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴿٩﴾﴾ الزخرف، واتە: (وە ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکانو زەویی بەدیهێناون؟ بە دڵنیاییەوە دەڵێن: ـ خوای ـ زاڵی زانا بەدیهێناون)، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە خوا ﷻ بە تاکە پەرستراو بگرینو تاکە پەرستراومان بێ و، تاکە کەسێك بێ کە عیبادەتی بۆ دەکەینو دەیپەرستین.

وەك پێشتریش باسمانکردوە، پەرستن واتە: ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەوپەڕی بەگەورەگرتن و، ئەوپەڕی مل بۆ کەچ کردن و، ئەوپەڕی لێ ترسان، ئەوانە دەبێ بەتەنیا بۆ خوا ﷻ بن، ئەوجار مانای وایە ئێمە تەنیا خوا ﷻمان پەرستوە.

هەر کۆمەڵگایەك، هەر کۆمەڵە خەڵکێك بە درێژایی مێژوو خوا ﷻ ڕەوانەکراوێکی تێدا ناردوون، پێیڕاگەیاندوە کە ئەوە بە خەڵکەکە ڕابگەیەنێ، هەر بۆیەش خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ...﴿٣٦﴾﴾ النحل، تاغووت کێیە؟ هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان وەك ئەبو جەعفەری تەبەریی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، گوتوویانە: (تاغووت: هەموو پەرستراوێکە جگە لە خوا)[1]، بەڵام بەڕاستی من کە سەرنجی وشەی (طاغوت)م داوە، لەو سیاقانەدا کە لە قورئاندا هاتون، بۆم

١) قال أبو جعفر: اختلف أهل التأويل في معنى(الطاغوت)، فقال بعضهم: هو الشيطان... وقال آخرون: الطاغوت: هو الساحر... وقال آخرون: بل (الطاغوت) هو الكاهن...
قال أبو جعفر: والصواب من القول عندي في (الطاغوت)، أنه كل ذي طغيان على الله، فعبد من دونه، إما بقهر منه لمن عبده، وإما بطاعة ممن عبده له، وإنسانا كان ذلك المعبود، أو شيطانا، أو وثنا، أو صنما، أو كائنا ما كان من شيء. (جامع البيان في تأويل القرآن،ج: (٣)، ص: (٢٠– ٢١).

دەركەوتوە كە نەخێر تاغووت هەموو پەرستراوێك نیە، بەڵكو تاغووت بریتیە لە پەرستراوانێك كە بە ئیرادەی خۆیان خەڵك دەكەنە كۆیلە و، دەیانەوێ خەڵك بیانپەرستێ. كەواتە: تاغووت تەنیا ئەوانە دەگرێتەوە كە خاوەنی عەقڵو ئیرادەن، جا شەیتان بێ، یان ئینسان بێ، ئەمما دارو بەردێك كە دەپەرسترێ، پێی ناگوترێ تاغووت، مانگو خۆر پێیان ناگوترێ تاغووت، چونكە ئیرادەیان نیەو خەڵك بۆ خۆی بە هەڵەدا چووە، نەك ئەوان خەڵك ناچار بكەن.

ئەها ئەگەر تەماشای ئایەتی ژمارە (٢٥٧)ی سوورەتی (البقرة) بكەین، دەبینین خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّـٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَـٰتِ ۗ ...﴾، واتە: (خوا ﷻ دۆستی ئیماندارانە لە تاریكاییان دەریاندێنێ بۆ ڕۆشنایی، وە ئەوانەی بێبڕوان تاغووتەكان دۆستیانن، دەریاندێنن لە ڕووناكاییەوە بەرەو تاریكایییەكان ...). كەواتە: تاغووت ئیرادەی هەیەو شت دەكات، خەڵك دەگوازێتەوە لە ڕووناكییەوە بۆ تاریكایییەكان، بەڵام دیارە دارو بەردو مانگو خۆر، كردەوە (فِعْلْ)یان پاڵنادرێتە لا.

كەواتە: تاغووت بریتیە لە كەسێكی خاوەن ئیرادە، هەر بۆیەش دەگوترێ تاغووت، چونكە (طاغوت) (صيغة المبالغة)ی (طاغي)یە، (طاغي) یانی كەسێك كە یاخی بووە، (طاغوت) واتە: كەسێك كە تێپەڕاندوە لە یاخیبووندا، دیارە ئەگەر كەسێك ئیرادەی نەبێو بە ئیرادەی خۆی یاخی نەبووبێ، پێی ناگوترێ تێپەڕاندوە.

**سێیەم: فەرمانڕەوایەتیی خوا (حاكمیة الله) ﷻ بەشێك‌و لقێكە لە پەروەردگارێتیی‌و پەرستراوێتیی خوا ﷻ و، فەرمانڕەوایەتیی خواش ﷻ لە ژیانی مرۆڤدا لە پیادەكردنی شەریعەت‌و ئایینەكەیدا بەرجەستە دەبێ :**

حاكم بوونی خوا ﷻ‌و فەرمانڕەوا بوونی خوا ﷻ، یانی : بەرنامەدانەر (مشَرِّع) بوونی خوا ﷻ، نەك حوكمڕان بوونی خوا ﷻ، كە ئەوە مرۆڤەكانن حوكم دەگێڕن، بەڵام حاكم بوونی خوا ﷻ بە مانای بەرنامەدانەر بوونی خوای پەروەردگار ﷻ، ئەوە بەشێكە لە پەروەردگارێتیی‌و پەرستراوێتیی خوا ﷻ.

واتە : مادام خوا ﷻ تەنیا پەروەردگار بێ، دەبێ هەر ئەویش حاكم بێ‌و هەر ئەویش بەرنامە دابنێ، چونكە پەروەردگار بوونی خوا ﷻ لە ژیانی بەشەردا، لەوەدا بەرجەستە دەبێ كە بەرنامەیان بۆ دابنێ‌و حەڵاڵ‌و حەڕامیان بۆ دیاری بكات‌و چاكەو خراپەیان بۆ دیاری بكات، بفەرموێ : وا بكەن‌و وا مەكەن، چونكە پەروەردگار كەسێكە كە خەڵك پەروەردە دەكات‌و مشووریان دەخواو سەرپەرشتییان دەكات‌و بەخێویان دەكات‌و چاكەو خراپەیان فێردەكات، جا دەبێ لە میانەی بەرنامەداناندا، ئەو پەروەردگارێتییەی خوای بەرزو مەزن بەرجەستەبێ.

هەروەها پەرستراوێتیی خوا ﷻ، واتە : تەنیا خوا ﷻ ئەوپەڕی ملكەچیی‌و خۆشویستن‌و بەگەورەگرتنی بۆ بڕیاربدرێ، ئینجا ئەگەر خوا ﷻ بەرنامەدانەر نەبێ بۆ خەڵك‌و خەڵكیدیكە بەرنامە دابنێ‌و حەڵاڵ‌و حەڕام دیاری بكات، ئەوە مانای وایە خەڵكیدیكە ئەوپەڕی ملكەچیی بۆ كراوە، ئەگەر گریمان خۆشیشنەویسترێ‌و ترسیشی بەرانبەر نەنوێنرێ، بەڵام تۆ بەدوای بەرنامەی كێ كەوتی، مانای وایە ئەوپەڕی ملكەچییت بۆ ئەوە.

جا فەرمانڕەوایەتیی خوای پەروەردگار ﷻ بە مانای شەریعەت و بەرنامەدانانی، بەشێك و لقێکە لە پەروەردگاریێتیی و پەرستراویێتیی خوا ﷻ، وە فەرمانڕەوایەتیی خوای پەروەردگاریش ﷻ لە ژیانی مرۆڤدا لە پیادەکردنی ئایین و شەریعەتەکەیدا بەرجەستە دەبێ، ئێمە چ کاتێك خوا ﷻ بە فەرمانڕەوا (حاکم)ی خۆمان دەگرین؟ کاتێك کە پابەند بین بە شەریعەتەکەیەوە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە ئەوەیە کە خوای بەرز و مەزن لەسەر زمانی یوسف عليه السلام کە لەگەڵ دوو هاوەڵە زیندانییەکەیدا وتوویێژ دەکات، فەرموویەتی: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ یوسف، یوسف عليه السلام دەیاندوێنێ و دەڵێ: (ئەی دوو هاوەڵە زیندانییەکەم! ئایا چەند سەروەر و پەروەردگارێکی پەرتەوازە باشترن، یاخود خوای تاکی ملپێکەچکەر؟ ئێوە هیچ ناپەرستن ـ لە جیاتی خوا ـ جگە لە چەند ناوێك کە خۆتان و باب و باپیرانتان ناوتانناون ـ ئەو پەرستراوانە ـ خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خواریێ، حوکم تەنیا هی خوایە و هەر ئەو دەبێ حاکم بێ، فەرمانی کردوە کە تەنیا ئەو بپەرستن، ئا ئەوە دینی ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن).

ئایا ئینسان دەبێ کێ بکاتە پەروەردگاری خۆی؟ خوای تاکی خاوەن دەسەڵات و باڵادەست ﷻ کە مل بە غەیری خۆی کەچ دەکات؟ یاخود چەند پەروەردگار و چەند سەیدو سەروەرێکی پەرتەوازە و لێك جیا، بەڵکو زۆرجار پێکەوە دژ و ناکۆکیش؟! کامیان باشترە؟ چونکە پەرستراوانی غەیری خوا ﷻ ناوی بێ نێوەڕۆکن؟ هەڵبەتە میسرییەکان چەندان جۆرە پەرستراویان هەبوون، کە بە

پەروەردگاریان زانیون، جا ئایا هیچ کام لەوانە پەرستراوو پەروەردگار بوون؟ نەخێر، کەواتە: ناوی بێ نێوەرۆکن، بەڵێ نێوەرۆکێکیان هەیە، بەلام نەك وەك ئەو ناوەی کە لێیان نراوە، بۆ نموونە: یەکێك ناوی مامۆستا یان زانایە، دیارە ئەگەر مامۆستاو زانا نەبوو، دەمێنێتەوە ناوی بێ نێوەرۆك، ئەو پەرستراوانە بەڵێ نێوەرۆکێکیان هەیە، بەلام نەك ئەو نێوەرۆکەی کە ئەوان مەبەستیان بووە و، لە دڵو مێشکیاندا هەبووە، بەڵکو ئەوەی لە دڵو مێشکی ئەواندا هەبووەو ئەوەی لە واقیعدا هەبووە، دوو شتی لێکجیان.

کەواتە: کەی تەنیا خوا ﷻ دەپەرستین؟ کاتێك ئەو تەنیا حاکم بێ، وە ئایا دینی راست کامەیە؟ ئەوەیە کە تەنیا خوا ﷻ بپەرستی، کاتێکیش تەنیا خوا ﷻ دەپەرستی کە تەنیا خوا ﷻ فەرمانڕەوات بێو بەرنامەو شەریعەتو ڕێبازت بۆ دابنێ.

هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾﴾ الشورى.

ئینجا بۆ دەرخستنی تێکهەڵکێشیی لەنێوان چەمكو واتای هەرکام لە: پەروەردگاریێتیی و پەرستراویێتیی و فەرمانڕەواییێتیی (الربوبية والألوهية والحاكمية)ی خوای تاكو پاك ﷻ، وە سەلماندنی ئەوە کە هەرکەسێك بەرنامەی ژیانو حەلالو حەرام لە غەیری خوای بێ وێنە ﷻ وەربگرێ، مانای وایە ئەو کەسەی پەرستووەو بە پەروەردگارو پەرستراوی خۆی داناوە، با سەرنجی ئەم دەقەی سوننەت بدەین، کە بەڕاستی زۆر جێی سەرنج لێ دانو هەڵوەستە لەبەردەمدا کردنە: {عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ لَمَّا بَلَغَتْهُ دَعْوَةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَرَّ إِلَى الشَّامِ، وَكَانَ قَدْ تَنَصَّرَ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَأُسِرَتْ أُخْتُهُ وَجَمَاعَةٌ مِنْ قَوْمِهِ، ثُمَّ مَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى أُخْتِهِ

وَأَعْطَاهَا، فَرَجَعَتْ إِلَى أَخِيهَا فَرَغَّبَتْهُ فِي الإِسْلامِ وَفِي القُدُومِ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَدِمَ عَدِيٌّ المَدِينَةَ وَكَانَ رَئِيسًا فِي قَوْمِهِ طَيْءٍ وَأَبُوهُ حَاتِمُ الطَّائِيُّ المَشْهُورِ بِالْكَرَمِ، فَتَحَدَّثَ النَّاسُ بِقُدُومِهِ فَدَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَفِي عُنُقِ عَدِيّ صَلِيبٌ مِنْ فِضَّةٍ وَهُوَ يَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ...(٣١)﴾ التوبة[1]، قال: فقلت: إِنَّهُمْ لَمْ يَعْبُدُوهُمْ. فَقَالَ: بَلَى، إِنَّهُمْ حَرَّمُوا عَلَيْهِمُ الحَلالَ وَأَحَلُّوا لَهُمُ الحَرَامَ فَاتَّبَعُوهُمْ. فَذَلِكَ عِبَادَتُهُمْ إِيَّاهُمْ. وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا عَدِيّ مَا تَقُولُ أَيُفِرُّكَ أَنْ يُقَالُ أَللهُ أَكْبَرُ؟ فَهَلْ تَعْلَمُ شَيْئًا أَكْبَرَ مِنَ اللهِ؟ مَا يُفِرُّكَ؟ أَيُفِرُّكَ أَنْ يُقَالُ لا إِلهَ إِلَّا اللهُ؟ فَهَلْ تَعْلَمُ إِلهاً غَيْرَ اللهِ؟ ثُمَّ دَعَاهُ إِلَى الإِسْلامِ فَأَسْلَمَ فَشَهِدَ شَهَادَةَ الحَقِّ. قَالَ فَلَقَدْ رَأَيْتُ وَجْهَهُ اسْتَبْشَرَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اليَهُودَ مَغْضُوبٌ عَلَيْهِمْ، وَالنَّصَارَى ضَالُّونَ} رواه أحمد والترمذي وابن جرير من طرق، المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص: (٥٦٣، ٥٦٤)، واتە: {عەدیی كوڕی حاتەمی تائیی ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ دەگێڕێتەوە، كە كاتێك بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺی پێگەیشت ڕایكرد بۆ شام، وە پێشتریش لە سەردەمی نەفاییدا ببووە نەسڕانیی، جاخوشكەكەی و كۆمەڵێك لە هۆزەكەی بەدیل گیران، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ چاكەی لەگەڵ خوشكەكەی كردو بەخۆڕایی

---

١) مەبەست ئەم ئایەتە بەپێزەیە كە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٣١)﴾ التوبة، واتە: (ـ جوولەكەو نەسڕانییەكان – زاناو ڕەبەنەكانی خۆیانیان كردە پەروەردگاریان لە بری خوا، وە عیسای كوڕی مەریەمیش، وە فەرمانیشیان پێ كرابوو كە تەنها خوای تاك بپەرستن، جگە لەو خوایە هیچ پەرستراوێكی دیكەی بە هەق نیە، پاكیی و بێ خەوشیی بۆ خوایە لەو شتانەی دەیانكەنە هاوبەشی).

ئازادی کردو خەڵاتیشی کرد، جا خوشکەکەی چووەوە بۆ لای عەدیی و ئەوەی بەسەری هاتوە بۆی باس کردو هانیدا کە بچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمان بێ، عەدییش هاتە مەدینە، لەو کاتەشدا سەرۆکی هۆزی (طَـيْءْ) بووەو باییشی – حاتەمی تائیی- ناودار بووە بە سەخاوەت و بەخشندەیی، خەڵك باسی هاتنی عەدیی دەکەن، عەدیی دەچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و خاچێکی زیوی لە گەردەندا دەبێ، جا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە (کە واتاکەی ئەمەیە): - جووولەکەو نەصرانییەکان- زاناو قەشەو گۆشەگیرەکانی خۆیانیان لەجیاتی خوا ﷻ یان لەگەڵ خوا ﷻدا کردن بە پەرستراوی خۆیان، وە مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردە پەرستراوی خۆیان، فەرمانیشیان پێ نەکرابوو کە هیچکەس بپەرستن جگە لە یەك پەرستراو کە خوایە ﷻ، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، پاکیی بۆوی لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی. -عەدیی دەڵێ- گوتم: ئەوان نەیاندەپەرستن، فەرمووی: با دەیانپەرستن، ئەوان -زاناو ڕەبەنەکان- حەڵاڵیان لێ قەدەغە دەکردن و قەدەغەکراوەکانیشیان بۆ حەڵاڵ دەکردن و ئەوانیش شوێنیان دەکەوتن، ئا ئەوە پەرستنی ئەوان بوو بۆوان، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عەدیی! چی دەڵێی؟ ئایا ئەوە دوچاری لە ئیسلام ڕاکردن و ڕەتاندنی کردووی کە بگوترێ: خوا ﷻ لە هەموو شتێك گەورەترە؟ ئایا هیچ شتێکت پێ شك دێ کە لە خوا ﷻ گەورەتربێ)؟ چ شتێك ناچاری ڕاکردنی کردووی؟ ئایا ئەوە دوچاری ڕاکردنی کردووی کە بگوترێ: هیچ پەرستراو نین بێجگە لە خوا ﷻ؟ ئایا بێجگە لەوی هیچ پەرستراوی دیکە دەزانی؟ پاشان پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام و ئەویش مسوڵمان بووو شایەتمانی حەقی هێنا، -عەدیی- دەڵێ: ڕووی موبارەکی -پێغەمبەر ﷺ- م بینی گەشایەوە، دوایی -پێغەمبەر ﷺ- فەرمووی: جووولەکەکان غەزەب لێگیراون و نەصرانییەکانیش گومڕاو سەرگەردانن).

دیارە "عەدیی کوڕی حاتەمی تائیی"ش وەك زۆربەی خەڵکی مسوڵمانی ئێستا بە شێوەیەك لە چەمکی پەرستن حاڵی بووە، کە بابای پەرستراو حەتمەن دەبێ سەجدەو رکووعی بۆ بەری، نەیدەزانی کە سەجدەو رکووع دەربڕی راستییەکی گەورەترە لە سەجدەو رکووع، کە بریتییە لەوپەڕی ملکەچیی و خۆ بە کەم زانین و خۆ پێ بچووك بوون لە بەرانبەر خوا ﷻدا، جا دیارە ئەوپەڕی خۆ بە بچووك زانین و ئەوپەڕی بە گەورە زانینی خوا ﷻ، بە سەجدەو رکووع تەعبیری لێدەکرێ، بەڵام سەجدەو رکووع بردن تەنها رووکارو نیشانەی ئەو خۆ پێ بچووك بوون و، خوا ﷻ پێ گەورە بوون و پەرستنەن.

کەواتە: بۆمان دەرکەوت کە بە حاکم دانانی هەر کەسێك، پەرستانی ئەو کەسەیە، جا ئەگەر خوا ﷻ بێ، ئەوە پەرستراوی حەقە، وە ئەگەر بێجگە لەویش بێ، ئەوە پەرستراوێکی بە ناحەقە.

کەواتە: بەڕاستی پێویستە ئەو خەڵك و میللەتەی خۆمان زۆرباش بزانێ کە ئەو مەسەلەی عەلمانییەتە کە بێجگە لە خوا ﷻ بە پەرستراو و، بێجگە لە دینی خوا ﷻ بە بەرنامە دادەنێن و، غەیری خوا ﷻ بەو لایەنە دادەنێن کە دەبێ ملکەچیی بۆ بکرێ، ئەوە بەڕاستی دەرچوونە لە بازنەی ئیسلام، ئەگەر خەڵك تێبگا، وەك لە کتێبی: (**چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم**)دا گوتوومە، بەڵام هی وا هەیە هەر بە دوای هەڵلای مام کوێخا کەوتووەو هیچ حاڵی نیە، وە ئەوە رەنگە عوزر بە نەزانیی (العذر بالجهل)ی بۆ بەبیانوو دابنرێ، هەتا تێدەگەیەنرێ و دەرباز ببێ، بەڵام ئەوەی کە باش دەزانێ عەلمانییەت چییەو، بڵێ: عەلمانییەتم تەبەنیی کردووەو قەناعەتم پێیەتی، ناگونجێ بڵێ: من

مسوڵمانم[١]، چونکە عەلمانییەت یانی بێ دینایەتیی، کەواتە: چۆن دەگونجێ بڵێ: بێ دینایەتییم هەڵبژاردووەو، لەولاشەوە بڵێ: من دینم هەیە! (واتە: دین بەمانای – ئیسلام ـ ئەگەرنا سیکۆلاریزمیش جۆرە دینێکە)، کە لە کتێبی (تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان)دا ئەم مەسەلەیەم جوان ڕوونکردۆتەوە.

**چوارەم: بەڵام لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە نابێ لێی بێ ئاگا بین: ئێمە کە دەڵێین: پێویستە ئامانجە بالاّیەکان بکرێنە جێی گرنگی پێدانی زیاترو خۆ بپارێزرێ لە گیروگرفتە لاوەکییو گچکەکان، مەبەستمان ئەوە نیە کە لە بەرانبەر هەڵەو کەمو کوڕییەکانی کۆمەڵگادا دەستەوئەژنۆ دابنیشینو هیچ نەکەین!**

هەندێك هەن هەر دەڵێن: خیلافەتی ئیسلامیی دەگێڕینەوەو دەڵێن: نابێ هیچ شتێکی دیکە بکەین، حیزبی تەحریر وان، دەڵێن نوێژی سوننەتو ئەوانەش با نەکرێنو هەردەبێ خەریکی ئەوەبین خیلافەتی ئیسلامیی بگێڕینەوە، نازانن کەسێك سوننەتان نەکاو تۆزێك لە خوا ﷻ نزیك نەکەوێتەوە، چۆن خەڵکی بۆ لە خوا ﷻ نزیك دەخرێتەوەو کۆمەڵگای بۆ دەگۆڕێو خیلافەتی ئیسلامیی دەگێڕێتەوە؟! یانی من خۆم لەوانەم بینیونو گفتوگۆم لەگەڵدا کردوون، وەنەبێ هەروا لە خۆمەوە بیڵێم، جارێك هەندێکیان گوتیان: ئێمە زۆر بڕوامان بەوە نیە ئێستا زۆر زیکرو تەسبیحاتو سوننەتو شەونوێژو عیبادەتی زیادەو ئەوانە بکەین،

---

١ـ مەگەر ئەو کەسە جۆرە تێگەیشتنو پێناسەیەکی بۆ سیکۆلاریزم هەبێ کە لەگەڵ ئیسلامو عەقیدەو شەریعەتەکەیدا تێك نەگیرێ، هەرچەندە ئەو تێگەیشتنو پێناسەیەشی هەڵە بێ لە خودی خۆیدا.

گوتم: بۆچی و چۆن؟ گوتیان: دەبێ کاتەکە زیاتر بۆ ئەوە تەرخان بکەین خەڵك لە لایەنی فیکرەوە هۆشیار بکەینەوەو، ئامادەیان بکەین بۆ ئەوەی خیلافەتی ئیسلامیی بگێڕینەوە، جا ئەگەر خیلافەت گەڕایەوە، ئەوکاتە با بە کەیفی خۆی نوێژان بکات و سوننەتان بکات، گوتم: باشە ئاخر خیلافەتی ئیسلامیی و دەسەڵاتی ئیسلامیی چۆن دەگەڕێتەوە؟ بە کەسانێك نەبێ کە زۆر بۆ خوا ﷻ سوڵحاوو لە خوا ﷻ نزیك بن، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغٗا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ الأنبياء، واتە: (وە لە زەبووردا لە دوای تەوڕات نووسیومانە کە سەر زەوی دنیا بەندە چاکەکانم بە میراتی دەگرن، لەوەدا پەندێکی بە ئامانج گەیێنەر هەیە بۆ کۆمەڵی خواپەرستان)، کەواتە: دەبێ چاك بین ئەوجار خوا ﷻ دەمانکاتە میراتگری ئەم زەوییەو میراتگری کافران، ئینجا لەڕێی خواپەرستییەوە ئینسان ساڵح دەبێ، وە هەتا ساڵحیش نەبێ، شایستەی ئەوە نیە کە خوای پەروەردگار ﷻ ئەوەی بۆ بکات.

کەواتە: لەو قسەیەماندا مەبەستێکی دیکەمان هەیە، مەبەستمان ئەوە نیە کە ئێمە لە بەرانبەر هەڵەو کەموکوورییەکانی کۆمەڵگادا دەستەوئەژنۆ دابنیشین، چونکە پێشتر باسمانکرد کە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە، ئەرکێکی گەورەی سەرشانمانە! بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە سەرگەرمبوون بە چارەسەرکردنی گیروگرفت و نەهێشتنی گوناەو خراپەو لادان و هەڵەو پەڵەکانی کۆمەڵگاوە، هەموو تواناو وزەکانمان نەخواو بێئاگامان نەکا لە پاکسازیی و چاکسازیی کردنی کۆمەڵگا لە بوارە ریشەیی و بنەڕەتییەکانداو، ڕێ نەدەین لەسەر حیسابی چارەسەری کێشە گرنگەکانمان، بە وردە گیروگرفتەکانەوە سەرقاڵ بکرێین!

ئەگەرنا ئێمە نابێ سەلبیی بین لە کۆمەڵگای خۆمانداو، دەبێ فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە هەر هەبێ، دەبێ جارێ خۆمان چاك بکەین و لە سەرەتادا خۆمان بڕازێنینەوە بە وردو درشتی ئەو شتانەی کە شەریعەت بە پەسندی داناون، وە خۆمان بژار بکەین لە وردو درشتی ئەو شتانەی کە شەریعەت بە خراپی داناون و لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوروبەریشدا خەریك بین، بەڵام چی بکەینە ئامانجی یەکەم و ئامانجی دووەم و ئامانجی سێیەم؟ دەبێ ڕیزبەندیی دابنێین، بەپێی ئەوە کە پێویستی کۆمەڵگای ئێمە چۆنە؟ وە بەپێی ئەوەش کە لە شەریعەتدا چۆن هاتوە، لە شەریعەتدا چ شتێك زیاتر گرنگی پێ دراوە، ئێمەش گرنگی زیاتر بەوە بدەین، ئینجا هی دوایی ئینجا هی دوایی، نەك بێین لەسەر شتێکی بچووك هەرایەکی گەورە بەرپا بکەین و ئامانجی گەورەمان هەر لەبیربچێتەوە، وەك هەندێك خەڵك بۆ نموونە لەگەڵ نوێژ خوێنەکان لە مزگەوت لەسەر پەنجە جووڵاندن و دەست گرتن و چەند شتێکی بچووك، کە ڕەنگە نەك هەر سوننەت بێ، بەڵکو لەوانەیە ئەو بارەش سوننەت بێ و بە بارەکەی دیکەشیدا هەر سوننەت بێ، هەرایەك بەرپادەکەن کە ئەسڵی ئامانج لەبیر خەڵك دەچێتەوەو، خۆیان دەکەن بە شتێکی جێی سەرنج و جێی هەڵوەستە کردن لە نێو خەڵك و کۆمەڵگادا.

# بنەمـای نـۆزدەیـەم

## مەیـدانی کار و چالاکـی ئێسـتای کۆمـەڵ کوردسـتان و عێراقە، بەڵام هاوکارییکردنی مسـوڵمـانان بە پـێی توانـا لە هـەر جـێیەك بن، بە پێویسـت دەزانێ

# بنەمای نۆزدەیەم

## مەیدانی کار و چالاکی ئێستای کۆمەڵ کوردستان و عیراقە، بەڵام هاوکارییکردنی مسوڵمانان بە پێی توانا لەهەر جێیەك بن، بە پێویست دەزانێ :

هەرچەندە مەیدانی کار و چالاکی ئێستای کۆمەڵی ئیسلامیی (هەرێمی کوردستان) بەتایبەتیو (عێراق)ە بەگشتی، بەڵام لەسەر بناغەی برایەتییو دۆستایەتیی ئیمانییو یەك ئۆممەت بوونی مسوڵمانان لە سەرتاسەری دنیادا، خۆی لە بەرانبەر گەلانی مسوڵمان بە گشتیو کۆمەڵو جموجۆڵە ئیسلامییەکانیاندا بە تایبەت، بە بەرپرسیار دەزانێو، پشتگرتنو هاوکاریی کردنیان بەگوێرەی توانا بە پێویست دەزانێو، دیارە ئەویش لە بەرانبەردا هەمان مافی لەسەر ئەوان هەیە.

وە بێگومان خۆ کوشمەڵەکردن (التقوقع) لە جوغزی سنووره دەستکردەکانی وڵاتانی ئیسلامییداو، گوێ نەدان بە کێشەو گرفتو ئێشو ژانەکانی مسوڵمانان، هەڵەو کەمتەرخەمییەکی گەورەیە، بەتایبەت لەم چاخو رۆژگارەدا کە دوژمنو ناحەزانیان یەکدەستو یەکدەنگن لە بەرانبەریاندا، چونکە:

١- خـــوای بـــەرز و مـــەزن فەرموویـــەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ... ﴿١٠﴾ ﴾ الحجرات. واتە: (بێگومان بڕواداران بران، وە خوشك و بران، وە ئافرەتانیان خوشكن ...).

٢- وە خـوای بەدیهێنـەر ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: (ئا ئەمە ئۆممەتی ئێوەیە یەك ئۆممەتە، وە من پەروەردگارتانم، تەنیا من بپەرستن).

٣- هـەروەها خـوای پـەروەردگار ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ... ﴿١٠٣﴾ ﴾ آل عمـران، واتـە: (وە تێكـڕا تونـد دەسـت بـە ڕێسمانی خوا بگرن و پەرتەوازە مەبن ...).

٤- وە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: (مَثَـلُ الْمُـؤْمِنِينَ فِـي تَـوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى) رواه البخـاري: (٦٠١١)، ومـسلم: (٢٥٨٦)، واللفظ له، عن النعمان بن بشير رضي الله عنه، واتە: (وێنەی بـڕواداران لـە یەكدی خۆشویستن‌و بەزەیی بەیەكداهاتنەوەو هاوسۆزبوونیان لەگەڵ یەكدیدا، وەك جەستەیەك وایە كە ئەگەر ئەندامێكی نەساغ بوو، هەموو جەستە بەشداریی دەكات بە شەونخوونیی‌و تا لێهاتن).

٥- هـەروەها پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: (الْمُسْلِمُونَ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ) رواه ابـن ماجـه: (٢٦٨٤) واللفـظ لـه، وأحمـد: (٦٧٩٧)، وقـال الألباني وشعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره، واتە: (مـسوڵمانان یـەك دەسـتن لە بەرانبەر غەیری خۆیاندا).

## ڕوونكردنـەوە:

ئەم بنەمایە لە چوار خاڵ دا ڕوون دەكەینەوە:

## یەكـەم: یـەك ئۆممـەت بـوونی مـسوڵمانانو پێكـەوە دۆسـتو خوشـكو برابوونیان، یەكێكە لە شتە ئاشكراو بەڵگەنەویستەكانی ئیسلام:

واتـە پێویستی بە بەڵگە لەسەر هێنـانەوە ناكات، كە مسوڵمانان هـەموویان یـەك ئۆممەتو یەك كۆمەڵنو، پێكەوە خوشكو برانو دۆستو پشتیوانی یەكـدین، وەك خـــوا ﷻ فەرموویـــــەتی: ﴿إِنَّ هَـٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾﴾ الأنبيـاء، وە فەرموویـەتی: ﴿وَإِنَّ هَـٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾﴾ المؤمنون، واتە: (بێگومـان ئەمـە كۆمـەڵی ئێوەیە یـەك ئۆممەتە، وە من پەروەردگارتانم، لە ـ سەرپێچیی لێكردنی ـ مـن خۆتـان بپارێزن)، واتە: ئێمە ئەهلی خوا بەیەكگرتن (توحيد)ینو، ئەهلی یەكبوون (وحدة)یشین.

هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ...﴿١٠﴾﴾ الحجرات، واتە: ناگونجێ بڕوادار بنو برا نەبن، یـاخود: بێگومـان هـەر بـڕواداران بران، واتـە: برایەتی ڕاسـتەقینە تەنیا لەنێـوان بڕواداراندایـە.

جاری دیكەش گوتوومانـە كـە وشـەی (إِخۡوَةٞ) لـە زمـانی عەرەبیـدا نێـرو مـێ دەگرێتـەوە، (إخـوان) تـەنیا پیـاوان دەگرێتـەوە، بـەڵام (إِخۡوَةٞ) پیـاوانو ئافرەتـان

دەگرێتەوە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ ...﴿١٧٦﴾﴾ النساء. دەربارەی میرات گرتن لە بێ وەجاخ (كَلالَة) واتە: كەسێك كە دەمرێ نە دایكو باب (أصل)ی هەیەو نە وەچە (فرع)ی هەیە، چۆن میراتی لێدەگیرێ؟ باس دەكات، دوایی دەفەرموێ: {... جا ئەگەر ـ میراتگرەكان ـ (إخوة) بوون، پیاوانو ئافرەتان، ئەوا بۆ نێرینە دوو هێندەی مێیینە هەیە ...}. كەواتە كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ...﴿١٠﴾﴾ الحجرات، واتە: (بێگومان بڕواداران پیاوەكانیان برای یەكدینو، پیاوانو ئافرەتان خوشكو برای یەكدینو، ئافرەتانیش خوشكی یەكدین).

بۆیە پێویستە وریاو هۆشیاربینو سەرگەرمبوونمان بە واقیعی كارو چالاكی تێدا ئەنجام دانمانەوە، وامان لێ نەكا كە ئەو راستییەمان لەبیربچێتەوە یان كاڵ بێتەوە.

ئەوە مەسەلەیەكی زۆر گرنگە كە ئێمە لە واقیعی كاری ئیسلامیی خۆماندا نەچینە قاوغو قەپێلكی خۆمانەوەو سەرقاپ لەسەر خۆمان دابخەینو ئاگامان لە مسوڵمانانی دیكەو ئێشو ژانو موعاناتو گیروگرفتەكانیان نەمێنێو، لە خۆشییو ناخۆشییاندا هیچ بەشداریی نەكەین، چونكە ئەوە پێچەوانەی یەك ئۆممەت بوونو پێكەوە خوشكو براو دۆستو پشتیوانو نزیكبوونە.

**دووەم: (واقیعیی بوون)مان ئەوە دەخوازێ كە هەلو مەرجو بارودۆخی تایبەتی كارو چالاكی خۆمان، كە هەرێمی كوردستان بەتایبەتیو عێراقە بەگشتی، زۆر بەوردیی رەچاوبكەینو لەبەرچاوبگرینو بە**

**بیانووو پاساوی ئەوەوە كە ئۆممەتی ئیسلامیی یەك ئۆممەتەو جیهانی ئیسلامیی هەمووی وڵاتی مسوڵمانانە، واقیعی تایبەتی خۆمانو هەلو مەرجە تایبەتییەكەی نادیدە نەگرین:**

ئێمە چۆن دەبینە خەڵكێكی ئیسلامیی واقیعیی؟ بەوە كە ئەو هەلو مەرجە بابەتییو تایبەتییانەی خۆمان لە هەرێمی كوردستانو لە عێراقدا باش لەبەرچاو بگرینو، نەچین لاقی خۆمان لە لاقی حیزبی دادو گەشەپێدانی توركیا ببەستین، یاخود مسوڵمانانی میسر، یان مسوڵمانانی ئەفغانستان، یان مسوڵمانانی كشمیر، بەڵكو دەبێ واقیعی خۆمان لەبەرچاو بگرین، چونكە: (الفتوى تختلف زمانًا ومكانًا وشخصًا وعرفًا وحالاً)، واتە: (فەتوا بەپێی كاتو شوێنو كەسو نەریتو هەلو مەرج دەگۆڕێ)، ئینجا شێوەی كاركردن كە لە فەتوا زۆر گرنگترەو وردەكاریی زۆر زیاتری دەوێو، گۆڕانی زۆر زیاتری بەسەردادێ، هەلو مەرجی كارو چۆنیەتی كار چۆن نابێ بگۆڕێ؟! لەبەرئەوە هەموو ئەوانەی كە باسی ئەوە دەكەن كە بۆ وێنە: دەبێ بزانین داخۆ حیزبی دادو گەشەپێدان لە توركیا چییان كردوە، ئێمەش دەبێ كتومت وا بكەین، ئەوە هیچ نیەو نەچێتە عەقڵتانەوە، لاسایی كردنەوەی خەڵك قەت بە هیچت ناگەیەنێ، چونكە هەلو مەرجی ئەو جیایە، وە هەلو مەرجی ئێمە دە ساڵ پێشتر جیابووە لەوەی ئێستا، بگرە ئێمە نەك هەر ناتوانین وەك ئێستای حیزبی دادو گەشەپێدانی توركیا یان حیزبی دادو گەشەپێدانی مەغریب، یان ئێستای بزاڤی ئاشتیی جەزائیری (حركة السلم الجزائري)، یان كۆمەڵی ئیسلامیی پاكستان بكەین، بەڵكو ناتوانین ئێستا وەك هی پازدە ساڵ پێشی خۆشمان بكەین، وەك دە ساڵ لەمەوپێشی خۆشمان بكەین! بۆیە پێویستە بەپێی گۆڕانی هەلو مەرجو ژینگەكان، شێوازو ئامرازەكانی كارمان بگۆڕین.

كەواتە: كاتێك دەبین بە واقیعیی‌و پڕ بە پێستی ئەو واقیعە دەتوانین هەنگاو بنێین‌و هەڵسوكەوتێكی واقیعبینانە پڕ بە پێست لەگەڵ دەوروبەرماندا بكەین، كە هەل‌و مەرجی تایبەتیی خۆمان لەبەرچاو بگرین، وە بە بیانووو پاساوی ئەوە كە ئۆممەتی ئیسلامیی یەك ئۆممەتەو خاكی ئیسلامیی هەمووی وڵاتی مسوڵمانانە، واقیع‌و هەل‌و مەرجی تایبەتیی خۆمان نادیدە نەگرین، ئەگەرنا دوایی دەبینە شتێكی سەیر، بەڵگەشمان لەسەر ئەمە ئەوەیە كە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ هەرچەندە خوای كاربەجێ ﷻ بۆ تێكڕای بەشەری ناردوە، بە درێژایی زەمان بۆ هەموو چاخ‌و سەردەمەكان و، بە پانایی زەمین بۆ هەموو وڵات‌و نەتەوەكان، وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ...﴿٢٨﴾﴾ سبأ، واتە: (تۆمان ڕەوان نەكردوە مەگەر بۆ تێكڕای خەڵكی مژدەدەرو ترسێنەر بی ...)، هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴿١٠٧﴾﴾ الأنبياء. واتە: (تۆمان نەناردوە مەگەر بەزەیی بی بۆ تێكڕای جیهانییان)، وە هەروەها دەفەرمووێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ...﴿١٥٨﴾﴾ الأعراف. واتە: (بڵێ: ئەی خەڵكینە! من ڕەوانەكراوی خوام بۆ هەمووتان بە تێكڕا ...). وە لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەریشدا ئەوە هاتوە، بەڵام ئەمە وای لێنەكرد كە ڕەچاوی مەیدانی كارو چالاكی تایبەتیی خۆی نەكات‌و لە هەر قۆناغەدا خیتابێكی تایبەتی بۆی نەبێ، بۆ نموونە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ﴿٢١٤﴾﴾ الشعراء. واتە: (وە خزمە نزیكەكانت وریابكەوە)، ئایا دەگونجێ بگوترێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری هەموو مرۆڤایەتییەو بۆ هەموو دنیا هاتوە، بۆیە نابێ هەقی خزمانی خۆی هەر هەبێ‌و، دەبێ هەر بڵێ:

ئەی خەڵكینە! لە هەموو دنیـا؟! بێگومان نا، بەڵكو دەبێ لە خزمانـەوە دەسـتپێبكا، تۆ جارێ هەتا خەڵكە نزیكـەكەت لێت تێنەگـەنو بـڕوات پـێ نەكـەن، هـی دوور چۆن لێت حاڵی دەبن؟

وە هــەروەها خــوای بــەرزو مــەزن دەفــەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ ...﴿٤٤﴾﴾ الزخرف. واتە: (ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ خۆتو بۆ گەلەكەت ...)، لە دوای هۆز (عشیـرة) ئینجا گەل (قـوم) دێ.

وە هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ ...﴿٦٤﴾﴾ آل عمـران. واتـە: (بڵـێ: ئـەی خـاوەن كتێبەكان! وەرن بۆ —پەیوەست بوون بەـ وشەو بەرنامەیەك كە بـۆ ئێمـەو ئێـوە وەك یەكە ...)، واتە: وەرن بۆ خوا بەیەككرتن، كەواتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەهلی كیتاب دواندن (خطـاب)ێكی جیای هەبووە، وە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دوانـدنێكی جیا، بۆ خزمان بە تایبەت، بۆ گەل بە تایبەت، وە بۆ تێكڕای مرۆڤایەتی بەگـشتی، بە شێوەیەكی دیكە بووە.

**سێیەم: پێویستە لەنێوان جیهانیی بوونی ئیـسلامو یـەك ئۆممـەت بـوونو پێكـەوە دۆسـتو خوشـكو برابـوونی مـسوڵمانان لەلایـەكو، ناوچـەیی بـوونی كـارو پڕۆژەكـەمانو لەیـەك جیـاوازبوونی بـارودۆخی گـەلانو وڵاتـانو كۆمەڵگاكـانی مـسوڵماناندا لەلایـەكی دیكـەوە، هاوسـەنگیی ڕابگیـرێ، وە پێویـستە واقیعـبین بـینو بـزانین كـە ئۆممـەتی ئیـسلام**

**لـەم ڕۆژگـارەدا تـەنیا لـەڕووی عەقیـدەییو فیكـرییو عاتیفییـەوە، یەكە، ئەگەرنا لەڕووی سیاسییەوە وا نیە:**

لەلایەكەوە ئیسلام ئیسلامی هەموو مرۆڤایەتییەو، هەرچی مسوڵمانە بە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دادەنرێ، ولاّتی مسوڵمانان هەمووی مەنزڵگای ئیسلام (دار الإسلام)ە، ئەوە حەقیقەتێكە، بەلاّم لە لایەكی دیكەو لایەنێكی دیكەوە، ئێمەو هەر حیزبێكی دیكە كارو پڕۆژەكەی ناوچەیی‌یەو تایبەتە بە ناوچەیەكی دیاریكراوەوە، وە مەحكوومی ئەو هەل‌و مەرجە جوگرافیی‌و سیاسییەیە (الجیوسیاسي)، كەواتە: دەبێ لەنێوان جیهانیی بوونی ئیسلام‌و ناوچەیی كارو پڕۆژەی ئیسلامییماندا، هاوسەنگیی ڕابگیرێ‌و پێویستە واقیعبین بین و، بزانین كە ئۆممەتی ئیسلام لەم ڕۆژگارەدا تەنیا لە ڕووی عەقیدەیی‌و فیكریی‌و عاتیفییەوە، یەكە.

جا ئەوە جارێك گوێم لە یەكێكی خۆ بە سەلەفیی زان (سەلەفیی ناو) بوو باسی (كۆمەڵی ئیسلامیی)و لایەنە ئیسلامییەكانی دەكردو دەیگوت: ئایا پێش ئەو لایەنە ئیسلامییانە، كۆمەڵی خوا (حزب الله) هەبووە یان نا؟ دیارە (حزب الله) هەبووە، ئینجا ئەوانە هەڵساون (كۆمەڵی ئیسلامیی)و لایەنە ئیسلامییەكانیان داناوە، كەواتە: لایەنە ئیسلامییەكان كۆمەڵی خوا (حزب الله)یان لەت كردووەو پارچە پارچەیان كردوە! منیش گوتم: ئەوەیە دەڵێن دەبێ دوعای بۆ بكەی بڵێی: (خوا عەقڵ بدات بە منداڵت)! چونكە خوای پەروەدگار ﷻ چۆن باسی كۆمەڵی خوا (حزب الله) دەكات لە قورئاندا؟ دەفەرموێ: ﴿... فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾ المائدة، واتە: (... كۆمەڵی خوا بە دڵنیاییەوە سەركەوتوون)، جا ئایا دەتوانین ئێستا بڵێین مسوڵمانان ئەو كۆمەڵی خوایەن، كە خوا ﷻ لە قورئاندا دەفەرموێ سەركەوتوون؟ ئەدی ئەوەنیە بە دەردی كابرا دەڵێ بە دەست هەزار ستەملێكراوییەوە

دەناڵێنین؟ بێگومان ئێستا ئێمە زاڵو سەركەوتوو نین، چونكە وڵاتمان هەرجارەی دەوڵەتێك داگیری دەكاتو، خێروبێرمان بە تاڵان دەبردرێ، سەدو یەك دەردو نەخۆشییمان هەیە، پەرتەوازەین و ژێر چەپۆكین، جا ئایا ئێستا ئێمە كۆمەڵی سەركەوتووی خواین؟ نەخێر وا نین، بەڵێ بێگومان ئێستا ئۆممەتی ئیسلام لەڕووی فیكریی و عەقیدەیی و شعووریی یەوە، یەك ئۆممەتەو بوونی هەیە، بەڵام نەك بەو واتایەی كە خوا ﷻ لە قورئاندا دەفەرموێ! كۆمەڵی خوا سەركەوتووو زاڵە، ئایا ئێستا ئێمە زاڵین، یان بەسەرماندا زاڵ بوون؟ كەواتە: وەك لایەنە ئیسلامییەكان كە دەڵێین: ئەگەر ناتوانین هەموو مسوڵمانانی جیهان پێكەوە كۆبكەینەوە، بگرە مسوڵمانانی كوردستانیشمان هەموو بۆ كۆنابنەوە، با چەند هەزارێكمان كە بەدەنگەوە دێن كۆیان بكەینەوەو تۆزێك ڕێكیان بخەین، ئایا ئەوە مانای وایە كۆمەڵی خوامان لەت كردوە؟ یان دەمانەوێ كۆمەڵی خوا بە چەمكە قورئانییەكەی زیندوو بكەینەوە، نەك بە چەمكە واقیعییەكەی كە ژێر چەپۆكو زەبوونو زەلیلەو، تەنانەت ئەوەش كە خۆی بە شوێنكەوتووی پێشینی چاك (السلف الصالح)یش دەزانێ، ناچارە خۆی بە حیزبێكی عەلمانیی هەڵواسێ، بەڵكو مووچەیەكی بداتێ، یاخود بە مامۆستای مزگەوت دایبمەزرێنێ، ئا ئەوە چ (حزب الله)یەكە كاكی خۆم؟!

بەڵێ، پێویستە واقیعبین بینو بزانین كە ئۆممەتی ئیسلام لەم ڕۆژگارەدا تەنیا لەڕووی عەقیدەیی و فیكریی و عاتیفییەوە، یەكە، ئەگەرنا لەڕووی سیاسییەوە وا نیە، ئاخر كوا ئۆممەتی موحەممەد لەڕووی سیاسییەوە، یەكە؟ هەر عەرەب بیستو دوو دەوڵەتیان هەیە، بەڵكو هەم لەڕووی سیاسییەوەو هەم لەڕووی جوگرافییەوە، بەش بەشو پارچە پارچەین.

شایانی باسیشە كە لەكاتی تێكگیرانی بەرژەوەندیی كارو پڕۆژەی ئیسلامیی و بەرژەوەندیی هاوكاریی كردنی مسوڵمانانی دەرەوەی بازنەی كارو پڕۆژەكەدا، پێویستە بەرژەوەندیی پڕۆژە ئیسلامییەكە زاڵ بكرێ.

با زیاتر ئەم مەسەلەیە روون بكەینەوە:

ئێمە لە واقیعی هەرێمی كوردستان و هەندێك لە پارێزگاكانی عیراقدا، كارو پڕۆژەیەكی ئیسلامییمان هەیە، جا كاتێك بەرژەوەندیی ئەو كارو پڕۆژە ئیسلامییە كە لە ناوچەیەكی جوگرافیی دیاریكراودایە، تێكدەگیرێ لەگەڵ بەرژەوەندیی هاوكاریی كردنمان بۆ خەڵكی مسوڵمان، بۆ نموونە: لە بەشەكانی دیكەی كوردستانی گەورەو فەلەستین و كشمیرو شیشان یان شوێنێكی دیكەدا، دەبێ بەرژەوەندیی كارو پڕۆژەكەی ئێرە زاڵ بكرێ، چونكە تۆ بە پلەی یەكەم كارەكەت لێرەیەو، ئەگەر ئەوەی ئێرە سەربگرێ دەتوانی شتێكیش بۆ خەڵكی دیكە بكەی، بەڵام كە هی ئێرەت سەركەوتوو نەبوو، ئەوە بە دڵنیاییەوە لە شوێنی دیكە سەركەوتن بەدەست ناهێنی.

بەڵگەی ئەم مەسەلەیەش ئەم ئایەتەیە كە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾﴾ الأنفال، واتە: {بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو كۆچیان كردوەو بە سامان و گیانیان تێكۆشاون و فیداكارییان كردوە لە رێی خوادا، وە ئەوانەش كە ئەوانیان پەناداوەو یارمەتییان

داون، ئەوانە هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن، بەڵام ئەوانەی كە بڕوایان هێناوە، بەڵام كۆچیان نەكردوە، ئێوە هیچ پەیوەندییەكتان پێیانەوە نیە (لەڕووی پشتیوانیی كردنو هاوكاریی كردنەوە) هەتا كۆچ نەكەن، وە ئەگەر داوای یارمەتییان لێ كردن لە دیندا (واتە: لەسەر دین ستەمیان لێكرابوو) ئەوە ئێوە لەسەرتانە هاوكارییان بكەن، مەگەر ئەوەی كە دەستدرێژیی كردوونە سەری، پەیمانتان لەگەڵ بەستبن، وە خوا بینەری ئەوەیە كە دەیكەن﴾، واتە: ئەگەر كۆمەڵە كافرێك هەبن كە لەگەڵیان هاوپەیمان بن، ئەوە نابێ لەو حاڵەتەدا یارمەتی ئەو مسوڵمانە ستەملێكراوانە بدەن لەدژیان، بۆئەوەی پەیمانەكەتان لەگەڵ ئەو كافرە ستەمكارانەدا هەڵنەوەشێتەوە، كە ڕەنگە بە هەڵوەشانەوەی پەیمانەكە، زەرەرێكی گەورەتر بكەن لەو سوودەی بەو مسوڵمانە ستەملێكراوانەی دەگەیەنن.

كەواتە: لەم ئایەتەوە وەردەگیرێ: كاتێك تۆ واقیعێكی ئیسلامییت هەیە، دەبێ بەرژەوەندیی ئەو واقیعە ئیسلامییە بپارێزی، هەرچەندە تۆ بەرانبەر بە مسوڵمانانی دیكەش بەرپرسیاری، بەڵام لەكاتی تێكگیراندا، بەرژەوەندیی كارو پڕۆژە ناوچەییەكە زاڵ دەكرێ.

هەڵبەتە لێرەدا خوای پەروەردگار ﷻ باسی دەوڵەتی ئیسلامیی و قەوارەیەكی سیاسیی دەكات، بەڵام ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ بۆ دەوڵەتو قەوارەیەكی سیاسیی دەیفەرموێ، هەندێك لە حوكمەكانی بۆ شتی لەوە بچووكتریش گشتگیردەبن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێوە ئەو مسوڵمانانەی كۆچتان كردوەو تێكۆشاونو ئەوانەش كە هاوكارییان كردوون، (واتە: مسوڵمانانی كە لە مەدینە كۆبوونەتەوە)، هەندێكتان دۆستو پشتیوانی هەندێكتانن، بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو كۆچیان نەكردوەو هەر لە مەككەن یان لە شوێنەكانی دیكەنو نەهاتوونە نێو بازنەی وڵاتی ئیسلام (دار الإسلام)ەوە، ئەوە ئێوە لەسەرتان پێویست نیە كە

هاوكارییان بكەنو پشتیان بگرن، تا كۆچ نەكەن، مەگەر ستەمیان لێبكرێ لەسەر دینو بویستریێ هەڵیانگێڕنەوە، لەو حاڵەتەدا بە دەمیانەوە بچن، بەڵام بە مەرجێك ئەوانەی ستەمەكەیان لێ دەكەن، كۆمەڵێك نەبن كە لەگەڵ ئێوەدا هاوپەیمان بن، ئەگەر هاوپەیمانێكی ئێوە بوون، نابێ پەیمانەكە هەڵبوەشێننەوە، چونكە كە پەیمانەكەتان هەڵوەشاندەوە لەوانەیە دەوڵەتو پڕۆژەكەی خۆتان بكەوێتە مەترسییەوە، كە ئەوكاتە وەك ئەوەی لێ دێ كە لە كوردەوارییی خۆماندا دەڵێن: (بۆ ریش چوو بوو سمێڵیشی لەسەر دانا)، تۆ كە بە حیساب یارمەتی ئەوەی دیكە دەدەی، بەڵام شتەكەی خۆشت بكەوێتە مەترسییەوە، مانای وایە ئەوە سەودایەكە، قازانجەكەی سەری مایەی دەخوا.

ئینجا لێرەدا دەمەوێ ئەوەش بخەمە پاڵ قسەكانی پێشێم، كە ئێمە مەبەستمان ئەوەیە: لەلایەكەوە دەبێ بەرژەوەندیی كارو پڕۆژە ئیسلامییەكەمان لەو جوگرافیاو سنوورەدا كە تێیدا ئەنجام دەدرێ -كە وەك گوتمان هەرێمی كوردستانو عیراقە- دەبێ ئەولەوییەت بدەینە بەرژەوەندیی ئەو كارو پڕۆژە ئیسلامییەمان، بەڵام ئەوە نابێ وامان لێبكا كە ئێمە لە مسوڵمانانی دیكەو ئێشو ژانو موعاناتو كێشەو گیروگرفتەكانیان بێ خەبەر بین و، دەستەوئەژنۆ دابنیشینو لە بەرانبەریاندا بێ هەڵوێست بین، بەڵكو دەبێ ئەوەی لە دەستمان دێ بۆ ئەوانیش بیكەین، بەڵام نابێ شتێك بكەین كە ئیشی ئێرەمان لێ تێكبداو هەڵبوەشێنێتەوەو پەرچ بخاتە بەردەمی، چونكە ئەوەتا خوای پەروەردگار ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانانی كۆچكەرو پشتیوان، كە دەوڵەتیشیان هەبووە، دەفەرموێ: هەر كەسێك لە دەرەوەی ئەو قەوارەیەی ئێوە بووو زوڵمی دینیی لێكرا، بە دەنگیەوە بچن بە مەرجێك ئەو لایەنە دەستدرێژكارە هاوپەیمان نەبێو، ئەو بە دەنگەوە چوونەی ئێوە نەبێتەهۆی ئەوەی پەیمانەكەتان لێ هەڵبوەشێتەوە، چونكە لەو حاڵەتەدا قەوارە سیاسییەكە زەرەر

دەکات‌و دەکەوێتە بەر هەڕەشەو مەترسیی، بۆیە ئێوە لەو حاڵەتەدا نەك هەر لەسەرتان پێویست نیە، بەڵکو بۆشتان نیە.

## چوارەم: یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا ئێمە چیمان بۆ مسوڵمانانی دیکەی دنیا پێ دەکرێ لەکاتی لێقەومان‌و پێویستییاندا؟!

کە من پێموایە ڕەنگە ئێستا ئەو پرسیارە لە مێشکی ئێوەشدا سەرە تاتکە بکات، یەکێك لەوانەیە بڵێ: خۆ ئێمە هیچمان لەدەست نایەت!

لە وەڵامدا دەڵێین:

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ ... ﴿٧﴾﴾ الطلاق. واتە: (... خوا لە هیچ کەسێك داواناکات مەگەر ئەوەندەی پێیداوە ...)، خوا ﷻ چەندی پێداوی ئەوەندەشت لەسەر پێویست دەکات، وە دەفەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ ... ﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة، واتە: (خوا لە هیچ کەسێك داواناکات مەگەر ئەوەندەی پێی دەکرێ ...)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ... ﴿١٦﴾﴾ التغابن، واتە: (ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیەو هەتا پێتان دەکرێ، پارێز لە خوا بکەن ...)، کەواتە: لە توانا بەدەر خوا ﷻ لەسەر مرۆڤی پێویست ناکات‌و شتێك کە لە تواناماندا نەبێ، لە سەرمان پێویست نابێ بەرانبەر برایان‌و خوشکانی مسوڵمانمان لە دنیادا، بەڵام ئەوەی لە تواناماندایە لەسەرمان پێویست دەبێ، جا ئایا چیمان لە توانادایە؟ دەتوانین بڵێین: وەك نموونە: دوعای خێرو پاڕانەوە هەمیشە ئاسانەو لە توانادا هەیەو دەکرێ. هیچ کاتێك نیە مسوڵمان نەتوانێ بۆ برای

مسوڵمانیو خوشكی مسوڵمانیو خەڵكی مسوڵمان بپارێتەوە، بە كوڵ بۆیان بپارێتەوەو دوعا یان بۆ بكات و، دوعاش كەم نیە، لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە: {عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: رَأَى سَعْدٌ أَنَّ لَهُ فَضْلا عَلَى مَنْ دُونَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلا بِضُعَفَائِكُمْ؟} رواه البخاري: (٢٨٩٦)، واتە: (ڕۆژێك سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص[1] مسوڵمانێكی لاواز بە كەم دەبینێ، كە ڕەنگە لە ڕووی جەستەییەوە بێ هێز بووبێ، یان شەڕی نەزانیبێ، ئیدی هەستێكی خۆ بە زێدەزانینی بۆ دروست دەبێو، قسەیەك دەكات كە شعوری پێ بریندارەدەبێ، پێغەمبەریش لە سەعد تووڕەدەبێو دەفەرموێ: ئایا ئێوە سەردەخرێنو ڕۆزییتان دەدرێ، مەگەر بەهۆی لاوازو كەم دەستەكانتانەوە نەبێ)؟ بۆچی؟ چونكە وەك لە ریوایەتێكی دیكە هاتوە، كە: (أَنَّهُ ظَنَّ أَنَّ لَهُ فَضْلًا عَلَى مَنْ دُونَهُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّمَا يَنْصُرُ اللهُ هذِهِ الأُمَّةَ بِضَعِيفِهَا: بِدَعْوَتِهِمْ، وَصَلاتِهِمْ، وَإِخْلاصِهِمْ) رواه النسائي: (٣١٧٨)، وقال الألباني: صحيح، واتە: (ـ سەعدی كوڕی ئەبی وەققاسـ وا گومانی برد كە چاكەی هەیە بەسەر ئەوانەی لەخۆی خوارترن لە هاوەڵانی پێغەمبەر، جا پێغەمبەر فەرمووی: خوا ئەم ئۆممەتە سەردەخا بە لاوازەكانی، بەهۆی پاڕانەوەو نوێژو خوا ویستییان)، یانی: خوای بەرز ﷻ بەهۆی ئەوانەوە، ئێوەش سەردەخا، كەواتە: با دوعا بە كەم نەزانین، دوعای وا هەیە واقیعێك دەگۆڕێ.

هەروەها (ڕاگەیاندن) هۆكارێكی كاریگەری ڕۆژگارە بۆ پشتگیریی یەكدی كردنی مسوڵمانانو بەرگریی لەیەك كردنیانو، یەكێك لەو شتانەیە كە ئێمە دەتوانین

---

١) پێغەمبەر ﷺ بە سەعد نەبێ بە كەسی دیكەی نەگوتوە: {إرم فداك أبي وأمي}، واتە: (بهاوێ دایكو بابم بە فیدات بن)، عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا ﷺ يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُفَدِّي رَجُلًا بَعْدَ سَعْدٍ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: {إِرْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي} رواه البخاري: (٢٩٠٥).

بەهۆیەوە هاودەردیی و هاوكارییان لەگەڵ بكەین، ڕاگەیاندن كە ئێستا پێی دەگوترێ: (دەسەڵاتی چوارەم)، بەڵكو زۆرجار دەبێتە دەسەڵاتی یەكەم، بەتایبەت بەدەست ئەو تاغووتانەوە كە بۆش و خاڵیین لە هەموو شتێك و، تەنیا قسەیان هەیە بۆ چەواشەكردنی خەڵك، بۆ وان دەسەڵاتی یەكەمە، ئەگەر بە ڕیزبەندیی ئاسایی دەسەڵاتی چوارەمە[1]، بەڵام لەڕاستیدا زۆرجار ڕاگەیاندن دەسەڵاتی یەكەمەو چەكێكی زۆر بڕندەیەو خەڵكێكی زۆر بەهۆی ڕاگەیاندنەوە چەواشەدەكرێن و ڕاستییەكانیان لەپێش چاو دەكرێنە ناڕاستیی و ناڕاستییەكانیان لەپێش چاو دەكرێنە ڕاستی، وەك دەیبینین و لەبەرچاومانە، كەواتە: پێویستە بە ڕاگەیاندنیش ئەوەندەی دەنگمان دەڕواو لە تواناماندایە، بەرگریی لە مەزڵوومیەتی میللەتانی مسوڵمان و خەڵكی مسوڵمان بكەین.

هەروەها كۆڕ بەستن و سیمینار گرتن، وەك ئەو گردبوونەوە جەماوەرییەی لە (٥/ ١/ ٢٠٠٩)[2] بۆ پشتگیریی مسوڵمانانی كەرتی غەززە كردمان، كە بۆ زانیارییتان، دوای ئەو گردبوونەوەیە پێمگەیشتەوە كە جوولەكە لەوێوە پێی

---

١) دەسەڵاتی یاسادانان هەیە كە لە پەرلەماندا بەرجەستەیە، وە دەسەڵاتی جێبەجێكردن هەیە كە حكوومەتە، وە دەسەڵاتی دادوەریی هەیە، ئینجا دەسەڵاتی ڕاگەیاندن.

٢) ڕژێمی جوولەكە لە (٢٧/ ١٢/ ٢٠٠٨) هێرشێكی دڕندانەی كردە سەر دانیشتووانی كەرتی غەززە لە فەلەستین، كە بە بۆردومانی بنكەیەكی پۆلیس دەستپێكرد.

شایانی باسە مەكتەبی سیاسیی كۆمەڵی ئیسلامیی لە (٢٨/ ١٢/ ٢٠٠٨) بەیاننامەی ناڕەزایی دژی ئە بۆردومانە دەركردو، پاشان ئەنجوومەنی سەركردایەتیی كۆمەڵی ئیسلامیی لە (٤/ ١/ ٢٠٠٩) بەیاننامەیەكی دیكەی ناڕەزایی دژی هێرشەكانی ڕژێمی جوولەكە بۆ سەر كەرتی غەززە دەركرد. هەروەها لە (٥/ ١/ ٢٠٠٩) بە هاوبەشی لەگەڵ برایانی یەكگرتوو گردبوونەوەیەكی جەماوەرییمان لە هۆڵی (های سیتی) لە شاری هەولێر سازكردو، من وتارێكم تێدا پێشكەش كرد.

سەغڵەت بوو بوون، هەروەها ئەو کۆبوونەوە جەماوەرییـەی لـە (٧/ ٨/ ٢٠٠٦)ی زایینی دژی دەسـتدرێژیی ڕژێمی جوولەکە بۆ سەر مسوڵمانانی خواروی لوبنـانو فەلەسـتین سـازمانکرد لـە بـەردەم مەڵبەنـدی هـەولێردا، بیـستمانەوە کـە لـەوێوە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جوولەکە باسیان کردوە، جا دوای ئەو کۆڕەی کە لـە هـۆڵی (هـای سـیتی) لە شاری هـەولێر بەبۆنەی پـشتگیریی کردنـی مـسوڵمانانی کـەرتی غەززە بەستمان، یـەکێك کـە دەمزانـی لەلایـەن جوولەکـەوە ڕاسـپێردراوەو هێنـدە کەسێکی خراپە ناوەکەی ناهێنـم، بۆ یەکەم جارو بۆ دواجار هات بۆ لام، گـوتی: مامۆستا، گـوتم: بـەڵێ، گـوتی: مـن زۆر خـۆم بـە دڵـسۆزی جـەنابت دەزانم، جەنابت حاڵت واو حیـسابت واو شـانت واو باڵـت وا، گـوتم: بـەڵێ سوپاسـت دەکەم، فەرموو؟! گوتی: مـن هـاتووم ئاگـادارت بکەمـەوە کـە ئـەمریکا دەیـەوێ بتگـرێ، منیش پێکـەنیم، گوتی: بۆچی پێدەکـەنی؟ گـوتم: پەنـدێکی کـوردی هەیـە دەڵێ: (لەش تەڕ بوو لە بارانێ ناترسێ)، ئەمریکاشمان تاقیکردۆتەوە، دوایی بۆم دەرکەوت کە هەر لەوێوە پێیانگـوتبوو بچـۆ ئەوانە بترسـێنە، تاکو جارێکیـدی شتی وا نەکەن، چونکە ئەوانە پێیان ناخۆشـە ڕاسـتییەکانیان دەرکـەون، جوولەکـە پێی خۆشە لەوێ مسوڵمانانی فەلەستین خەڵتانی خوێن بکات، بەڵام کەس باسـی نەکا، بەڵێ ئەوەش کەم نیە خەڵك کۆڕ ببەسـتێو مەقالە بنووسـێ، بێگومـان ئـەوە فشاریان لەسەر دروست دەکات و، ڕای گشتییان لە بەرانبەر دروسـت دەبـێ، وەك ئێستا جوولەکە کەوتۆتە ژێر پرسیارەوە، چونکە لە ئـەنجامی تەقـەکردن لـە کەشـتی ئازادییو کوشتنی ئەو مسوڵمانانەی تورکیادا، شتی زۆری هاتەسەرێ، کەواتە کۆڕ بەستنو سیمینار بەستن، وە هەروەها ڕێپێوانو خۆپیشاندان، ئەوانـە هـەموو شـتی گرنگنو لە زۆربەی هەلو مەرجەکاندا دەگونجێ بکرێن.

هەڵبەتە هێندێك لەوانەش باجیان دەوێ، بەڵام خۆ مەرج نیە هەر شتێك باجی بوێ ئێمە نەیکەین، پاشان مەسەلەی کۆکردنەوەی پارەو پیتاكو ئەوانە کە زۆرجار بۆ مسوڵمانان کراوەو دەکرێ، بۆ وێنە: ئێستا مسوڵمانانی پاکستان بیست ملیۆن کەسێك بەهۆی لافاوەوە دەربەدەر بوون، لە زۆربەی دنیادا شتیان بۆ کۆدەکرێتەوە، هەرچەندە بەداخەوە لەم کوردستانەی خۆمان هیچ خەبەر نیە، ئێمە زۆرجار گلەیی دەکەین‌و دەڵێین: بۆچی ئێمە کاتی خۆی ستەممان لێ کراوەو کەس لەسەرمان بەدەنگ نەهاتوە، کەچی بۆخۆشمان لەسەر کەس بەدەنگ نایەین، ئەو برادەرە عەلمانییانە هەموو جارێ گلەیی دەکەن دەڵێن: کاتی خۆی کەس بەرگریی لێنەکردین، بەڵام ئەوەتا ئێوەش بەرگریی لە کەس ناکەن، تەنانەت بە قسەو ڕاگەیاندنیش، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە ڕاگەیاندنی ڕەسمیی ئەو حیزبە عەلمانییە حوکمڕانانە دەبینی، ئەگەر تێکگیران لەنێوان مسوڵمانانی فەلەستین‌و جوولەکەکاندا بێ، هەمیشە لای جوولەکەکان دەگرن، وە ئەگەر لەنێوان مسوڵمانانی شیشان‌و ڕووسەکاندا بێ، هەمیشە لای ڕووسەکان دەگرن، وە لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان کشمیرییەکان‌و هیندۆسەکان لە هیندستاندا، هەمیشە لایەنی هیندۆسەکان دەگرن، زۆر عەجایەبە، وەك بڵێی بڕیاریان دابێ هەر لەگەڵ کافران دابن‌و، هەر پشتی ئەوانە بگرن کە دژی خوا ﷻو پێغەمبەری خوان ﷺ، دەی برادەر، تۆ بۆ گلەیی دوێنێ لە خەڵکی دەکەی! کە ئەمڕۆ بۆخۆت زۆر خراپتریش دەکەی!

بەڵام بەهەرحاڵ لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێویستە ڕەچاوی بەرژەوەندیی‌و هاوسەنگیی نێوان زیان‌و قازانج بکرێ، هەرچەندە هیچ شتێکیش بەبێ باج دان‌و زەرەر لەخۆگرتن نابێ، بەڵام دەبێ باج‌و زیانەکە ئەوەندە نەبێ، کە لە قازانجی زیاتربێ.

ئینجا یەكێك بۆی هەیە پرسیار بكات‌و بڵێ: باشە مادام مسوڵمانان ئەمڕۆ لەڕووی سیاسیی‌و واقیعییەوە یەك ئۆممەت نین، ئەدی ئەو ئایەتانە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ...﴿١٠٣﴾﴾ آل عمران، وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾﴾ الأنبياء، وە فەرموودەكەی پێغەمبەر كە دەفەرموێ: {مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى} رواه البخاري: (٦٠١١)، ومسلم: (٢٥٨٦) واللفظ له، عن النعمان بن بشير رضي الله عنه، وە ئەو فەرموودەیە كە دەفەرموێ: {الـمُسْلِمُونَ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ} رواه ابن ماجه: (٢٦٨٤) واللفظ له، وأحمد: (٦٧٩٧)، وقال الألباني وشعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره، چییان لێدێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر مسوڵمانان نەیانتوانی كەم‌و زۆر ئەم ئایەت‌و فەرموودانە لەڕووی واقیعیی‌و سیاسییەوە پیادەبكەن، بەلایەنی كەم لەڕووی فیكریی‌و عەقیدەیی‌و عاتیفیی‌و مەعنەوییەوە دەتوانن، دەتوانین هەموومان هەر دەست بە ئیسلامەوە بگرین‌و، هەر ئیسلام بە ڕاست بزانین، كە دیارە ئەمەش لای كەمی ئیمان‌و مسوڵمانەتییە.

كەواتە: كەم‌و زۆر هەر دەتوانین ڕاستێتی (مِصْدَاق)[1]ی چەمك‌و واتای ئەم ئایەت‌و فەرموودانە بێنینەدی، با بە نیوەیی بێ، با هێندێكی بێ، وە: (ما لا يُدْرَكُ كُلُّهُ لا يُتْرَكُ جُلُّهُ أَو بَعْضُهُ)، واتە: (ئەوەی هەمووی جێبەجێ ناكرێ، نابێ زۆربەشی یان هێندێكیشی واز لێبهێنرێ)، كە مەبەستم لەو بەشەی دەتوانین جێبەجێی بكەین، لایەنی فیكریی‌و عەقیدەیی‌یەو، ئەوەش كە لەم هەل‌و مەرجەدا نایتوانین، لایەنی سیاسییە.

---

١) شاهید لەسەر ڕاستیی شتێك یان ڕاستگۆیی كەسێك.

هــەروەها دەتــوانرێ چــەمك و واتــای هــەردوو فەرموودەكــەی پێغەمبــەر ﷺ بێنینەدی، بە دوعاو پاڕانەوەو لەڕێی ڕاگەیاندن و ئەو هەنگاوانەی پێمان دەكــرێن، هەروەها بە یەكدەست بوونمان لــە بەرانبــەر غــەیری خۆمانــدا، دەتــوانین لــە قــەدەر خۆمان ئەو چەمك واتایە بێنینەدی.

ئینجا بنچینەیەكی شەرعیی هەیە دەڵێ: (لا يَسْقُطُ الْمَيْسُورُ بِالْمَعْـسُورِ)، واتــە: (ئەوەی كە ئاسانە بەوەی كە بە زەحمەتــە لاناچــێ)، واتــە: شــتێك كــە بەشــێكی بــە زەحمەتەو بەشێكیشی ئاسانە، بەشە ئاسانەكەشت لەسەر لاناچــێ، لەبەرئــەوەی كــە بەشەكەی دیكەی بە زەحمەتە، چونكە ئەوەی كە بــە زەحمەتــەو بــۆت نــاكرێ، خــوا داوات لێناكا، بەڵام ئەوەی كە ئاسانەو بۆت دەكرێ، لەسەرت پێویستە.

كاتی خۆی دوای پشتگیریی كردنمان لە مسوڵمانانی غەززە ڕۆژنامەو بڵاوكــراوە زۆریان لەسەر من نووسی، گوتیــان: فــڵان كــەس دەڵــێ: ئەگــەر بۆمــان بگونجــێ پارەیان بۆ كۆدەكەینەوەو موجاهیدانیش دەنێرین، جا ئێــستاش دەڵــێم: ئەگــەر بــۆم بكرێ بۆخۆشم دەچم، بەڵێ ئەگەر مسوڵمانێك لەوپەڕی دنیاوە ستەمی لێبكرێ و، بزانم بە چوونی من ستەمەكەی لەســەر لادەچــێ، دەچــم، چــونكە ئــەوە بــەرگریی مسوڵمانانە لە یەكدی، جا ئێمە نابێ بەهۆی ئەوەوە كــە بۆمــان نــاكرێ واز لــەوەش بێنین كە بۆمان دەكرێ، زۆرجار ئەوەندەی بۆت دەكرێ ئەگەر كــردت، وردە وردە ئەوە زەمینە خۆشدەكات بۆئەوەی ئەویدیكەشت بۆ بكــرێ، ئــەوەی بــۆت دەكــرێ بیكە، ئەوە زەمینەت بۆ خۆشدەكات ئەویدیكەشت بۆ بكرێ. بەڵام تۆ بڵێی: یــان هەمووی یان هیچ، ئەوە لە ڕاستیدا شتێكی هەڵەیە، بــەڵكو شتێكیــشمان بــۆ بكــرێ هەر چاكە، لە شتێكی شتێك پەیدادەبێ، بەڵام لە هیچ هیچ پەیدانابێ.

# بنەمـای بیســتەم

## کۆمەڵی ئیسـلامیی پاراسـتن و کاملْکردنی

## قەوارەی سـیاسی هـەرێمی کوردسـتان و

## تێـدا پیادەکـردنی شـەریعـەت،

## بە ئەرکـی سـەرشـانی دەزانــێ.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# بنـەمـای بیسـتـەم

## كۆمـەڵی ئیـسلامیی پاراسـتن و كامڵـكردنی قـەوارەی سیاسـی هـەرێمی كوردسـتان و تێـدا پیادەكردنی شـەریعەت، بە ئەركی سەرشانی دەزانێ:

لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە مـافی ڕەوای هـەر گـەل (شَعْبْ)ێكـە لـە نیـشتمانی خۆیدا ئازادبێو لەژێر ركـێفی هیچ گەلێكی دیكـەدا نـەبێ، وە لەبەرئـەوەی كـە بـەبێ خاكـێكی ئـازادو گـەلو كۆمەڵگـایەكی سەربەسـتو رزگـار، ناگونجـێ ئـایینی خــوا ﷻ بــەرپابكرێو شــەریعەتەكەی پیــادەبكرێ، بۆیــە كۆمــەڵی ئیسلامیی هەم پارێزگاریی لێكردنی ئەم قـەوارەو واقیعـە سیاسـییەی هـەرێمی كوردسـتانو، هـەم كـامڵكردنیو نەهێـشتنی كەموكووڕییـەكانیو گـۆڕینی بـۆ قەوارەیـەكی سیاسـیی تۆكمـەو تـەواو لەسـەر بناغـەی شـەریعەت، بـە ئـەركی سەرشانی دەزانێ.

ئاشكراشـە كە لەسەر هـەقو دادگـەریی پـشتگیرییكردنی گـەلو كۆمەڵگـاو خزمەتكردنی، پێویستییەكی شەرعیی یەو هـیچ پەیوەندییـشی بـە دەمـارگیریی (تَعَـصُّبْ)ەوە نیـە، كـە بریتیـە لـە: سـەرخـستنو پـشتگیرییكردنی گـەلو كۆمەڵگا بە ناهەقو لەسەر بنچینەی ستەم، وەك:

١- خـوای كاربـەجێو زانـا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ

خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ الحجـرات، واتـە: (ئـەی خەڵکـینە! ئێمـە ئێوەمـان لـە نێـرو مێیەك وەدیهێناوەو گێڕاومانن بە چەندان گەل‌و تیرە تاکو پێك ئاشنابن، بێگومـان بـەڕێزترتان لای خـوا پارێزکارترتانـە، بەڕاسـتی خـوا زانـای شارەزایە).

٢- هەروەهـا خـوای پـەروەردگار ﷻ فەرموویـەتی: ﴿... لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ البـقرة، واتـە: (... نـە سـتەم بکـەن‌و نـە ستەمیـشتان لێبکرێ).

٣- وە لـە فـەرموودەی پێغەمبەریـشدا هـاتوە: {عَنْ عَبَّادِ بْنُ كَثِيرٍ الشَّامِيّ مِنْ أَهْلِ فِلَسْطِينَ عَنِ امْرَأَةٍ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهَا فَسِيلَةُ أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَمِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ؟ قَالَ: لا، وَلَكِنْ مِنْ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يَنْصُرَ الرَّجُلُ قَوْمَهُ عَلَى الظُّلْمِ} رواه أحمد: (١٧٠٣٠)، وقـال شـعيب الأرنـؤوط: حـديث حـسن، وضعفه الألبـاني، واتـە: (فەسـیله دەڵـێ: لـە بـاوکمم بیـست گـوتی: لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺم پرسـی و گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئایـا لـە دەمارگیـرییە کە مرۆڤ میللـەتی خۆی خۆشبوێ؟ پێغەمبـەری خواش لـە وەڵامـدا فـەرمووی: نـەخێر، بـەڵکو لـە دەمارگیـرییە کـە مرۆڤ خـەڵك‌و کۆمەڵەکەی لەسەر ستەم سەربخا).

## ڕوونكـردنەوە:

ئەم بنەمایە لە پێنج خاڵ دا ڕووندەكەینـەوە:

**یەكەم: مەسەلەی مافە نەتەوایەتییەكان كە لە ئێستادا بە زاراوەی: (مافی دیاریكردنی چارەنووس - حق تقرير المصير) تەعبیـری لێدەكرێ، لـە شەریعەتی ئیسلامییدا بە شتێكی ڕوونو بێ چەندوچوون دادەنرێ:**

وەك من لە كتێبـی: (سۆزی نەتەوایـەتیی و بـیری ناسیۆنالیزم لـە تـەرازووی ئیسلام دا) بەدرێژیی باسمكردووەو قسەم لـەبارەوە كـردوە لەبـەر ڕۆشـنایی ئایـەتی (١٣)ی سوورەتی (الحجرات)دا، لەوێدا باسمكردوە كـە چـۆن دانپێـداهێنانی مافـە نەتەوایەتییەكانو دابینكردنیان لە شەریعەتی ئیسلامییدا، بە مـافێكی ئاسـایی هـەموو میللەتان دادەندرێن، كە ئەوانە چـۆن لـە ئایـەتی (١٣)ی سـوورەتی (الحجـرات)دا دەفامرێنەوەو وەردەگیرێن؟ لەوێدا بە دوورو درێژیی باسمانكردوە.

چۆنیەتی فامرانەوەی مافە نەتەوایەتییەكانو مافی چارەنووسیش لەو ئایەتە بـەپێزە بەكورتیو گوشراویی بەم شێوەیە:

دیارە لەڕووی عەقڵو مەنتیقیشەوە هەر ئەوە شتێكی ئاساییە، چـونكە هـەبوونی قەوارەی سیاسیی شتێكی پێویستە بـۆ ڕێكخـستنی ژیـانی هـەر كۆمەڵگایـەك، ئـەو قەوارە سیاسـییەش ئەگـەر بـۆ گـەلێك ڕەوا بـێ بـۆ ئەویدیكـەش ڕەوایـە، چـونكە گەلەكان خوای پەروەردگار ﷻ هەموویانی وەك یەك گێڕاوە بە گەل، وەك بۆخـۆی دەفەرموێ: ﴿... وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ ...﴿١٣﴾﴾ الحجرات، واتە: چەندە خـوای پەروەردگار ﷻ عەرەبی كردوە بە عەرەب، هێندەش كـوردی كـردوە بـە كـوردو،

توركی كردوە بە توركو ... وە هەروەها باقی گەلانی دیكە، كەواتە: ئەگەر ڕەوابێ یەكێكیان قەوارەی سیاسیی هەبێ، بۆ ئەویدیكەشیان ڕەوایە هەیبێ، دیارە حاڵەتی ئاسایی لە ئیسلامدا ئەوەیە كە هەموو گەلان ئەوانەی كە دێنەژێر چەترو سێبەری ئیسلامەوە، لە یەك قەوارەی سیاسییدا خۆیان ببیننەوە، بەڵام دیسان ئەوكاتیش بە مافی یەكسان، واتە: بڕیار نیە كە هیچیان سەردەستە بێو ئەویدیكە ژێردەستە بێ، هەموویان وەك یەك هاوبەشیی سیاسییان دەبێ لە پێكهێنانی ئەو قەوارە ئیسلامییەدا كە چەترو سێبەرێك دەبێ بۆ هەموویان، وە لە دەوڵەتی ئیسلامییشدا ئەوەی كە ئێستا پێی دەڵێن: (فیدراڵیی) لەوە زیاتر بە گەلانێك دراوە كە لەژێر سایەو سێبەری دەوڵەتی ئیسلامییدا بوون، بەڵكو ئەوەی كە لە سیستەمی (ولایات)ی ئیسلامییدا هەبوە، زیاتر لە سیستەمی (كۆنفیدراڵی)یەوە نزیكە، چونكە زۆر لەو هەرێمانەی كە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بوونو بەپێی سیستەمی خیلافەتی ئیسلامیی بەڕێوەبراون لە زۆر شتدا سەربەخۆ بوون وەك دەوڵەتێكی سەربەخۆ.

كەواتە: ئێمە لە شەریعەتی ئیسلامییدا هیچ كێشەمان لەگەڵ ئەوەدا نیە، بەڵكو حاڵەتی ئاسایی ئەوەیە كە میللەتانو گەلان هەموویان وەك یەك بن لەڕووی مافە نەتەوایەتییەكانو لەڕووی مافی سیاسییەوە، جا چ لە قەوارەیەكی سیاسییدا خۆ ببیننەوە، بەپێی سیستەمی هەرێمەكان (نِظامُ الوِلایات)، چ هەركامێكیان قەوارەو دەوڵەتێكی سەربەخۆی خۆی هەبێ.

**دووەم: ئەوە كە گوتوومانە: بەبێ خاكێكی ئازادو خەڵكێكی ڕزگارو سەربەستو سەربەخۆ، ناگونجێ ئایینی خوا ﷻ بەتەواویی بەرپابكرێو شەریعەت وەك خۆی پیادە بكرێ، شتێكی بەئاشكرا**

## زانراوی عەقڵیی‌و واقیعییەو هیچ پێویستیی بە بەڵگەی نەقڵیی ناكا:

ناشڵێم بەڵگەی شەرعیی، بەڵكو دەڵێم بەڵگەی نەقڵیی، چونكە شەریعەت هەم لە عەقڵ وەردەگیرێ‌و هەم لە نەقڵ، وە پێم وایە نەقڵ‌و عەقڵ مادام ڕاست‌و ساغ بن، هەردووكیان بەڵگەی شەرعیین، نەك تەنیا نەقڵ، ئەگەر تەماشای شەریعەت بكەین، بەشێك لە بەڵگەكانی دەگەڕێنەوە بۆ عەقڵ، بۆ نموونە: (قیاس) كە باشترین بەڵگەیە لەوبارەوە ـ وە قیاس لەڕاستیدا پڕۆسەیەكی عەقڵییە ـ، هەروەها ئەوەی كە پێی دەگوترێ: بەرژەوەندییە ڕەهایەكان (المصالح المرسلة)، یان ئەوەی كە پێی دەگوترێ داب‌و نەریت (العُرْف).

ئەگەر تەماشای بەڵگە شەرعییەكان بكەین، یان ئەو سەرچاوانەی كە بەڵگەی شەرعییان لێ وەردەگیرێ، دەبینین بەشێكیان پەیوەستن بە عەقڵەوە، وە هیچ كاتێكیش نەقڵی صەحیح لەگەڵ عەقڵی سەلیم‌و ساغ تێكناگیرێن، بەڵكو هەمیشە پشتگیری یەكن.

جا ئەم مەسەلەیە پێویستی بە بەڵگەی نەقڵیی ناكا، ئێمە بێین لە قورئان‌و سوننەت بەڵگە بێنینەوە، كە ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە كە دەبێ خاكێكی ئازادمان هەبێ‌و خەڵكێكی ڕزگارمان هەبێ، بۆئەوەی كە دین بەرپابكەین‌و شەریعەت پیادەبكەین، بۆچی؟ چونكە هەر عەقڵ‌و سەرنجدان لە واقیع، دەمانگەیەنێتە ئەوە كە بەڕاستی هەر میللەتێك‌و كۆمەڵگایەك خاوەنی بوونی خۆی‌و ئیرادەی خۆی‌و سەر زەمینی ئازادی خۆی نەبێ، ناتوانێ وەك پێویست دینی خوای پەروەردگار ﷻ بەرپا بكات، كە دیارە ئێمە مولزەمین بە بەرپاكردنی دین، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿... أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا

فِيهِ ...﴿١٣﴾ الشورى، واته: (... كه ئایینی خوا بەرپابكەن‌و تێیدا پەرتەوازە مەبن ...)، وە ناشتوانیٚ شەریعەت پیادەبكا، كه دیارە دیسان به پیادەكردنی شەریعەتیش مولزەمین، مادام خۆمان به مسوڵمان دەزانین، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ثُمَّ جَعَلۡنَـٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ فَٱتَّبِعۡهَا ...﴿١٨﴾﴾ الجاثية، واته: (ـئەی پێغەمبەر!ـ پاشان تۆمان داناوە لەسەر شەریعەتێك، دەجا شوێنی بكەوە ...).

هەربۆیەش خوای كاربەجیٚ ﷻ هەتا مسوڵمانان پێگەو قەوارەی سەربەخۆی خۆیان پەیدانەبوو، یاساكانی شەریعەتی بۆ نەناردنە خوار، واته ئەو یاسایانەی كه ژیانی ئابووریی‌و سیاسیی‌و كۆمەڵایەتییان ڕێكدەخەن.

هەر شتێكیش ئێمە به عەقڵی سەلیم‌و به ئەزموونی واقیعیی پێیگەیشتین، كه ئەو شتە دەبیٚ وابیٚ، ئەوە پەكمان لەسەر بەڵگەی نەقڵیی (ئایەت‌و فەرموودە) نەكەوتوە، بۆ وێنە: هەموو ئەو هەڵسوكەوتانەی ئێمە دەیانكەین، تۆ هەموو جارێك پێویستیت بەوە نیە بگەڕێیەوە داخۆ لە قورئاندا بەڵگەیان چییە؟ یاخود لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺدا بەڵگەیان چییە؟ مادام عەقڵی سەلیم دەلالەتیان لەسەردەكات، وە بەزۆرییش وایە ئەو شتانەی كه به عەقڵ دەزانرێن، نەقڵ (وحي) باسی نەكردوون‌و خەڵكی حەوالەی عەقڵ كردوە، بۆ نموونە: دروستكردنی خانووبەرە، دروستكردنی ئەو كەلوپەلانەی كه ژیانی دنیامان پێویستیی پێیانە، ڕێكخستنی ژیانی سیاسیی‌و ئابووریی‌و كۆمەڵایەتییمان، تەماشادەكەین شەریعەت به بۆشایی هێشتوویەتەوەو بۆ عەقڵ‌و ئەزموونی لێگەڕاوە، چونكە ئەوە لە مەودای عەقڵدایە.

كەواتە: پێویستییمان به بەڵگەی نەقڵیی ناكا، بۆ سەلماندنی ئەوە كه: ئێمە دەبیٚ قەوارەیەكی سیاسییمان هەبیٚ، سەر زەمینێكمان هەبیٚ، خەڵكێكی ئازادو ڕزگارمان هەبیٚ، ئینجا دەتوانین وەك پێویست دینداریی بكەین‌و ئیسلام بەڕێوەبەرین.

بەڵام وێڕای ئەوەش ئەگەر تەماشای سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بكەین لەوبارەوە، دیسان زۆر بە ڕۆشنیی ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كە بەڕاستی بەبێ هەبوونی سەرزەمینێكی ئازادو بەبێ هەبوونی خەڵكێكی ڕزگار، ناگونجێ وەك پێویست ئیسلام پیادەبكرێو بەرپابكرێ.

ئێمە دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا لە مەككە بووە، كە مسوڵمانان لە مەككە نە خاوەنی سەرزەمینی خۆیان بوون و، نە خاوەنی ئازادییو سەربەستییش بوون، بەڵكو لەژێر دەستی غەیری خۆیاندا بوون، كە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانی مەككە بوون، لەوێ خوا ﷻ بێجگە لەو بەشەی دینداریی كە پەكی لەسەر سەرزەمینی ئازادو خەڵكێكی ڕزگار نەكەوتوە، هیچیدیكەی بۆ مسوڵمانان نەناردوە، باسی ئیمانو عەقیدە بە هەرسێ ڕەهەندی سەرەكی: خوا بەیەكگرتنو، بڕوا بە پێغەمبەرایەتییو وەحی، وە بڕوا بە دوارۆژ (بەهەشتو دۆزەخو سزاو پاداشتی خوا ﷻ)، ئێمە تەماشادەكەین قورئانی مەككی بە زۆری لەو سێ تەوەرەیەدا دەسووڕێتەوە، بۆچی؟ چونكە هەڵگرتنی ئیمانو عەقیدە پەكی لەسەر ئەوە نەكەوتوە، كە ئینسان قەوارەی سیاسیی هەبێ و، خاكێكی ئازادی هەبێو خاوەنی ئیرادەی خۆی بێو خاوەنی دەسەڵات بێ، ئینسان لە زیندانێكیشدا هەر دەتوانێ خاوەنی ئیمانو عەقیدەی خۆی بێ و، هەڵگری بیروبڕوای ئیسلامیی بێ، بەڵام ئایا شەریعەت لە مەككەدا هاتۆتەخوارەوە؟ شەریعەت بەو مانایەی ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامەو، وا بكەنو وا مەكەنو، ئەگەر كەسێك وای كرد وا سزای بدەن، نەخێر، بەڵكو تەنانەت پێنج نوێژە فەرزەكانیش لە ئاخرو ئۆخری قۆناغی مەككیدا هاتوونەخوارو، لە شەوی میعراجدا فەرزكراون، ئینجا مەسەلەی ڕۆژوو لە ساڵی دووەمی كۆچیدا بووە، هەروەها جەنگو جیهاد، دیارە لە دوای ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ كۆمەڵگای ئیسلامیی یەكەم بنیاتدەنێ، فەرزدەكرێ، ئینجا

مەسەلەی زەكاتو، دوایی حەجو، ئینجا قەدەغەكردنی سوود خۆریی‌و سزایەكانی زیناو دزیی‌و قەتڵو ئەوانە هەمووی لە كوێ فەرزبوون؟ دیارە لە مەدینە، بۆچی؟ چونكە لە مەدینەدا مسوڵمانان بوونە خاوەنی سەر زەمینێكی ئازاد و، بوونە خاوەنی ئیرادەو قەوارەی سەربەخۆی خۆیان، وە دەستیان كراوەبوو بۆ جێبەجێكردنی ئەو یاسایانەی كە خوای پەروەردگار ﷻ لەسەری پێویست دەكردن، بەڵام لە مەككە دەست بەستراوبوون، دیارە خواش ﷻ كاربەجێیەو هیچ داوایەك لە هیچ كەسێك ناكاتو، هیچ ئەركێك ناخاتەسەر هیچ كەسێك كە لە توانایدا نەبێ.

**سێیەم: كەواتە: كۆمەڵی ئیسلامیی بە دوو پاڵنەری بەهێزی شەرعیی بە ئەركی سەرشانی خۆی دەزانێ، پارێزگاریی لە واقیعی سیاسیی هەرێمی كوردستانو ئەزموونەكەی بكاتو بەتەنگییەوەبێ:**

ئەو دوو پاڵنەرەش ئەمانەن:

١/ خەڵكی كوردستان بەگشتی‌و گەلی كورد بەتایبەت مافی خۆیەتی خاوەنی قەوارەی خۆی‌و ئیدارەو ئیرادەی خۆی بێ.

٢/ بەبێ هەبوونی ئەو قەوارەیە ناگونجێ وەك پێویست دینداریی بكاتو شەریعەت پیادەبكا.

بەو دوو پاڵنەرە ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی خۆمان بە مولزەم دەزانین كە بەتەنگ ئەم واقیعە سیاسییەی خۆمانەوە بین، بەو شێوەیە كە باسمانكردو، لە خاڵی چوارەمیشدا زیاتر ئەوە ڕووندەكەینەوەو تیشكی دەخەینەسەر.

**چوارەم: بەڵام بێگومان شەرعیی نیەو ناگونجێ کۆمەڵی ئیسلامیی لە کەم و کوڕیی و ناتەواوییەکانی واقیعی هەرێمی کوردستان و عیراقیش رابمێنێ و هەوڵی پاکسازیی و چاکسازیی یان نەدا:**

دیارە پاکسازیی و چاکسازیی ریشەیی و راستەقینەش تەنیا کاتێك ئەنجامدەدرێ و سەر

دەگرێ و بەر دەگرێ، کە ئەم واقیعە سیاسییە بهێنرێتە سەر بناغەی شەریعەت، کە دیارە هەر ئەوەش حاڵەتێکی ئاسایی و شەرعییە، بۆ گەل و کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾ النور، واتە: (بێگومان قسەی بڕواداران هەر ئەوەیە کاتێك کە بانگ بکرێن بۆ لای خواو بۆ لای پێغەمبەرەکەی بۆئەوەی حوکم و دادوەرییان لەنێواندا بکەن[1]، قسەو هەڵوێستیان هەر ئەوەیە کە بڵێن: فەرمانەکەمان بیست و تێگەیشتین، وە بەقسەشی دەکەین و گوێڕایەڵیشین، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن)، واتە: مسوڵمانان لە بەرانبەر شەریعەتدا هیچ هەڵوێستێکیان بۆ رەوا نیە ئەوە نەبێ، کە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین.

ئینجا دیارە ئێستا لە واقیعی هەرێمی کوردستانیشدا بەرهەمی پەراوێزخستنی ئایینمان دەبینین و، زۆر جوان بۆمان دەرکەوتوە کە لە کاتێکدا یاسا حەکیمەکانی ئایینی راست و تەواوو نەشێوێنراو (ئیسلام)و بەها بەرزەکانی لە بواری حوکم و سیاسەت دووردەخرێنەوە، کۆمەڵگا چ زیانێکی گەورە دەکات و چۆن وڵات پڕدەبێ

---

١) کە دادوەریی کردن بەپێی شەریعەت بەشێکە لە شەریعەت، نەك هەموو شەریعەت.

لــە دزیــیو گەنــدەڵییو ســتەمو خراپــەو قــۆرخكردنی ئیمتیــازاتو زاڵكردنــی بەرژەوەندیی تاكییو بنەماڵەیی ... هتد، ئەوە دیارە ئەگەر تەماشای واقیعی هەرێمی كوردستان بكەین، دەبینین زۆر كەس زاڵەیەتی لەم واقیعە، كـە لـە ئـەنجامی چـییدا وایلێهاتوە؟ لەڕاستیدا لە ئەنجامی تەبەننیی كردنی عەلـمانییەت (سیكۆلاریزم)دا، وە لە ئـەنجامی ئـەوەدا كـە شـەریعەتی ئیـسلام هەیمەنـەو سـێبەری نیـە بەسـەر واقیعـە سیاسییەكەوە، بۆیە واقیعە سیاسییەكە وەك دارستانی لێهاتوە، كە لە دارستاندا: (چ ئاژەڵێك دڕندەتر بێ ئەویدیكە دەخوا)، یان یاسای دەریا كە (ماسـی گـەورە ماسـی بچووك قووتدەدا)، كەسانێك هەن كە نەك ملیـۆنێر، بـوون بـە ملیـاردێرو زۆریـان لەسەرەوە ڕژاوە، خەڵكیدیكەش هەن كە سواڵیان پێدەشێو بۆ سـەرەتاییترین شـت ئاتاجن، لە حاڵێكدا كە ئێمـە كـاتی خـۆی لـەو شـاخو داخـە بـووین، هـەموومان تاڕاددەیەك وەك یەك بووین، بەڵام ئێستا دەبینین كابرا یەك گاڕان ئۆتۆمبیلی هەیە و، چەندان كۆشكی هەنو پارەو سامانی زۆری لە دەرەوە داناوە و، چەندان بازرگـانیی گەورە گەورە دەكاتو كۆمپانیای زەبەلاحی هەن، باشە برادەر تۆ كوێڕا وات لێهات هەموو سەعاتێك دەفتەرێك دۆلارت دەستبكەوێو، ڕەنگە زیاتریش پەیدابكـەی؟! ئەو جۆرە كەسابەتەمان نەزانیوە! جا بۆیە لە ڕاستیدا كە ئیـسلام هـەژموونی بەسـەر بوارەكانی ژیاندا نامێنـێو، بـەها بـەرزەكانی دیـن هـەژموونیان نامێنـێ، ئـاوا وەك دارستان دنیا تەختو ئاچووخ دەبێ، بۆ كەسـانێك كـە كەڵبـەو نینۆكیـان تیـژترە، بكەونە گیانی خەڵكیدیكەو لەسەر حیسابی خەڵكیدیكە، ئاوا بەبێ ڕەزایی دەوڵەمەند بن، هەڵبەتە ئیسلام هیچ حەساسیەتی نیە بە دەوڵەمەند بوونو ساماندارییی، مادام لە ڕێیەكی حەڵاڵو دروسـتەوە بـێ، بـەڵام وەڵڵاهـی زۆر دوورە كـابرا لـە ماوەیـەكی كورتدا هێندە دەوڵەمەند بێ، هەموو سەعاتێك دەفتەرێكی بەربكەوێ، خانووەكەی بایی چەند ملیۆن دۆلار بێ و، كۆمپانیای هەبێو بازرگانی وای هەبێ كە بە حیسابی خۆی نەزانێ، هەرگیز لەڕێی حەڵاڵەوە، ئاوا بەخێرایی خەڵك دەوڵەمەند نابێ!

بۆیە پێم وایە ئێستا ناگونجێ بە پاساوی چاوبەستانەی وەك: (تێكەڵ نەكردنی ئاینو سیاسەت) یاخود (ئیسلام شتێكی پاكەو سیاسەت پیسو پۆخەڵیی زۆری تێدایە، بۆیە نابێ ئەو دووانە تێكەڵ بكرێن، یان توخنی یەك بكەون)! چیدی خەڵكو جەماوەر فریو بخواتو كڵاوی لەسەر بنرێ.

وە بەڕاستی ئێستا ئێمە بێ بنەمایيو پووچیی ئەو قسانەمان چاك بۆ دەركەوتوە، وە بۆمان دەركەوتوە كە ئەو قسانە ئێستا كەسانێك دەیانكەن، كە دەیانەوێ بە پیسو پۆخەڵیی خۆیان حوكمڕانیی بكەنو، ئەم بارودۆخە سیاسییە بۆ سوودی شەخسییو بنەماڵەییو حیزبییو تایبەتی خۆیان بقۆزنەوە و، دەشزانن ئەگەر ئیسلام دەسەڵاتی هەبێ یەكێك لە یاساكانی ئیسلام ئەوەیە، كە دەڵێ: (من أين لك هذا)؟ واتە: (ئەوەت لەكوێ بوو)؟

عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێ هەموو ساڵێك لەكاتی حەجدا والییەكانی كۆدەكردەوەو لێی دەپرسینەوە كە پێشتر چەندی هەبووەو ئێستا چەندی پەیدابووە؟ وە دەیگوت: ئەمەت لەكوێ بووو چۆنت پەیداكرد؟ (إبن خلدون) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە كتێبی (المقدمة)ی خۆیدا قسەیەكی جوان دەكات، دەڵێ: (أن التجارة من السلطان مضرة بالرعايا مفسدة للجباية)[1]، واتە: (بازرگانی كردن لەلایەن حوكمڕانەوە زیان بە هاوڵاتیان دەگەیەنێو باجو خەراج لە بن دێنێ). چونكە بە حوكمی ئەو حوكمڕانییو دەسەڵاتە سیاسییەی كە هەیەتی هەموو بازاڕ بۆ خۆی قۆرخ دەكاتو هەموو كایەكانی ژیان، كە بازرگانییو مامەڵەیان تێدا دەكرێ، بۆ خۆی قۆرخ دەكات، وەك ئێستا وایلێهاتوە، جڵەوبەدەستی دوو حیزبی حاكمی دەسەڵاتدار، لەبەرئەوەی كە بازرگانیی دەكەن، دەبینن دنیا چی لێهاتوە؟

---

١) مقدمة إبن خلدون، ص: (٢٢٢).

كەواتە: ئێستا ئێمە زۆر جوان بۆمان دەركەوتوە كە لەڕاستیدا ئـەم واقیعـەو هـەر واقیعێكـی دیكـەی سیاسـیی زۆر پێویـستی بـەوە هەیـە، كـە ئیـسلامی تێـدا دەسەڵاتداربێ‌و ئیسلام سێبەری لێبكا، وە لەڕاستیدا هەبوونی هـەژموون (هَيْمَنَـة)و سـێبەری ئیـسلام لـە بـواری حـوكمڕانیی‌و سیاسـەتدا، دەبێتـەهۆی چەسـپانی دادگەریی‌و، نەمانی ستەم‌و زۆرداریی‌و گەندەڵیی‌و، بـە قـازانجی زۆرینـەی خـەڵك تەواودەبێ، بەڵێ كەمینەیـەك كـە دەیانـەوێ لەسـەر حیـسابی خـەڵك دەوڵەمەنـدبن زەرەردەكەن، بەڵام زۆرینەی خەڵك‌و جەماوەر قازانج دەكەن.

وە بۆ زانیاریتـان ئـەو قـسانەی دژی ئیـسلام‌و سیـستمی حـوكمڕانیی ئیـسلام‌و دەسـەڵاتی ئیـسلامیی دەكـرێن، بـەڵێ جـاری وایـە خـەڵكی هـەژارو جـەماوەری ڕەشوڕووتیشی پێ چەواشەدەكرێ، بەڵام ئەگەر لێی بكۆڵیەوە هـەمووی دەچـێتەوە سەر ئەو كەمینەیەی كە بەهرەمەندن لەوەی كە ئیسلام دەسەڵات‌و هەژموونی نیـە و، شەریعەت سێبەری نیە، ئەوانەی بەهرەمەندن لەم بارودۆخە، كوردەواریی خۆشمان جوانیان گوتوە، كە دەڵێن: (دز بازاڕی ئـاڵۆزی دەوێ)، هەروەها دەڵێن: (ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێـڵدا ڕاوی ماسی دەكات).

ئینجا ئەو قسەی كە دەكرێت: (جیاكردنـەوەی دیـن‌و سیاسـەت لـە یەكـدی)، ڕاست نیەو چەندان هەڵەو چەواشەكاریی گرتۆتە خۆ:

١) ئەمە ڕێك‌و ڕاست قیاس كردنی ئیسلامە لەسەر نەسڕانییەت‌و، قیـاس كردنـی وڵاتی مسوڵمانانە لەسەر ڕۆژئاوا، كـە لەڕاسـتییدا ئیـسلام‌و نەسـڕانییەت زۆر لێك جیـان، جـارێ ئیـسلام وەحـی‌و دینـی ڕاسـت‌و دروسـت‌و دەسـتكاریی نەكراوی خوای پەروەردگارە ﷻ و، خاوەنی كتێبێكە كە تاكە كتێبی پارێزراوی خوایە ﷻ كە قوڕئانـەو لـە دەسـتكاریی كـران پـارێزراوەو، كتێبـەكانی دیكـە هەموویان گۆڕدراون، بـەڵام نەسـڕانییەت شـێوێنراوە، وە ئیـسلام شـەریعەتی

تێدایە، بەڵام نەسڕانییەت هەر چوار ئینجیلەكانی شەریعەتیان تێدانیە، هەر هێندێك ئامۆژگاریی رۆحیی و ئەخلاقییە.

٢) وە دوایی ئەو قسەیەش كە دەگوترێ: (سیاسەت و حوكم پیس و پۆخەڵەو ئیسلام پاكە)، دەڵێین: ئەوەش وا نیە، چونكە سیاسەت و حوكمڕانیی واتە سەرپەرشتی كردنی كاروباری خەڵك و ئیدارەكردنی خەڵك، سیاسەت واتە: هونەری بەڕێوەبردن (فن الإدارة)، واتە: بەڕێوەبردنی كاروباری خەڵك و مشوورخواردن لە خەڵك، جا ئەوە بۆچی پیس و پۆخەڵە؟ بەڵێ راستە، سیاسەتێك كە دووربێ لە ئیمان و ئیسلام و، چەواشەكاریی تێدابێ و، دووربێ لە ئەدەب و ئەخلاق و بەها بەرزەكانی ئیسلامەتیی، بێگومان پیس و پۆخەڵ دەبێ، بەڵام نەك هەموو سیاسەتێك و، ئەم قسەیە مەرج نیە هەمیشە وابێ و بۆ هەموو سیاسەتێك راست بێ، دیارە هەر كەسەش لە هەمبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ!

**پێنجەم: دەبێ هەمیشە ئاگاداری ئەوەبین كە بەهۆی بە هەڵە بەكارهێنانی هەق و راستییەكەوە، یان زێدەڕۆیی تێداكردنییەوە، ئەو هەق و راستییەمان لەبەرچاو نەكەوێ:**

واتە: كە دەبینین هەقێك هەیە بە هەڵە بەكاردەهێنرێ، یان زێدەڕۆیی تێدادەكرێ، خودی هەقەكەمان لەبەرچاو نەكەوێ، بەڵكو بە هەڵە بەكارهێنانەكەی و زێدەڕۆیی تێداكردنەكەی مەحكووم بكەین.

لێرەدا مەبەستم مەسەلەی نەتەوایەتیی و مافە نیشتمانیی و نەتەوایەتییەكانە، كە ئێمە وەك كورد دەبینین لەلایەن گەلە دراوسێكانمانەوە: تورك و فارس و عەرەب، لە

رابردوودا و، هێندێكیان تا ئێستاش، بـە دەمارگیرانـە مامەڵـەمان لەگەڵـدا كـراوە، واتە: ئەوانە مومارەسەی مافە نەتەوایەتییەكانی خۆیانیان كردوە، بەڵام بە تێپەڕاندنو زێدەڕۆیی تێداكردنو هەڵەوە، وە لەسەر حیسابی مافـە نەتەوایەتییـەكانی ئێمـە وەك میللەتی كورد، كە تا ئێستاش ئەوە لە توركیاو سووریا بە تۆخیی هەر هەیـە، وە لـە ئێران تا رادەیەك هەیە، بەس لێرە (لە عیـراق) تۆزێك دەربازمان بـووە، بـەڵام وەك پێویست لێمان ناسەلمێنن، جا ئێمە دەبێ وریابین كاتێك میللەتێك بـە هەڵـەو لەسـەر حیـسابی نەتەوەیـەكی دیكـە، مومارەسـەی ئـەو مافـە (مـافی نەتـەوەیی‌و مـافی چارەنووسیی خۆ هەبوون) دەكات، یـان زێـدەڕۆیی تێـدا دەكـاتو زیـاتر بـۆ لای میللەتی خۆی تێدەنووسێ، نابێ بڵێین ئەوە لە بنەڕەتدا هەڵەیە، نا، ئەو ئەندازەیـەی كە زێدەڕۆیی تێدادەكرێ هەڵەیە، ئینجا ئەوە بەنسبەت ئێمەی كوردیشەوە هەروایە، ئێمەی كوردیش لەو شوێنانەی كە دەسەلاتمان هـەبووە، وەك: موسـڵو كـەركووك مومارەسەی سیاسەتێكی هەڵە كراوە، كە دوایی زەرەرمـان لـێكردوە، بـەڵام نابـێ ئەمە بكەینە بەڵگە لەسەر ئەوە كە ئەسڵی هەبوونی مافی نەتەوایەتی‌و ئەوە كە میللەتان خاوەنی قەوارەی سیاسیی خۆیان بن، شتێكی لە بنەڕەتدا ناشەرعیی‌و هەڵەیە، ئێمـە دەبێ هەقەكان وەك خۆیان بسـەلـمێنینو، ئـەو بـە ناهـەق بـەكارهێنانو زێـدەڕۆیی تێداكرانەی كە هەیـە، ئەوەی لـێ لابەرین.

دیارە لە ئیسـلامیشـدا تەنیا خوا ﷻ بە بەرزو پیرۆز گیراوو پەرستراوو بەندایەتیی بۆ كراوەو، نابێ هیچ شتێكی دیكە ببرێتە ئەو ئاستەوە، ئەگەرنا شـیركو كـوفرو لـە بازنەی ئیسلام چوونەدەر، پەیدادەبێ.

فەرمایشتەكانی پێغەمبەریش ﷺ نوختەیان خستۆتەسەر پیت لەوبارەوە، وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوە كە: {عَنْ عَبَّـادِ بْنُ كَـثِيـرٍ الـشَّـامِيّ مِـنْ

أَهْلِ فِلَسْطِينَ عَنِ امْرَأَةٍ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهَا فَسِيلَةُ[1] أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَمِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ[2]؟ قَالَ: لا، وَلَكِنْ مِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يَنْصُرَ الرَّجُلُ قَوْمَهُ عَلَى الظُّلْمِ}. رواه أحمد: (١٦٩٨٩) (١٧١١٤)، والبيهقي: ٧٦٧٥، وقال الألباني: ضعيف، وقال شعيب الأرنؤوط: حسن. كەواتە: دەمارگیریی، یارمەتی گەلی خۆ دانە لەسەر ستەمو، ئەوەیە كە مەڕفوزە، بەڵام ئەگەر میللەتی خۆت خۆشبوێ لەسەر هەقو بەرگریی لێبكەیو پشتگیریی بكەی، بۆئەوەی مافەكانی دەستبكەوێ، ئەوە هیچ شتێكی خراپت نەكردوە، بەڵكو ئەركێكی شەرعییت جێبەجێكردوە كە بەرگرییت كردوە، لە خەڵكێكی ستەملێكراو.

دیارە لەپێش ئەویش خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة، واتە: با نە هەقی خەڵكی بە لای ئێوەدا بێ، نە هەقی ئێوە بچێتەلای خەڵكی، هەڵبەتە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ، بنچینەیەكی گشتیی وردی بۆ دادگەریی داناوەو، هیچ گومانیشی تێدانیە كە دەمارگیریی و ڕەگەزپەرستیی، حەتمەن لەسەر حیسابی خەڵكی دیكە دەبێو ناگونجێ ستەمكار هەبێ، بەبێ ستەملێكراو! وە لەڕاستیدا هەر كاتێك ستەمكارێك پەیدادەبێ، ئەوە لەسەر حیسابی هەبوونی ستەملێكراوێكە، دەڵێن: (لە هەر شوێنێك چیای زۆر بەرزت بینی، شیوی زۆر قووڵیش دەبینی)، لە هەر شوێنێك پڕیی و لەسەرەوە ڕژان هەبوو، قڕیی و لەبەر بڕانیش هەیە، ئینجا ئەوە چ لە ڕووی

---

١) قَالَ أَبُو مُوسَى (وَهُوَ مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى): فَسِيلَةُ هَذِهِ يُقَالُ إِنَّهَا بِنْتُ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ، وَقَالَ أَبُو عَبْد الرَّحْمَنِ سَمِعْتُ مَنْ يَذْكُرُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ أَبَاهَا (يَعْنِي فَسِيلَةَ) وَاثِلَةُ بْنُ الْأَسْقَعِ.

٢) بێگومان وشەی (قوم) مانای (نەتەوە)و (كۆمەڵگا)و (تیرەو هۆز)و (حیزب)یش دەگەیەنێ.

سیاسییەوە بێ، چ لە ڕووی نەتەوەییەوە بێ، چ لە ڕووی ئابوورییەوە بێ، هەروایە.

ئینساف و دادگەریی و یەکسانیی ئەوەیە، کە نە کەس هەقی کەسی بۆ بێ و، نە هەقی بۆ لای کەس بچێ، ئیسلام ئاوای دەوێ.

دیارە ئێمەش وەك میللەتی کورد بەڕاستی زەرەری زۆرترمان کردوە لە زۆربەی گەلانی دنیا و، لە هەموویان زیاتر باجی هەبوونی دەمارگیریی نەتەوەییمان داوە، واتە: ئەو دەمارگیرییەی کە گەلە دراوسێیەکانی دەوروبەرمان مامەڵەیان پێ لەگەڵ کورددا کردوە، هەرچەندە هەرکەسێك بەر لە دەمارگیرانی نێو گەلانی عەرەب و تورك و فارس، گلەیی لە زلهێزەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کۆن و نوێ نەکات کە: (سایکس پیکۆ)یان ئیمزاکردو ئێستاش پێیەوە پابەندن، ئەوە بە بێ ئینسافی دەبینین و وەك ئەوە وایە: درێشە ببینێ (کە گەلە دراوسێکان لێماندەدەن) بەڵام ئەو دەستەی درێشەکە دەوەشێنێ نەیبینێ (ئەو زلهێزانەی کوردستانیان دابەشکرد)!

ئێستا زۆر لە حیزبە عەلمانییەکان هەر دێن گلەیی دەکەن لە فارس و تورك و عەرەب کە ئێمەیان چەوساندۆتەوە، بەڵام هێندە ڕووکەش (سطحي) و سەرکێڵن، گلەیی ناکەن لەو زلهێزانەی کاتی خۆی کوردستانیان دابەشکردوەو بەشێکیان لکاندوە بە ئێرانەوەو، بەشێك بە تورکیاو، بەشێك بە عیراق و، بەشێك بە سوریاو، بەشێکیش بە یەکێتی سۆڤیەتی پێشووەوە، گلەیی لەوان ناکەن، کە لە حاڵێکدا ئەگەر ئەو گەلە دراوسێیانە درێشەکەبن، ئەوان دەستەکەن، چونکە ئێمە کاتێك ئەو ستەمە نەتەوایەتییەمان هاتەسەر، کە وڵاتەکەمان دابەشکراو دابڕدابڕ کرا، دوای پەیمانی (سایکس پیکۆ)، کە لە ساڵی (١٩١٦) لەنێوان بەریتانیاو فەڕەنساو ڕووسیاداو، پاشانیش بە پشتگیریی ئەمریکا، ئیمزاکرا، بۆ دابەشینی

نیشتمانی ئیسلامیی بەسەر ئەو زلهێزانەدا، لەنێویشیدا نیشتمانی کورد، لـەو کاتـەوە ئێمە بە ڕەسمیی تووشی چەوسێنرانەوە بووین‌و بە ڕەسمیی کوردسـتان دابەشـکرا، ئەدی باشە بۆچی گلەیی لەوان ناکەن برادەرینە؟ بۆچی گلەییەك لەو زلهێزە کافرانە: ئەمریکا، بەریتانیـا، فەڕەنساو ڕووسـیا ناکـەن؟ هـەر دێـن چـەپەڵۆکی خۆتـان بـە عەرەب‌و تورك‌و فارس دادەدەن، کە ئەوانیش کاتی خۆی وەك ئەم گەلی کوردە هەر لە ستەملێکراوەکان بوون، لە دەوڵەتێکی عوسمانیی گەورەو زەبـەلاح، دەوڵـەتێکی گـچکەیـان بـۆ تورکیـا هێـشـتەوە، وەك دەڵـێن: (کردیانـە تـەیرێکی مـەعقووڵ)، فارسـیش هـەرواو، عـەرەبیش تەماشـادەکەین بیـست‌و دوو دەوڵەتۆکـەیان بـۆ دروستکردن، بۆ ئەوەی وەك چۆن دەڵێن: کەسێك کە نـان دەخـوا پـاروو پـارووی دەکات، بۆئەوەی چاکی بۆ قووت بچێ، کەواتە: ئەوانیش لە ڕاستیدا هەر بێـچارە بوون، بەڵێ ئەوان گلەییان لێدەکرێ لەوەدا کە برایەتیی لەگەڵ ئێمەدا ناکـەن، بـەڵام گلەییە بنەڕەتییەکە دەبێ لەو زلهێزانە بکرێ کە کوردستانیان بە شـێوەیەکی ڕەسمیـی دابەشیوەو کردوویانەتە پارچە پارچـەو، هەر پارچەیەکیان لکاندوە بە وڵاتێکەوەو، هەر کەسە دەبێ بە قەدەر خۆی گلەیی لێبکرێ.

# بنەمـای بیسـت و یەکـەم

## کۆمـەڵی ئیسلامیی هەڵوێسـتی ئیجـابییـە لەگەڵ بەرانبـەرەکانیـدا چ لەنێو هەرێـم و عیـڕاق و چ دەرەوەشـدا، مەگـەر ئەوان هەڵوێسـتیان خـراپ بێ.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# بنەمای بیست و یەكەم

## كۆمەڵی ئیسلامیی هەڵوێستی ئیجابییە لەگەڵ بەرانبەرەكانیدا چ لەنێو هەرێم و عێراق و چ دەرەوەشدا، مەگەر ئەوان هەڵوێستیان خراپ بێ:

كۆمەڵی ئیسلامیی هەڵوێستی خۆی لە بواری هەڵسوكەوت (تعامل) لەگەڵ لایەنە سیاسییەكانی كوردستانو عێراقو حكوومەتو دەوڵەتانی دەوروبەرو جیهاندا، بەگوێرەی هەڵوێستی ئەوان بەرانبەر بە ئیسلامو مسوڵمانانو كێشە ڕەوایەكانیان بەگشتیو، خەڵكی كوردستانو عێراقو كۆمەڵی ئیسلامیی بەتایبەت، دیاری دەكات.

وە بەپێویستی دەزانێ كە بۆ هێنانەدی ئامانجە هاوبەشەكان (الأهداف المشتركة)، وەك: پارێزگاریی لێكردنی خاكی هەرێمی كوردستانو عێراقو هێمنییو ئاسایشیانو، ئاوەدانكردنەوەیانو، خۆشگوزەران كردنی خەڵكەكەیانو، پاراستنی دینو ژینو كەرامەتو ماڵو سامانو سەرجەم بەرژەوەندییەكانیان، دەستبارگرو هاوكاری هەموو كەسو لایەنێكی دڵسۆز بە خەڵكو وڵات بێ، چونكە:

١- خوای تاكو پاك ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٢﴾ المائدة،

واتە: (... وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی‌و پارێزكاریی، وە هاوكاریی یەكدی مەكەن لەسەر گوناهـ و دەستدرێژیی، وە پارێز لە خوا بكەن، بێگومان خوا تۆڵەی توندە).

٢- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة، واتە: (خوا لێتان قەدەغە ناكات سەبارەت بە كەسانێك كە لەسەر دینتان جەنگتان لەگەڵ ناكەن‌و لە نیشتمان‌و ماڵ‌و حاڵی خۆتان وەدەرتان نانێن، كە چاكەیان لەگەڵدا بكەن‌و لە ماڵ‌و سامانی خۆتان پێیان بدەن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێ).

٣- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (لَقَدْ شَهِدْتُ فِي دَارِ عَبدِاللهِ بْنِ جِدْعانَ حِلْفًا مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهِ حُمْرُ النَّعَمِ، وَلَوْ أُدْعَى بِهِ فِي الإِسْلامِ لأَجَبْتُ) رواه ابن إسحاق وأورده ابن كثير[1]، واتە: (من لە ماڵی عەبدوڵڵای كوڕی جیدعاندا بەشداریی پەیمانێك بووم، حەزناكەم كە لەجیاتی ئەو پەیمانە حوشتری سپییم هەبێ[2]، وە ئەگەر لە ئیسلامیشدا بۆ پەیمانێكی وا بانگ بكرێم، وەڵام دەدەمەوەو بەشداریی تێدادەكەم).

---

١) (السيرة النبويّة) لابن هشام، ج: (١)، ص: (٧٢)،و(البداية والنهاية) لابن كثير، ج: (٢)، ص: (٣٧٦).

٢) بە حوشتری سووریش لێكدراوەتەوە، كە دیارە ئەوكاتە ماڵێكی زۆر بە نرخ بووە، لەبەرئەوە عەرەب نموونەیان پێ دەهێنایەوە لەسەر گرانبەهایی شت.

## ڕوونکردنــەوە:

ئەم بنەمــایەش لە پێنــج خــاڵ دا ڕووندەکەینــەوە :

**یەکەم: بناغـەی هەڵسوکەوت کردنی کۆمەڵو لایەنێکی ئیـسلامیی لەگـەڵ لایەنـەکانی بەرانبەریـدا[١]، خـاوەنی هـەر بیــروبڕواو ئیدیۆلـۆژییەك بن، بریتیە لە هاوکاریی کـردن بۆ هێنانەدی ئامانجـە هاوبەشـەکان :**

واتـە ئـەو ئامانجانـەی کـە بەرژەوەنـدیی هەموولایـەکیان تێدایـەو دەبنـە مایـەی دوورخــستنەوەی زیانــەکانو دەستخــستنی ســوودەکان (دَفْـعُ الْمَـضَارِّ وَجَــلْبُ الْمَنَـافِعِ)، چونکە خـوا ﷻ فـەرمانی بـە پێغەمبـەری خـۆی کـردوە، کـە خـاوەن کتێـبەکان (جوولەکەو نەسرانیو ئەوانیدیکەش) بانگ بکات بـۆ شـتێك کـە خـاڵی هاوبەشە، وەك دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ آل عمــران. واتە: (بڵێ ئەی خاوەن کتێبـینە! وەرن بۆ وشـەیەکی یەکسان لەنێوان ئێمـەو ئێـوەدا کە بۆ هەمووان وەك یەکـە، کـە جگـە لـە خـوا نەپەرسـتینو هـیچ شـتێك نەکەینـە هاوبەشــی خــواو هێنــدێکمان هێندێکــی دیکــەمان لەجیــاتی خــوا نەکەینــە پەروەردگـارو سەروەری خۆمـان، جا ئەگەر پشـتیان تێکردیو وەڵامیان نەدایەوە،

١) جـا لایەنی سیاسیی بن، دەوڵـەت بن، حکوومەت بن، ڕێکخراویدیکـە بن ... هتد.

ئەوا ـ تۆو مسولْمانانیش ـ بڵێن: شایەد بن کە ئێمە ملکەچین بۆ خوا)، واتە: ئێمە ئەهلی خوا بەیەکگرتن (توحید)ین، بانگیان بکە بۆ خوا بەیەکگرتن، کە هەموو کتێبە ئاسمانییەکانو هەموو بەرنامە خواییەکان، بۆ ئەوە هاتوون کە خەڵك تەنیا خوا ﷻ بە پەرستراوو پەروەردگارو سەروەری خۆیان بزانن.

کەواتە: ئێمە بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکدا کە هەر لایەنێك بنو هەر بیروبۆچوونێکیان هەبێ، دەبێ بانگیان بکەین بۆ خاڵی هاوبەش، خاڵی هاوبەشی نێوان ئێمەو خاوەن کتێبەکان ئەوەیە کە تەنها خوا ﷻ بپەرستین، ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو شەریعەتە ئاسمانییەکانە[1].

---

١) من وشەی (دینە ئاسمانییەکان) بەکارناهێنم، چونکە خوا ﷻ یەك دینی لە ئاسمانەوە ناردۆتە خوارەوە بۆ هەموو مرۆڤەکان لە ئادەمەوە ؈ تا خاتەم ﷺ، ئەویش ئیسلامە، وەك خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ...﴿١٩﴾﴾ آل عمران، واتە: (تەنیا دینی پەسندو قبوولکراو لەلای خوا، ئایینی ئیسلامە ...)، ئەو ئیسلامەی کە بریتیە لە ملکەچیی بۆ خوا ﷻو تەسلیم بوونی خوا ﷻو پابەندیی بە شەریعەتی خواوە، بەلاّم بەرنامەکان جیاجیا بوون، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ ...﴿٤٨﴾﴾ المائدة، واتە: (... بۆ هەر کامێکتان بەرنامەیەكو ڕێبازێکمان داناوە ...)، نەك بۆ هەر کامێکتان دینێك، یەك دین هەبووە، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ...﴿١٣﴾﴾ الشورى، واتە: (ـ ئەی ئۆممەتی موحەممەد!ـ هەر ئەو دینەمان کردە بەرنامەی ژیانتان کە بە ـ نووح ـ مان سپارد، وە ئەو دینەیە کە بۆ تۆ ـ موحەممەد ـ مان نارد، وە هەر ئەو دینەیە کە بە ئیبڕاهیمو مووساو عیسامان سپارد، ئەویش ئەوەیە کە دین بەرپابکەنو تێیدا پەرتەوازە مەبن)، واتە: لە دینی خۆی شەرعێکی بۆ داناون، واتە: دینەکە یەکە، بەلاّم شەریعەتەکان جیان.

جا ئێمە وەك چۆن بۆ مامەڵە لەگەڵ خاوەن كتێبە ئاسمانییەكانو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەكاندا، دەبێ بانگیان بكەین بۆ خاڵی هاوبەش، بە هەمان شێوە لەگەڵ ئەهلی دنیاشدا، واتە: ئەگەر لەگەڵ ئەهلی دیندا بناغەی كارەكەمان بریتیە لە خاڵە هاوبەشەكان، لەگەڵ ئەهلی دنیاشدا دەبێ بزانین داخۆ چ شتێكی هاوبەشمان لەنێواندا هەیە؟ ئەوە خاڵێكی زۆر گرنگەو دەبێ باشی بیر لێبكەینەوە، ئەگەرنا تۆ نەگەڕێی بۆ خاڵی هاوبەش، چۆن لەگەڵ خەڵك دەژی؟ تۆ بڵێی: من مسوڵمانمو تۆش كافری، من بۆ بەهەشتو تۆش بۆ جەهەننەم، مانای وایە لێك جیاینو هیچ شتێك پێكەوە ناكەین! جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وای كردبایە، دەبووایە هەر لەگەڵ ئەوەی كۆچی كرد بۆ مەدینە، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانو جوولەكەكان تێكگیراباو سەنگەریان لێك بگرتایە، وە لەگەڵ دووڕووەكان دەبووایە لێكترازابانایە! ئینجا پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان لەلایەكو جوولەكەو بتپەرستو دووڕووەكان لەلایەكی دیكە، چ شتێك كۆیدەكردنەوە؟ بێگومان بەرژەوەندیی هاوبەش، وەك لە بەڵگەنامە (وثيقة)ی مەدینەدا هاتوە.

هەروەها خوا ﷻ فەرمانی بە مسوڵمانان كردوە كە لەگەڵ غەیری خۆیان -واتە نامسوڵماناندا- لەسەر بناغەی چاكەكاریی‌و پارێزكاریی (البر والتقوى) هاوكاریی یەكدی بكەن، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَـٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُوا۟ ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ۘ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾ المائدة، واتە: {ئەی

ئـــەوانەی بڕواتان هێنـاوە! دروشمەكانی خـوا مەشـكێنن‌و بێڕێزییـان پـێ مەكـەن، هـەروەها مـانگی قەدەغـەكراو مەشـكێنن، وە ئـاژەڵانی نیـشانەكراو بـۆ قوربـانیی بەبۆنەی حەجەوە، وە ئەو ئاژەڵانەش كە هەوساریان لە مـل كــراوە، وە حورمـەتی ئەو بتپەرســتانەش مەشـكێنن‌و بـە ڕەوای دامـەنێن دەسـت بێننــە ڕێیــان، كـە بـۆ مزگەوتی حـەڕام دێـن (بـۆ جێبــەجێكردنی خواپەرسـتییەكانی خۆیـان)، چـونكە ئـەوانیش داوای بەخــشش‌و ڕەزامەنــدیی خــوای پەروەردگــاریان دەكــــەن (بــە بیروبڕوای خۆیان)، وە هەركاتێك ئیحڕامتـان شـكاند، بۆتـان هەیــە ڕاوو شـكار بكەن، وە با ڕقهەڵسـانتان لە كەسـانێك كـە كـاتی خــۆی ئێوەیــان لـە مزگــەوتی حەڕام گێڕاوەتەوە، واتـان لێنــەكا دەســتدرێژیی بكــەنە سـەریان، وە هاوكـاریی یەكدی بكەن لەسـەر چـاكەكاریی‌و پارێزكــاریی، وە هاوكــاریی یەكـدی مەكـەن لەسەر گونـاەو دەسـتدرێــژیی، وە پـارێز لـە خـوا بكــەن بێگومـان خـوا تۆڵــەی تونـدە﴾.

لێـرەدا ئەو سیاقەی ئـەم ڕســتە قوڕئانییــەی تێـدا هـاتوە: ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ﴾ ســــیاقێكە قــــسەدەكات دەربـــــارەی هەڵـسوكەوت كـردن لەگـەڵ نامـسوڵمانانـدا، ئەوانـەی كـە ڕۆژانێـك‌و سـاڵانێك مسوڵمانانیان لە مزگەوتی حەڕام دەگێڕایەوەو نەیاندەهێشت بـچنەنێوی، دەربـارەی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەیە كە ساڵەهای ساڵ بوو ڕێگایان بە مسوڵمانان نـەدەدا، بچن حەج‌و عـەمرە بكـەن لـە مزگـەوتی حەڕامـدا، هـەروەك لـە سـاڵی شەشـەمی كۆچییش لە پەیـمانی حودەیبیـەدا ئەمە ڕوویـدا، كـە دوایـی وا پێكهـاتن بـۆ سـاڵی داهـاتوو ڕێگـا بـە مـسوڵمانان بـدەن بـچن، كەچـی خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ئێـوە لەبەرئەوەی ئەوان ساڵانێك ئێوەیان گێڕاوەتەوەو ستەمیان لە ئێـوە كـردوە، مەیكەنـە

پاساو ئێوەش ئێستا كـە دەسـەڵاتتان هەیـە ئـەوان بگێڕنـەوە، هەڵبەتـە ئەمـە پـێش ئەوەبوو كە لـە سـاڵی نۆیـەمی كۆچییـدا بـە یـەكجاریی ڕابگەیەنـدرێ، كـە نابـێ لەمەودوا هیچ كەس بە ڕووتیی بـەدەوری كەعبـەدا بـسووڕێتەوەو تـەواف بكـات، چونكە هاوبەش بۆ خوا دانـەرەكان هێنـدێكیان بـە ڕووتیـی تـەوافیان دەكـرد، كـە ناگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺو مسوڵمانان لەوێ بن‌و ئافرەت‌و پیاویش بـە ڕووتیـی تەواف بكەن، لەبەرئەوەی بەرگیان دەستنەكەوتوە. ئەو ڕەفتارەیان كە قەدەغـەكراوە جیایە، بەڵام مادام مزگەوتی حـەڕام بە شوێنێكی پیرۆز دەزانـن، ڕێیـان لێنـەگیراوە زیارەتی بكەن، بەڵكو فەرمان بە مسوڵمانان كراوە كە لەگەڵیشیاندا هاوكار بـن، بـۆ هەرشـتێك كـە مایـەی چـاكەكارییە بـۆ خـەڵك‌و سـوودی لێـدەبینن، وە مایـەی پارێزكارییـە بۆ لای خوا ﷻ.

ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ﴾، زۆر كـەس وادەزانـێ فەرمانە بۆ مسوڵمانان تا لەنێوان خۆیـاندا هاوكاریی یەكدی بكـەن، نـەخێر وا نیـەو ئەم ڕستە قورئانییە ئاڕاستەی مسوڵمانان نەكراوە، بڵێ: لـەنێو خۆتانـدا هاوكـاریی یەكدی بكەن، چونكە مسوڵمانان لە بنەڕەتدا هـەر پێكـەوە هاوكـارن، بـەڵكو ئـەم ڕسـتەیە ئاڕاستەی مسوڵمانان كراوە، تاكو لەگەڵ نامـسوڵمانان‌و غـەیری خۆیانـدا بگەڕێن، داخـۆ چ شـتێك مایـەی ڕەزامەنـدیی خـوا ﷻو چاكەكـاریی‌و سـوودو كەڵكـە بۆ خەڵك، هاوكاریی یەكدی تێـدا بكـەن.

**دووەم: بەپێـچەوانەی حـاڵی بـوونی هەنـدێك كەسـی حـاڵی نـەبوو لـە ئیـسلام، ئیـسلام نـەك هـەر هـیچ هەسـتیاریی (حَسَّاسِيَة)یـەكی بەرانبـەر بـە نامـسوڵمانانێكی تەبـاو بـێ زەڕو سـەلامەت نیـە، لـە**

**بـواری هەڵـسوكەوتو پەیوەندییەكـانـدا، بگـرە فـەرمانیش بـە مـسوڵمانان دەكـات كـە هەمیـشە دەستپێـشخەری چـاكەگوتنو چاكەكـردنو هـاوكـاریـیو دەسـتبارگـرتن بن :**

هـەندێك كەس وادەزانێ كە ئیسـلام هـەر لـە رێـوە بـە شـوێنكەوتووانی خـۆی دەڵـێ : دەبـێ هەمیـشـە سـەلبیی بـن لەگـەڵ نامـسوڵماناندا‌و نابـێ هـیچ جـۆرە هاوكارییەكیان لەگـەڵدا بكەن‌و هیچ كرانەوەیەكیـان لەگەڵیـاندا هەبـێ! بــەڵام ئەوە وانیـە، وە ئـەوەش كـە هێنـدێك لـە توێژەرەوانـی قورئـان كـە بەداخـەوە گوتوویـانە: ئایـەتی شـمـشێر (آیـة الـسیف)[1] پێنجسـەد (٥٠٠) ئایـەتی

---

١) مەبەست لەم ئایەتەیە كـە خـوای بـەرزو مـەزن دەفـەرمویٚ : ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾ التوبـة، هەنـدێكیش لـە زانایان دەڵێن مەبەست لەم ئایەتەیە : ﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ۚ فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ ۚ وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ التوبـة.

ويروى عن علي رضي الله عنه أنه قال: سيوف الله أربعـة: واحد على المشركين قال تعالـى: ﴿... فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ ...﴿٥﴾ ﴾ التوبة، وثـان على الكافرين قال تعالى: ﴿ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ...﴿٢٩﴾ ﴾ التوبـة، وثالـث علـى المنـافقين: قـال تعالــى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ...﴿٧٣﴾ ﴾ التوبة، ورابع علـى البغـاة. قـال تعالــى: ﴿... فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ ...﴿٩﴾ ﴾ الحجرات.

نەسخ[1] کردۆتەوە، هێندێکیان گوتوویانە: سێسەد (٣٠٠) ئایەت، هێندێکی دیکەیان کە لای کەمیان گوتوە، گوتوویانە: سەد (١٠٠) ئایەت، یان هەشتا (٨٠) ئایەتی نەسخ کردۆتەوە، بۆ نموونە ئەم ئایەتە: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ النحل، گوتوویانە: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە،

---

١) جەلالەددینی سیوطیی دەربارەی ئایەتی شمشێر دەڵێ: (نَسَخَتْ آيَاتِ الْعَفْوِ وَالصَّفْحِ وَالإِعْرَاضِ وَالْمُسَالَمَةِ)، واتە: (هەموو ئایەتەکانی لێبووردنو سینە فراوانییو پشت تێکردنو ئاشتیخوازیی نەسخ کردۆتەوە)، هەندێك لە زانایانی دیکە دەڵێن: ئەو ئایەتانەی نەسخ کردۆتەوە کە باسی جەنگ ڕاگرتنو ڕێککەوتنو پێکهاتن (الإتِّفَاقِيَّةِ وَالصُّلْحِ) دەکەن، بۆ نموونە: ئەم ئایەتانە: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغۡفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجۡزِيَ قَوۡمَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ الجاثية، وە: ﴿إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾﴾ النمل، وە: ﴿ فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾﴾ آل عمران، وە: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٨٣﴾﴾ البقرة، وە: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ﴿١٠٨﴾﴾ يونس، وە: ﴿ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَدَعۡ أَذَىٰهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿٤٨﴾﴾ الأحزاب، وە: ﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ﴿٢١﴾ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ﴿٢٢﴾﴾ الغاشية ...هتد.

واتە: كاتی خۆی كە بێ دەسەڵاتیی بووە، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی بانگەواز بكە بۆ لای خوای پەروەردگارت بە حیكمەتو ئامۆژگاریی چاكو گفتوگۆ بكەن بەشێوازی هەرە باش، بەڵام ئێستا كە ئیسلام دەسەڵاتی هەیە، پێویست ناكات حیكمەتو ئامۆژگاریی چاك بەكاربێنین!! یان ئەو ئایەتەی كە دەفەرمویَ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾﴾ المائدة، واتە: (چاوپۆشییان لێ بكەو لێیان ببوورە)، دەڵێن ئەم ئایەتەش نەسخ بۆتەوە، وە ئەم ئایەتەش: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة، وە ئەو ئایەتەش كە دەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾ الأنفال، واتە: (ئەگەر باڵیان بۆ ئاشتیی دا تۆش باڵی بۆ بدەو پشت بە خوا ببەستە، بێگومان ئەو بیسەری زانایە)، گوتوویانە: ئەم ئایەتانە هەموو نەسخ بوونەتەوە، كە لەڕاستیدا ئەوە حاڵی نەبوونە لە ئیسلامو، ئایەتە مەككەییەكان ئایەتی مەنسووخیان هەر تێدانیە، چونكە هەموویان هەر بنەماو شتی نەگۆڕن، ئایا مسوڵمان هەر نابێ بە حیكمەت بانگەواز بكات؟ هەر نابێ كاری چاكە بكات؟ هەر نابێ لێبووردنو چاوپۆشیی هەبێ؟!

وە پاشان تۆ تەماشای ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بكە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە بەرجەستەكەری لێبوردن (العفو)و بەزەیی (رحمة)و سینە فراوانیی (السماحة)و

چاوپۆشـیی و نـەرم و نیـانیی و ...هتـد بـووە، وەك خـوای پـەروەردگار ﷻ پـێی دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبيـاء.

ئینجـا بەڕاستی هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیـە بگونجـێ بڵـێی ئـەم ئایەتـە نەسـخ كراوەتەوە، ئەو رایەش ئەوە نیـە بڵێی تـازە پەیـدابووە، كـاتی خـۆی زانایـان ئـەو رایەیان هەر هەبووە، وە وشەی (نسخ) كە كاتی خـۆی بـەكارهێنراوە، مەبەسـتیان پێی ئەو چەمكەی ئێستای نەبووە، كە ئایەتێك بێ و ئایەتێكی دیكە لابەرێ، بـەڵكو مەبەستیان پێی ئەوە بووە كە: یان ئایەتێك بەگشتی (عـام) هاتوە، دوایی ئایـەتێكی دیكـە هاتوە چەمك و واتـای گشـتی ئەو ئایەتـەی تایبـەت (تخـصيص) كـردوە، یـان رەها (مطلق) بووەو بەنددار (تقييـد)ی كردوە، یان پوختـەو كـورت (مجمـل) بـووە درێژەو وردەكاریی (تفصيل)ی داوەتێ، كە بەهەرحاڵ ئـەوە باسـێكی دیكەیـەو[1]، گرنگ ئەوەیە كە ئیسلام هەمیشە دەستپێشخەری تەبایی و ئاشتەوایی و پێكەوە ژیانە.

ئەگەر بۆ نـموونە سەرنجی ئەم ئایەتـانە بدەیـن:

١/ خوای پـەروەردگار ﷻ دەفـەرمووێ: ﴿... وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ... ٨٣﴾ البقـرة، واتە: (... وە قسەی باش لەگەڵ خەڵكی بكـەن ...). كەواتـە: دەبـێ قسەی ئێمـە وەك مسوڵمان لەگەڵ خەڵكیدا بـە كـافرو مـسوڵمانەوە، جگـە لـە

---

١) لە بەرگی یەكەمی (تەفسیری قورئـانی بـەرزو بـەپێز)دا كـە هـەردوو سـووڕەتی (الفاتحـة)و (البقرة) دەگرێتەخۆی و، لە تەفسیری ئایـەتی: ﴿مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٠٦﴾دا باسێكی خەستو خۆڵمان لەبارەی نەسخەوە كردوەو لە شێوەی نامیلكەیەكیشدا چاپو بڵاوكراوەتەوە، بە ناوونیشانی: (**هەڵسەنگاندنێك لەبارەی هەبوونو نەبوونی نەسخ لە قورئان دا**).

قسەی باش هیچیدیکە نەزانین، ئینجا ئەگەر کەسێك بڵێ: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە، باشە ئەدی ئێمە دەبێ قسەی خراپ بکەین؟! خۆ نابێ قسەی خراپ بکەین، دیارە هەر دەبێ قسەی باش بکەین.

٢/ وە خوای بە بەزەیی ﷻ دەفەرموێ: ﴿... وَأَحْسِنُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ البقرة، واتە: (... وە چاکە بکەن، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێ)، خۆ تۆ هەر دەبێ چاکە بکەیو نابێ خراپە بکەی، بەڵێ ئەگەر کەسێك خراپەی لەگەڵدا کردی، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ... ﴿٤٠﴾﴾ الشورى، واتە: (وە سزای خراپە خراپەیەکی وەك خۆیەتی ...)، بەڵێ بۆت هەیە سزای بدەیەوە، بەلام لەڕاستیدا وەك دەستپێشخەریی کردن، مسوڵمان قەت نابێ خراپە بکات، هەمیشە دەبێ چاکەکار بێ.

٣/ هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة، واتە: کەسانێك کە نە زەرەری دینییان بۆتان هەیەو نە زەرەری دنیایی، ئینجا لەڕاستیدا ئەم ئایەتەش وەك هەموو ئایەتەکانی دیکە کارپێکراو (مُحْكَمْ)و لەجێی خۆی ماوەتەوەو لابراو (منسوخ) نیە.

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان ﴿وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ﴾یان بە مانای (دادگەریی)یان لەگەڵ بکەن، لێکداوەتەوە، کە دیارە وشەی (تُقْسِطُوا) یان (أَقْسِطُوا) لە سوورەتی (المائدة)و شوێنی دیکەشدا بە مانای (دادگەریی) هاتوە، بەلام لێرەدا ناگونجێ بە

مانای (دادگەریی) لێكبدرێتەوە، چونكە دیارە دادگەریی (قِسْطَ ـ عَدْلْ) هەرگیزو لە هیچ حاڵێكدا قەدەغە ناكرێ، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ﴾، كەواتە: لێرەدا دەبێ ﴿وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ﴾ واتایەكی هەبێ نزیك بێ لە مانای ﴿تَبَرُّوهُمْ﴾، واتە: (چاكەیان لەگەڵ بكەن)، ئەویش بریتیە لە واتای: (پێیان ببەخشن)، چونكە: (أَقْسَطَ إِلَيْهِ) واتە: (أَعْطَاهُ قِسْطاً مِنْ مَالِهِ)، یانی: (بەشێكی لە ماڵی خۆی پێدا)، كە لێرەدا (إقساط) بە مانای دادگەریی نیە، بەڵكو بە مانای بەخشینە، چونكە بە (إلى) (تَعَدَّى)ی كردوە، كە دیارە (أَقْسَطَ إِلَيْهِ) جیایە لە (أَقْسَطَ).

كەواتە: نامسوڵمانانێك كە لەگەڵمان دەژین و زەرەری دین و ژینیان بۆمان نیە، خوای پەروەردگار ﷻ ڕێمان لێناگرێ كە چاكەی ماددیی و مەعنەوییان لەگەڵدا بكەین، بەڵكو خوا ﷻ چاكەكاران و بەخشەرانی خۆشدەوێ، ئەگەر ئەو چاكەو بەخشینە لەگەڵ نامسوڵمانانیش بێ.

**سێیەم: ئینجا وێڕای ئەوەش بەپێی بنچینەی شەرعیی: (مَا لاَيَتِمُّ الوَاجِبُ إِلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، وە بنچینەی: (لِلْوَسَائِلِ حُكْمُ الْمَقَاصِدِ)، مادام كۆمەڵێك بەرژەوەندیی هاوبەش (مَصَالِحَ مُشْتَرَكَةَ) هەبن، كە هیچ لایەنێك بەتەنیا نەتوانێ دەستەبەریان بكات، كەواتە: لەسەر هەموولایەكیان پێویستە كە هاوكاریی یەكدی بكەن بۆ هێنانەدی و دەستەبەركردنیان:**

(مَا لاَيَتِمُّ الوَاجِبُ إِلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، واتە: (هەر شتێك فەرزێك بەبێ ئەو نەیەتەدی، ئەویش فەرز دەبێ)، وە بنچینەی: (لِلْوَسَائِلِ حُكْمُ الْمَقَاصِدِ)، واتە:

(ئامرازەكان حوكمی ئامانجەكانیان هەیە)، مادام كۆمەڵێك بەرژەوەندیی هاوبەش (مَصَالِحَ مُشْتَرَكَة) هەبن كە هیچ لایەنێك بەتەنیا نەتوانێ دەستەبەریان بكات، وەك: پاراستنی سنوورەكانی وڵاتو هێمنییو ئاسایشی كۆمەڵگا، ئاوەدانكردنەوەی وڵاتو خزمەتكردنی خەڵك، پاراستنی دینو ژینو كەرامەتو وەچەو عەقڵوماڵو سامانو ... هتدی كۆمەڵگا، ئەوانە هیچ كەس بەتەنیا بۆی دابین ناكرێن، بە هاوكاریی هەموو لایەك نەبێ.

كەواتە: بۆ وەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەی كە بۆ هەموو كەس باشن، لەسەر هەموولایەكیان پێویستە هاوكاریی یەكدی بكەن بۆ هێنانەدیو دەستەبەركردنیان: ئەگەر وڵاتەكەمان ئازاد نەبێ، هەمووومان زەرەردەكەین، ئەگەر خێروبێری وڵات بەدەست خۆمانەوە نەبێو، بە تاڵان ببردرێ، هەمووومان زەرەردەكەین، ئەگەر هێمنییو ئاسایش لە وڵاتدا نەبێو لە بری ئەوە ئاڵۆزییو ئاژاوە جێی بگرێتەوە، هەمووومان زەرەردەكەین، ئەگەر دینو ژینو كەرامەتو وەچەو عەقڵو ماڵو سامانی خەڵك پارێزراو نەبێ، هەمووومان زەرەردەكەین، كەواتە: ئەوانە كۆمەڵێك بەرژەوەندیی هاوبەشنو پێویستە هاوكارییان لەسەربكرێ.

ئینجا بێگومان هەركام لەوشتانەی ئاماژەمان پێدانو هاووێنەكانیان، لەبازنەی فەرزە گشتییەكان (الفروض العامة)دان كە بە (الفروض الكفائية) ناسراونو، فەرزە كیفائییەكانیش هەركەسێك كەمتەرخەمییان تێدا بكاتو بشتوانێ بیانهێنێتەدی، ئەوە گوناهباردەبێ، چونكە فەرزە گشتییەكان لە بنەڕەتدا لەسەر هەموو كۆمەڵگە فەرزنو، لەكاتی جێبەجێنەكردنیاندا، سەرجەم تاكەكانی كۆمەڵگا گوناهباردەبن، بەڵام ئەوانەی كە ئەو فەرزە كیفائییانە پەكیان لەسەریان دەكەوێ، لەسەریان دەبێتە فەرزی عەین كە پێیان هەڵسن.

**چـوارەم: هەڵبەتـە شـێوازو چـۆنیەتی ئـەو هاوكـاریی‌و دەسـتبار بۆیەكگرتنـەش، لـە چاخ‌و ڕۆژگـارو كۆمەڵگـاو واقیعێكەوە، بـۆ یـەكی دیكـە جیـاوازەو، دەگـۆڕێ، بۆیـە پێویـستە لـە بـواری شـێوازو میكانیزمەكانی كارو چالاكیی‌و هێنانەدی بەرژەوەندییەكاندا، یەكجـار هۆشـیارو عەقـڵ فـراوان‌و بـوێرو وردبـین‌و دووربـین بـین، تـاكو لـە ڕۆژگـاری خۆمـان بـەجێ نـەمێنین‌و، لەبـەردەم هێنانـەدی ئامـانج‌و بەرژەوەندییە شەرعییەكانیشماندا دۆش دانەمێنین !**

دیـارە بە ئەندازەی لێـبڕان‌و بـۆ خـوا یەكلابوونـەوەو سـاغیی‌و ڕاستییـشمان، خوای بەخشەر ﷻ دەستمان دەگـرێ‌و ڕێنماییمـان دەكـات‌و، شـێوازو ڕێـازو ئـامرازە گونجاوەكانـمان پێـشاندەدا، وەك فەرموویـەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبـوت، واتـە: (وە ئەوانـەی لەڕێی ئێمـەدا تێدەكۆشـن ڕێبازەكانی خۆمانیان پێشاندەدەین، وە بێگومـان خـوا لەگەڵ چاكەكاراندایە). ئەم ئایـەتە یەكەمین ئایەتێكە كـە وشـەی (سُبُلْ)ی بـە كـۆ هێنـابێ‌و پاڵیـشیدابێتـە لای خـوای بـەرزو مـەزن، وە لـە شـوێنەكانی دیكـە هەموویاندا بە تاك هـاتوە، بۆوێنـە، دەفـەرموێ: ﴿ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحۡصِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ...﴿٢٧٣﴾ ﴾ البقـرة، وە دەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ...﴿٩٩﴾ ﴾ آل عمـران، وە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ ...﴿٣٨﴾ ﴾ التوبـة، هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي

سَبِيلِ ٱللَّهِ ...﴿٣٨﴾ محمـد، وە هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ...﴿١٢٥﴾ النحل ...هتـد، بەڵام لە ئایەتی (٦٩)ی سوورەی (العنكبوت)دا بـە كـۆ هاتوە، واتە: (ڕێبازەكـانـمان)، وە پاڵیشدراوەتە لای خوا ﷻ، وشـەی (سُبُلْ) لـە شـوێنیدیكـە لـە قورئانـدا هـاتوە، بـەڵام پاڵنەدراوەتـە لای خـوا ﷻ، خـوای پـەروەردگار ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ الأنعام، واتە: (وە بێگومان ئەوە ڕێبـازی ڕاسـتی منـەو ئێـوەش ـ ئـەی بـڕواداران ـ شـوێنی بكەون، وە شوێنی ڕێچكەكانی دیكـە مەكەون، چونكە لە ڕێگای خوا لاتاندەدەن، ئەوانە سپاردەو ئامۆژگاریی خوان بۆ ئێوە تا خۆتان بپـارێزن)، لێـرەدا مەبەسـت لـە وشەی (ٱلسُّبُلَ) ڕێچكەو ڕێبازەكانی دیكەی جگە لە ئیسلامە.

حیكمەتەكەی چییە لە ئایەتی (٦٩)ی سوورەی (العنكبوت) بەو شـێوەیە بـە كـۆ هـاتوە؟ حیكمەتەكـەی ئەوەیـە: كـە لێـرەدا خـوای پـەروەردگار ﷻ باسـی كـاری ئیسلامیی و شێوازەكانی كار دەكات و شێوازو ڕێبازەكـانی كـاریش جۆراوجـۆرن و هەر یەك شێوازو ڕێگا نیە، بۆیـە ئێمـە لەهـەر قۆنـاغ و چاخ و هـەل و مەرجێكـدا، پێویستیمان بە شێوازو ڕێبازێكی گونجـاو دەكـات، بـۆ ئـەوەی لـەڕێی خـوا ﷻدا تێبكۆشین و كارو چالاكیی ئیسـلامییانەی خۆمان ئەنجام بدەین.

**پێنجەم: دیارە پەسندكردن و شانازیی پێوەكردنی پێغەمبەری خـواش ﷺ بە بەڵێن و پەیمانێكەوە، كـە بـە پـەیمانی جوامێران (حِلْفُ الفُضُولْ) ناسـراوەو لـە سـەردەمی پـێش پێغەمبەرایەتیـدا تێیـدا بەشـداربووەو، ڕاگەیانـدنی ئـەوە كـە لـە ئیسلامیـشدا ئامـادەی بەشـداریی تێـداكردنی**

پەیمانێکی لەوجۆرەیە، بەڵگەیەکی بەهێزە لەو ڕووەوە کە ئیسلام فەرمان بە مسوڵمانان دەکات کە هەمیشەو هەردەم بۆ سەرخستنی بەها بەرزەکان‌و چەسپاندنی بەرژەوەندییەکان، ئامادەی هاوکاریی بن لەگەڵ هەموو کەسدا، چونکە ئاشکرایە کە پەیمانی جوامێران بۆ بەرگریی لێکردنی مافی ستەملێکراوان‌و لەسەرکردنەوەیان، هاتەدی:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لَقَدْ شَهِدْتُ فِي دَارِ عَبدِاللهِ بْنِ جِدْعانَ حِلْفًا مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهِ حُمْرُ النَّعَمِ، وَلَوْ أُدْعَى بِهِ فِي الإِسْلامِ لَأَجَبْتُ} السيرة النبوية لابن هشام، ج: (١)، ص: (٧٢)، واتە: (لە ماڵی عەبدوڵلای کوڕی جیدعاندا بەشداری بەستنی پەیمانێك بووم، پێمخۆش نیە لەجیاتی ئەوە وشتری سوور[١]م هەبێ، وە ئەگەر لە سەردەمی ئیسلامیشدا بۆی بانگ بکرێمەوە وەڵام دەدەمەوە)، دیارە کە ئەو پەیمانەشی بەست هێشتا وەحیی بۆ نەهاتبوو پێش سەردەمی ئیسلام‌و پێغەمبەرایەتیی بوو، وە پەیمانەکەش لەگەڵ خەڵکانێك بەسترا کە کافر بوون‌و هیچیان مسوڵمان نەبوون، بەڵام ئەو ئامانجەی کە پەیمانەکەی بۆ بەسترا، ئامانجێکە لە ئیسلامیشدا ڕەوایە، کە بریتیە لە بەرگریی کردن لە خەڵکی ستەملێکراو، هۆکاری بەستنی ئەو پەیمانەش ڕووداوێك بوو کە پوختەکەی بەم شێوەیە بوو: دوای گەڕانەوەی قوڕەیش لە جەنگی تاوانبارانە (حَرْبُ الفِجَار)، کابرایەکی خەڵکی یەمەن لە مانگی (ذو القعدة) هاتبووە مەککەو شتێکی[٢] فرۆشتبووە عاسی کوڕی وائیل کە یەکێك بوو لە گەورەکانی قوڕەیش‌و پارەکەی نەدەدایە، کابراش هانای

---

١) هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست لە (حُمْرُ النَّعَمِ) لێرەدا وشتری سپییە نەك سوور.

٢) لە ریوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: کابرا کچێکی جوانی پێبوو کە کچی خۆی بوو، گەورەکەی قوڕەیش کچەکەی لێ زەوت کردبووو نەیدەدایەوە.

بردە بەر زلە زلەكانی قورەیش، بەڵام لەبەر پلەوپایەی عاسی كوڕی وائیل كەسیان بەهانایەوە نەچوون، ئینجا لە نزیك كەعبە وەستاو بە هەموو توانای هاواری ستەملێكراویی خۆی بە شیعرێك كردو، داوای لە جوامێران كرد كە بە هانایەوە بچن، ئینجا كۆمەڵێك لە جوامێرانی قورەیش لە ماڵی عەبدوڵڵای كوڕی جیدعان كۆبوونەوەو پەیمانیان بەستو گوتیان: دەبێ هەموومان یەكدەست بین بۆ وەرگرتنەوەی مافی ستەملێكراو لە ستەمكارو نابێ لێبگەڕێین كەس ستەمی لێبكرێ، پاشان چوونە لای عاسی كوڕی وائیلو شتەكەی كابرای خەڵكی یەمەنیان لێسەندەوەو دایانەوە خاوەنەكەیو، پێغەمبەریش ﷺ لەو پەیمانەدا بەشداربوو.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە پێویستە ئێمە لەگەڵ خەڵكی نامسوڵمانیشدا، كاتێك بانگ بكرێین بۆ پرۆژەیەك كە ببێتە هۆی چەسپاندنی دادگەرییو لابردنی ستەمو خراپە، بە ئەركی سەر شانی خۆمانی بزانین كە تێیدا بەشدار بین، چونكە پێغەمبەر ﷺ ئاوای كردوە.

كەواتە: لەبواری هاوپەیمانێتیی بەستن (التَّحَالُفْ)یش لەگەڵ هەركەسو لایەنێكدا بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییو ئامانجە هاوبەشەكان، دیسان لایەنێكی ئیسلامیی دەستكراوەو ئازادە و، پێویستە ئەوپەڕی وەفادارییو پابەندیشی هەبێ بە پەیمانەكانیەوە، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ...﴿١﴾﴾ المائدة، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەفاداربن بەو گرێبەستو پەیمانانەی كە دەیانبەستن ...)[1].

---

١) ئێمە لە كتێبی (چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحی دا) باسی ئەم مەسەلەیەمان كردوە، بۆیە لێرە بەو ئەندازەیە وازی لێدێنینو خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەكەین.

مەبەست ئەوەیە ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی دەستمان كراوەیەو شەریعەت دەستی كردووینەوەو ئازادی كردووین، كە بەپێی هەلو مەرجە گۆڕاوەكانو بەپێی بارودۆخە جۆراوجۆرەكان، چ شتێكمان لە بەرژەوەندیی خۆمانو خەڵكەكەمانو وڵاتەكەمان بینی، لەگەڵ غەیری خۆماندا یا نامسوڵمانیش بن، ئەنجامی بدەین، نەك هەر ئازادین، بەڵكو فەرمانیشمان بەوە پێ كراوە، چونكە: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ﴾ فەرمانێكی خوایییە.

خوای پەروەردگار زیاتر شارەزامان بكاتو عەقڵمان فراوانتر بكات، كە جێی هەموو ڕاستییەكانی ئیسلامی تێدا ببێتەوە، بۆئەوەی بتوانین كاری ئیسلامیی لە واقیعو هەلو مەرجە جیاجیاكاندا، بەشێوەیەك ئەنجام بدەین، كە ئامانجە شەرعییەكانی پێ بپێكین.

# بنەمـای بیسـت و دووەم

کۆمـەڵی ئیسـلامیی بڕوای وایە کە :

دەبێ تێکـڕای دەوڵەت و کۆمـەڵ و تـەوژم و کەسایەتییەکانی جیهانی ئیسلام، پێکەوە هاوکـاربن بۆ بووژاندنـەوەی ئۆممـەت و گـێڕانەوەی سـەروەریـی شـەریعـەت.

# بنەمای بیست و دووەم

**كۆمەڵی ئیسلامیی بڕوای وایە كە:**

**دەبێ تێكڕای دەوڵەت و كۆمەڵ و تەوژم و كەسایەتییەكانی جیهانی ئیسلام، پێكەوە هاوكاربن، بۆ بووژاندنەوەی ئۆممەت و گێڕانەوەی سەروەریی شەریعەت.**

كۆمەڵی ئیسلامیی لەسەرخۆی بە پێویستی دەزانێ، كە وەك ئامانجێكی ستراتیژیی و دوور، شان بە شانی دەوڵەتو تەوژمو كۆمەڵو ڕێكخراوو كەسایەتییە ئیسلامییەكانی جیهان، كردوكۆش بكات بۆ بووژاندنەوەی ئۆممەتی ئیسلامو گێڕانەوەی سەروەریی شەریعەت (سیادة الشريعة)ی خوا ﷻ لەسەر تێكڕای نیشتمانی ئیسلامیی و، پێكهێنانی دەوڵەتو قەوارەیەكی ئیسلامیی فراوانو، بەرزكردنەوەی ئاڵای ئیسلام بەسەر سەرتاپای زەمیندا، تاكو ئۆممەتی ئیسلام، وەك خوا ﷻ بۆی دیاریكردوەو لەسەری پێویستكردوە، ببێتە شایەدو بەڵگەی ڕاستیی ئیسلام بەسەر مرۆڤایەتییەوەو، مایەی پاكسازیی و چاكسازیی كۆمەڵگای بەشەریی بەگشتی، چونكە:

١- خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿... وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢﴾﴾ المائدة.

واتە: (... وە لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی هاوكاریی یەكدی بكەن، وە

لەسەر گوناه و دەستدرێژیی هاوكاریی یەكدی مەكەن، وە پارێز لە خوا بكەن، بێگومان خوا سزای توندە).

٢- هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾﴾ المؤمنون، واتە: (وە بێگومان ئەم كۆمەڵەی ئێوە یەك كۆمەڵە، وە من پەروەردگارتانم جا پارێزم لێبكەن).

٣- وە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ...﴿١٤٣﴾﴾ البقرة، واتە: {وە ئاوا بەوشێوەیە گێڕاومانن بە كۆمەڵێكی چاكترین (یاخود میانگیر)، تاوەكو ببنە شایەدو چاودێر بەسەر خەڵكییەوەو، پێغەمبەریش بەسەرتانەوە شایەدو چاودێر بێ ...}.

٤- وە خوای بەدیهێنەر ﷻ فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ...﴿١١٠﴾﴾ آل عمران. واتە: (ئێوە باشترین كۆمەڵن بۆ خەڵكی پەیداكراون، فەرمان بە شتە پەسندەكان دەكەنو، ڕێ لە شتە ناپەسندەكان دەگرنو، بڕوا بە خوا دێنن ...).

٥- وە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾﴾

النـور، واتـە: (خـوا بـەڵێنی بەوانـەتان داوە كـە بڕوایـان هێنـاوەو كـردەوە باشـەكان ئەنجامـدەدەن، كـە بێگومـان دەیانكاتـە جێنـشـین لـە زەویـدا، وەك چـۆن ئەوانەی پێـش ئەوانی كردە جێنشـین، وە ئەو بەرنامەیـەی كـە بـۆی پەسـند كـردوون، بۆیـان دەچەسـپێنیٚو ترسـیان بـۆ دەگـۆڕیٚ بـە دڵنیـاییو هێمنیی، بە مەرجێك بمپەرستنو هـیچ شـتێك نەكەنـە هاوبەشـم، جا هـەر كەسێك دوای ئەوە بێبـڕوا بیٚ، ئەوە بێگومان ئەوانـەن لە ڕیٚ دەرچووان).

## ڕوونكـردنەوە:

ئەم بنەمایەش لە چوار خاڵی سەرەكییدا ڕوون دەكەینەوە:

**یەكـەم: بێگومـان هاوكـاریی پێكـەوەكردنی مـسوڵمانان و دەسـتبار بـۆ یـەكگرتنیان، بـۆ جێبـەجێكردنی هـەر ئـەركێكی شـەرعیی، كـە پـەكی لەسەر كاری هـەرەوەزیی و كاری هـاوبەش كـەوتبێ، فـەرزە:**

واتە: مادام كارێك بە هەموویان نەبێ نەكرێ، پەكی لەسەر چـەندیان كـەوتبێ، پێویستە ئەوەندەیان بۆی بێنە مەیدان و قۆڵی بۆ هـەڵماڵن، چـونكە وێـڕای فـەرمانی خـوای پـەروەردگار ﷻ كـە دەفـەرموێ: ﴿... وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ... ﴿٢﴾﴾[1] المائدة، وە وێـڕای گەلێـك ئایـەت و فـەرموودەی دیكـەی پێغەمبـەر ﷺ، زانایانی شەریعەت وەك بنچینـەیەكی گشـتیی شەرعیی گوتوویـانە: (إِنَّ الأَمْرَ بِالشَّـيْءِ أَمْرٌ بِهِ وَبِمَا لا يَتِـمُّ إِلاَّ بِهِ)، واتە: (فەرمان كردن بە شتێك، فەرمان كردنـە بە خودی ئەو شتە، وە بە هەموو ئەو شتانەی كە ئەو شتە پەكی لەسەریان كـەوتووە، بـەبێ ئـەوان نایەتـەدی)، بـۆ وێنـە: فـەرمان كـردن بـە نوێـژ، فـەرمان كردنـە بـە دەستنوێژیش و، بە پاكوخاوێنییش و، بە بـەرگ و پۆشـاك لەبـەركردنیش و عـەوڕەت

---

١) البـر: كل طـاعة لله ورسـوله، والتقـوى: فعـل ما أمـر الله بـه ورسـوله وتـرك مـا نهـى عنـه الله ورسوله ﷺ، ﴿أيسر التفاسير لكلام العلي الكبيـر، الـمؤلف: أبو بكر الجزائري، ص: (٢٧٤)﴾.
فـي البـر (وهو فعل الخيـر) رضا النـاس، وفي التقوى رضا الله، ومن جمع بين رضا النــاس ورضـا الله فقد جمع الخيـر كله وتـمت سـعادته في دنيـاه وآخرته، ﴿أيسر التفاسيـر لكـلام العلـي الكبيــر، الـمؤلف: أبو بكر الجزائري، ص: (٢٧٥)﴾.

داپۆشینیشو، روو بەرەو قیبلە وەستانیشو ...هتد، هەروەها خوا ﷻ كە دەفەرمویٚ: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ ...﴿٧٨﴾﴾ الحج، واتە: (وە لەپێناوی خوادا تێبكۆشن بەو شێوەیەی كە پێویستە ...)، دیارە فەرمان كردن بە جەنگو جیهاد، فەرمان كردنە بە پەیداكردنو فەراهەم هێنانی پێداویستیو ئامرازو هۆكارەكانیشی.

ئینجا دیارە هەركام لە:

١/ هەڵساندنەوەو بووژاندنەوەی ئۆممەتی ئیسلامیو رێكخستنەوەی كاروبارەكانی.

٢/ گێڕانەوەی سەروەریی شەریعەتی خوا ﷻ بۆ سەرجەم بوارو لایەنەكانی ژیانو گوزەرانی تاكییو خێزانییو كۆمەڵایەتییو سیاسیی مسوڵمانان.

٣/ پێكهێنانی دەوڵەتو قەوارەیەكی ئیسلامیی فراوان، كە سێبەرو سایە بیٚ بۆ هەموو مسوڵمانان.

٤/ بەرزكردنەوەی ئاڵای ئیسلام بەسەر سەرتاپای زەمینداو، گەیاندنی پەیامی خوای پەروەردگار ﷻ بە هەموو خەڵكی سەر زەوی.

بێگومان هەر كام لەو چوارەی سەرەوە، فەرزو پێویستن لەسەر كۆی مسوڵمانان، وەك چەند فەرزێكی بە كۆمەڵو كیفائیی، ئینجا دیارە بەهاوكارییو پشتی یەكدی گرتنو كاری هاوبەشیش نەبیٚ، هیچ كام لەو ئامانجانە نایەنەدی.

كەواتە: پێكەوە هاوكاریی كردنی مسوڵمانان بۆ هێنانەدی ئەو چوار ئەركە سەرەكییە، پێویستە، بۆیە گوتوومانە: كۆمەڵی ئیسلامیی بە ئەركی سەرشانی خۆی دەزانیٚ، كە شان بە شانی دەوڵەتو لایەنو تەوژمو رێكخراوو دەزگاو

كەسایەتییە ئیسلامییەكان، دەستبار بگریٚو، هاوكاربیٚ بۆ هێنانەدی هەركام لەو چوار ئەركە.

**دووەم: بەڵگە لەسەر پێویست بوونی هەركام لەو چوار ئەركە زۆرن، هەڵبەتە ئێمە هەر بۆ دڵنیاكردن بەڵگەیان لەسەر دێنینەوە، ئەگەرنا هەموویان شتی بە ئاشكرا زانراون لە شەریعەتدا :**

بۆنموونە:

**١- بووژاندنەوەی ئۆممەتو یەكخستنەوەی ریزەكانی:**

وەك بەڵگە بۆ ئەوە، دەگونجیٚ زۆر ئایەتو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بهێنینەوە، بۆ نموونە: یەكێك لەوانە ئەو ئایەتەیە كە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ ۝٥٢﴾ المؤمنون، واتە: (وە ئەمە كۆمەڵی ئێوەیە یەك كۆمەڵە منیش پەروەردگارتانم دەجا پارێزم لێبكەن، یانی: هەوڵبدەن پێكەوە بە دەستەجەمعیی پارێزكاربن لە بەرانبەرمدا، وە لە شوێنێكی دیكەدا خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ۝٩٢﴾ الأنبیاء، واتە: (وە بێگومان ئەم كۆمەڵەتان یەك كۆمەڵەو منیش پەروەردگارتانم، دەجا بمپەرستن)، كە دیارە پارێزكارییش بەرهەمی خواپەرستییو بەندایەتیی كردنە بۆ خوا ﷻ.

كەواتە: پێویستە ئۆممەتی ئیسلام یەك كۆمەڵی تۆكمەو یەكگرتووبیٚ، بۆئەوەی بتوانیٚ بەندایەتیی راستەقینە بۆ خوا ﷻ بكاتو پارێزكاریی باش لە

خـوای پـەروەردگار ﷻ بکـات، کـە دیـارە پەرسـتن (عبــادة)و پارێزکـاریی (تقـوی)ی تەواویش، کاتێك دەبێ کە پابەندیی بکات بە هـەموو شـەریعەتەوە، وە دیارە مسوڵمانان بە هەموویشیان نەبێ ناتوانن بە هـەموو شـەریعەت‌و هـەموو یاساکانیەوە پابەندبن‌و، لە هەموو بوارەکانی ژیانیاندا شەریعەت‌و دینـی خـوای پەروەردگار ﷻ بەرجەستەبکەن.

هــەروەها خــوای پــەروەردگار ﷻ دەفــەرموێ: ﴿ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ...﴿١٠٣﴾﴾ آل عمران. واتە: (هـەمووتان تێکـڕا دەسـت بـە ڕێسمانی خوا وە بگـرن‌و پەرتـەوازە مـەبن ...)، کەواتـە: فـەڕزە کـە ئۆممـەتی ئیسـلام یەك ئۆممەت‌و یەك کۆمەڵ بێ، یەك کۆمەڵی دەسـتگرتوو بـە ڕێـسمانی خوا ﷻ، یەك کۆمەڵی پێشـکەشـکەری بەندایەتیی بـۆ خـوا ﷻ، پارێزکـار لـە خوا ﷻو پابەند بە شەریعەتی خواوە ﷻ.

٢- **گێڕانەوەی سەروەریی شەریعەتی خوا (إعادە سيادە شريعە الله)** ﷻ:

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، ئەم ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار ﷻ دەفـەرموێ:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾ الجاثية. لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوایـە ﷺ، خـوای بـەرزو مەزن پێـشتر باسـی ئـەهلی کیتـاب (جوولەکـەو نەصـڕانیی‌و ئـەوانی دیکـە)و ئـەزموونی ئـەوان دەکـات، ئینجـا دەفـەرموێ: (دوای -تێپـەڕبوونی قۆنـاغ‌و ئەزموونی ئەهلی کیتاب- تۆمان لەسەر بەرنامەیەك دانا لەلایەن خۆمانـەوە، جـا تۆش شوێنی بکەوەو پێیەوە پابەند بە، وە بەدوای ئارەزووی ئەوانـە مەکـەوە کـە نـازانن)، دیـارە هـەر فـەرمانێکیش بـە پێغەمبـەر ﷺ کرابـێ، فەرمانـە بـە

ئۆممەتەکەشی ، مەگەر بە بەڵگەیەکی تایبەتیی تایبەت کرابێ بە پێغەمبەری خوا وە ﷺ ، ئەگەرنا هەرچی خوای پەروەردگار ﷻ بە پێغەمبەر ﷺی فەرمووە، دیارە ئۆممەتەکەیشی پێ‌ی مەبەستە .

هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٠٨﴾ ﴾ البقرة، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە تێکڕایی بچنەنێو گەردنکەچییەوەو بەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، بێگومان ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە)، لێرەدا وشەی: (كَآفَّةً )، واتە: (بە تێکڕایی یان بەتەواویی)، دەگونجێ پەیوەست بێ بە (ءَامَنُواْ )، واتە: (هەمووتان تێکڕا بچنەنێو ئیسلامەتییەوە)، کە بێگومان گەردنکەچیی بۆ خوا ﷻ لە پابەندیی بە ئیسلامەوەدا بەرجەستەدەبێ، وە دەشگونجێ پەیوەست بێ بە (ٱلسِّلۡمِ )ەوە، واتە: (بچنەنێو تێکڕای ئاشتییەوە)، واتە: تێکڕای گەردنکەچیی، بە واتایەکی دیکە: هەموو ئیسلام جێبەجێ بکەن، هەڵبەتە هەردوو واتایەکە ڕاستن‌و تێکیش ناگیرێن، دەبێ تێکڕای مسوڵمانان بەبێ هەڵاواردن پابەندبن بە هەموو ئیسلامەوە، وە بەتەواویی گەردنکەچ بن بۆ خوا ﷻ . کە دیارە ئەوەش وەك گوتمان: واتایەکەی ئەوەیە کە شەریعەت سەروەربێ لە ژیانی تێکڕای مسوڵمانانداو، سایەو سێبەریان بێ .

**٣- پێکهێنانی قەوارەو دەوڵەتێکی سیاسیی ئیسلامیی فراوانی یەکگرتوو لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامییدا:**

بەڵگە لەسەر ئەم حاڵەش ئەو ئایـەتەیە كە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ:
﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ ﴾ آل عمـران، واتـە: (وە وەك ئەوانـە مـەبن كـە پەرتـەوازە بوونو ناكۆك بوون، دوای ئەوەی كە بەڵگە ڕوونو ئاشكراكانیان بۆ هـات، وە ئەوانە ئـازارێكی مەزنیـان بۆ دانـدراوە)، كەواتــە: مـسوڵمانان نابـێ پارچـە پارچە بن، ئێـستا مـسوڵمانان بـە هەموویـان لەوانەیـە چـل پـەنجا دەوڵـەتیان هــەبێ، هــەر عــەرەب بیـستو دوو دەوڵـەتیان هەیــە، كـە ئـەوە حاڵـەتێكی نائاساییە، وە لەڕاستیدا حاڵەتێكی ناشـەرعییە، چـونكە بنـەڕەت (أصـل) وایـە مسوڵمانان یەك قەوارەو یەك دەوڵەتیان هـەبێ، كەواتـە: ئـەو حاڵەتـەی ئێـستا حاڵەتێكی نائاساییو ناشەرعییە بە مل مسوڵماناندا هاتوە.

هەروەها پێغەمبـەر ﷺ لە فەرمایشـتێكیدا دەفـەرموێ: {الْمُـسْلِمُونَ تَتَكَافَـأُ دِمَـاؤُهُمْ، وَهُمْ يَـدٌ عَلَى مَـنْ سِــوَاهُمْ، يَـسْعَى بِـذِمَّتِهِمْ أَدْنَـاهُمْ ...} رواه ابـن ماجه: (٢٦٨٣) واللفظ له، وأبوداود: (٢٧٥١)، والنسائي: (٨٦٨١)، وقـال الألبـاني: صحيح. واتە: {مسوڵمانان خوێنیان یەكسانە (و كەسـیان خـوێنی لـە كەسـیدیكەیان بـەنرختر نیـە)، وە هـەموویان یەكدەسـتن لـە بەرانبـەر غـەیری خۆیاندا، وە بچووكترینیـان دەتوانێ بە نــاوی ئەوانـەوە كەسـێك پـەنا بـداتو مافی پەنابـەریی پێبـدات ...}، واتـە: حاڵـەتی ئاسـاییو شـەرعیی ئەوەیـە كـە مسوڵمانان یەك دەستو یەك هێـزو یـەك هەڵوێـست بـن، لـە بەرانبـەر غـەیری خۆیاندا، كەواتـە: مسـوڵمانان دەبێ یەك دەست بنو، كە ئێستا لەوانەیە هەزار دەسـت بـن! مانـای وایـە ئەمـە حاڵـەتێكی ناشــەرعییەو دیـارە گێڕانـەوەی مسوڵمانانیش بۆ حاڵەتە ئاساییەكەیان لەسەر هەموویان فەرزە، چونكە بە یـەكو دووانیان ناكرێت.

**٤- بەرزكردنەوەی ئاڵای ئیسلام بەسەر سەرتاپای زەمینداو گەیاندنی پەیامی خوا ﷻ بە هەموو مرۆڤایەتی، كە بێگومان ئێستاشی لەگەڵدابێ خەڵكێكی زۆر هەیە یان بە هەڵە لە ئیسلام تێگەیشتوە، یان ئیسلامی هەر پێنەگەیشتوە:**

بەڵگە لەسەر ئەم خاڵەش ئەم ئایەتەیە كە خوای بەرزو مەزن دەفەرمویّ:

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾ الأعراف، واتە: (ـ ئەی موحەممەد!ـ بڵێ: ئەی خەڵكینە! من ڕەوانەكراوی خوام بۆ لای ئێوە هەمووتان، ئەو خوایەی كە ئاسمانەكانو زەوی هی ئەون، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، دەژیێنیّو دەمرێنیّ، دەجا ئیمان بێنن بە خواو بە ڕەوانەكراوە پێغەمبەرەكەی كە نەخوێندەوارە، ئەو پێغەمبەرەی كە ئیمان دێنیّ بە خواو بە وشەكانی، وە شوێنی بكەون بەڵكو ڕیّی ڕاست بگرن)، دیارە كە دەڵیّ: ئەی خەڵكینە! ئەوە بە ڕەشو سپیو عەرەبو عەجەمەوە هەمووی دەگرێتەوە.

وە ئەم ئایەتە یەكێكە لەو ئایەتانەی كە بەڵگەن لەسەر ئەوەی پێغەمبەری ئێمە ﷺ بۆ هەموو خەڵكی نێردراوەو، پەیامەكەی ئاڕاستەكەی هەموو مرۆڤایەتیی كراوە.

جا دیارە كە خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كردوە وا بفەرمویّ، ئێمەش كە ئۆممەتی ئەوین، لەسەرمان پێویستە ئەو پەیامەی پێغەمبەر ﷺ بگەیەنینە مرۆڤایەتیی.

ئەوە بەڵگە لەسەر ئەوە كە هەركام لەو چوار خاڵەی سەرەوە، لەسەر هەموو مسوڵمانان فەرزە، ئێمەش وەك كۆمەڵی ئیسلامیی كە بەشێكین لە ئۆممەتی ئیسلامیی، دیارە لەسەرمان پێویستە هاوكاریی هەموو ئەوانە بكەین، كە بەو ئاڕاستەیەدا بۆ هێنانەدی ئەو چوار ئەركانە كاردەكەن.

**سێیەم: دیارە بەبێ جێبەجێكردنی ئەو چوار ئەركە سەرەكییەش، ئۆممەتی ئیسلام ئەركی سەرشانی خۆی لەبەرانبەر مرۆڤایەتییدا بۆ ئەنجام نادرێ:**

ئەركی ئۆممەتی ئیسلام بەرانبەر بە مرۆڤایەتیی وەك خوا ﷻ بۆی دیاریكردوە، دوو خاڵی سەرەكییە:

١) شایەدیی دان بەڕاستیی و تەواویی ئیسلام.

٢) پاكسازیی و چاكسازیی كردنی كۆمەڵگای بەشەریی.

بەڵگەش لەسەر ئەوە كە ئەو دوو ئەركە سەرەكییە لەسەر ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ فەرزكراون لە بەرانبەر مرۆڤایەتییدا، ئەم ئایەتەیە كە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ...﴿١٤٣﴾﴾ البقرة، واتە: (ئاوا ئێوەمان كردوە بە چاكترین كۆمەڵ ـ یان كۆمەڵێكی میانگیر كە كورت نەهێنێ‌و تێنەپەڕێنێ‌و لانەدا نە بەملاداو نە بەولادا ـ تاكو شایەد ـ یان چاودێر ـ بن بەسەر خەڵكییەوە، وە پێغەمبەریش ببێتە شایەد بەسەر ئێوەوە)، شایەد بن، واتە: بەڵگەو شایەدی ڕاستیی ئیسلام بن، كە ئیسلام ئۆممەتێكی ئاوای فەراهەم هێناوە، هەر كەسێك تەماشای ئێوە

بکات، بزانیّ کە ئیسلام راستە، ئیسلام لە خۆتاندا بەرجەستە بکەن، یاخود چاودێربن، واتە: چاودێربن بەسەر مرۆڤایەتییەوە، تا لانەدات بەملاو بەولادا، وە چاودێربن بەسەریەوەو نەهێڵن هێندێکی هێندێکی بخوا، وە هێندێکی ستەمکارو هێندێکی دیکەی ستەملێکراوبیّ، نەك چاودێر بەو مانایەی کە بەزۆر خەڵکی مسوڵمان بکەن، خەڵك ئازادن لەسەر چ بیرۆکەو دینێك دەبن، بەڵام دەبیّ بەسەریانەوە چاودێربن، کە نەهێڵن یەکدی بچەوسێننەوەو ستەم لە یەکدی بکەن، وەك ئێستا کە دەبینین دنیا چۆنە!!

هەروەها بەڵگەش لەسەر ئەوە کە پاکسازیی و چاکسازیی کردنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی، لەسەر ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ فەرزە، ئەم ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمویّ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ...﴿١١٠﴾﴾ آل عمران. کەواتە: وشەی (وَسَطْ)یش پێدەچیّ هەر بە مانای (خَيْرْ) بیّ، واتە: (چاکترین)، وە دەگونجیّ بە مانای (خەتی نێوەڕاست گرتوو) بیّ، لەبەرئەوەی هەر کەسێك خەتی نێوەڕاستی گرت‌و بەملاو بەولادا لاینەدا، چاك دەبیّ‌و هاوسەنگ دەبیّ، مانای وایە هەردوو مانایەکە یەکدی تەواودەکەن.

کەواتە: ئەوە ئەرکی ئۆممەتی پێغەمبەرە ﷺ کە لەنێو مرۆڤایەتییدا ئەو ئەرکانە ئەنجام بدەن‌و دەبیّ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە تۆکمەو توندوتۆڵ‌و دامەزراو بن، کە بتوانن هەرچی شتی باشە بیچەسپێنن لەسەر زەوی‌و لەنێو مرۆڤایەتییدا، وە هەرچی شتی خراپە لایبەن‌و ریشەکێشی بکەن.

جا بێگومان لێرەدا مەبەست ئەوەنیە کە بەزۆر ئیسلام بەسەر خەڵکدا بسەپێنین، بەڵام وەك چۆن ئێستا ئەمریکا دەیەویّ هێندێك بەها (قِيَمْ)ی خۆی بلاوبکاتەوە، "ئیسلام"یش بە حوکمی جیهانیی بوونی، دەبیّ دەنگی زوڵاڵی بگاتە گویّی

هەموو کەس، جا ئەمریکا لەڕێی تۆپو تانکەوە بەهاکانی بڵاودەکاتەوە، بەڵام ئیسلام ئەگەر دەسەڵاتی هەبێ، زەبرو زۆر بەکارناهێنێ، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴿٢٥٦﴾﴾ البقرة، واتە: (تۆبزیی کردن لە ئاییندا نیە ...)، بەڵام ڕەواجیش دەدا بە بەهاکانی خۆی، ڕەواج دەدا بە برایەتیی‌و دادگەریی‌و چاکیی‌و پاکیی‌و ...هتد، وەك چۆن ئێستا ئەمریکا ڕەواج دەدا بەو بەهایانەی خۆی کە زیاتر بەهای ئاژەڵیین‌و لە چوارچێوەی جەستەو غەریزەکاندا دەسووڕێنەوە، ئیسلامیش ئەگەر دەسەڵاتی هەبێ، ئەهلی ئیسلام‌و ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ لەسەریان فەرزە، برەو بدەن بەو بەهاو ڕەوشت‌و ئەدەبە بەرزانەو، بەو بیرۆکە ڕاست‌و دروستانەی کە خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکەن.

جا دیارە ئەگەر ئۆممەتی ئیسلام نەبووژێتەوەو خۆی ڕێك نەخاتەوە، توانای پیادەکردنی شەریعەتی نابێ لە ژیان‌و گوزەرانی خۆیداو، هەتا شەریعەتیش پیادە نەکا، لە ژیان‌و گوزەرانی خۆیدا، ناتوانێ قەوارەو دەوڵەتێکی یەکگرتووو بەهێزی هەبێ‌و، هەتا واش نەبێ، توانای بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام‌و گەیاندنی پەیامی خوا ﷻی بە هەموو خەڵکی سەرزەوی نابێ!

**چوارەم: دیارە بۆ هێنانەدی هەموو ئەو ئامانجانەش، خوای باڵادەست ﷻ گفت‌و بەڵێنی بە مسوڵمانان داوەو، چەند جارێکیش بەگشتی یان بە جوزئیی، بەگوێرەی شایستەیی مسوڵمانان‌و لەخۆدا هێنانەدی ئەو شتانەی خوا ﷻ بەمەرجی گرتوون، ئەو گفت‌و بەڵێنە لەسەر زەوی واقیع هاتۆتەدی:**

بەڵگەمان لەسەر ئەوەش ئەم ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ:

﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا

ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ النور، واتە: ئەگەر ئەو مەرجە لە خۆتاندا ببێننەدیو ئەهلی خوا بەیەكگرتن (توحید)ی ڕاستەقینە بن، ئەوە خوای پەروەردگار ﷻ ئەو بەڵێنانەتان بۆ دێنێتەدی.

جا ئەگەر ئێمە تەماشای مێژوو بكەین، دەبینین قۆناغی پێغەمبەر ﷺو دواتر هاوەڵە بەڕێزەكانیو جێنشینەكانی، بە چاكترین شێوە، خوا بەیەكگرتنیان هێناوەتەدیو بەندایەتییان بۆ خوا ﷻ كردوە، بێ ئەوەی هاوبەشی بۆ بڕیاربدەن، بۆیە خوای پەروەردگاریش ﷻ بە باشترین شێوە بەڵێنەكەی بۆ هێناونەدی، هەروەها لە قۆناغەكانی دواییشدا، هەر كۆمەڵێكو هەر گەلێك كەمو زۆر خوا بەیەكگرتنو تەنیا خوا پەرستنی لە خۆیدا هێنابێتەدی، خوای پەروەردگاریش ﷻ ئەو بەڵێنەی بۆ هێناونەدی، جا غەزنەوییەكان بووبن، كورد بووبن، سەلجوقیی بووبن، توركەكان بووبن، فارس بووبن، لە ئەفریقیا بووبن ...هتد، هەر گەلێك لەهەر شوێنێكی دنیادا بە ئەندازەی ئەوە كە ئەو مەرجەیان هێناوەتەدی، خوای پەروەردگاریش ﷻ ئەو بەڵێنەی بۆ هێناونەدی.

ئینجا ئەوە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، كە لە هەموو قورئاندا ئەو دووە پێكەوە هاتوون، ﴿ءَامَنُواْ﴾ واتە: وەرگرتنی ئەو هەقەی كە خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺدا ناردوویەتی، لێتێگەیشتنیو قبوولكردنی، وەك حاڵەتێكی ئیمانییو عەقیدەییو فیكریی، ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: لەخۆدا بەرجەستەكردنی ئەو هەقەی وەرتگرتوە، وەك ئیمانو عەقیدە، ئینجا كاری

پێبكەی، چونكە ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ یانی: هەموو كردەوەو خەسڵەتە چاكەكانیان ئەنجامداوە، وە خوای پەروەردگار ﷻ ئەو وشەیەی بەكارهێناوە، بۆئەوەی هەرچی كردەوەی چاكە بیگرێتەوە، جا چ پەیوەندیی بە لایەنی عیبادەتەوە هەبێ، چ بە ئەخلاقەوە، چ بە لایەنی هەڵسوكەوتی خێزانییەوە، چ بە لایەنی هەڵسوكەوتی كۆمەڵایەتییەوە، چ بە لایەنی حوكمو سیاسەتەوە، چ بە لایەنی جەنگو ئاشتییەوە، پەیوەندیی بە هەر بوارێكەوە هەبێ، دەیگرێتەوە.

كەواتە: ﴿ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، واتە: مسوڵمانێتییەكی تێرو تەواو، كە لە وەرگرتنی عەقیدەو پیادەكردنی شەریعەتدا بەرجەستەدەبێ.

ئینجا ئەوە كە خوا ﷻ فەرموویەتی، بە تەئكید خوا ﷻ چۆنی فەرمووە، هەروابووەو هەروادەبێ، كە دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾﴾ النور، ئەوەی كە خوا ﷻ فەرموویەتی، ئێمە كە تەماشای مێژوو دەكەین، دەبینین بە جوانترین شێوە ئەو بەڵێنەی خوای پەروەردگار ﷻ هاتۆتەدی بۆ ئیماندااران، بە ئەندازەی ئەوە كە ئەوان مەرجەكەیان لەخۆیاندا هێناوەتەدی، وە ئەو تایبەتمەندییانەیان تێدابووە، كە خوای پەروەردگار ﷻ ئەوانی پێ وەسف كردوە.

# بنەمای بیست و سێیەم

## بەکارهێنانی سەرجەم شێواز و ڕێبازو ئامرازە شەرعییەکان، هەرکامیان لەجێی خۆیدا بۆ هێنانەدی ئامانجەکان.

# بنەمـای بیسـت و سـێـیەم

## بەكارهێنـانی سـەرجەم شـێوازو ڕێـبازو ئـامرازە شـەرعـییەكان، هەركامیان لەجـێی خۆیدا بۆ هـێنـانەدی ئاما نجەكان :

كۆمـەڵی ئیـسلامیی بـەكارهێنانی هـەر هۆكـارێكی شـەرعیی بـۆ گەیـشتن بـە ئامـانج و مەبەسـتە ڕەوایـەكانی، بـە دروسـتو ڕەوا دەزانـێ، وەك: بانگـەواز، ڕاگەیاندن، پەروەردەو فێركردنو تەزكیـە، ڕێكخسـتنو هۆنینـەوە، فـەرمان بـە چاكـەو ڕێگریـی لـە خراپـە، خـەباتی سیاسـیی، جـەنگو بەرەنگاربوونـەوە، هەركامێكـیان لـە بـواری خۆیـداو بـە ئەنـدازەی پێویـستو لـە كـاتو شـوێنی گونجاوی خۆیـدا، چونكـە:

١- خـــوای بـــێ وێنـــە ﷻ فەرموویـــەتی: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ النحـل، واتـە: (بانگـەواز بكـە بـۆ ڕێبـازی پەروەردگـارت بـە حیكمـەتو ئامۆژگـاریی چاكو، بـە باشـترین شێواز گفتوگۆیـان لەگەڵدا بكـە، بێگومـان پـەروەردگارت زانـاترە بـەوەی كـە لەڕێی وی لایـداوەو، هـەر ئـەویش زانـاترە بەوانـەی كـە قبـووڵی هیدایـەتی خوای پـەروەردگـاریان كردووەو ڕێی ڕاست دەگرن).

٢- وە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة، واتە: (خوا ئەو کەسەیە کە لەنێو نەشارەزایەکاندا[1] ڕەوانەکراوێکی لە خۆیان ناردوە، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو، تەزکیەیان دەکاتو، کتێبو حیکمەتیان فێردەکات، وە بێگومان لەوەپێشیش لە گومڕاییەکی ئاشکرادابوون).

٣- هەروەها خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَـٰهِدُواْ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! پارێز لە خوا بکەنو ئامڕازو هۆکار بەرەو خوا دەستەبەربکەنو، لەڕێی خوادا تێبکۆشن بۆئەوەی سەرفرازبن).

٤- وە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الشوری، واتە: (وە مسوڵمانان ئەوانەن کە کاتێك دەستدرێژییان کرایەسەر، تۆڵە دەستێننەوە).

٥- هەروەها خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَقَـٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقرة. واتە: (وە لەڕێی خوادا بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی کە لە دژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، بێگومان خوا دەستدرێژییکارانی خۆشناوێ).

---

١) وشەی (أُمّي) بە نەخوێندەوارو بە نەشارەزاش لە کتێبە ئاسمانییەکان، لێکدراوەتەوەو، مـن واتای دووەمم پێ ڕاسترە.

٦- وە هەروەهـا خـوای پەروەردگـار ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾ الكهف، واتە: {وە دەربارەی (ذُو الْقَرْنَيْنْ) لێت دەپرسن - كێ بووە و چیی كردوە ؟-، بڵێ: لەمەودوا هەواڵی ئەوتان بۆ دەخوێنمەوە، ئێمە لە زەویدا دەسەڵاتمان پێدابوو و بۆ هەر شتێك هۆكارێكمان پێدابوو، ئەویش بەدوای هۆكارەكە دەكەوت}.

## ڕوونكـردنەوە:

ئەم بنـەمایە لە چـوار خاڵ دا ڕوون دەكەینــەوە:

**یەكـەم: ئــەم دنیایــە لەســەر هۆكارەكــان (الأسـباب) بنیــاتنراوە، بۆیــە هەركەسێك بەتەمای ئەنجامدانی كارێك یـان هێنانـەدی ئامانجێك بـێ، پێویستە مشووری پەیـداكردنی هۆكـارەكــانی بخــوا، ئەگـــەرنا هیــچ بە هیــچ ناكـا:**

ئەم دنیایە دنیای هۆكارەكانەو، مرۆڤـ هەر كارێك كە دەیەوێ بیكا یان ئامانجێك كە دەیـەوێ بیهێنـێتـەدی، پەكی لەسـەر چ هۆكارێك كـەوتوەو بە چ ئـامرازێــكو بە چ شێوازێك دێتـەدی، پێویستە مشووری لــێ بخـوا، ئەگـەرنا بـەبێ بـەدیهێنانو فەراهەم كردنی هۆكارو ئامرازەكانی كە ئەو كارو ئامانجە پەكی لەسەریان كـەوتوە، ئەوە لەڕاستیدا خۆ ماندووكردنی بێهوودەیەو هیـچ بـە هـیچ ناكــا، وەك شـاعیری عەرەب (أبي العتـاهیـة) دەڵــێ:

تَرْجُـو النَّجَـاةَ وَلَمْ تَسْـلُكْ مَسَـالِكَهَـا

إِنَّ السَّـفِينَـةَ لا تَجْـرِي عَلَـى اليَـبَسِ

واتە: (بە تـەمای دەربـازبوونی، بـەڵام بـە ڕێی دەربازییـدا نـاڕۆی، بێگومـان كەشــتیی لەســەر وشـــكایی نـاڕوا)، بێگومــان ئەگــەر بتــەوێ كەشـــتییەكەت بەڕێبخـەی، دەبێ بیخەیە نێـو ئـاوێ!

وە خوای كاربەجـێ ﷻ لەوبارەوە كە بەبێ هۆكارو ڕەنـج دان، ئینـسان ناگاتـە ئامانج، فەرموویەتی: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ النجم، واتە: (مرۆڤـ

بەبێ هـەوڵ‌و كۆشش هیـچی دەسـتگیر نابـێ)، كـە بەشـێك لـە هـەوڵ‌و كۆشـش ئەوەیە، تۆ هۆكارەكـان پەیدابكـەی‌و هەر ئامانجـە ڕێی خـۆی‌و ئـامڕازو ڕێبـازی خۆی بۆ بگریەبەر.

هەروەها لەبارەی (ذوالقرنـین)ەوە، فەرموویەتی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾ الكهف، واتە: {وە دەربـارەی (ذوالْقَرْنَیْـنْ) لێـت دەپرسـن: (كێ بووەو چیی كردوە؟)، بڵێ: لەمەودوا هەواڵی ئەوتان بۆ دەخوێنمەوە، ئێمە لـە زەویدا دەسەڵاتـمان پێـدابووو بـۆ هـەر شـتێك هۆكارێكمـان پێـدابوو، ئـەویش بەدوای هۆكارەكە دەكەوت}.

(مَكَّنَـهُ) واتە: لە شوێنی خۆی دانـا، جـا هـەر شـتێك لـە شـوێنی خـۆی بـوو نەجوولا، ئەوە مانای وایە هێزی هەیە، بـەڵام شـت كـە جـووڵاو نـەیتوانی خـۆی بچەسپێنێ، مانای وایە لاوازە، واتە: ئێمە دەسەڵاتـمان پێـدابوو، بۆ هەر كارێـك‌و هەر ئامانجێك هۆكارێكمان پێدابوو، لێرەدا مەبەست ئەوەنیە كە خوای پـەروەردگار ﷻ هۆكارەكەی بە فریشتاندا بۆ ناردبێ، واتە: توانامان دابوویە كـە بـۆ ئەنجامـدانی هەر كارێك، ئامڕازو هۆكاری گونجاوی بۆ پەیدابكاو ڕێبازی خۆی بۆ بگرێتەبـەر، ئەویش بەدوای هۆكارەكان دەكەوت بۆ هێنانەدی ئامانجەكان.

كەواتە: بـەهۆی دابینكردنـی هۆكارەكانـەوە (تـمكین)ی بـۆ پەیـدابووبوو، وە ئێوەش ئەگەر بتانەوێ ئامانجەكانتان بێننـەدی، دەبـێ ئـەو هۆكـارو ئامڕازانـە دابـین بكەن، كە ئەو كارە بەبێ ئەوان نایەتەدی. هەربۆیەش خوای كاربەجێ‌و زانا ﷻ لـە ئایەتی ژمـارە (٣٥)ی سـوورەتی (الـمائدة)دا دوای ئـەوەی فـەرمان بـە بـڕواداران دەكات كە پارێز لە خوا ﷻ بكەن، فـەرمانیان پـێ دەكـات كـە ئامڕازەكـانی بـەرەو

پارێزكاریی و خوا ڕازیی كردن دابین بكەن، پاشان فەرمانیان پێدەكات كە لەپێناوی خوا ﷻدا ئەوپەڕی تێكۆشان بكەن، تاكو لە ئەنجامی ئەوەدا سەرفرازیی بۆ خۆیان مسۆگەر بكەن: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَـٰهِدُواْ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ المائدة.

كەواتە: هەركەسێك بیەوێ پارێزكار بێو، تێكۆشەری ڕێی خوا ﷻ بێو، سەرەنجام سەرفراز بێ، دەبێ خەمی دابینكردنی هۆكارو ئامڕازەكانی پارێزكاریی و جیهادو تێكۆشان دابین بكات.

شایانی باسیشە وشەی (ٱلْوَسِيلَةَ: ئامڕاز) مادام ئەلیفو لام (أل)ی لەسەرە، تێكڕای ئامڕازو هۆكارەكان دەگرێتەوە بە هەموو جۆرو شێوەكانیانەوە، دیارە هەر ئامڕازو هۆكارێك كە بۆ كارو پڕۆژەو ئامانجێك كە پەكی لەسەری كەوتوە.

**دووەم: دیارە هەر ئامانجەش پێویستە هۆكاری لەقەدەر خۆی بۆ دابین بكرێ، ئەگەرنا ئاشكرایە كە هەموو هۆكارێك بۆ هێنانەدی هەموو ئامانجێك دەست نادا:**

بێگومان هەموو كارێكو هەموو ئامانجێكیش، بە هەر هۆكارێكو هەر ئامڕازێك جێبەجێ نابن، بەڵكو دەبێ كارو ئامانجەكە چۆنە، هۆكارو ئامڕازەكانیش كە پەیوەستن بەو كارو ئامانجەوەو پەكی لەسەریان كەوتوە، دابینیان بكەی، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿... وَءَاتَيْنَـٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ ﴾ الكهف، لە هەر شتەی هۆكارێكی پێدرابوو، یان بۆی دانرابوو، هۆكارێكی وەك خۆیو گونجاو لەگەڵ خۆی، كەواتە: هەر كارو ئامانجێكو هەر قۆناغو هەلو مەرجە، هۆكارو ئامڕازی تایبەتی خۆی دەوێ!

هەربۆیەش دەبینین خوای زاناو شارەزا ﷻ لە قۆناغێکدا کە کارو پرۆژەی بانگەواز لە ئارادایە، بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ...﴿١٢٥﴾ ﴾ النحل، وە شێوازە بنەڕەتییەکانی بانگەوازی بۆ دیاریی دەکات، بەلاّم لە قۆناغو هەلو مەرجێکی دیکەدا کە پرۆسەی پەروەردەکردن لەپێشە، شێوازو ئامرازەکانی پەروەردەکردنی پێغەمبەری خۆی ﷺ بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانیو کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەمو پاشان ئۆممەتەکەی دەخاتەڕوو: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ...﴿٢﴾ ﴾ الجمعة، بەلاّم لە هەلو مەرجو قۆناغێکی دیکەدا پێی دەفەرموێ: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ ...﴿٨٤﴾ ﴾ النساء، واتە: (لەڕێی خوادا بجەنگە بەس خۆتت لەسەرە، بەلاّم هانی بڕوادارانیش بدە لەسەر جەنگ ...).

بێگومانیش هەر کارو پرۆژەیە لە قۆناغی خۆیدا، لە کارو پرۆژەکانی دیکە گرنگترو لەپێشترە، پێویستە زۆر وریای ئەو ریزبەندیی (ترتیب)ە بین.

**سێیەم: هەڵبەتە مەرجیش نیە کە هۆکارو شێوازو ئامرازەکانی کارو چالاکیی ئیسلامیی، بەشێوەیەکی وشك (جامد) بەسەر قۆناغەکانی کارو چالاکییەکەدا دابەش بن:**

واتە: لەکاتێکدا کە سەرگەرمی بانگەوازین کاری سیاسیی نەکەین، یان لە گەرمەی تەزکیەی نەفسدا راگەیاندن پشتگوێ بخەین، یان لەکاتی فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپەدا، هیچ حیسابی هەلو مەرجو واقیعی سیاسیی نەکەینو ... هتد.

واتە: كە دەڵێـین: بۆ هەر كارێك پێویستە هۆكارو ئـامرازو ڕێبـازی خـۆی بـۆ بگرینەبەر، مەبەست ئەوەنیە كە لەكاتێكـدا خـەریكی ئـەو كـارەین، شـتەكانیدیكە لێبگەڕێین، بەڵكو پێویستە بزانین كە: هۆكارو ئامرازو شـێوازو ڕێبازەكـانی كـاری ئیسلامیی لەشێوەی ئاڵقەكانی زنجیرێك دان، كە بە هـەموویان زنجیرەكـە پێكـدێنن‌و هیچ كامیشیان بەدیلی ئەوی دیكە نیە و، هیچ كامیشیان ڕێگـری ئـەوی دیكـە نیـە، بەڵكو جاری وایە وا پێویست دەكات كـە لـە یـەك كاتـدا هـەموویان هـەبن، بـەڵام هەركامێكیان لە كات‌و شوێنی خۆیـداو بـە ئەنـدازەی خـۆی‌و، بـە هەماهـەنگی‌و تەبایی لەگەڵ ئەوانی دیكەدا، بۆ وێنە: ئێمە دەمانەوێ بانگەوازی ئیـسلامیی بكـەین لەنێو میللەتی خۆماندا، ئەو بانگەوازە پێویـستیی بە هۆكارەكانی ڕاگەیانـدن هەیـە، وە بەكارهێنانی هۆكارەكانی ڕاگەیاندن، پێویستی بـە كـەش‌و هەوایـەكی سیاسـیی گونجاو هەیە، چونكە ئەگەر تـۆ لەگـەڵ لایەنەكـان تـەبا نـەبی‌و، كـەش‌و هـەوای لـەبارت نـەبێ‌و پێگـەی سیاسـییت نـەبێ، چـۆن هۆیـەكانی ڕاگەیانـدنت بـۆ دەخرێنەگـەڕ، تاكو بتوانی بانگەواز بكەی؟ هەروەهـا تۆ خـەڵك بانگ دەكـەی بـۆ لای خوای پەروەردگار ﷻ، بەڵام خۆ ناكرێ هەر قسەی خـۆت بكـەی‌و بـڕۆی! ئەدی ئەوانەی بەدەنگتەوە هاتن، خۆ دواتر دەبـێ تێبگەیـەنرێن‌و پـەروەردەو تەزكیـە بكرێن، كەواتە: لەڕاستیدا هەموو جموجۆڵەكانی كارو چالاكیی ئیسلامیی پێكـەوە پەیوەستن‌و، وانیـە بلـێی پێكـەوە دژو نـاكۆك بـن، یـاخود جـارێ كـە خـەریكی یەكێكیـان بووی، ئەوانیدیكـە لێبگـەڕێی!

یان وەك هەندێك كەس بۆ نـموونە دەڵێـن: ئەوەی كاری سیاسـیی بكـات نابـێ كاری بانگەواز بكات، وە ئەوەی كـاری پـەروەردە بكـات نابـێ كـاری ڕاگەیانـدن بكات، نەخێر وانیە، هەر خودی مـسوڵمان بۆخـۆی، واتـە: بـێ ئـەوەی بیهێنێتـە بەرچاو، كە لە لایەنێكی ئیسلامیی‌و لە ڕێكخراوێكی ئیسـلامییدایە، مسوڵمان دەبێ

هاوسـەنگ بێو هیچ لایەنێكـی دینـداریی زاڵ نەبێ بەسـەر لایەنەكـەی دیكەیـداو، پێویسـتە هەر لایـەنە هەقی خۆی پێ بدات.

لە صەحیحی بوخارییـدا هاتوە كە: {عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: آخَى النَّبِـيُّ ﷺ بَيْنَ سَلْمَانَ وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، فَزارَ سَلْمَانُ أَبَـا الـدَّرداءِ فَـرَأَى أُمَّ الـدَّرداءِ مُتَبَذِّلَـةً، فَقَالَ: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: أَخُوكَ أَبُو الـدَّردَاءِ لَـيْسَ لَـهُ حَاجَـةٌ فِي الدُّنْيَـا، فَجـاءَ أَبُـو الدَّرْدَاءِ فَصَنَعَ لَهُ طَعَاماً، فَقَالَ لَهُ: كُلْ فَإِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: مَـا أنـا بِآكِـلٍ حَتَّى تَأْكُـلَ فَأَكَلَ، فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يَقُومُ فَقَالَ لَهُ: نَمْ، فَنَـامَ، ثُـمَّ ذَهَــبَ يَقُـومُ فَقَالَ لَهُ: نَمْ. فَلَمَّا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ قَالَ سَلْمَانُ: قُمْ الآن، فَصَلَّيَا جَمِيعـاً فَقَـالَ لَـهُ سَلْمَانُ: إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيكَ حَقًّا، وَلأَهْلِكَ عَلَيكَ حَقّـاً، فَـأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقّ حَقَّهُ، فَأَتَى النَّبِـيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذلِكَ لَهُ فَقَالَ النَّبِـيُّ ﷺ: صَدَقَ سَلْمَانُ} رواه البخاري: (١٩٦٨)، واتە: (لە بابی جوحەیفە وەهبـی كوڕی عەبدوڵـلا خـوا لێی ڕازی بێ دەگێـڕنەوە كـە گوتوویـەتی: پێغەمبــەر، سەلــمانی فارسـیی و بـابی دەردائـی كردنـە برا، جا جارێكیان سەلـمان سەردانی مـاڵی بـابی دەردائـی كـرد، دایكی دەردائی بینـی جلوبەرگێكــی شــڕو شـەپڕێوی لەبـەردابوو، گـوتی: ئـەوە بۆچی وەهای؟ - دایكی دەرداء - گوتی: بابی دەردائـی برات پێویسـتی بە دنیا نیـە، جا كە بابی دەرداء هاتـەوە، خواردنێكی بۆ ئامادەكردو - بە سەلـمانی - گوت: بخـۆ من بەڕۆژووم، - سـەلـمان - گوتی: من ناخۆم تا تـۆش نـەخۆی، ئیـدی ئـەویش خواردی، وە كە شەو داهات بابی دەرداء چـوو شـەونوێژ بكـات، -سـەلمان- پـێی گوت: بنوو، ئەویش نوست، پاشان هەستا بچێ شەونوێژ بكـات، دیـسان پـێی گوت: بنوو، ئەویش نوست، جا كە بووە سێیەكی كۆتایی شەو، سەلـمان گوتی: ئێستا هەستە - شـەونوێـژ بكە -، ئیدی بەیەكەوە شەونوێژیان كرد، جا سەلـمان بـە بابی دەردائی گوت: بێگومان پـەروەردگارت مـافی لەسـەرت هەیـە، وە بێگومـان خۆیشت مافت لەسەرت هەیە، وە هاوسەرت مـافی لەسـەرت هەیـە، دەجـا هـەر

خاوەن مافێك مافی خۆی پێبدە، پاشان ـ بـابی دەرداء ـ هاتـەلای پێغەمبـەرو بـۆی گێڕایەوە، پێغەمبەریش فەرمووی: سەلـمان ڕاستی كرد).

بەڵێ مسوڵمان دەبێ هاوسەنگ بێ، نابێ لاتـەڵ بێو لایـەك لەسـەر حیـسابی لایەكی دیكە گەورەبكا، یاخود لە كاتێكدا كە خـەریكی ئەنجامـدانی چـالاكییەكە، لایەنەكانی دیكە پشتگوێ بخا.

بەڵام دیسان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە ڕەچاوكردنی ڕیزبەنـدیی كـاتیی (الترتیـب الزمني) لەنێوان ئەو هۆكارو ئامراززو شێوازانەدا نیـە، بـەڵكو ئـەوەش پێویـستە، كـە دەتوانین بەشێوەیەكی ئـاوا ڕیزیـان بكـەین: بانگـەوازو ڕاگەیانـدن لـەپێش هـەموو شتێكەوەیە، پاشان پەروەردەو فێركـردنو تەزكیـەكردن، ئینجـا دوایـی هۆنینـەوەو ڕێكخستن، ئینجـا دوایی خەباتی سیاسیی، ئینجا دوای ئەوە بـەرگریی لـەخۆكردن لــەكاتی دەســتدرێژیی كرانەســەرو شــەڕپێ فرۆشــراندا، وە پاشــان جــەنگو بەرەنگاربوونەوە لەكاتی ستەم لێكرانی دینیـیو ژینییدا، ئەوانـە بـەپێی ڕیزكردنـی كاتیی (التـرتیب الزمنـي) بەو شێوەیەن، بـەڵام جـاری واش هەیـە یـەكێكیان پـێش ئەویدیكــە دەكەوێتــەوە، لــە قۆنــاغو هــەلو مەرجێكــدا بــەهۆی گۆڕانكــاریی بارودۆخێـك كە دێتـەپێش.

## چـوارەم: بێگومـان دۆزینــەوەو بەكارهێنــانی شــێوازو ئـامڕازی پــڕ بــە پێـستو بـە ئامـانج گەیەنـەر، لـە بـواری كـارو چـالاكی ئیـسلامییدا، لـێزانییو ژیریی‌و وردبینیـی‌و دووربینییەكـی زۆری دەوێ:

هەربۆیەش پەندێك هەیە دەڵێ: (رُبَّ حِيلَةٍ أَنْجَعُ مِـنْ وَسِـيلَةٍ)، واتـە: (جـاری وایە تەدبیر كردنێك سوودی زیاترە لە هۆكارێك)، مەبەستی ئەوەیە كە جـاری وایـە

بەکارهێنانی عەقڵ مەسرەفێکی زۆرت لەکۆڵ دەکاتەوە، یانی مەرج نیە هەمووی بە توانا ماددییەکان بکرێ، بەڕاستی بەکارهێنانی عەقڵو نەخشەو بەرنامەدانان کاریگەریی زۆری هەیە.

بەڵام دیارە خوای بەخشەر ﷻ بەڵێنی بە بڕواداران داوە، کە هەرکەسێك ئەگەر بەڕاستیی و دڵسۆزیی و ساغیی بەرەو خوا ﷻ تێبکۆشێ، خوا ﷻ بەرەو ڕێبازو شێوازە بەئامانج گەیەنەرەکانی کاری ئیسلامیی ڕێنمایی دەکات و، تێیدەگەیەنێ کە دەبێ لە هەر قۆناغێکدا چۆن بکەن؟ وە چیی بکەن؟ وە چ ڕێبازێك و چ شێوازێك و چ ئامرازێك بەکاربێنن؟ وەك خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: (وە ئەوانەی بە دڵسۆزیی لەڕێی ئێمەدا تێدەکۆشن، ئەوە بێگومان ئێمە ڕێبازەکانی خۆمانیان پیشاندەدەین، وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە). واتە: ئەوانەی ئیخلاسیان هەیە بۆ خوا ﷻ و خۆشیان ماندووەدەکەن، دەیانخەینەسەر ڕێگاکانی خۆمان و ئەو هۆکارو شێوازو ئامرازانەی خۆمانیان پیشاندەدەین، کە دەیانگەیەنن بەو ئامانجانەی دەیانەوێ بیانهێننەدی.

پێشتریش باسمانکرد کە ئەم ئایەتە قورئانییە، یەکەمین ئایەتە لە قورئاندا کە وشەی (سُبُلْ)[1]ی بە کۆ پاڵدابێتە لای خوای پەروەردگار ﷻ، چونکە لە قورئاندا هەمیشە وشەی (سَبِيلْ) بە تاك پاڵدراوەتە لای خوا ﷻ، وەك: (سَبِيلِ رَبِّكَ، سَبِيلَنَا، سَبِيلِهِ، سَبِيلِ اللهِ)، بەڵام لێرەدا یەك شوێنی ناوازەیە کە خوا ﷻ وشەی (سُبُلْ) واتە: (ڕێیەکان)ی کۆکردۆتەوەو پاڵیداوەتە لای خۆی، کە یەکێك بۆی هەیە بپرسێ و بڵێ: باشە خوا ﷻ یەك ڕێی هەیە کە ئیسلامە، ئیسلامیش یەك ئیسلامەو

١) وشەی (سُبُلْ) کۆی وشەی (سَبِيلْ)ە، (سَبِيلْ) واتە: ڕێگا، وە (سُبُلْ) واتە: ڕێگاکان.

بەندایەتیی بۆ خوا کردنیش ﷻ یەك ڕێبازی هەیەو یەك ڕاستە شەقامە، ئەدی لێرەدا یانی چیی خوا ﷻ کۆیکردۆتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لێرەدا مەبەست لە وشەی (سُبُلْ) ڕێبازی خوا ﷻ نیە، بەو مانایەی کە دینەکەی و شەریعەتەکەی و بەرنامەکەی بێ، بەڵکو مەبەست پێی ئەو هۆکارو شێوازو چۆنیەتییانەیە، کە خزمەتی دینی خوای پەروەردگار ﷻیان پێ دەکرێ. بۆیە دەفەرمویێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ ﴾، واتە: ئەو ڕێیانەی کە ئێمە لێیان ڕازین بۆ خزمەتی دینی خۆمانو بەرنامەی خۆمان، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە شەرعییانە ئەو ڕێیانەیان پێشاندەدەین.

کەواتە: ڕێبازی خوا (سَبِيلُ الله) ﷻ یەکە، بەلام خزمەتکردنی ئەو ڕێبازەو پیادەکردنی ڕێبازەکانیو شێوازەکانی زۆرو جۆراوجۆرن!

ئینجا ئەم ئایەتە بەڕاستی زۆر جێی دڵخۆشییە، کە ئینسان ئەگەر دڵسۆزیی هەبێ بۆ خوا ﷻ، خوای پەروەردگار ﷻ لە هەر قۆناغەو لەهەر هەلو مەرجەدا، چ وەك تاك، چ وەك کۆمەڵ، هیدایەتی ئینسان دەدا، بە مەرجێك ئەو دوو سیفەتەی تێدابن: ﴿جَٰهَدُواْ فِينَا﴾، واتە: خۆی ماندوو بکاتو کۆشش بکات بەپێی توانا، وە لە پێناوی خوا ﷻدابێ، دەبێ هەوڵ بداتو کۆشش بکات، وە دڵسۆزیشی هەبێ. هەر کاتێك ئەو ئینسانە یان ئەو کۆمەڵە، ئەو دوو سیفەتەی لەخۆیدا هێنانەدی، ئەوە بەتەئکید ئەو ئەنجامەی لێدەکەوێتەوەو ئەو بەرهەمەی دێتە دەست، کە بریتیە لە هیدایەتی خوا ﷻ بۆیو، خوای پەروەردگار ﷻ ڕێنمایی دەکات کە ئەو شێوازو ڕێبازانە بەکاربێنێ، کە دەیگەیەننە ئامانجە شەرعییەکان.

دیارە وەك گوتم: بۆیە خوا ﷻ وشەی (سُبُلْ)ی بەکارهێناوە، چونکە لە هەر قۆناغو هەلو مەرجەدا شێوازێك پەیڕەودەکرێو بە ڕێبازێكو شێوەو

چۆنیەتییەكی تایبەت خزمەتی دینی خوا دەكرێ، كەواتە: شێوازو ڕێبازەكانی كارو تێكۆشان زۆرو جۆراوجۆرن‌و، ئەگەر گریمان شێوازو ڕێبازی كارو تێكۆشان، هەر یەكێك بووایە، ئەوە ئایەتەكە هەر بە (سَبِيلْ) دەیهێنا، بەلاَم دیارە ڕێی خوا ﷻ یەكە، بەلاَم ڕێیەكانی خزمەت بە دینی خوا ﷻ زۆرو جۆراوجۆرن، بەپێی ئەو هەل‌و مەرجە گۆڕاوانەی كە مسوڵمانان تێیاندا دەژین.

**لە كۆتایی توێژینەوەماندا لەبارەی ئەم بنەمای بیست‌و سێیەمەوە، دەڵێم:**

بێگومان ـ وەك پێشتریش گوتمان ـ دیاریكردنی قۆناغەكانی كارو پڕۆژەی ئیسلامیی‌و دانانی ڕیزبەندیی (ترتیب)یەكی ڕاست‌و دروست بۆیان‌و، پاشان بەكارهێنانی هۆكارو ئامڕازو شێوازی پڕ بەپێست، بۆ هەر قۆناغەو هەر كارو چالاكییە، حیكمەت‌و كارامەیی‌و وردبینیی‌و دووربینییەكی زۆری پێویستەو، بەهەڵەداچوونیش لەو بوارەدا دەرەنجامی زۆر گەورەو مەترسیداری لێدەكەوێتەوە، ئاشكراشە ئەو حیكمەت‌و كارامەیی‌و وردبینیی‌و دووربینییە، زادەی زانیاریی‌و شارەزایی قووڵ‌و فراوانە بە قورئان‌و سوننەت‌و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ‌و، بەرچاوڕوونیی‌و ئاشنایی باش بە واقیع‌و هەل‌و مەرجی كۆمەڵگایە لە هەموو ڕووەكانەوە: فیكریی، سیاسیی، كۆمەلاَیەتیی، ئابووریی، كلتووریی ...هتد.

هەڵبەتە ئەوەش بۆ هەموو كەس دەستەبەر نابێ‌و پێویستە هەركەسە باش خۆی بناسێ، خۆی لە قەرەی كارێك نەدا كە لە توانای بەدەرەو، جوانیش گوتراوە: (رَحِمَ اللهُ عَبْدًا عَرَفَ قَدْرَ نَفْسِهِ، فَوَقَفَ عِنْدَ حَدِّهِ)، واتە: (خوا ڕەحم بەو بەندەیە بكات كە خۆی ناسیوەو لە سنووری خۆیدا وەستاوە)!

بەڵام پێویستە بزانرێ کە لە هەموو قۆناغو هەلو مەرجەکانی کارو پرۆژەی ئیسلامییدا، پێویستە دوو سیفەتی بنەڕەتیی رەچاوبکرێنو هەرگیز لەبیرنەکرێن:

**١) قبوولْ نەکردنی زەبوونییو سەرشۆڕیی و تەسلیم بوونو، هەردەم ئامادەبوونی گیانی بەرهەڵستییو فیداکارییو خۆبەختکردن لەپێناوی خوا ﷻ و رێبازەکەیدا:**

هەربۆیەش دەبینین خوای کاربەجێ ﷻ لە قۆناغی مەککەدا کە جارێ جەنگو جیهادیش لەسەر بڕواداران فەرز نەبووە، کۆمەڵی مسوڵمانی بە چەند خەسڵەتێك پێناسەکردوە، کە یەکێکیان بەرپەرچدانەوەی ستەمو دەستدرێژییە کە دەکرێتەسەر شخص (خود)ی هەر کامێکیان، وەك فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾﴾ الشورى، واتە: (وە ئیمانداران ئەوانەن کە دەستدرێژییان کرایەسەر تۆڵە دەستێننەوە)!

**٢) نەبەزاندنی سنوورەکانی شەریعەت:**

هەربۆیەش خوا ﷻ لە گەرمەی فەرمان کردنی بە جەنگو جیهادیشدا، فەرمان بە مسوڵمانانی جەنگاوەر دەکات، کە سنوور نەبەزێننو دەستدرێژیی نەکەن، دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ البقرة، واتە: (وە لەپێناوی خوادا جەنگ لە دژی ئەوانە بکەن کە شەڕتان پێدەفرۆشن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێن).

# بنەمای بیست و چوارەم

## چەسپاندنی زەبت و ڕەبتی حیزبیی و جێبەجێكردنی بەسەر هەموو لایەكدا.

كۆمەڵی ئیسلامیی لەڕووی سیستەم و بەڕێوەبردنی كاروباری نێوخۆیەوە، بڕوای بە تۆكمەیی‌و توندوتۆڵیی‌و جیددیی بوون هەیەو، بەهیچ جۆرێك قبووڵ ناكات كەس لە بنەما شەرعییەكان‌و هێڵە گشتییەكانی‌و بەرنامەو پەیڕەوی نێوخۆی لابداتو، ڕێ بە هیچ كەس نادا تاكڕەوانە ڕەفتار بكات، وە بە هیچ شێوەیەك‌و بە هیچ پاساوێك ڕێ بە ماڵ ماڵۆكێنەو دەستەگەریی (تَكَتُّلْ)و سەرپێكەوەنان‌و چپەچپ ناداو، ئامادەشە دەستبەرداری هەر ئەندامێكی گەورە یان گچكەی ببێ كە نەتوانێ پابەند بێ‌و، واز لەو جۆرە ڕەفتارانە بێنێ، دوای ئەوەی قۆناغەكانی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەبڕدرێن، چونكە بێگومان دەستبەرداربوون لە ئەندامێكی لارو لاسار، زیانی كەمترە لە تێكچوون‌و شیرازە پچڕانی سەرجەم كۆمەڵەكە.

دیارە سەركردایەتیی‌و مشوورخۆرانی بالای (كۆمەڵی ئیسلامیی)یش هەمیشە هەوڵدەدەن لە ئاستی بەرزی دینداریی‌و پارێزكاریی‌و دڵسۆزیی دابن‌و، بەهیچ جۆرێك بیانوو و پاساوی هەڵوێست‌و ڕەفتاری نارێك‌و لار، نەدەنە دەستی هیچ ئەندامێكەوە.

وە لەكاتی مشتومڕ و ناكۆكیی و راجیایی نێوان ئەندامانداا، لەهەر ئاستێك دابن، پێویستە بگەڕێنەوە بۆ تەرازووی شەریعەتو بەگوێرەی قورئانو سوننەتو بنەما رۆشنەكانیان دادوەریی یان لەنێواندا بكرێ، وەك:

١- خوای كاربەجێ ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٠٥﴾ المائدة، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وریای خۆتان بن، ئەگەر ئێوە رێی راست بگرن، كەسانێك كە گومڕان، زیانتان پێ ناگەیەنن، هەموو لایەكتان بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، جا هەواڵتان پێدەدا بەوەی كە دەتانكرد).

٢- وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾ النساء، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرو هی كاربەدەستانێك كە لەخۆتانن بكەن، وە ئەگەر لە شتێكدا كەوتنە ناكۆكییەوە، بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە رۆژی دوایی هەیە، ئەوە باشترەو سەرەنجامی چاكترە).

٣- هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٤ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢٥﴾ الأنفال، واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان

هێنـــاوە! بـەدەم فـەرمانی خــواو پێغەمبــەری خــواوە بــچن، هــەر كاتێـك بانگیان كردن بۆ شتێك كە پێی زیندوودەبنەوەو دەژییێنەوە، وە بـزانن كـە خوا دەكەوێتـە نێوان ئینسـانو دڵییـەوە، وە بـۆ لای ئـەویش كۆدەكرێنـەوە، وە خۆتـان بپـارێزن لـە بەڵایـەك كـە تەنیــاو بەتایبـەتی تووشـی ئەوانـەتان نابێت كە ستەمیان كردوە، وە بزانن كە خوا سزای توندە).

٤- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {(الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا)، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ} رواه البخـاري: (٢٤٤٦) واللفظ لـه، ومسلم: (٢٥٨٥)، عن أبي موسى الأشعري، واته: (بـڕوادار بـۆ بـڕوادار وەك دیــوار وایــە، هێندێكــی هێندێكــی بــەهێز دەكــات)، - ڕاوی دەڵــێ- وە پەنجەكانیشی خستنە نێویەكەوە.

٥- وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی پێویست بوونی ڕێكوپێكیی مسوڵمانانەوە فەرموویــەتی: (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ، أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ) رواه البخاري: (٧١٧)، ومسلم: (٤٣٦)، عن النعمان بن بشير، واته: (بە تەئكید دەبێ ڕیزەكانتـان ڕێكبخـەن، یـان ئـەوەتا بەدڵنیــایی خــوا ڕووتـان لێـك وەردەگێـڕێ).

٦- هــەروەها پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: (الْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ إِلاَّ شَرْطًا حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَامًا) رواه الترمذي: (١٣٥٢)، عن عمرو بن عوف، وقال الألباني: صحيح، واتـە: (مـسوڵمانان بـەپێی مەرجـەكانی خۆیــانن، مەگــەر مــەرجێك حــەڵاڵێكی تێــدا قەدەغــەكرابێ، یــاخود قەدەغەكراوێكی تێدا حەڵاڵ كرابێت)، واته: مسوڵمانان دەبێ پابەندبن بـەو مەرجانـەوە كـە لـەنێوان خۆیانـدا دەیـانگرن، مەگـەر مـەرجێك پێـچەوانەی شـەریعەت بـێ ، ئەگـەرنا لەسـەر مـسوڵمانان پێویـستە بـە مەرجەكانیانـەوە پابەندبن.

## ڕوونكـردنەوە:

ئەم بنەمـایە لە پێنـج خـاڵ دا ڕووندەكەینـــەوە:

**یەكـەم: دیـارە هـیچ كـارو پـڕۆژەیـەكی بەكۆمـەڵ، بـەبێ هـەبوونی چـەند مـەرج و بنەمایـەك بـۆ چـۆنیەتی كۆبوونـەوەو پێكـەوە كاركردنیـان، بەڕێوەناچێ، بۆیە پێویـستە سـەرجەم ئەنـدامانی كۆمـەڵی ئیـسلامیی بە سەرو خوارو درشتو وردەوە، زۆر بەجیـددیی پابەنـدی ئـەو بنـەما گشتیو هێڵە سەرەكییانە بن، كـە وەك مەرجـەكان (شـروط)ی پێكـەوە كاركردنیان لەسەریان ڕێككەوتوون:**

واتــە: چ ڕێكخراوێكــی سیاســیی بــێ، چ ڕێكخراوێكــی مــەدەنیی بــێ، چ ڕێكخراوێكی پیشەیی بێ، هەر كارێك بێ، مادام پێویستی بە كـاری هـەرەوەزیی و كۆبوونەوەی خەڵكێك بـێ، بـەبێ هـەبوونی چـەند مـەرج و بنەمایـەك بـۆ چـۆنێتی كۆبوونەوەو پێكەوە كاركردنیان بەڕێوەناچێ و ئەو پڕۆژەیە سەرناگرێ، بۆیە پێویستە سـەرجەم ئەنـدامانی كۆمـەڵی ئیـسلامیی بـە سـەرو خـوارو درشـتو وردەوە زۆر بەجیددیی پابەندی ئەو بنـەما گـشتیو هێڵـە سـەرەكییانە بـن، كـە وەك مەرجـەكان (شروط)ی پێكەوە كاركردنیان لەسەریان ڕێكدەكەون.

چونكە بێگومان هیچ كۆڕو كۆمەڵێك بەبێ تۆكمەیی و توندوتۆڵیی و ڕێكـوپێكی نێوخۆ، مەحاڵە هـیچ شـتێكیان لەدەسـت بـێ، هەربۆیـەش خـوای پـەنهانبین ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ...﴿١٠٥﴾﴾، واتە: {ئەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـــاوە! وریـای خۆتـان بـن، (كـاری

خۆتـان ڕێكبخـەن‌و بزانـن چـۆن پێكـەوە مامەڵـە دەكـەن)، ئەگـەر ئێـوە دینداری بـاش بـن، ئـەوەی ڕێـی ڕاسـتی ونكـردوەو دژایـەتی ئێـوە دەكـات زیانتـان پێ ناگـەیەنێ ...} .

لەڕاستیدا هەروایـەو، هەمیشە ئـەهلی ئیسلام دوژمنـەكانیان بـەهۆی كەموكووڕییـەكانی خۆیانـەوەو لـە كـەلێن‌و درزەكانیانـەوە زەفـەریان پێبردوون، هەروەها كەسێك بۆخۆی كاری ڕێكوپێك نەبێ، بێگومـان لەگـەڵ دەرەوەی خـۆی هیچی پێناكرێ، وەك گوتراوە: (إِنَّ فَاقِـدَ الـشَّيْءِ لا يُعْطِيـهِ)، واتـە: (كەسێك شتێكی نەبێ ناتوانێ بیبەخشێ)، ئێمە ئەگەر خۆمـان ڕێـك نـەبین، خـەڵكمان بـۆ ڕێكناخرێ، خۆمان ڕاست نـەبین، خـەڵكمان پـێ ڕاستنابێتـەوە، خۆمـان پـاك نەبین، خەڵكمان پێ پاكسازیی ناكرێ، وە ئەگەر خۆمان چاك نەبین، خەڵكمان پێ چاكسازیی ناكرێ.

**دووەم: دیـارە پابەنـدییش بـەو بنـەما گـشتی‌و مەرجانـەوە كـە مـشوورخۆران‌و سـەركردایەتیی ئـەو كۆمەڵـە لەسـەریان ڕێككـەوتوون، فـەرزەو، بەكەمتەرخـەمیی تێداكـردنی، مرۆڤـ گوناهـبار دەبـێ، لـە هەر ئاستێك دابێ:**

زۆربەی جـار وایە ئەو بنەما گشتی‌و مەرج‌و هێڵە شەرعییانە كـە دیاریـدەكرێن، یان لە كۆنگرەدا بە ڕای هەموو یـان زۆربـەی ئەنـدامانی كۆنگـرە دیاریـدەكرێن، یاخود سەركردایەتیی‌و ئەوانەی مشوورخۆرن، دیارییان دەكەن، هەڵبەتـە هەرچـۆن بێ ئەو مەرج‌و بنەمـا شـەرعییانە كە ئەو كۆمەڵە لەسەریان پێكدێن، جـا میكـانیزمی دانرانیان هەرچۆنێك بووبێ، مادام هەموویان یان زۆربەیان قەناعەتیان بـەو مـەرج‌و

بنەمایانە هەبێ، پابەندبوون پێیانەوە فەرزە، واتە: بە پێوە پابەندنەبوونیان مرۆڤ گوناهباردەبێو، بە پێوە پابەندبوونیشیان پاداشتی دەبێ، جا ئیدی ئەو كەسە لە هەر ئاستێكدابێ، چونكە ئەو مەرجانەی خەڵكمان لەسەریان كۆبۆتەوە، ئێمە بەو مەرجانە پێكەوە كاردەكەین، ئاوا لە ئیسلام تێگەیشتووینو دەمانەوێ ئاوا بكەینو ئاوا لەگەڵ واقیعدا مامەڵە بكەین، بۆیە پابەندیی پێیانەوە فەرزەو لێ لادانیشیان قەدەغەو حەرامە، وە لەسەر پابەندبوون پێیانەوە پاداشت هەیەو، لەسەر كەمتەرخەمیی تێداكردن، یاخود لێ لادانیان، گوناهباریی هەیە، چونكە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ...﴿٥٩﴾﴾.

پێغەمبەریش ﷺ كە دەفەرموێ: {(الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا)، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ} وەك پێشتر هێنامان، ئایا مسوڵمان چۆن براو خوشكی مسوڵمانی پتەو دەكات؟ دیارە وا پتەوی دەكات، كە هەر كامێكیان هاوكارو دەستبارگری ئەویدیكەبێو، پابەندی ئەو بەرنامەو ڕێبازە بێ كە دانراوە، ئەمما ئەگەر هەر كەسەو ڕووی لەلایەك بێو پێكەوە هاوكار نەبنو دەستباری یەكدی نەگرن، مانای وایە یەكدییان بەهێز نەكرد، جا كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئیماندار بۆ ئیماندار وەك دیوار وایە یەكدی مەحكەم دەكات، مانای وایە ئەگەر وانەبینو هەر كەسەو ڕووی لە لایەك بێ، بەلایەنی كەمەوە كەموكوڕیی لە ئیمانماندا هەیە، چونكە ئەو دەفەرموێ: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوار وایە، ئەدی ئەگەر وەك دیوار نەبووینو یەكدیمان مەحكەم نەكرد؟ وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ بە پەنجە موبارەكەكانیشی ئاماژەی پێداوە، بۆئەوەی چاك تێبگەین، (وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ)، مانای وایە ئەگەر ئیمانداران بەڕاستی ئیمانداربن، دەبێ

پێكەوە ئاوابن‌و بۆ یەكدی ئاوابن، ئەگەر وا نەبوون مانای وایە خەوش‌و كەم‌و كوڕیی لە ئیمانیاندا هەیە!

كەواتە: پشتی یەكدی گرتنی ئێمە لەسەر هەق، بۆئەوەی ئەو بەرنامەیەی كە دانراوە پێكەوە پیادەی بكەین، ئەوە لە خودی ئیمانەكەمانەوە سەرچاوە دەگرێ‌و، مادام ئیمانداران‌و مسوڵمانین، دەبێ وابین.

ئینجا هاندەرێكی دیكەش هەیە، ئەویش ئەوەیە كە هەركاتێك كۆمەڵێك لەسەر هەندێك شت پێكهاتن، وەك مەرجی نێوخۆیان، لەسەریان پێویستە بەو مەرجانەوە پابەندبن، چونكە بەڵێن‌و بڕیاریان بە یەكدی داوە، هاندەری یەكەم لە ئیمانەوە هەڵدەقوڵێ‌و، هاندەری دووەم لە بەڵێنی كارێكی هاوبەش كە بڕیاردراوە پابەندی پێوە بكرێ‌و بەو شێوەیە ئەنجامبدرێ، وەك فەرمایشتەكەی پێغەمبەر ﷺ كە هێنامان: {الْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ إِلاَّ شَرْطًا حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَامًا} رواه الترمذي: (١٣٥٢)، عن عمرو بن عوف، وقال الألباني: صحيح، واتە: مسوڵمانان دەبێ بە مەرجەكانیانەوە پابەندبن، مەگەر مەرجێك كە ناشەرعیی بێ، دیارە كۆمەڵێكی ئیسلامییش بەتەئكید دەبێ خۆی بپارێزێ لە شتی ناشەرعیی.

ئینجا دەڵێین: هەرچەندە كارو چالاكیی ئیسلامیی بە هەموو موفرەدەو رەهەندەكانیەوە، هەر لە بانگەوازەوە بگرە، هەتاكو مەسەلەی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەو هەر شتێكی دیكە، بە ماناو چەمكی فراوانیان، كە سەرجەم بوارەكانی دین‌و ژین دەگرنەوە، فەرزو پێویستەو، ئەگەر فەرزی عەین نەبێ، لەسەر تاك تاكی ئەو كۆمەڵە، بەلای كەمەوە فەرزی كیفایەیە، كە دیارە:

**فەرزی عەین**: ئەوەیە كە بەبێ ئەو كەسە نەكرێ، یان بەتایبەت ڕوو لەو كەسە بكات، بەڵام **فەرزی كیفایە**: ئەوەیە كە بەگشتی ڕوو لە خەڵكەكە دەكات‌و بە

هەندێك لە خەڵکەکەش جێبەجێ دەکرێ، ئەگەرنا هەرکاتێك فەرزی کیفایەش پەکی لەسەر کۆمەڵێکی دیاریکراو کەوت، لەسەریان دەبێتە فەرزی عەین، یاخود ئەگەر پەکی لەسەر کەسێکی دیاریکراو کەوت، لەسەری دەبێتە فەرزی عەین، بۆ وێنە: ئەگەر لە دێیەکدا تەنیا یەك کەس هەبێ بزانێ نوێژی مردوو بکات، لەسەری دەبێتە فەرزی عەین، چونکە هەر ئەو هەیە بیزانێ‌و ئەوانیدیکە نایزانن، وە ئەگەر هەر یەك کەس هەبێ بتوانێ وتاری هەینییان بۆ بدا، لەسەری دەبێتە فەرزی عەین، وە ئەگەر هەر یەك کەس لەوێ بتوانێ پێشنوێژییان بۆ بکات (لەسەر رای ئەو زانایانەی کە دەڵێن: نوێژی بە کۆمەڵ فەرزی کیفایەیە)، ئەوە لەسەر ئەو کەسە دەبێتە فەرزی عەین، وە هەروەها هەموو فەرزەکانیدیکەش، بۆ وێنە: ئەگەر هەر یەك کەس هەبێ بتوانێ ئاشتەواییان لەنێواندا بکات، کاتێك کە تێکدەچن لەنێوان خۆیاندا، لەسەری دەبێتە فەرزی عەین، کەواتە: فەرزە کیفائییەکانیش دەبنەوە فەرزی عەین، لەو کاتەدا کە پەکیان لەسەر کەسێکی دیاریکراو، یاخود چەند کەسێکی دیاریکراو دەکەوێ، کە من پێموایە ئەمڕۆ کارو چالاکیی ئیسلامیی بۆ ئێمەی ئیسلامیی، کۆمەڵی ئیسلامیی‌و خەڵکیدیکەی ئیسلامیی کە لەگەڵمان لە گۆڕەپانەکەدا هەن، بۆتە فەرزی عەین، لەبەرئەوەی پەکی لەسەر ئێمە کەوتووە، هەرکامێك لە ئێمە شانی لەژێر بێنێتەدەر، خەلەل‌و کەم‌و کوڕیی روو لە کارەکە دەکات.

ئینجا ئەگەر گریمان ئەو موفرەدەو رەهەندانەی کارو چالاکیی ئیسلامیی بە فەرزیش دانەنرێن، ئەوە بێگومان وەفاداربوون بەرانبەر پەیمان پێکەوە بەستنیان، وەك هەر مامەڵەیەکی گرێبەستییانە (تعامل تعاقدي)ی دیکە، کە لەگەڵ یەکدی دەکەن‌و، بە حوکمی پێویست بوونی پابەندیی بەگرێبەستەکانەوە، لەسەریان دەبێتە فەرزی عەین، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ

...﴿١﴾ المائدة، واته: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەفادارو پابەندبن بە گرێبەستەکانەوە ...).

وە بە حوکمی فەڕزبوونی جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەوە، کە کۆمەڵێك لەنێوخۆیاندا لەسەریان پێکدێن: (الْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ) رواه الترمذي: (١٣٥٢)، عن عمرو بن عوف، وقال الألباني: صحيح. ئەوە دیسان هەر پێویستە جێبەجێ بکرێ، چونکە ئێمە کاتێك پێکەوە کۆدەبینەوەو پەیمانی کاری ئیسلامیی پێکەوە دەدەین، مانای وایە ئەو کارەمان لەسەر خۆمان پێویست کردووە، پەیمانمان بە یەکدی داوەو، وەفادارییش بەو بەڵێن و پەیمانەوە، فەڕزە.

**سێیەم: هەڵبەتە لادان لە بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکان و ئەو مەرجانەی کە (کۆمەڵی ئیسلامیی)شیان لەسەر بنیاتنراوە، جا چ بەهۆی سەرپێچیی و لاملییەوە بێ لە فەرمان و ئاڕاستەکانی سەرووی خۆ، وە چ بەهۆی تاکڕەویی و راوێژنەکردنەوە بێ، وە چ بەهۆی سەرپێکەوەنان و دەستەگەریی و ماڵماڵۆکێنەو چپەچپ و ... هتدەوە بێ، بەڵێ لادان لە بەرنامەو رێبازی کۆمەڵ، خاوەنەکەی دووچاری گوناهباریی قیامەت و عەیبداریی دنیا دەکات، دیارە ئەرکی سەرشانی مشوورخۆرو بەرپرسانییشە کە رێ نەدەن بە خۆ گوناهبارکردن و خۆ عەیبدارکردنی ئەندامان، کە هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا ریزەکانی کۆمەڵیش بەو رەفتارو هەڵوێستانە دەخەنە مەترسییەوە، بۆیە پێویستە لە حاڵەتی بەدیکردنی ئەو رەفتارانەدا، بە زوویی لێپرسینەوەو بەدواداچوون بکرێ بۆ چارەسەر، هەڵبەتە**

**بەشێوەیەکی پلەپلەییو واقیعبینانە، بەلام لە هەمان کاتیشدا ڕوونو یەکلایی کەرەوانە:**

خوای کاربەجێ ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾﴾ الأنفال، خوا ﷻ لێرەدا بانگی ئیمانداران دەکات، دەفەرموێ: ئەی بڕوادارینە! بەدەم فەرمانی خوا ﷻو پێغەمبەری خوا وە ﷺ بچن، هەر کاتێك بانگیان کردن بۆ شتێك کە مایەی ژیانتانەو پێی زیندوودەبنەوە، جا ئایا ئەوە یانی چیو چ پەیوەندییەکی بە کاری ئیسلامییەوە هەیە؟ کەسێك کە بەرپرسە لە کاری ئیسلامییدا، هەر لە بەرپرسی شانەیەکەوە، هەتا بەرپرسی پۆلێكو، ڕێکخراوێكو، ناوچەیەكو، مەڵبەندێكو، هەر شتێکی دیکە، یانی هەر جۆرە بەرپرسێك، خەڵك بۆ چی بانگ دەکات؟ بێگومان بۆ ئەو شتانەی کە خوا ﷻو پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموویانە، لێرەشدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی ئیماندارینە! هەر کاتێك خوا ﷻو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگیانکردن بۆ شتێك کە پێی دەژینو زیندوودەبنەوە، بەدەمیانەوە بچن، خۆ خوا ﷻ بۆخۆی لە ئاسمانەوە بانگی کەس ناکا! وە ناگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆی بێ پێی بڵێ: وەرە! ئەدی کێ لەجیاتی خوا ﷻو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگمان دەکات؟ بێگومان هەر کەسێك ئایەتی خوا ﷻو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺمان بۆ بخوێنێتەوەو بۆ شەریعەتی خوا ﷻ بانگمان بکات، مانای وایە ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە.

دوایـی خـوا ﷻ وەك هەڕەشـە دەفـەرموێ: ﴿... وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ ...﴾، واتـە: (... وە بـزانن كـە خـوا ﷻ دەكەوێتـە نێـوانی ئینـسانو دڵییـەوە ...)، واتـە: جـاری وایـە خـوا ﷻ دڵـی ئینـسان لادەداو وەریدەچـەرخێنێ، وەك لـە فـەرموودەی صـەحیحی پێغەمبـەر ﷺدا هـاتوە: {إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّـهَا بَيْنَ إِصْبُعَيْنِ مِـنْ أَصَـابِعِ الـرَّحْمَنِ كَـقَلْـبٍ وَاحِـدٍ يُـصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَـاءُ} رواه مسلم: (٢٦٥٤)، واتە: (بێگومان دڵی ئادەمزادەكان هەموویان لـەنێوان دوو پەنجـە لـە پەنجـەكانی خوادایـە، وێنـەی یـەك دڵ، چـۆنی بـوێ ئـاوا دەیسووڕێنیو بایدەدا)، یانی چی؟ یانی خوا ﷻ یاسایەكی داناوە، كە ئەگەر ئینسان ڕەغبەتی لە هەر شتێك بێو عەزمی لەسەر جەزم كرد، بەرەو ئەو شتە دەچـێ، خـوا ﷻ ئەو یاسایەی خۆی وا داناوە كە ئەو دەیكا.

وە پێغەمبـەر ﷺ ئەو ڕاسـتییە لە قاڵبێكی وێناكردندا پێشانی ئێمە دەدا، كـە وەك چۆن ئەگەر ئێمە شـتێك لەنێوان دوو پەنجەماندا بێ، قەڵـەمێك كـە بـە دوو پەنجـەت گرتووتە بە كەیفی خۆت هەڵینـاسـووڕێنی؟ دەجـا دڵـی ئینـسانەكانیش بەنـسبەت خوای پەروەردگارەوە ﷻ كە بەملادا بیبـا، یان بەولادا بیبا ئاوایە، لێـرەدا مەبەسـت ئەوە نیە كە ئێمە پەنجە بۆ خوای پەروەردگار ﷻ بڕیاربدەین، لێرەدا قەزیە ئەوەیە كـە خـوای پـەروەردگار ﷻ وەك چـۆن ئینـسانێك كـە شـتێك بـە دوو پەنجـە بگرێـتو بیسووڕێنێ پێی ئاسانە، ئاوا خوای پـەروەردگاریش ﷻ دڵـی ئینـسانەكان بـەملاو بەولادا دەسووڕێنێ، بەڵام نەك بە گۆترە، بەڵكو بەپێی ئەوە كە ئـەو دڵانـە خۆیـان چییان دەوێو ڕوو لە كوێ دەكەن؟ چونكە تێگەیشتن لـەو مەسـەلەیە زۆر گرنگـە، بۆئەوەی تووشی گومانی خراپ نەبین بەرانبەر بـە خـوا ﷻ، یـان پێمانوانـەبێ كـە خوای بەرزو مەزن لە خەڵكی بە بەهانەیەو هەر بەخۆت نازانی خوا ﷻ دڵت بەولادا

دەبا، بەلای خراپەدا!! بەڵگەمان چییە بۆ ئەوە؟ بەڵگەمان ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾﴾ الإسراء، پێشێ خوا ﷻ باسی ئەهلی دنیا دەکات‌و دەفەرموێ: (هەر کەسێك ژیانی بەپەلەی دنیای بوێ، ئەوەندەی بمانەوێ‌و بۆ هەر کەسێك ئیرادە بکەین، بۆی دێنینە پێش، ـمادام بۆ دنیا هەوڵدەدا بۆی دێنینە پێش ـ بەڵام دوایی دۆزەخمان بۆی داناوەو بە زەمکراویی‌و تێشکاویی دەچێتە دۆزەخەوە، وە هەر کەسێکیش دوارِۆژی بوێ‌و هەوڵیشی بۆ بدات‌و ئیمانیشی هەبێ ئا ئەوانە هەوڵ‌و کۆششەکەیان جێی سوپاس‌و پێزانینە، هەرکامێکیان ئیمداد دەکەین‌و یارمەتی دەدەین، ئەوانەش‌و ئەوانەش، ـ واتە: دنیاویستانیش‌و دوارِۆژویستانیش ـ ئێمە هاوکاریی هەرکامێکیان دەکەین لە بەخششی پەروەردگارت، ـ یەکێك لە سیفەتەکانی خوا ﷻ (شَكُور، شَاكِر)ە، واتە: (سوپاسگوزارە، بە چاکەیان دەزانێت)، (مِنْ عَطَاءِ) واتە: لەوەی کە خوا ﷻ دەیدات‌و دەیبەخشێ، نەیفەرمووە: (مِنْ كَرَمِ)، بۆچی؟ چونکە ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ بۆ ئەهلی دنیا دەیدا، شتێکی باش نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ کەس بێئومێد ناکا، هەرکەسێك بەهەر لایەکدا بڕوا خوا ﷻ هاوکاریی دەکات، جا خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ و دواییش لەسەر زمانی جێگران‌و میراتگرانی پێغەمبەر ﷺ، ئێمە بانگ دەکات بۆ قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا دەفەرموێ: ﴿...وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ

ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الأنفال، واتـه: {... وه بشزانن كه بۆلای خوا ﷻ دەگەڕێنەوەو بـۆ لای ئـەویش كۆدەكرێنـەوه، وه خۆتان بپارێزن له ئاژاوەیەك[1] و (له بەڵایەك بترسێن) كـه تـەنیاو بەتایبـەتی تووشـی ئەوانەتان نابێ كه ستەمیان كـردوه، (واتـه: بـەڵاو گرفتـاریی كـه دێ تـەنیا ئەوانـه ناگرێتەوه كـه سـتەمیان كـردوەو بـەدەم بـانگی خـوا ﷻو پێغەمبـەری خـوا ﷺوه نەچوون، بەڵكو جاری وایه بەهۆی كردەوەی خراپـی كۆمەڵێكـەوه خـەڵكێكی زۆر بەربەڵا دەبێ)، وه بزانن كـه خـوا ﷻ سـزای تونـده} . وەك كـوردەواریی خۆمـان دەڵێن: (ئاگر كه بەربووه لێڕەوار، تەڕو وشك پێكەوه دەسووتێنێ).

له جەنگی ئوحوددا خۆ هەموو جەنگاوەرەكانو هەموو موجاهیـدەكان فـەرمانی پێغەمبـەر ﷺیـان نەشـكاندبوو، ئـەو پـەنجا نەفـەرەی لەسـەر ئـەو شـاخۆلكەیەی تیرهاوێژەكان (كه زۆر كەس وادەزانێ لەسەر چیای ئوحـودی دانـاون، بـەڵام نـا، چیای ئوحود زۆر بەرزه، تیر لەسەر چـیای ئوحـود را ناگاتـه ئـەوێ، وەك لەسـەر سەفین، یان ئەزمڕ، یان كێوەڕەش بەروه خوار تـیر ناگاتـه ئـەوێ، خـۆ دۆشـكەی بیستو سێو نیویشیان پێنـەبووه!)، شاخۆلكەیەكی بچووك هەیه له دامێنی چـیای ئوحود، پێغەمبەر ﷺ پەنجا تیرهاوێژی لەوێ داناوه، ئەو پەنجا نەفەرەش هـەموویان سەرپێچییان نەكردوه، دەوری چل كەسیان، چونكه هەشـت نـۆ دەیـەكیان لەگـەڵ ئەمیرەكەیان (عبدالله)دا لەوێ مانەوه، بەڵام بەهۆی ئەو سـی چـل كەسـەوه كـه بـێ

---

١) وشـەی (فتنـة) بـەپێی ئـەو سـیاقانەی لـه قورئانـدا هـاتوه مانـادەكرێ، جارێـك بـه مانـای (ئازاردان)ه، جارێك به مانای (بەڵا)یه، جارێك به مانـای (ئاشـووب)ه، جارێـك بـه مانـای (ئازار)ه، جارێك به مانای (تاقیكردنەوه)یـه، وەك لـه نامیلكـەی: (**تاقیكردنـەوەی خـوا بـۆ بەندەكانی چییەو چۆنه؟**)دا روونمان كردۆتەوه، بڕوانه چـاپی دووەمـی سـاڵی (٢٠١١ز)، نووسینگەی تەفسیر.

فەرمانییان كـرد، شكـستێكی گـەورە بەسـەر مـسولْمانانـدا هـات، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمویێ: وە لە بەلاَیەك بترسێن كە بەتەنیا تووشی ستەمكارەكانتان نایە، واتە: لە كاری هەرەوەزییدا دەبێ هەمووی وریابێ، بە هەمووان شتی چاك دەكرێ، بەلاَم بە هەندێكیان شتی خراپ دەكـرێ، یـەك یـەكیان دەتـوانن زیـان بگەیـەنن، بـەلاَم بـە هەموویان نەبێ ئامانج نایەتەدی، هەمیشە هەروایە، بیناكردن پێویستی بە هەمووانە، بەلاَم خراپ كردن، یەك كەسی بەسە، بۆیە كـاری هـەرەوەزیی زۆر هەسـتیارە و، وریایی و بێداریی زۆری گەرەكە.

ئینجـا تەماشـا بكـەن! پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەوبارەوە وێنەیـەكی چـەند سەرنجڕاكێـشمان بـۆ دێنێتـەوە! كـە دیـارە هەرچـی پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی، هەمووی لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا فەرموویەتی، وەك (ئیمام شـافیعی)ش لـە كتێبـی (الرسالة)[1]دا گوتوویەتی: (وَمِنْهُمْ مَنْ قَالَ: لَمْ يَسُنَّ سُنَّةً قَـطٌّ إِلاّ وَلَهَـا أَصّـل فِـي الكِتَـابِ)، واتە: (وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: هەرچـی سـوننەتی پێغەمبـەرە ﷺ، هـەمووی بنـچینەیەكی هەیـە لـە قورئانـدا)، تەماشـابكەن لێـرەدا وەك بلێـی پێغەمبـەر ﷺ شـەرحی ئـەم رسـتە قورئانییـەمان بـۆ دەكـات: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ ...﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: (لە بەلاَیەك بترسێن بەتـەنیا تووشی ئەوانەتان نابێ كە سـتەمیان كـردوە، بـەڵكو هـەمووتان باجەكـەی دەدەن)، دەفەرمویێ: {مَثَـلُ القَائِمِ عَلَى حُدُودِ اللَّهِ وَالْوَاقِعِ فِيهَا، كَمَثَلِ قَـوْمٍ اسْـتَهَمُوا عَلَـى سَـفِينَةٍ، فَأَصَـابَ بَعْضُهُمْ أعْلاهَا، وَبَعْـضُهُمْ أَسْـفَلَهَا، فَكَـانَ الَّـذِينَ فِـي أَسْـفَلِهَا إِذا اسْـتَقَوْا مِنَ الْمَـاءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوقَهُمْ، فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا خَرَقْـنَا فِي نَصِـيبِنَا خَرْقًا وَلَـمْ نُؤْذِ مَنْ فَوقَنـا؟ فَإِنْ يَتْرُكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا، هَلَكُوا جَمِيعًا، وَإِنْ أَخَـذُوا عَلَـى أَيْـدِيهِمْ،

١) الرسـالة ص: (١٢٢).

نَجَوْا، وَنَجَوْا جَمِيعًا} رواه البخاري: (٢٤٩٣) عن النعمان بن بشير، واتە: {وێنەی ئەوانە کە سنوورەکانی خوا دەپارێزن‌و ئەوانەی دەیانبەزێنن، وەك ئەوە وایە کۆمەڵێك لە کەشتییەکدا تیرو پشکیان کردووەو هێندێکیان چوونە قاتی سەریّ‌و، هێندێکیشیان قاتی خوارێیان پێبڕاوە[1]، ئەوانەی کە لە خوارێن، هەرکاتێك ئاویان لە دەریا هێنابێ، بەسەر سەری ئەوانەی سەرێدا تێپەڕبوون‌و لە قەراغی کەشتیەکەوە ئاوەکەیان هێناوە، بۆیە گوتیان: ئەگەر لەلای خۆمانەوە کونێکی تێبکەین‌و ئاوی لێ بێنینە ژووریّ، بۆئەوەی چیدیکە ئەوانەی سەریّ ئەزیەت نەدەین، بەسەریاندا هاتوچۆ بکەین[2]! جا ئەگەر لێیانگەڕێن ئەوەی دەیانەویّ بیکەن، هەموویان پێکەوە دەفەوتێن، وە ئەگەر دەستیشیان بگرن‌و ڕێیان لێبگرن، هەموویان پێکەوە دەربازدەبن‌و قوتاریاندەبێ}، کەواتە: کاری بەکۆمەڵ ئاوایەو، دەبێ هەر کامێك چاودێر بێ‌و هەست بە بەرپرسیارێتیی بکات، کە نەك تەنیا خۆی تووشی هەڵە نەبێ، بەڵکو هاوەڵەکانیشی هەڵە نەکەن، چونکە هەر کامێکیان هەڵە بکات، هەموویان باجەکەی دەدەن، جا ئەوە بەتایبەتی لە کاری سەربازییدا زۆر وایە، جاری وایە یەك هەڵەی سەربازیی سەری کۆمەڵێك بەفەتارەتدەدا.

**چوارەم: وەك چۆن بابای پێشنوێژ (إمام الصلاة) ئەرکیەتی کە شوێنکەوتوو (مأموم)ەکانی ڕێکوپێك بکات‌و جوان ڕیزیان بکات‌و**

١) ئەو کاتە دیارە هەر کەشتیی دوو قات هەبووە، بەڵام ئێستا کەشتیی پازدە قاتیش هەیە.

٢) واتە: دەبینی لە خەودان، لە پشوودان، بۆچی هەموو جاریّ بەلای ئەواندا بچین؟ هەر لەلای خۆمانەوە کونێکی تێدەکەین‌و بەلووعەیەك ڕادەکێشین!

**نەهێڵێ ناڕێکیی لە ریزەکانیانـدا هـەبێ، بەهـەمان شـێوەش بـەرپرس‌و مشوورخۆرانی هەر کۆڕو کۆمەڵێك، لەسـەریان پێویـستە تێبکۆشـن بـۆ ڕێکوپێك کردنی ئەوانەی لەبەردەستیانن‌و فەرمانبەریانن:**

پێشنوێژ هـەموو جـارێ دەڵـێ: (إِسْـتَوُوا وَاتَّـصِلُوا)، واتـە: (ڕێـك بـن‌و پـاڵ وێکبدەن)، بابای ئیمام ئەو کارە ئەرکی سەر شانیەتی، کە نەك هەر بەقسە، بـەڵکو جاری وایە دەبێ بچێ بە دەست ڕێکیان بخا، جا وەك چۆن پێشنوێژ لەسەری پێویستە شوێنکەوتوەکانی خۆی ڕێکبخا، بە هەمان شـێوە بـەرپرس‌و مـشوورخۆرانی هـەر کۆڕو کۆمەڵێکیش، لەسەریان پێویـستە تێبکۆشـن بـۆ ڕێکوپێـك کردنـی ئەوانـەی لەبەردەستیاندان‌و فەرمانبەریانن، ئینجا با لەوبارەشـەوە سـەرنجی ئـەم فەرمایـشتەی پێغەمبەر ﷺ بدەین: {عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَـانَ بْـنَ بَـشِيرٍ يَقُـولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَوِّي صُفُوفَنَا حَتَّى كَأَنَّمَا يُسَوِّي بِهَا الْقِدَاحَ[1] حَتَّى رَأَى أَنَّـا قَدْ عَقَلْنَا عَنْهُ، ثُمَّ خَرَجَ يَوْمًا فَقَـامَ حَتَّى كَـادَ أَنْ يُكَبِّـرُ فَـرَأَى رَجُــلاً بَادِيًـا صَـدْرُهُ فَقَالَ: عِبَادَ اللَّهِ لَتُـسَوُّنَّ صُـفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَـالِفَنَّ اللَّـهُ بَـيْنَ وُجُـوهِكُمْ} رواه مـسلم: (٤٣٦)، واتە: (لـە سـیماکی کـوڕی حـەڕب دەگێڕنـەوە گوتوویـەتی: گـوێم لـە نوعمـانی کـوڕی بەشـیر بـوو گـوتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ریـزی نوێـژەکانمانی ڕاستدەکرد، وای ڕاستدەکرد وەك ئەوەی بیەوێ ـ قِـدَاح ـ ی پـێ ڕاسـت بکـات، هەتا کاتێك کە وای هاتە بەرچاو ئێمـە لێـی تێگەیـشتووین‌و هـەموو جارێـك ڕێـك ڕادەوەستین، تا ڕۆژێك هاتەدەرێ ڕاوەستا، کە نزیك بوو نوێژ دابەستێ، پیـاوێکی بینی سنگی هاتبوە پێش‌و لە ریزەکە هاتبوە دەرێ، ئینجا فەرمووی: ئەی بەنـدەکانی خـوا! بە تەئکید یان ریزەکانتـان ڕێـك‌و ڕاسـت دەکـەن، یـان خـوا ڕووتـان لێـك

١) قِـدَاحْ: تەختەیەکە یان تیرێکە بەبێ ئـەوەی نووکـە تیژەکـەی پێـوە نووسـێنرابێ، زۆر ڕاسـت بووەو بۆ تیروپشـك کردن بەکاریان هێناوە.

وەردەگێڕێ). واتە: تەماشای كرد هەموو جارێك ڕێك ڕادەوەستاین، نەك هەموو جارێك بڵێ: ڕاست ڕاوەستن، ئینجا ئێمە ڕێك ڕابوەستین، كابرا دەبێ هۆشیاربێ كە دوو جار پێی دەگوترێ: ڕێك ڕاوەستە، مانای وایە هەموو جارێك بۆخۆت ڕێك ڕاوەستە، هەرچەندە هی وا هەیە تا هەموو جارێك پێی نەڵێی، هەر لار ڕادەوەستێ، یاخود پاڵ نادا بەوانەی دەوروبەریەوە.

جا ئەوە ڕێنماییەكی زۆر گرنگی پێغەمبەرە ﷺ كە نوێژ بۆخۆی قوتابخانەیە، نوێژ دەبێ هەموو شتێكی تێدا فێربین، دەبێ ڕێكوپێكیشی تێدا فێربین، ئەو پەرستشانە: نوێژو ڕۆژووو زەكاتو حەج، قوتابخانەن بۆ پەروەردەبوونی خەڵك تێییاندا، نوێژ فێرت دەكات كە تۆ دەبێ هەمیشە سەركردەت هەبێ، تۆ بۆ نوێژ كە پەرستشێكی زۆر كەسییو تایبەتو خواییە، بەڵام پێویستییت بە پێشەوا هەیە، هەتا پێشەوا نوێژ دانەبەستێ، ئەگەر تۆ نوێژەكەت دابەستی، نوێژەكەت بەتاڵە، هەتا پێشەوا نەچێتە ركووع، تۆ بچیتە ركووع گوناهباری، هەتا پێشەوا هەڵنەستێتەوە، تۆ هەڵبستیەوە گوناهباری، كاتێك پێشەوا لە نوێژی ئاشكرا (جَهْرِي)دا قوڕئان دەخوێنێ، تۆ دەبێ گوێی بۆ بگری، خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ الأعراف، واتە: (وە ئەگەر قوڕئان خوێندرا، گوێی بۆ بگرنو بێدەنگ بن بەڵكو ڕەحمتان پێبكرێ)، مانای وایە نوێژ فێرت دەكات كە تۆ دەبێ چۆن بكەی، لە دەرەوەی نوێژو لە دەرەوەی مزگەوت تۆ دەبێ چۆن بكەی، دەبێ برا گەورەو مشوورخۆرت هەبێو، بەدوایدا بچیو، گوێی بۆ بگریو ...هتد.

جا هەندێك كەس وادەزانێ ئەوە تەنها بۆ نوێژە، بەڵام (النووي) لە (ریاض الصالحین)دا ئەو فەرمایشتەی لەژێر ناوونیشانی: (بَابٌ فِي الأَمْرِ بِالْمُحَافَظَةِ عَلَى السُّنَّةِ وَآدَابِهَا)دا، ص: (٨٢ – ٨٦)، هێناوە! واتە: (باسێك دەربارەی فەرمان

بــە پارێزگــارییکردن لــە رێبــازی پێغەمبــەرو ئــەدەبو رەوشــتەکانی رێبــازی پێغەمبــەر).

**پێنجەم: دیارە لەکاتی هەبوونی کێشەو مشتومڕیشدا بەتایبەت لەنێوان ئەنـدامانی خـوارەوەو بەرپرسـێك یـان زیـاتردا، پێویـستە قورئـانو سـوننەت بكرێنـە دادوەر، وە ئەگـەر دەزگـاو لایـەنێکی تایبـەت بـە چارەسەری کێشەو مشتومڕو تێکگیـرانەکان هەبێ، زۆر باشتـرە:**

بـەڵێ لـەکاتی تـێکگیرانو کێـشەو گرفتـدا پێویـستە بگەڕێینـەوە لای قورئـانو سـوننەت، خـوای پـەروەردگار ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ...﴿١٠﴾﴾ الشورى، واتە: (هەر شـتێك کـە راجیاییتـان لەسـەری هەبوو، ئـەوە حوکمەکـەی گێڕانەوەیـە بـۆ لای خـوا ...)، وە خـوای دادگـەر ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾ النساء، واتە: {ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە! فەرمانبـەریی خوا ﷻو فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺو هی کاربەدەستانێك کە لـەخۆتانن بکـەن، وە ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە ناکۆکیی و کێشەوەو مشتومڕێکتان بەیەکـەوە بـوو، (جـا چ دوو ئەندام پێکـەوە، چ ئەنـدامێکی خـوارێ لەگـەڵ هـی سـەرێ، چ هـی سـەرێ پێکـەوە، هەرچـۆن بـێ)، بیگێـڕنەوە بـۆ لای خـوا ﷻو پێغەمبـەری خـوا ﷺ، (واتـە: بۆ لای قورئانو سوننەت)، ئەگـەر بڕواتـان بە خوا ﷻو بـە رۆژی دوایـی هەیـە، ئەوە باشـترەو سەرەنجامی چاکترە}.

دیارە ئەگەر دەزگایەكی تایبەتیش هەبێ بۆ چارەسەری ئەو كێشەو مشتومڕانە، وەك ئێمە ئەمجارە لە كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی دا بڕیارمانداوە كە دەزگایەكی دادوەریی هەبێ‌و ستایش بۆ خوا ئێستا ئەو دەزگایە هەیە، ئەوە بێگومان چاكترە، وە ئەگەر ئەوەش نەبێ، دیارە ئەوە بەرپرسی ئەو ئۆرگانە بەرپرسیارە بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشەو مشتومڕانە كە لەنێو ئەو كۆمەڵەدا ڕوودەدەن.

# بنەمای بیستو پێنجەم

لەکاتی پابەندبوونی ئەمیر و

سەرکردایەتیی کۆمەڵ دا

بەو بنەمایانەوە،گوێبیستیی و

فەرمانبەریی ئەندامانیان بۆ

پێویست دەبێ.

# بنەمای بیست و پێنجەم

**لەکاتی پابەندبوونی ئەمیرو سەرکردایەتیی کۆمەڵ دا، بەو بنەمایانەوە،گوێبیستیی و فەرمانبەریی ئەندامانیان بۆ پێویست دەبێ.**

لە کاتێکدا کە مشوورخۆرانو سەرکردایەتیی کۆمەڵی ئیسلامیی بەگشتیو لە پێشدا کەسی یەکەم کە ئەمیرو بەرپرسو چاوساغی (کۆمەڵ)ە، بەو بنەما شەرعییانەوە پابەند دەبنو، بەپێی ئەو هێڵە گشتییانە بەڕێوەدەچن، ئەوە ئەو سەرکردایەتییە بەگشتیو بەتایبەت کەسی یەکەم، مافی ڕێزو حورمەت لێگیرانو گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی (السمع والطاعة) بۆ کرانیان لەسەر ئەو ئەندامانە پێویست دەبێ، کە چوونەتە ریزی (کۆمەڵی ئیسلامیی)یەوە.

هەڵبەتە پەیمان لەگەڵ بەستنو بەیعەت پێدانی ئەندامانیش لەگەڵ کەسی یەکەمو بەرپرسی باڵای کۆمەڵی ئیسلامییدا، جگە لە دەربڕینو پێشاندانی ئامادەیی گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی (السمع والطاعة)و ڕێزلێگرتنو دڵسۆزیی بۆ نواندن، شتێکی دیکە نیە، وە بێگومان هەر بەیعەتێکیش کە دەدرێ هەر تەعبیر لەوە دەکات.

وە پێویستە ئەندامانی هەر بەشو ئۆرگانێك دڵسۆزانەو بەڕاستییو ساغیی، لە سنووری توانایانو لە بازنەی شەریعەتدا، بەقسەی سەرەوەی خۆیان بکەنو ڕێزو حورمەتی بگرن، وە گوتنی قسەی هەق (قول الحق) و

خستنەڕووی پێشنیار و ڕەخنەكانیان لە جوغزی ئەدەبە شەرعییەكاندا بە ئەركی سەر شانیان بزانن، چونكە:

١- خوای بەرزو بێ وێنە ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَـٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾﴾ الفتح، واتە: (بێگومان ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ دەبەستن، ئەوە تەنیا پەیمان لەگەڵ خوا دەبەستن، دەستی خوا لە سەرووی دەستی ئەوانەوەیە، جا هەر كەسێك پەیمانی هەڵوەشاندەوە، ئەوە پەیمان هەڵوەشاندنەوەكەی بە زیانی خۆی تەواودەبێ، وە هەر كەسێك ئەو پەیمانەی لەگەڵ خوا داویەتی بردیەسەر، ئەوە لەمەودوا خوا پاداشتێكی مەزنی دەداتەوە).

٢- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ ...﴿٥٩﴾﴾ النساء. واتە: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرو هی كاربەدەستانێك كە لەخۆتانن بكەن ...).

٣- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ مِنْ إِجْلاَلِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَلاَ الْجَافِي عَنْهُ وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ) رواه أبوداود: (٤٨٤٣)، عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه، وحسنه ابن حجر والعراقي والنووي والألباني، واتە: (بێگومان لە بە بەرزگرتنی خوای بەرزە، ڕێزلێگرتنی مسوڵمانی بە تەمەن كە سەری سپی بووە، وە ڕێزلێگرتنی هەڵگری قورئان كە لە سنوورەكانی تێناپەڕێنێو لەگەڵیشیدا كەمتەرخەم نیە، وە ڕێزلێگرتنی خاوەن دەسەڵاتێكی دادگەر).

٤- وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي} رواه البخاري: (٧١٣٧)، ومسلم: (١٨٣٥) واللفظ له، عن أبي هريرة. واتە: (هەر كەسێك فەرمانبەریی من بكات، ئەوە فەرمانبەریی خوای كردوە، وە هەر كەسێك سەرپێچیی من بكات، ئەوە سەرپێچیی خوای پەروەردگاری كردوە، وە هەر كەسێك فەرمانبەریی بەرپرسو فەرماندەكەی خۆی بكات، ئەوە فەرمانبەریی منی كردوە، وە هەر كەسێك سەرپێچیی بەرپرسو فەرماندەكەی بكات، ئەوە سەرپێچیی منی كردوە).

٥- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ إِلاَّ أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلا سَمْعَ وَلا طَاعَةَ) رواه البخاري: (٧١٤٤)، ومسلم: (١٨٣٩) واللفظ له، عن ابن عمر. واتە: {لەسەر ئینسانی مسوڵمان پێویستە گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی بۆ سەرووی خۆی، لە شتێكدا كە حەزی لێدەكاتو لە شتێكیشدا كە حەزی لێناكا، مەگەر فەرمانی پێبكرێ بە شتێك كە سەرپێچیی (خواو پێغەمبەر) بێ، جا ئەگەر فەرمانی پێكرا بە سەرپێچیی، ئەوە نە گوێ دەگرێو نە جێبەجێش دەكات}.

٦- وە: {عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كُنَّا إِذَا بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، يَقُولُ لَنَا: فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ} رواه البخاري: (٧٢٠٢)، واللفظ له، ومسلم: (١٨٦٧)، واتە: (لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر دەگێڕنەوە گوتوویەتی: ئێمە كاتێك پەیمانمان بە پێغەمبەری خوا دەدا لەسەر گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی، پێی دەفەرمووین: ئەوەندەی كە لە توانایاتاندایە).

٧- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا لِمَنْ؟! قَالَ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ) رواه مسلم: (٥٥) عن تميم الداري رضي الله عنه، واتە: (دین دڵسۆزییە، گوتمان -هاوەڵە بەڕێزەكان لە پێغەمبەر ﷺیان پرسی-: -دڵسۆزیی و بەتەنگەوەبوون و پەرۆشیی- بۆ كێ؟! فەرمووی: بۆ خوا و بۆ كتێبی خوا و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆ پێشەوایان و مشورخۆرانی مسوڵمانان و بۆ تێكڕای مسوڵمانان بەگشتی).

## ڕوونكـــردنەوە:

ئەم كۆتـا بنەمایەی بیســتو پێنجەمیش لە شەش خاڵ دا ڕوون دەكەینەوە:

**یەكـەم: پـەیمان لەگـەڵ بەسـتنو بەیعـەت پێـدانی ئەنـدامان بـە كەسـی یەكـــەمو ســـەركردایەتیی كۆمـــەڵی ئیـــسلامیی، دەربـــڕو پێـــشاندەری ئامـادەیی گوێڕایـەڵیی و فەرمانبــەریی (الـسمع والطاعة)یانـە بۆیـان، بۆیە بە هەر شێوەو چۆنیەتییەك ئەو ئامـادەیی (إسـتعداد)یـە پێـشان بدرێو بخرێتەڕوو، ئامانـج دێتەدی:**

بەیعـەت كاتی خۆی چۆن بـووە؟ هـەر وشـەی (بَيْعَـــة) لـە (بَيْـــع)ەوە هـاتوە، كەسێك شتێكی كڕیوە كڕینو فرۆشـتنێكیان بووە، دەسـتیان خـستۆتە نێـو دەسـتی یەكـــدی، كڕیارەكـە گوتوویـەتی: ئـــەوە ئـەو شــتەم لێـت كـڕی بەوەنــدە، فرۆشیارەكەش گوتوویەتی: بەڵێ ئەوە قبـوولم كرد، ئاوا بـووە، لـەوەوە بەیعـەت پێدان هـاتوەو، كەسێك كە بە بەرپرس هەڵبـژێردراوە، ئەو خەڵكە چوون دەسـتیان خستۆتە نێو دەستی: ئەوە پەیـمانـمان پێـدای تـۆ بـەرپرسو بـرا گـەورە بـی، بـەم شێوەیە بووە، جا ئەو بەڵێـنو بەیعەت پێـدانو دەست خستنە نێو دەسـتی یەكدییـە، هێمایە بۆ ئەوە كە تۆ بەرپرسـیو منـیش بەقـسەت دەكـەم لـە سـنووری شـەرعدا، كەواتە: ئا ئەو ئامادەیی دەربڕینە بە هەر میكانیزمێكی دیكە بێتــەدی، مانـــای وایــە ئەو ئینسانە بەیعەتی هـەر داوە، دەزانن بۆچی وا دەڵێم؟ ئێمـە لە كـۆنگرەدا شـــتێك بە ئەندامان پڕكراوەتەوە، ئەوە من بەڵێنو پەیـمان دەدەم كـە ئـاوا بم، پڕكردنـەوەی ئەو فۆڕمە بۆ خۆی مانای وایە تۆ ئامادەییـت دەردەبـڕی، كـە بەقـسەی ئـەو كەسـە

بكەیت‌و بە بەرپرسی خۆتی بزانی، ئیدی بە هەر جۆرێك ئەو ئامادەیی دەربڕینە پێشاندرا، ئەو ئامانجە دێتەدی، خۆ تۆ مەرج نیە بچی دەست بخەیتە نێو دەستی ئەو كەسەوە.

ئینجا زاناو پێشەوایانیش وەك بنچینەیەكی شەرعیی گوتوویانە: (إِنَّ الأَمْـرَ بِالشَّيْءِ أَمْرٌ بِهِ وَأَمْرٌ بِمَا لا يَتِمُّ إِلاَّ بِهِ) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، ص: (١٤٢)، واتە: (بێگومان فەرمان بە شتێك، فەرمانە بەو شتە، وە فەرمانیشە بە هەر شتێك كە ئەو شتە بەبێ وی تەواونابێ)، هەڵبەتە ئەوە بنچینەیەكی زانراوی زانایانەو وەك بنەمایەكی شەرعیی لەسەری رێككەوتوون، كە جارێكی دیكەش بۆم هێنانەوە، بۆ نموونە: خوا ﷻ دەفەرموێ: نوێژ بكەن، نوێژیش ناكرێ ئەگەر دەستنوێژت نەبێ، پێش دەستنوێژیش دەبێ تارەتت گرتبێ‌و خۆت پاككردبێتەوە، دوایی دەبێ بەرگ‌و پۆشاكیشت پاك‌و خاوێن بێ، دوایی دەبێ لە شوێنێكی خاوێن بوەستی، دوایی دەبێ كاتی نوێژەكە هاتبێ، دوایی دەبێ روو بە قیبلە (ڕووگە) وەستابی، مانای وایە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: نوێژ بكەن، هاوكات لەگەڵ ئەوەی فەرمانی كردوە بە نوێژكردن، فەرمانیشی كردوە بە تارەت گرتن‌و، دەستنوێژ گرتن‌و، عەورەتی خۆ داپۆشین‌و، بەرگ‌و پۆشاكی خاوێن لەبەركردن‌و، لەسەر شوێنی پاك راوەستان‌و، لە كاتی خۆیدا نوێژكردن‌و، روو بە قیبلە وەستانیش.

كەواتە: بەڵێن‌و پەیمان بە یەكدی دانی كۆمەڵە مسوڵمانێك لەسەر ئەنجامدانی كارێكی خێر، شتێكی شەرعیی‌و بگرە پێویستیشە، مادام ئەنجامدانی كارە خێرەكە پەكی لەسەری بكەوێ، مەبەستمان لەوە چییە؟ بۆوێنە: دەتەوێ كارێكی خێر بكەی، ئەو كارە خێرە بەبێ ئەوەی خەڵكێك پێكەوە پەیمان بدا، ناكرێ، ئەگەر هەر لەخۆڕا خەڵك كۆبێتەوە، بۆ كارێكی كاتیی باشە، ئێمە جاری وایە

وتارێك دەدەین، خۆپێشاندانێك ڕێكدەخەین خەڵك دوایی هەركەسەو دەچێتەوە ماڵی خۆی، ئەوە بۆ ئەوەندە كارە باشە، بەڵام بتەوێ كارێكی بەردەوام بێ، ئاوا ناكرێ، دەبێ مەرجێك هەبێ‌و پەیمانێك لەبەینـدابێ‌و پابەندییەك هەبێ، كەواتە: ئەو كارە خێرە مادام بەبێ ئەو پەیمان بەیەكەوە دان‌و پابەندیی بەیەكەوە هەبوونە ئەنجام نەدرێ، ئەوە ئەو پابەندبوون بە یەكدیی‌و پەیمان‌و بەڵێن بەیەكدی دانەش پێویستە، جا ئەوە دوایی باسی دەكەم، چونكە هەندێك وشكە سەلەفیی دەڵێن: بەیعەت دان بە خەلیفەی مسوڵمانان نەبێ بیدعەتە، كە قسەكەی ئەوان لەڕاستیدا زۆر شتێكی هەڵەیە، بەڵام ناڵێم بیدعەتە، چونكە بیدعەت تەنیا لە بواری بیروبڕوا (عقیدة)و پەرستش (عبادة)دایە، بەڵام شتێكی بێ جێ‌و ناشەرعییە.

بۆیە هەموو ئەو قسانەی كە لەلایەن كەسانێكی لاف لێدەری شوێنكەوتنی پێشینەی چاكەوە دەكرێن، لەسەر ناشەرعیی بوونی بەیعەت‌و پەیمان پێكەوە دانی ئەندامانی كۆمەڵ‌و ڕێكخراوێكی ئیسلامیی، قسەی پووچ‌و بێ بنەمان‌و پێچەوانەی عەقڵ‌و شەرعیشن:

١/ پێچەوانەی عەقڵن، لەبەرئەوەی بە عەقڵ دیارو ڕوونە، كە هیچ كۆمەڵە خەڵكێك بەبێ هەبوونی بەڵێن‌و پەیمانێك لە بەینیاندا، ناتوانن بەردەوام بن‌و ئامانجەكانیان بێننەدی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذا خَرَجَ ثَلاَثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ} رواه أبو داود: (٢٦٠٨)، وقال الألباني: حسن صحيح، واتە: (ئەگەر سێ كەس بە سەفەر چوون، با یەكێكیان بكەنە ئەمیر)، جا ئایا چۆن دەیكەنە فەرماندە؟! هەر بڵێن تۆ بەرپرسی‌و هیچی دیكە؟ قەیناكات با دەستیشی لەنێو دەستی نەنێن، بەڵام دەڵێن: ئەوە تۆ بەرپرسی‌و بەقسەشی دەكەن، نەك وەك مەفرەزەیەكی ئێمە جارێك یەكێكیان

کردبووه برا گەورە، دیارە یەکێك لەنێویاندا بەو بەرپرسە رازی نەبووە، فەرماندەکەیان گوتبووی: براینە! دەبێ ئاوا بڕۆین، ئەو گوتبووی: نەخێر ئاوا دەڕۆین، گوتبووی: ئاخر کاکە ئەدی من بەرپرس نیم؟ گوتبووی: با با تۆ بەرپرسی، بەلاّم دەبێ لێرەوە بڕۆین! جا ئەوە مانای وایە بۆ خۆی بەرپرسە، براگەورەو بەرپرس ئەوەیە کە بەقسەی بکرێ لە سنووری شەرعدا، خۆ نالّێین مادام بەرپرسە، بۆی هەیە بلّێ: بەنێو درِكو دالّ بکەونو خۆ بخەنە نێو ئاگر، نا، وەك دوایی باسی دەکەین، بەقسەکردنی براگەورەو بەرپرس لە سنووری شەریعەتو لە سنووری تواناداییە، کەواتە: شتێکی پێچەوانەی عەقلّە کە کارو پرۆژەیەکی ئیسلامیی، بەبێ بەلّێنو پەیمان پێکەوە دان بکرێ، مانای وایە هەر کەسێك بلّێ: بەلّێنو پەیمان پێکەوە بەستنی کۆمەلّە خەلّکێك بۆ ئەنجامدانی کارێکی شەرعیی، شتێکی ناشەرعییە، پێچەوانەی عەقلّو واقیع جوولاّوەتەوە، ئەوە بە عەقلّ دیارە کە هیچ کارێك تەنانەت دوو نەفەریش ناتوانن شتێك بکەن، ئەگەر پابەندییەکیان پێکەوە نەبێ.

٢/ ئینجا لەڕووی شەرعییشەوە خوا ﷻ بە ڕاشکاویی فەرموویەتی:

﴿... وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ...﴿٢﴾﴾ المائدة. واتە: (... وە هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکارییو پارێزکاریی ...)، هەلّبەتە پێشتریش باسمانکردوە کە هاوکاریی یەکدی کردن لەگەلّ نامسولّمانانیشدا، بۆ کاری خێرو چاکە هەر پێویستە، ئەدی مسولّمانان لەنێو خۆیاندا؟ دیارە ئەگەر لەگەلّ نامسولّمانانیش لەسەرت پێویست بێ هاوکاری بکەی، مادام بۆ شتێکی چاكو بەسوودبێ بۆ خەلّكو مایەی رەزامەندیی خوا ﷻ بێ، بێگومان هاوکاریی کردن لەگەلّ مسولّماناندا چاکتر پێویستە.

وە بنچینەی شەرعییش دەڵێ: (مَا لايَتِمُّ الْوَاجِبُ إلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، واتە: (هەر شتێك فەرزێك بەبێ ئەو جێبەجێ نەكرێ، ئەویش فەرزە)، وەك پێشتر وێنەم بۆ هێناوەتەوە، باشە كاری ئیسلامیی چۆن ئەنجامدەدرێ، بەبێ ئەوە كە بەرپرسێك هەبێو، ئەوانیش بەقسەی بكەنو، پاشان بەرنامەیەكیان هەبێو، دوایی چەند مەرجێكیان لەنێواندا هەبێ، كە ئەو بەرپرسە دەبێ ئاوا بەرپرسیارێتیی بكاتو، ئەوانیدیكەی خوارێش دەبێ ئاوا بكەن؟ بەڵێ: هەر شتێك واجبێك پەكی لەسەری بكەوێ، ئەویش واجب دەبێ.

ئینجا دیارە خودی پەیمان پێكەوە بەستنی كۆمەڵە مسوڵمانێك بۆ ئەنجامدانی ئەركێكی شەرعیی، لە خودی خۆیدا ڕەوا (مباح)یە، بۆ نموونە: من بانگی دوو سێیەكتان بكەم: ئەرێ برایینە وەرن بەڵێن پێكەوە بدەین، لێقەوماوێك لەو گەڕەكە هەیە نەخۆشە، با بچین داخۆ تەگبیرێكی لێناكەین؟ ئایا ئەو بەڵێن پێكەوە دانە شتێكی شەرعییە یان ناشەرعییە؟ بێگومان شەرعییەو، گرنگ ئەوەیە بەڵێن بە یەكدی دان لە خودی خۆیدا ڕەوایە، ئینجا دەكەوێتەسەر ئەوەی ئەو بەڵێنە بۆ چی دەدرێت؟ ئەگەر بۆ شتی چاك بدرێ چاكەو، بەڵكو ئەگەر بۆ شتی واجب بدرێ واجبەو، ئەگەر بۆ سوننەت بدرێ سوننەتە، بەڵام ئەگەر بۆ شتی حەڕامو قەدەغە بێ، ئەوە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿... وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ ...﴿٢﴾﴾ المائدة، واتە: (... وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی‌و پارێزكاریی، بەڵام هاوكاریی یەكدی مەكەن لەسەر گوناەو دەستدرێژیی ...)، واتە: ئەگەر بۆ شتی حەڕام بێ، ئەوە بەڵێنەكەش حەڕامە، وەك چۆن شتەكە حەڕامە، بەڵام ئەگەر بۆ شتێكی واجب بێ، ئەوە وەك چۆن شتەكە واجبە، ئەو بەڵێنەش كە بە یەكدی دەدەین، بۆئەوەی ئەو واجبەی پێ جێبەجێ بكەینو، بەبێ ئەو جێبەجێ نەكرێ، ئەو بەڵێنەش واجب دەبێ.

كەواتـە: بەڵێن بە یەكدی دان لە بنەڕەتـدا ڕەوایـە و، جـاری واش هەیـە پەسـند (منـدوب) و، بگرە پێویست (واجـب)یش دەبێ، بەگوێرەی حـوكمی ئـەو ئەركـە شـەرعییە، وە لەڕاستیدا ئەوە هیـچ پێویـستی بـە بەڵگـەهێنـانەوەی نـەقڵیی ناكـا، چونكە شتێكی ڕوونەو عەقڵی سەلیم دەیزانێ.

بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگای خۆ لێپاراستن‌و وریایی‌یە، ئەوەیە كە ئەو كۆبوونەوەو پەیمان‌و بەڵێن بەیەكدی دانە لەسەر شتی ناشەرعیی نـەبێ، ئـەوەی گرنگـە ئەوەیـە، ئەگەرنا بەڵێن بە یەكدی دان شتێكی شەرعییە، بەڵام گرنگ ئەوەیـە لەسـەر شـتێكی ناشەرعیی نەبێ. (إبن تیمیـة) – ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ ـ لـە سـیاقێكدا باسـی ئـەو مەسـەلەیە دەكـات لـە باسـی ئـەوەدا كـە ئەگـەر كۆمەڵـە قوتابییـەك هـەبن، لای مامۆستایەك وانە بخوێنن، یـان چـەند كۆمەڵـە قوتابییـەك لای چـەند مامۆسـتایەك دەرس بخوێنن، چۆن مامەڵەیان لەگـەڵ دەكـەن؟ لـەوبارەوە گوتوویـەتی: (وَلَـيْسَ لِأَحَدٍ مِنْهُمْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَى أَحَدٍ عَهْدًا بِمُوَافَقَتِهِ عَلَى كُلِّ مَا يُرِيـدُهُ وَمُوَالَـاةِ مَـنْ يُوَالِيـهِ وَمُعَادَاةِ مَنْ يُعَادِيـهِ بَلْ مَنْ فَـعَلَ هَـذَا كَانَ مِـنْ جِـنْسِ جَنْكِيزْخَـانَ وَأَمْثَـالِهِ الَّـذِينَ يَجْعَـلُونَ مَنْ وَافَقَهُمْ صَدِيقًا مُوَالِيًا وَمَنْ خَالَفَـهُمْ عَـدُوًّا بَاغِيًـا، بَـلْ عَلَـيْهِمْ وَعَلَـى أَتْبَاعِهِـمْ عَهْـدُ اللهِ وَرَسُولِهِ بِأَنْ يُطِيعُـوا اللهَ وَرَسُولَهُ وَيَفْعَلُوا مَـا أَمَـرَ اللهُ بِـهِ وَرَسُـولُهُ وَيُحَرِّمُوا مَا حَرَّمَ اللهُ وَرَسُولُهُ وَيَرْعَوْا حُقُوقَ الْمُعَلِّمِينَ كَمَـا أَمَـرَ اللهُ وَرَسُـولُهُ. فَـإِنْ كَانَ أُسْـتَاذ أَحَدٍ مَظْلُـومًا نَصَـرَهُ وَإِنْ كَانَ ظَالِمًـا لَمْ يُعَاوِنْهُ عَلَـى الظُّلْـمِ بَـلْ يَمْنَعُـهُ مِنْـهُ) مجموع الفتاوى، ج: (٢٨)، ص: (١٣)، واتـە: (هیچ كامێكیان – واتە: ئـەو قوتابییانەی لەلای مامۆستایەكان دەرس دەخـوێنن ـ بـۆی نیـە پەیـمان لـە كەسـێك وەربگرێ، بۆئەوەی كـە لـە هـەر شـتێكدا ویـستی لەگەڵیـدابێ‌و دۆسـتایەتیی هـەر كەسێك بكات كە ئەو دۆستایەتیی دەكات و، دژایەتیی هەر كەسێك بكات كـە ئـەو دژایـەتیی دەكـات، بـەڵكو هـەر كەسـێك وابكـات، ئـــەوە لـە شـێوەو وێنـەی

جەنگیزخانە، ئەوان كە هەر كەسێك لەگەڵ واندا بووایە، بە هاوەڵو دۆستیان دەزانیو، هەر كەسێك بە پێچەوانەی وان بووایە، بە دوژمنو سەرەڕۆو یاخیبوویان لەقەڵەم دەدا، (واتە: جا لەسەر هەق بووایە، یان لەسەر ناهەق بووایە، هەر كەسێك لەگەڵ واندا نەبووایە، ئاوایان تەماشادەكرد)، بەڵكو لەسەر خۆیانو شوێنكەوتوەكانیان پێویستە –واتە: لەسەر ئەو قوتابییانەی كە لەلای ئەو مامۆستایانە دەخوێنن، یاخود لەسەر ئەو مامۆستایانەی كە دەرس بە قوتابییەكان دەڵێن- كە بەڵێنی خواو پێغەمبەری خوا وەربگرن، لەسەر ئەوە كە گوێڕایەڵیو فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بكەن و، ئەوە بكەن كە خواو پێغەمبەری خوا فەرمانیان پێ كردوە، وە هەر شتێك كە خواو پێغەمبەرەكەی قەدەغەیان كردوە، ئەوانیش قەدەغەی بكەنو لەگەڵ ئەوەشدا مافی مامۆستایەكانو فێركەرەكانیشیان بپارێزنو ڕەچاوی بكەن، وەك خواو پێغەمبەری خوا فەرمانیان پێ كردوە، جا ئەگەر مامۆستای یەكێك ستەملێكراو بوو، بەرگریی لێبكاو سەری بخا، وە ئەگەر ستەمكار بوو هاوكاریی نەكا لەسەر ستەمەكەی، بەڵكو ڕێگریی لێبكا لەوەدا). دیارە لێرەدا باسی مامۆستاو قوتابی كراوە، بەڵام ئێمە ئێستا باسی كاری ئیسلامییو لایەنێكی ئیسلامیی دەكەین، گرنگ ئەوەیە كۆمەڵە خەڵكێك هەن بە كەسێكەوە پەیوەستن، كە مامۆستایە یان شێخە یان بەرپرسە.

هەروەها (إبن تيمية) – ڕەحمەتی خوای لێبێ - لەوبارەوە كە جێبەجێكردنی ئەو بەڵێنو پەیمانانەی كە مسوڵمانان لەنێوخۆیاندا بەیەكدییان دەدەن، پێویستە، مادام لەسەر شتی پێویستو پەسند، یان ڕەوا (مباح) بن، گوتوویەتی: (وَالَّذِي يُوجِبُهُ اللَّهُ عَلَى الْعَبْدِ قَدْ يُوجِبُهُ ابْتِدَاءً كَإِيجَابِهِ الْإِيمَانَ وَالتَّوْحِيدَ عَلَى كُلِّ أَحَدٍ، وَقَدْ يُوجِبُهُ لِأَنَّ الْعَبْدَ الْتَزَمَهُ وَأَوْجَبَهُ عَلَى نَفْسِهِ وَلَوْلَا ذَلِكَ لَمْ يُوجِبْهُ كَالْوَفَاءِ بِالنَّذْرِ لِلْمُسْتَحَبَّاتِ، وَبِمَا الْتَزَمَهُ فِي الْعُقُودِ الْمُبَاحَةِ: كَالْبَيْعِ وَالنِّكَاحِ وَالطَّلَاقِ وَنَحْوِ ذَلِكَ

إِذَا لَمْ يَكُنْ وَاجِبًا. وَقَدْ يُوجِبُهُ لِلْأَمْرَيْنِ كَمُبَايَعَةِ الرَّسُولِ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ لَهُ وَكَذَلِكَ مُبَايَعَةُ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَكَتَعَاقُدِ النَّاسِ عَلَى الْعَمَلِ بِمَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ وَرَسُولُهُ).

مجموع الفتاوى، ج: (٢٩)، ص: (١٩٠)، واته: {... وه ئەوەی كه خوا لەسەر بەندە پێویستی دەكات، جاری وایە هەر لە سەرەتاوە پێویستی دەكات، وەك فەرزكردنی ئیمانو خوا بەیەكگرتن لەسەر هەموو كەس، وه جاری واش هەیە خوا لەسەر بەندەی خۆی شتێك پێویست دەكات، لەبەرئەوەی ئەو بەندەیە بۆخۆی پێیەوە پابەند بووە، یان لەسەر خۆی پێویست كردوە، وه ئەگەر وانەبووایە لەسەری پێویست نەدەبوو، وەك بەجێهێنانی لەخۆگرتن – النذر[1]ـ وه بەوەی كه لەسەرخۆی پابەندیی بە گرێبەستە رەواكانەوە، وەك كڕینو فرۆشتنو ژن مارەكردنو جیابوونەوەی ژنو مێردو وێنەی ئەوانە، بە مەرجێك فەرزنەبن لەسەری، چونكە جاری وایە هەندێك لەوانەش فەرزدەبن، وه جاری وایە خوا شتێك لەسەر بەندەی خۆی فەرزدەكات لەبەر هەردووك شتەكان، (واتە: هەم لە سەرەتاوە خوا لەسەری پێویست دەكات، هەم لەبەرئەوەی بۆخۆشی پابەندیی پێوە دەربڕیوە)، وەك پەیماندان بە پێغەمبەر لەسەر فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی، هەم خوا فەرزی كردوەو هەم ئەو ئینسانەش دەچێ بەیعەت بە پێغەمبەر دەدا، هەروەها پەیماندان بە پێشەوایانی مسوڵمانانو بەرپرسەكانیان، وه هەروەها وەك پەیمان بەیەكدی دانی خەڵك لەسەر ئیشكردن بەوەی كه خواو پێغەمبەری خوا فەرمانیان پێ كردوە}، چونكە لەسەر هەموو كەس فەرزە، ئیمان بە خوا ﷻ

١) نذر: واتە شتێك لەسەر خۆی دەكاتە (نذر)، وەك بڵێ: خوایە سێ ڕۆژم لەسەر نەزربێ ئەگەر فلان كەس لەو نەخۆشییەی چاك بێتەوە، یان ئەگەر بە سەلامەتیی لە سەفەر بگەڕێتەوە، ڕۆژوو گرتن كارێكی پەسند (مستحب)ە لە بنەڕەتدا، بەڵام كە لەسەر خۆی نەزردەكا ئەوە فەرزە لەسەری، چونكە بۆخۆی پابەندیی لەخۆیدا دروستكردوە، بەوەی كە لەسەری فەرزبێ.

بێنیو خوا ﷻ بەیەكبگرێ و، تەنیا خوا ﷻ بە پەرستراوو بەدیهێنەرو پەروەردگاری خۆی بزانێ.

جا ئایا ئەو كارە ئیسلامییەی ئێمە، كە: بانگەوازو، فەرمان بە چاكەو ڕێگرتن لە خراپەو، بەرچاوی خەڵك ڕۆشنكردنەوەو، خەڵك هێنانەوەیە بۆ ژێر چەترو سێبەری دینی خوای پەروەردگار ﷻ و، هەوڵدانە بۆئەوەی شەریعەت پیادەبكەینەوە، كاری باش نیەو خوا ﷻو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێ نەكردوە؟ یا، كەواتە: كە پێكەوە پەیمانماندا، مانای وایە: یەكەم: دروستە پەیمان بدەین، دووەم: كە پەیمانماندا واجبە پەیمانەكە جێبەجێ بكەین، چونكە هەم خوا ﷻو پێغەمبەرەكەی ﷺ ئەو كارانەیان پێویست كردوون و، هەم خۆشمان لەسەر خۆمانمان پێویست كردوون!

هەروەها (إبن تیمیة)[1] - ڕەحمەتی خوای لێبێ- لەبارەی ئەوەوە كە ئەو گرێبەستانە (عقود)ی لەنێوان مسوڵمانانو مشوورخۆرو سەرپەرشتیارانیاندا دەبەسترێن، پێویستە پابەندییان پێوە بكرێ، گوتوویەتی: {وَكَذَلِكَ عُقُودُ الْمُطَاعِينَ وَشُرُوطُهُمْ وَأَمْرُهُمْ وَنَهْيُهُمْ كَالْوُلاةِ[2] وَالْقُضَاةِ وَالْمَشَايِخِ وَالْعُلَمَاءِ

---

١) بۆیە زۆر بەڵگەم بە قسەكانی (إبن تیمیة) هێناوەتەوە، چونكە هێندێك لەوانەی زۆر دژی كاری ئیسلامییو كاری بەكۆمەڵو ڕێكخراوەیین، وا پێشاندەدەن كە (إبن تیمیة)یان لەسەر خۆیان تاپۆكردوە، كە بەپێچەوانەشەوە، ئەو هەڵوێستو ڕەفتارانەی وان هەمووی پێچەوانەی قسەكانی (إبن تیمیة)یەو پێچەوانەی قسەی زانایانیدیكەشە، وەك (شێخ إبن باز، شێخ ناصرالدين الألباني، شێخ إبن عثيمينو ئەوانیدیكەش) وەك لە بۆنەی دیكەدا باسمانكردوە. بڕوانە نامیلكەی: **(كاری ئیسلامییو ڕەواندنەوەی چەند تەم و مژێك)**، چاپی یەكەم (٢٠١١)ز، نووسینگەی تەفسیر.

٢ـ (الولاة) كۆی (والي)یە كە بە مانای سەرپەرشتیار دێ، وە (مشايخ) كۆی (شیخ)ە كە بە مانای ئینسانی بەتەمەن دێ، بەڵام ڕەنگە لێرەدا مەبەستی پێی شێخانی تەریقەت بێ، كە لە سەردەمی

وَغَيْرِهِمْ، فَإِنَّ طَاعَتَهُمْ وَاجِبَةٌ فِيمَا أَمَرَ اللهُ وَرَسُولُهُ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾ النساء}[1]، واتە: {وە هەروەها ـ پێویستە جێبەجێ بكرێن ـ گرێبەستەكانی كەسانێك كە دەبێ گوێڕایەڵییان بۆ بكرێ، وە مەرجەكانیانو ئەمرو نەهییەكانیان، وەك: سەرپەرشتیارانو قازییەكانو شێخانو زانایانو جگەلەوانیش، بەقسەكردنیان فەرزە لەو شتەدا كە خواو پێغەمبەری خوا فەرمانیان پێكردوە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرو هی كاربەدەستانێك كە لەخۆتانن بكەن، وە ئەگەر لە شتێكدا كەوتنە ناكۆكییەوە، بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەكەی، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە باشترەو سەرەنجامی چاكترە)} .

ئینجا بەتەئكید ئەگەر كۆمەڵو لایەنە ئیسلامییەكان لە سەردەمی (إبن تيمية)دا هەبوونایە، لەپێش هەمووان‌دا باسی وانی دەكرد، چونكە سوپاس بۆ خوا ﷻ ئەوانەی سەرپەرشتیی لایەنە ئیسلامییەكان دەكەن، جاری وایە هەم واڵییشنو هەم زاناشنو تایبەتمەندیی دیكەشیان هەن، واتە: (إبن تيمية) ئەم ئایەتەی سەرەوە بە

---

ئەودا هەبوون، ئەوانەی كە پابەند بوون بە شەریعەتەوە، ئەوانیش مادام موریدو مەنسووبەكانیان بەیعەتیان پێ دەدەنو ئەوانیش بەرێی شەرعییاندا دەبەن، لەسەریان پێویستە بەقسەیان بكەن، وە (علماء) كۆی (عالم)ە كە مانای (زانا) دەگەیەنێ، واتە: كەسێك كە بەڵێن بە زانایەكی شەرعیی دەدا دەڵێ: من متمانەم بە زانستو دینداریی تۆ هەیە، لەبەرئەوە بەڵێنت پێدەدەم بەقسەت بكەم، دەبێ بەقسەی بكا.

١) نظرية العقد لابن تيمية ص: (١٦)، عن (مدى شرعية الإنتماء إلى الأحزاب والجماعات الإسلامية – د.صلاح الصاوي، ص: (٧٧).

بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوە کە بەقسەکردنی بەرپرسان فەرزە، نەك لەبەرئەوەی ئەوان وادەڵێن، بەڵکو لەبەرئەوەی فەرمانی خوا ﷻو پێغەمبەر ﷺت پێدەڵێن فەرزە، چونکە لێرەدا وشەی: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾ واتە: (کاربەدەستانێك کە لە خۆتان بن)، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە.

ئینجا شایانی باسیشە کە هەندێك کەس نەزانانە یان زۆرزانانە، مەسەلەی پەیمان پێدرانو بەیعەت پێکرانی حوکمڕانو بەرپرسی گشتیی دەوڵەتی مسوڵمانان، لەگەڵ پەیمان پێدرانو بەیعەت پێکرانی بەرپرسو مشوورخۆرانی کارو پڕۆژەی ئیسلامیی تێکەڵ دەکاتو، ئەو بەڵێنو بەیعەتەی کە بە خەلیفەی مسوڵمانان، یان بە سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامیی دەدرێ، لەگەڵ ئەوەی کە بە بەرپرسی لایەنێکی ئیسلامیی دەدرێ، ئەو دوو بەیعەتە تێکەڵ دەکات و، بەهۆی هەندێك فەرموودەوە کە لەبارەی خەلیفەو حوکمڕانی مسوڵمانانەوە هاتوون، دەیەوێ ئیشکال دروست بکات، چۆن؟ بۆ نموونە: ئەم فەرمایشتە: {إذا بُويعَ لِخَلِيفَتَيْنِ فَاقْتُلُوا الآخَرَ مِنْهُمَا} رواه مسلم: (١٨٥٣)، عن أبي سعيد الخدري، واتە: (ئەگەر پەیمان درا بە دوو جێنشینان، ئەوەی دواییان – دووەمیان ـ بکوژن).

هەروەها ئەم فەرمایشتە: {مَنْ أَتَاكُمْ وَأَمْرُكُمْ جَمِيعٌ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ يُرِيدُ أَنْ يَشُقَّ عَصَاكُمْ[1] أَوْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ فَاقْتُلُوهُ} رواه مسلم: (١٨٥٢)، عَنْ عَرْفَجَةَ، واتە: (هەر کەسێك هاتو ئێوە کاروبارتان کۆك بوو لەسەر پیاوێك، ئەو کەسەش دەیویست کە ریزەکەتان لەت بکات، یاخود کۆمەڵەکەتان پەرتەوازە بکات، بیکوژن).

---

١) زاراوەیەك هەیە (شق العصا)ی پێدەڵێن، واتە: گۆچان شکاندن، (عصا) واتە: گۆچان، گۆچان شکاندنیش واتە: ریز پەرت کردن.

جا تەماشا بكەن كەچفەهمیی و تێنەگەیشتن، مرۆڤ دووچاری چۆرتمی چۆن دەكات؟! بەڕاستی ئەو جۆرە كەسانە قسەی سەیرو سەمەرە دەكەن! من گوێم لە قسەی یەكێك لەوانە بوو، كە پێیانوایە دڵسۆزیی بۆ ئیسلام بەپێی ڕێبازی سەلەفی ساڵح، ئەوەیە كە دژایەتیی لایەنە ئیسلامییەكان بكات و، كۆمەڵ بوون و ڕێكوپێك بوونی مسوڵمانان بە ناشەرعیی و بیدعەت و، پرژوبڵاویی یان بە سوننەت دەزانیٚ، گوێم لێیبوو (دوای ئەوەی هەندێك لەو فەرمایشتانەی هێنا، ناوی من و برایەكی دیكەی هێنا) دەیگوت: بەپێی ئەم فەرمایشتانە پێویستە بەرپرسانی لایەنە ئیسلامییەكان، یان بەیعەت بە فلاّنە بەرپرس بدەن، یان ئەوەتا دەبێ لەملیان بدریٚ! هەڵبەتە ئەو بەرپرسە خۆی نەیگوتوە من خەلیفەی مسوڵمانانم، بگرە ئەو خۆی بە عەلمانیی دەزانیٚ و باسی دیموكراسیی دەكات و لە دیموكراسییشدا فرەلایەنیی (التعددية) هەیە، كە ئەو برا سەلەفییە ئاگای لەو دنیاو بازاڕە نیە، هەڵبەتە دیموكراسییش بەبێ فرە لایەنیی سیاسیی (التعددية السياسية، پلورالیزم) هەر بوونی نیە، مانای وایە ئێستاكە ئێمە وەك لایەنێكی ئیسلامیی فەرمیی هەین، بەپێی ئەو بەرنامەیە كە برادەرانی عەلمانیی لەسەرینی، ئەدی بەپێی ئیسلام؟ بەپێی ئیسلام ئێمە دەڵێین: هەركاتێك كەسێك هەبوو گوتی من ئەوە (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)[1] قورئان دەكەمە دەستوورو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و شەریعەت پیادە دەكەم، بە تەئكید ئێمە یەكەم كەس دەبین كە پشتی دەگرین و هاوكاری دەبین، بۆ جێبەجێ كردنی ئەو فەرمانە خواییەو، جێبەجێكردنی شەریعەت، هەرچەندە بێگومان ئەوكاتیش هەبوونی لایەنە سیاسییەكان بە ئیسلامیی و نائیسلامییەوە، هەر شتێكی ڕەوا (مُبَاح)یە، مادام چەسپاندنی دادگەریی و فەرمان بە چاكەو

---

١) (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) بەشێكە لە بانگ كە بەمانای (وەرن بۆ نوێژ) دێ، بەڵام لێرەدا مەبەست لێی (ڕاگەیاندنی قسەو هەڵوێست و قەناعەتێكە بە ئاشكراو بێ پێچ و پەنا).

ڕێگریـی لـە خراپـەو هێنانـەدی بەرژەوەندییـەکانی کۆمـەڵگا، پـەکی لەسـەر ئـەوە کەوتبـێ.

ئینجا گرفتو کێشەی ئەو جۆرە سەلەفیی ناوانە، ئەوەیـە کـە نـە وەك پێویـست شارەزاو ئاگاداری سیستەمی حوکمڕانیی دیـموکڕاسیین، کە بەپێی ئـەو سیـستەمە هـەبوونی چـەند لایـەنێکی سیاسـیی جۆراوجـۆرو دابەشـبوونیان بـۆ حـوکمڕانو ئۆپۆزیـسیۆن (الـسلطة والـمعارضة)، شـتێکی نـەك هـەر ئاسـاییو ڕەوا، بگـرە پێویستیشـەو، هیچ کەسو لایەنێکیش ڕەوانیە لەسەر ڕەخنەگرتنی لە حوکمڕانـانو ئۆپۆزیسـیۆن بوونی، هەر قسەشی پێ بگوترێ، چ جای بەپێی فەتوای ئەو جـۆرە کەسانە لەملی بدرێ!

هەروەها ئاگـادارو شارەزای سروشتو مێژووی دەوڵەتی ئیسلامییش هەر نـینو نازانن کە تەنـانەت لە ڕۆژگاری حوکمڕانیی پێغەمبەری خـوا ﷺو چـوار خەلیفـە ڕاشیدەکانیـشیدا، بـیروڕاو هەڵوێـستی سیاسـیی جۆراوجـۆرو جیـاواز هـەبووە، بەتایبەت لە ڕۆژگاری خەلیفـە ڕاشیدەکاندا، هەبوونی بەرەی ئۆپۆزیـسیۆن (جبهـة الـمعارضة) زۆر زەق بووەو هیچ کەسیش باسـی کوشـتنو لەملـدانی ئەویدیکـەی نەکردوە، چونکە بێگومان مەبەستی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کەسانێکن کـە بـە هێـزو چـەك لەگـەڵ حوکمڕانـانی شـەرعییدا بەرەنگاردەبنـەوە، نـەك هەرکەسـێك ڕەخنەیەکی گرتو ڕایەکی جیاوازی هـەبوو، چـونکە ڕەخنـەگرتنو قـسەی هـەق بەتایبـــەت ڕوو بــە حوکمڕانـــانی لارو ســتەمکار گــەورەترین جــۆری جیهــادە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَـائِرٍ}[1]

---

١) وە لە بەشێکی فەرموودەیەکی درێـژدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {... أَلا إِنَّ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءً يَوْمَ الْقِيَـامَةِ بِقَدْرِ غَدْرَتِهِ أَلَا وَأَكْبَرُ الْغَدْرِ غَدْرُ أَمِيـرِ عَامَّةٍ أَلَا لا يَمْـنَعَنَّ رَجُلًـا مَهَـابَةُ النّـَاسِ أَنْ يَتَكَلَّمَ بِالْحَقِّ إِذَا عَلِمَهُ أَلَا إِنَّ أَفْضَلَ الْجِهَادِ كَلِمَةُ حَقّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ ...} رواه أحمد: (١١١٤٣)

رواه أبوداود: (٤٣٤٤) واللفظ له، والترمذي: (٢١٧٤)، وابن ماجه: (٤٠١١) عن أبي سعيد الخُدْرِي ﷺ، وقال الألباني: صحيح. ، واته: (چاكترين جيهاد گوتنى قسەيەكى دادگەرانەيە لەلاى حوكمڕانێكى ستەمكار)، وە هەركەسێك لەو پێناوەدا بكوژرێ لە دواى حەمزە گەورەترين شەهيدە، پێغەمبەرى خوا ﷺ دەفەرموێ: {سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ حَمْزَةُ بْن عَبْد الْمُطَّلِب وَرَجُلٌ قَامَ إِلَى إِمَامٍ جَائِرٍ فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ فَقَتَلَهُ} أخرجه الحاكم: (٤٨٨٤)، وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه، واته: (گەورەى شەهيدان (حەمزەى كوڕى عەبدولموتتەليب)ە، وە پياوێكە لە حوكمڕانێكى ستەمكار هەڵدەستێ، فەرمانى پێدەكات – بە چاكە ـ و ڕێگريى لێدەكات – لە خراپە، ئەويش دەيكوژێ)، جا ئايا گەورەترين موجاهيدو گەورەى شەهيدان لەگەردن دانيان ڕەوايە؟!!

كەواتە: بەڵێن و پەيمان پێكەوەدانى كۆمەڵە مسوڵمانێك بۆ ئەنجامدانى كارو پرۆژەيەكى ئيسلاميى، يان –وەك (إبن تيمية) ڕەحمەتى خواى لێبێ باسيكردوە ـ هەر شتێك كە خوا ﷻ و پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمانيان پێكردبێ، دروستە، ئەگەر هەزار مسوڵمان، سەد هەزار مسوڵمان، مليۆنێك پێكەوە دابنيشن و بڵێن: وەرن با ئێمە هەمووومان پەيمان پێكەوە بدەين ئەو كارە بكەين، نەك هەر هيچ ناشەرعيى تێدانيە، بەڵكو ئەگەر ئەو كارە واجب بێ و بەبێ پەيمان پێكەوە دان و بەڵێن بە يەكدى دانيش سەرنەگرێ، بەيعەت بە يەكدى دانەكەش واجب دەبێ، ئينجا ديارە ئێمەش هەوڵدەدەين كە وەزعى مسوڵمانان چاك بكەينەوەو، ئەوەى تێكدراوە، دەمانەوێ چاكى بكەينەوە، مسوڵمانان پەرش و بلاوكراونەتەوەو ئێمە دەمانەوێ خڕيانبكەينەوە، نەك بەپێچەوانەوە.

---

(١١١٦٠)، صححه الحاكم، وقال الترمذي: حسن صحيح، وقال الألباني: ضعيف وبعضه صحيح، وقال شعيب الأرنؤط: ضعيف.

هەروەها یەكێك لەو سەلەفیی ناوانە گوتوویەتی: ئێستا حیزبی خوا (حـزب الله) هەیەو ئێوەش وەرن بـزانین داخـۆ حیزبـی خـوان، یـان حیزبـی خـوا نـین! بـەڵام دەربارەی حیزبی خـوا، خـوای بـەرزو مـەزن دەفـەرموێ: ﴿... فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾ الـمائدة، واتە: (... بێگومان حیزبی خوا زاڵــن)، جـا ئایـا ئێـستا كوا حیزبی خوا هەیـە؟ ئێستا كـوا مـسوڵمانان چـەمكی حیزبـی خوایـان بەسـەردا دەچەسپێ؟ ئاخر ئەگەر ئێمە حیزبی خوا بووینایە دەبووایە زاڵ (غالب) بـین، بـەڵام ئێستا شكستخواردوو (مغلـوب)ین! ئێستا ئێمـە دوژمنـی دەرەكـی هـاتوە، وڵاتـی داگیر كـردووین، وە لـەنێوخۆدا ئێمـە وەك مـسوڵمان بـە بـرا سەلەفییەكەشـەوە كـە ستەملێكراوو سەرو گوێلاك شكاوەو، ئەگەر پـارووە نـانێكی دەسـتبكەوێ، دەبـێ سەد مەرایی و مامە حەمەیی (تـملق) بكات بۆ حزبێكی عـەلمانیی، وە ئەگـەر بیـەوێ دایبمەزرێنن لە مزگەوتێكدا، دەبـێ سـەد قـسەی هەڵـەو پەڵـە بكـات و، دژایـەتیی ئیـسـلامییـەكان بكـات، ئینجـا پـاروە نـانێكی دەسـتدەكەوێ، هەرچـەندە لـە رووكاردا (ظاهـراً) نانەكەشی لێ حـەرام دەبـێ، چـونكە كەسـابەتەكەی حەرامـە، ئینجا كاكی بـرا! ئەگەر تۆ حیزبی خوای بـۆ وا تێـشـكاو و لاوازی؟! مانـای وایـە ئێمە ئەو حیزبی خوایە نین كە خوای پـەروەردگار ﷻ دەفـەرموێ، تـاوەكو بڵێـی: حیزبی خوا هەیەو زاڵەو هیچ كەمو كوڕیی نین، بەڵام لایەنە ئیـسلامییەكان حیزبـی خوا لەت دەكەن! كوا ئەو حیزبی خوایەی كە زاڵو سەرفراز (مفلح)ەو هـەژموونی هەیـە؟ كوا لەكوێیــە؟

جا هەڵبەتە كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (تێگەیشتن لە پلاوخواردنێ خۆشـترە)! بەڕاستی جوانیان گوتوە! هێندێك شت ئینسان تێینەگا زۆر خراپـە، هەڵبەتـە ئەگـەر تێبـگا لە پـلاوێ خۆشترە، بەڵام جاری واش هەیە رەنگە كابرا تێیگەیشتبێ، بـەڵام

خۆ بە تێنەگەیشتوو پیشاندان، پلاویكی بۆ دەستەبەرو مسۆگەر دەكات، ئەوەش هەیە، وادیارە هەندیك كەس پلاوخواردنیان پێخۆشترە لە تێگەیشتن، یان تێگەیشتوون بەلام ئەو جۆرە قسەكردنو خۆ بەناتێگەیشتوو پیشاندانە، پلاویان بۆ دەستەبەردەكات[1]!

## دووەم: پابەندیی هەموو لایەك بە فەرمانو ئاڕاستەكردنی سەرووی خۆیانەوە:

بەڕێزان!

هیچ كاریكی هەرەوەزیی و بە كۆمەڵ ئەنجام نادرێ، ئەگەر سەرێ و خوارێ یەك نەبنو، خوارەوە بەقسەی سەرەوە نەكا و، سەرەوە راوێژ بە خوارەوە نەكاو ریزی لێنەگرێ و، لەنێوانیاندا ریزو خۆشەویستی دوو سەرە نەبێ، حەتمەن هەر كاریكی دەستەجەمعیی، كە دەبێ بە هەرەوەزیی و بەكۆمەڵ ئەنجام بدرێ، دەبێ سەرێ و خوارێیەك هەبێ، چونكە ناگونجێ هەمووی لێكڕا شتەكە جێبەجێ بكەن، هەردەبێ سەرێك هەبێ و خوارێك هەبێ و، پێكەوە گونجانو تەبایی و ریزو خۆشەویستیش لەبەیندا هەبێ و، هەر كامێكیشیان ئیشی خۆی جێبەجێ بكات، سەرەوە ئاڕاستە (تَوْجِيـهْ) دەكاتو، خوارەوەش جێبەجێ دەكات، هەروەك چۆن ئەگەر تەماشای جەستەی ئینسان بكەین سەر لەسەرەوە قەراری گرتوە و، رێنماییەكان لەوێوە دەچن بۆ جەستە، چ رێنمایی خۆنەویستی (لا إرادي) هەموو جەستەی ئینسان لەرێی ئەو دەمارانەوە كە بە (النخاع الشوكي)و بە مێشكەوە پەیوەستن، لەوێوە رێنماییان بۆ

---

١) لە نامیلكەی: (كاری ئیسلامیی و رەواندنەوەی چەند تەمو مژێك)دا باسی مەسەلەی بەیعەتو چەند مەسەلەو ئیشكالێكی دیكەشمان كردوە، كە هەندێك خەڵكی سەلەفیی ناو لە دژی تەوژمی ئیسلامیی دەیانورووژێنن.

دیَ، واتە: هەموو جووڵـە خۆنەویـستەکان (الحركـات اللاإراديـة)ی ئەندامـەکانی وەك: دڵو سییەکانو جگـەرو پـەنکریاسو گـەدەو ریخۆڵـەکانو ...هتـد، ئەوانـە هەموویان جووڵەیان خۆنەویستەو، هەر هەموویان لە مێشکەوە ئاڕاستە دەکرێن، وە جووڵە خۆویستەکان (الحركات الإرادية)یش بەهەمان شێوەیە ...

ئینجا ئێمە لە (ڕوونکردنەوەی بنەمای پێنجەم)دا بە دوورو درێـژیی باسمـانکرد، کە قیادە بەرپرسیارە بەرانبەر قاعیدە، بەڵام وەك چـۆن قیـادە لـە بەرانبـەر قاعیـدەدا بەرپرسیارە، واتە حوکمڕان بەرانبەر خەڵك بەرپرسیارە و، دەبیَ بە چاکترین شـێوە ئەرکو کارەکانی خۆی لەگەڵیدا جێبەجیَ بکات، دیارە قاعیدەش لە بەرانبەر قیادەدا بەرپرسیارەو، لەسەری فەڕزە کە بە دڵو بە گیان ـ بیَ خۆ بـواردنو کەمتەرخـەمیی ـ فەرمانەکانی جێبەجیَ بکاتو، بەگوێرەی ئاڕاستەکان (توجيهات)ی بەڕێوەبـچیَ، وە لە ڕاستیدا بە قسەکردنی مسوڵمانان بۆ فەرمانـدەو بەرپرسـی خۆیـان، بـەو دوو مەرجە فەڕزە:

١/ بە شێوەیەکی شـەرعیی دانـرابیَ.

٢/ بەپێی شـەرعیش بەڕێوەبچـیَ.

بەڵام ئەگـەر یەکێـك لەو دووانـە یـان هەردووکیـــان نـەبن، ئەوکاتـە گـویَ بـۆ گرتـــنو بەقـــسەکردن نامێنـــیَ، ئایـا هەرکەســـێك خـــۆی فـــەڕزکرد بەســـەر مـسوڵماناناداو بـوو بـە بـەرپرس، دەبـیَ بەقـــسەی بکـــریَ؟ نـەخێر، خـوا ﷻ دەفەرمویَ: ﴿... وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ...﴿٥٩﴾﴾ النـساء، واتـە: (... کاربەدەسـتانێك کە لەخۆتان بن ...)، واتە بۆ خۆتان داتانابن، وە ئایا کابرا هـەر چـۆنێکی حـوکم بکات ـبا بۆ خۆشمان دامانابیَ ـ دەبیَ هەر بەقسەی بکەین؟ دیسان نەخێر، کەواتە: بەرپرسانو مشوورخۆرانێك بە قسەیان دەکریَ، کـە شـەرعییەتیان هـەبیَو خـەڵك دایانابنو کاری پیَ سپاردبن، وە بەپیَی شەریعەتیش بەڕێوەبـچن، جـا هـەرکاتێك

وابوون، ئەو كاتە بەقسەكردنو فەرمانبەریی بۆ كردنی مسوڵمانان بۆیان، چ لەسەر ئاستی شانەو پۆلێك بێ، چ لەسەر ئاستی كۆمەڵێك بێ، چ لەسەر ئاستی وڵاتێكو دەوڵەتێك بێ، چ لەسەر ئاستی هەموو ئوممەتی ئیسلامیی بێ، بەقسەكردنی خوارێ بۆ سەرێ دەبێتە تاعەتو خواپەرستیی و، ئینسان پاداشتی لەسەر وەردەگرێ، بەپێی ئەوە كە خوا ﷻ هەر شتێكی لەسەر مسوڵمانان فەرزكردوە، مانای وایە لەبەرانبەریدا پاداشت هەیە، كە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٞ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ٥٩﴾[1] النساء، واتە: فەرمانبەریی

---

١) وەك لە كتێبەكانی سوننەتدا هاتوە بوخاریی و موسلیم لە (عەلی كوڕی ئەبو تالیب)ەوە ـ خوا لێی رازی بێ ـ گێڕاویانەتەوە كە هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ئەو رووداوە بوو: {عَنْ عَلِيّ ﷺ قَالَ بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ سَرِيَّةً وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا مِنْ الْأَنْصَارِ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، فَغَضِبَ عَلَيْهِمْ وَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُطِيعُونِي؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: قَدْ عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ لَمَا جَمَعْتُمْ حَطَبًا وَأَوْقَدْتُمْ نَارًا ثُمَّ دَخَلْتُمْ فِيهَا، فَجَمَعُوا حَطَبًا فَأَوْقَدُوا نَارًا، فَلَمَّا هَمُّوا بِالدُّخُولِ فَقَامَ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، قَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا تَبِعْنَا النَّبِيَّ ﷺ فِرَارًا مِنْ النَّارِ أَفَنَدْخُلُهَا؟ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ خَمَدَتْ النَّارُ وَسَكَنَ غَضَبُهُ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا أَبَدًا، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ} رواه البخاري: (٧١٤٥) واللفظ له، ومسلم: (١٨٤٠)، واتە: (جارێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ (سریە)یەكی بە فەرماندەیی پیاوێك لە ئەنصارییەكان ـ عەبدوڵڵای كوڕی حوزافەی كوڕی قەیس ـ نارد بۆ شوێنێكو فەرمانی پێكردن گوێڕایەڵیی بكەن، لەوێ عەبدوڵڵا لەسەر شتێك لە دەستەكەی توورەبوو، لە كاردانەوەی ئەوەدا گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی نەگوتن بەقسەم بكەن؟ گوتیان: با، فەرمانی پێكردن كە دارو چیلكە كۆبكەنەوەو ئاگرێك بكەنەوەو بچنەنێوی، داریان كۆكردەوەو ئاگریان كردەوە، كە ویستیان بچنەنێو ئاگرەكەوە، سەراسیمە بوونو تەماشای یەكدییان كرد؟! یەكێكیان گوتی: ئێمە لە ترسی ئەم ئاگرە بەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ كەوتووین، ئەوان لەو حاڵەدابوون، ئاگرەكە كوژایەوەو توورەیی عەبدوڵڵاش دامركایەوە، جا كە گەڕانەوە بەسەرهاتەكەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر چووبانە

كردنی ئیمانداران بۆ خـوا ﷻو پێغەمبـەر ﷺو كاربەدەسـتانێك كـە لـەخۆیانن و، گێڕانەوەی ناكۆكییو مشتومڕەكانیان بۆ لای خوا ﷻو پێغەمبەر ﷺ، هەم لـە دنیـا چاكترەو، هەم لە قیامەتیش چاكترەو، خوا ﷻ پاداشتیان دەداتەوە.

پێغەمبەریشمان ﷺ كە فەرموویەتی: {عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَـا أَحَبَّ وَكَرِهَ إِلَّا أَنْ يُـؤْمَرَ بِمَعْـصِيَةٍ فَـإِذَا أُمِـرَ بِمَعْـصِيَةٍ فَـلا سَـمْعَ وَلَـا طَاعَـةَ} رواه البخاري: (٧١٤٤)، ومـسلم: (١٨٣٩) واللفـظ لـه، عـن ابـن عمـر. واتـە نـەك لەسەری پێویست نیە، بەڵكو هەر دروستیش نیە لە ناشـەرعییدا بەقـسەی سـەرووی خۆ بكرێ.

دیارە ئـەم فەرمایـشتەی پێغەمبـەریش ﷺ هـەر ئـەو مەبەسـتەی پێـشوو تەئكیـد دەكاتەوەو روونی دەكاتەوە، كە لـە ئایـەتی (٥٩)ی سـوورەتی (النـساء)دا هـاتوە، بەڵام فەرمایشتەكە وەك هەموو فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ ڕوونكردنـەوەی زیـاتر دەخاتەسەر ئەو مەسەلەیە، ئەویش ئەوەیە كە ئەوەش ڕووندەكاتەوە، كـە گـوێ بـۆ گرتنو فەرمانبەریی كردنی مسوڵمانان بۆ قیـادەی خۆیـان، لـە هـەردووك حاڵـەتی پێخۆشـبوونی شـتێكو پێناخۆشـبوونیدایە، دیـارە پێخۆشـبوونی شـتێكو پێناخۆشبوونیشی، بە مانای شەرعیی بوونو ناشەرعیی بوونی نیە، چونكە ئینـسان

نێوی هـەرگیز لێـی دەربـاز نـەدەبوون، چـونكە فەرمانبـەریی كـردن تـەنیا لـە چـاكەدایە). لـە ریوایەتێكی دیكەدا دەفەرموێ: (تا رۆژی دوایی).

بەڵێ مسوڵمانان دەبێ لە شتی چاكدا بە قـسەی بەرپرسـەكانی خۆیـان بكـەن، ئیـدی بـەو بۆنەیەوە ئەو ئایەتە هاتەخوارێ كـە دەفـەرموێ: (... فەرمانبـەریی خـوا بكـەنو فەرمانبـەریی پێغەمبەر بكەن، وە هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن، ئەگەر لە شتێكدا كەوتنە كێشەوە –وەك ئەوەی كە فەرمانێكی ناشـەرعییتان پـێ كـرا- بیگێڕنـەوە بـۆلای خـواو پێغەمبـەر ...)، واتـە: بیگێڕنەوە بۆ تەرازووی قوڕئانو سوننەت، بزانن تەرازووی شەریعەت چی دەڵێ؟ تـەرازووی شەریعەت بە هەر لایەكیدا خست پێی رازی بن.

جـاری وا هەیـە ئیـشێكی شـەرعییـشـەو هـەر پێیناخۆشـە، نـەك لـەو ڕووەوە پێیناخۆشبێ كە شەرع وا دەڵێ، چونكە ئەگـەر وابـێ پـێی كافردەبـێ، بـەس لـەو ڕووەوە پێیناخۆشە كـە پێـی قـورس و گرانـە، یان پێـچەوانەی ڕاو بۆچـوونیەتی، بۆ وێنە: زستانەو سەرمایەو خەڵك هەڵدەلەرزێ، بـرا گەورەكـەت دەڵـێ: بـەڕێزان! ڕووبارێكمان لەپێـشە دەبـێ بـەنێوی بكـەوین و بـە مەلـە لێـی بپەڕینـەوە، سـەرمایە لەبەرئەوە پێتناخۆشـە، یـان لـە شـیرین خەوێـدای، بەرپرسـەكەت هەڵتدەسـتێنێ دەڵێ: تۆ بچۆ بۆ فلان شوێن دەتنێرم، تۆش پێتناخۆشە، بـەڵام دەبـێ جێبەجێـشی بكەی، هەرچەند پێشـتناخۆشە، چونكە خۆ مەرج نیە هەر شـتێكت پێناخۆشـبێ، ناشەرعیی بێ.

جا پێخۆشبوون، واتە: شتێك كە لە قالبت خۆشدێ و لەگـەڵ زەوق و میزاجـت دەگونجێ، پێناخۆشبوونیش، واتە: شتێك كە لە قالبت خۆشـنایێ و لەگـەڵ زەوق و میزاجت ناگونجێ و، پێتخۆش نیـەو پـێی مورتـاح نـی، دیـارە زۆركـەس لـەوەدا بەهەڵەدا چووە، پێی وایە كـە هـەر شـتێكت پێنـاخۆش بـوو، ئـەوە ناشـەرعییە، دەڵێن: ئەدی ئەوەنیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: دەبێ لە ناشەرعییدا بەقـسەی كـەس نەكـرێ؟! ئینجـا دەڵـێ: منـیش ئـەو شـتەم پێناخۆشـە، جـا وادەزانـێ هەرچـی پێیناخۆش بوو ئەوە ناشەرعییە!! بەڵام وانیەو ئینسان زۆر شتی لە قالـب ناخۆشـە، بەڵام شەرعییشە، هەروەك لە شوێنی دیكەدا هاتوە: (فِـي العُـسْرِ وَاليُـسْرِ)، واتـە: (لەكاتی سەغڵەتیی و لەكاتی ئاسـانییدا)، جـاری وا هەیـە سـەغڵەتیی و تەنگانەیـە، جاری واش هەیە كاتی خۆشـیی و ئاسـانییە، لـە هـەردوو حاڵانـدا دەبـێ بەقـسەی بەرپرسان و مشوورخۆرانی خۆمان بكەین، مادام فەرمانەكە ناشەرعیی نەبێ.

بەڵێ مەرج نیە بابای مسوڵمان تەنها لەو شتانەدا كە خۆی حەزی لێیانەو لە شـانی خۆشن، بیستن و گوێڕایەڵیی (السمع والطاعة)ی هـەبێ! كـە بەداخـەوە زۆر كـەس

تەنانەت لە ئاستی قیادەشدا وا حاڵی بووە، یان بە كردەوە وا دەكات! هەربۆیەش لە زۆرێك لەو فەرموودانەدا كە باسی (السمع والطاعة)یان كردوە، چەند حاڵەتێكی جۆراوجۆر خراونەتەڕوو، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {عَلَيْكَ السَّمْعَ وَالطَّاعَةَ فِي عُسْرِكَ وَيُسْرِكَ وَمَنْشَطِكَ وَمَكْرَهِكَ وَأَثَرَةٍ عَلَيْكَ} رواه مسلم: (١٨٣٦)، واتە: (گوێ بۆ گرتن و فەرمانبەریی كردنت بۆ سەرووی خۆت لەسەر پێویستە، لە حاڵەتێكدا كە لە سەغڵەتییدای[١] وە لەكاتێكدا كە لە ئاسانییدای[٢]، وە لەكاتێكدا كە لە قالبت خۆشدیٚ[٣] وە لەكاتێكدا كە لە دڵت ناخۆشە، وە لەكاتی بێبەشكردن و ماف پێشێلكردنیشتدا)، واتە: لە هەموو حاڵاندا دەبیٚ ئینسان بەقسەی سەرووی خۆی بكات، دوایی لە حەقی خۆی بپێچێتەوە، بەڵام نابیٚ مافخوران و ماف پێشێلكران بكاتە بیانووی ئەوەی كە بەقسە نەكا، مادام ئەو شتەی پێت دەگوتریٚ ناشەرعیی نەبیٚ، چونكە ناكریٚ تۆ هەر رەخنەیەكت هەبوو لە بەرپرسی خۆت، لەسەر هەر گلەییەك و لەسەر هەر رەخنەیەك بڵێی: من بەقسەت ناكەم! ئاوا هیچ ئیشێك جێبەجیٚ ناكریٚ، تۆ ئەركی خۆت جێبەجیٚ بكە، بەڵام دوایی لە حەقی خۆشت بپێچەوە!

---

١) جا بەهۆی نەدارییەوە لە سەغڵەتییدای، یان بەهۆی نەخۆشییەوە، یان بەهۆی ترسەوە، یان بەهۆی سەرقاڵییەوە ... هتد.

٢) پێت دەگوتریٚ: ماڵ سەرف بكە، ئەگەر دەوڵەمەند بی ئاسانە، بەڵام ئەگەر هەژاربی و كەمت هەبیٚ و بۆ خۆت پێویستت بەو شتەبیٚ كە دەبیٚ بیبەخشی، بە زەحمەتە، یان پێت دەگوتریٚ: فەرمان جێبەجیٚ بكە، ئەگەر سەرقاڵ نەبی و بیٚ ئیش بی، ئاسانە، بەڵام سەرقاڵ بی و ئیشەكەی بۆ بفەوتێنی، بە زەحمەتە، یان پێت دەگوتریٚ: ئەو فەرمانە جێبەجیٚ بكە، ئەگەر نەخۆشبی بە زەحمەتە، بەڵام ئەگەر ساغ بی، لە قالبت خۆشدیٚ، هەروەها لەكاتی ترسێدا ناخۆشە فەرمان جێبەجیٚ بكەی، بەڵام لەكاتی ئەمینیی و هێمنییدا ئاسانە.

٣) یەعنی گورج و گۆڵیت هەیەو لە قالبت خۆشە.

كەواتە: گوێڕایەڵیی كردنی مسوڵمانان بۆ بەرپرسانێك كە شـەرعییەتیان هـەبێ‌و بەپێی شەریعەتیش بەڕێوەبچن، وەك فەرمانبەریی كردنیانە بۆ خوا ﷻو پێغەمبەری خـوا ﷺ، وە بەپێـچەوانەشەوە، سەرپێـچیی كردنیـان لـە ئـەمرو نـەهی ئـەمیرو بەرپرسان، سەرپێچیی كردنە لە ئەمرو نـەهی خـوا ﷻو پێغەمبەرەكـەی ﷺ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّـهَ وَمَـنْ عَـصَانِي فَقَـدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِـي وَمَنْ عَصَى أَمِيــرِي فَقَـدْ عَـصَانِي} رواه البخاري: (٧١٣٧) عن أبي هريرة، واتە: (هەركەسێك بەقسەی مـن بكـات ئـەوە بەقسەی خوای كردوە، وە هەر كەسێكیش سەرپێچیی لە من بكات ئەوە سەرپێـچی لە خوای بەرزو مەزن كردوە، وە هەركەسێك بەقسەی ئـەو فەرماندەیـە بكـات كـە دامناوە ئەوە بەقسەی منی كـردوە، وە هەركەسـێكیش سەرپێـچیی لـە فەرماندەیـەك بكات كە دامناوە ئـەوە سەرپێـچیی لـە مـن كـردوە)، جـا پێغەمبـەر ﷺ لێـرە لـەم فەرمایشتەدا ئەمیری پاڵداوەتە لای خۆی، وە لـە فەرمایـشتی دیكـەدا هـاتوە: {مَـنْ أَطَـاعَنِي فَقَـدْ أَطَـاعَ اللَّهَ، وَمَنْ يَعْصِنِـي فَقَدْ عَـصَى اللَّـهَ، وَمَـنْ يُطِـعِ الأَمِيــرَ فَقَـدْ أَطَـاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيــرَ فَقَــدْ عَـصَانِي} رواه البخـاري: (٧١٣٧)، ومـسلم: (١٨٣٥) واللفظ له، واتە: (هەركەسێك بەقسەی من بكات، ئەوە بەقسەی خوای كردوە، هەركەسێكیش سەرپێچـیی لە من بكات، ئەوە سەرپێچیی لە خوا كـردوە، وە هەركەسـێك بەقـسەی فەرمانـدە بكـات ئـەوە بەقـسەی منـی كـردوە، وە هـەر كەسێكیش سەرپێچیی لە فەرماندە بكات ئەوە سەرپێـچیی لـە مـن كـردوە)، لێـرەدا بەگشتی فەرموویەتی، لە فەرموودەی یەكەمدا ئەو ئەمیرو فەرماندانە دەگرێتـەوە كـە پێغەمبەر ﷺ دایناون لە سەردەمی خۆیدا، بەڵام لە فەرموودەی دووەمـدا هـەموان دەگرێتەوە، بەڵكو دەگونجێ بڵێین: مەبەستی لە (أمير) لە فـەرموودەی یەكەمیـشدا، كەسێكە بەپێی شەریعەت‌و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دادەنرێ، یان هەر ئەمیرێكـە كـە بە ئیزن‌و مۆڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانراوە.

کەواتە: بەقسەکردنی بەرپرس و فەرمانده، فەرمانبەریی کردنە بۆ خـوا ﷻ، وە لادانیش لە فەرمانی بەرپرس و مشوورخۆر، لادانە لە فەرمانی خوا ﷻ، بـەلاّم بـەو دوو مەرجەی کە پێشتر باسمانکردن.

## سـێیەم: خسـتنەڕووی ڕێـزو حورمەت و دڵسـۆزیی بۆ قیـادة:

لە خاڵی پێشوودا باسی گوێ بۆ گرتن و بـە قـسە کردنمـان کـرد، جـا ئایـا هـەر ئەوەندە لەسەر خەڵك فەرزە بەرانبەر بە بەرپرسان؟ نەخێر، بەڵکو دەبێ وێڕای ئـەوە ڕێزو حورمەت و دڵسۆزیی بۆ قیادە بنوێنرێ و، ئەرکێکی دیکەی گـرنگ و گـەورەی سەرشانی قاعیدە بەرانبەر بە قیادەیە کە دەبێ بۆی دڵسۆزو بە پـەرۆش بـێ و، ڕێـزو حورمەتی تەواوی بگرێ، دیارە ئەوەش زۆر شت دەگرێتەوە:

مرۆڤـ دەبێ خۆی لە هەر قسەو تەعبیرو هەڵسوکەوتێك دووربگـرێ کـە مایـەی بێڕێزیی نواندنی بێ، لە بەرانبەر ئەو کەسەدا کە بەرپرس و برا گەورەیـەتی، یـان بـە ناحەق دەبێتە مایەی نیگەران کردنی، هەڵبەتە بـە گـشتی مـسوڵمانان دەبـێ ڕێـز لـە یەکدی بگـرن و هیچ کەسێك نابێ دڵی کەسێکی دیکە برینـدار بکـات، بـەلاّم ئـەو ڕێزو حورمەت و خۆشەویسـتی و دڵسـۆزییە بۆ سەروو، زیاتر تەئکیدی لێـدەکرێ، چونکە ئەگەر تۆ دڵی ڕەفیقێکـی خۆت بێشـێنی، ڕەنگە زەرەرێکی کەمتری هـەبێ، بەلاّم کاتێك کە بێڕێزیی بەرانبەر سەرووی خۆت دەکەی، بە تەئکید زەرەری زیـاتر دەبێ و، لەوانەیە ئەویش کاردانـەوەی هـەبێ، لەبەرئـەوە وریـایی زیـاتر پێویـستە، ئەگەرنا بە ڕەهایی مسوڵمان نابێ دڵی کەس بێشـێنێ و، نابێ بەرانبەر بە کەس وشەو قسـەو هەڵسوکەوتی بێڕێـزی لـێ بوەشێتەوە.

بەڵێ دەبێ لەگەڵ هەموو لایەك دڵسۆزبی، جا زانایان باسیانکردوە دڵسۆزیی بـۆ خوا ﷻ ئەوەیە کە بەڕاسـتی بیپەرسـتی و هـەموو فەرمانـەکانی لەسـەر سـەرو چـاو

دابنێی، وە دڵسۆزیی بۆ خوا ئەوەیە هاوبەشی بۆ پەیدانەكەی، وە دڵسۆزیی بۆ خوا ئەوەیە كە هەوڵبدەی شەریعەتەكەی جێبەجێ بكەی، هەر شتێك خوا پێی ناخۆشە خۆتی لێ بپارێزیو ئەوەی پێی خۆشە لە خۆتی دا بێنیەدی، وە دڵسۆزیی بۆ كتێبی خوا ئەوەیە هەوڵبدەی چاكی بخوێنیو چاكی لێ تێبگەیو چاكی لەبەربكەیو چاك ئیشی پێبكەی، وە دڵسۆزیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەیە كە خۆشتبوێو بەقسەی بكەیو ڕێو شوێنی بگریەبەر، وە دڵسۆزیی بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان، ئەوەیە كە چی بە چاكی بزانی پێیان بڵێی، ئەگەر بە شێوەی ڕەخنە لێگرتنە، بە پێشنیاركردنە، بە ئاگاداركردنەوەیە، وە بەقسەیان بكەی لە سنووری شەرعداو بەپێی توانا، وە دڵسۆزیی بۆ مسوڵمانانیش بەگشتی ئەوەیە كە چیت بۆخۆت پێخۆشە بۆ ئەوانیشت پێخۆشبێو چیت بۆ خۆت پێناخۆشە بۆ ئەوانیشت پێناخۆشبێ، وە بەتەنگیانەوە بیو خەمیان لێ بخۆی.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ كە دەفەرموێ: {الدِّينُ النَّصِيحَةُ[1] قُلْنَا لِمَنْ؟! قَالَ لِلَّهِ[2] وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ} رواه مسلم: (٥٥) عن

---

١) لە كوردەواریی خۆماندا دەڵێ: نەسیحەتی كرد، بە مانای ئامۆژگاریی (موعظة) بەكاری دێنن، بەڵام (نصيحة) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای دڵسۆزییو بێ خەوشییو بەتەنگەوەبوون دێ، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بە هاوەڵانی فەرموو: **دین ـ** لێرەدا مەبەست دینداریيە، واتە دینداریيو مسوڵمانەتیی ـ بریتیە لە دڵسۆزیی، یانی دڵسۆزیی گەورەترین بەشی دینداریيو مسوڵمانەتیيە، وەك لە فەرموودەی دیكەدا فەرموویەتی: (الحج عرفة) رواه الترمذي: (٨٨٩)، والنسائي: (٣٠١٦، وابن ماجه: (٣٠١٥)، وقال الألباني: صحيح. واتە: (حەج ڕاوەستانە لە عەرەفات)، واتە ڕاوەستان لە عەرەفات بەشی گەورەی حەجە، ئەگەرنا حەج هەر ئەوەندە نییەو شتی دیكەشی تێدایە، دینداریيو مسوڵمانەتیش تەنیا دڵسۆزیی نییەو شتی دیكەشی تێدایە، بەڵام دڵسۆزیی بەشی گەورەیەتی.

٢) بۆیە گوتم لێرەدا مەبەست لە (النصيحة) ئامۆژگاریی نیە، چونكە ئامۆژگاریی خوا ﷻ چۆن دەكرێ؟!

تـميم الداري ﷺ، لەم فەرموودەیـەدا ﷺ دینـداریی و مـسوڵمانێتی لـە دڵـسۆزییدا کورت هەڵدێنێ، ئینجـا کـە پرسیاریـشی لێـدەکرێ: دڵـسۆزییەکە بەرانبـەر کـێ؟ رایدەگەیەنێ کە دڵسۆزیی و پەرۆش و بەتەنگەوەبوونی بابای مسوڵمان زۆر فـراوان و گشتگیرە و، لە خوای بەرزو مەزنەوە دەگرێتەوە، هەتا سەرجەم خـەڵك و میللـەت! جا لێرەدا دیارە مەبەستی پێغەمبـەری خوا ﷺ ئـەوەبووە کـە لـە هـاوەڵانی بـەڕێزی حاڵی بکات، دڵسۆزیی و بەتەنگەوەبوون و بەخەمـەوەبوونی ئینـسانی مـسوڵمان بـۆ خوا ﷻ و، بۆ کتێبی خوا و، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و، بۆ بەرپرسانی مسوڵمان و، بۆ مسوڵمانان بەگشتی، ئەوە بەڕاستی بەشی گەورەی دینداریی پێکـدێنێ، چـونکە دین هەمووی دەبێتەوە بە دوو بەش: (مامەڵە لەگەڵ خوا، وە مامەڵە لەگەڵ خـەڵکی خوا)، وە ئەو فەرموودەیە هەردووکی گرتۆتەوە، ئەوە لە لایەکەوە، وە لـە لایـەکی دیکەوە دین دەبێتەوە بە دوو بەش: عەقیدەو شـەریعەت، عەقیـدە پەنهانـەو لـە دڵ و عەقڵ جێگیر دەبێ و لە ئاکارەکانی ئینـساندا رەنگدەداتـەوەو، شـەریعەتیش لەسـەر رواڵەتی ئینسان دەبیندرێ، وە شەریعەت بریتیە لە رەفتارکردن و مامەڵەکردن بەپێی ئەوەی عەقیدە دەیخوازێ.

ئینجا لە راستیدا سەرچاوەو کانگای گوێ بۆ گرتن و بەقـسەکردنیش، هـەر ئـەم دڵسۆزیی و پەرۆش و رێزو حورمەت گرتنەیە، پێغەمبەری خـواش ﷺ لـەو بـارەوە فەرموویەتی: {إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّـيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِـلِ الْقُـرْآنِ غَيْـرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْـسِطِ} رواه أبـوداود: (٤٨٤٣)، وقال الألبـاني: حسن، واتە: (بێگومان لە رێزو بەرزگرتنی خوای پایـە بڵنـدە، کـە ئینسان رێز بگرێ لە مسوڵمانی موو سپی – تەمەندار چ پیاوبێ و چ ئافرەتـو خاوەن دەسەڵاتی دادگەرو، هەڵگری قورئـان کـە تێیـدا دووچـاری تێپەڕانـدن و بەزایـەدان نەبووبێ)، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جۆرە کەسمان بۆ دیاری دەکات:

**أ)** ئینســـانی بە تەمەن.

**ب)** حوكمڕانو بەرپرسێكی دادگەر.

**ج)** كەسێك كە شارەزای قورئـان بێو بە هاوسەنگیی مامەڵەی لەگەڵ بكات.

هەڵبەتە ئەمە مانای وانیە كە خەڵكی دیكە ڕێزی لێنـاگیرێ، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: ڕێزگرتن لەو سێ جۆرە كەسانە ڕێز لێگرتنی خوایە ﷻو بە بـەرزگرتنی خوای پەروەردگارە، بۆچی؟ چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ڕێز لـەو سـێیانە بگـرن: ئینسانی بە تەمەنی مسوڵمان بە تایبەت دەبێ ڕێزی لێـبگیرێ، ئەگـەر نامـسوڵمانیش بوو هەر دەبێ ڕێزی لێبگـیرێ، چـونكە ئینـسان بۆخـۆی ڕێزلێگـــیراوەو، ئەگـــەر بچێتە تەمەنیشەوە زیاتر پێویستی بە موراعاتو ڕێز هەیە.

وە حوكمڕانی دادگەریش دەبێ ڕێزی لێبگیرێ، هەر لەبەر ئەسـڵی حـوكمڕانیی ڕێزی لێدەگیرێ، كە دادگەریش بێ، ئەوە زیاتر تەئكید دەبێتەوە، چونكە بەرپرسان ئەگەر خەڵك بە قســـەیان نـەكاو ڕێزیـــان لێنـــەگرێ، ئیـشیان بـۆ نـاڕوا، بـەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەو قەیدەی خستۆتە سەر كە دەبێ دادگەربێ، چـونكە ئەگـەر دادگـەر نەبێ تۆ حەقت هەیە ڕەخنەی لێبگـریو، جاری وا هەیـە دەبـێ لەسـەر سـتەمەكەی بەگژیشیدا بچیـەوە.

وە كەسێكیش كە هەڵگری قورئان بێ، بەڵام هەڵگری قورئانیش ئەویشی دیسان بە دوو وەصف پێناسە كردوە: (غَيْرِ الْغَـالِي فِيـهِ وَلاالْجَـافِي عَنْـهُ)، ئەوەی كـە زۆر تێیدا ڕۆنەچووە – واتـە: تێینـــەپەڕاندوەـ، وە كورتیـشی نـەهێناوە. واتـە نـە تێیـدا تووشی تێپەڕاندن بووەو، نە تێیدا تووشی بەزایەدان بووە، بەو شێوەیە كە بۆ قورئان شایستەیە ئاوا قورئانی هەڵگرتووەو ئـاوا پێوەی پابەنـدە.

ئاشكراشە كە هەم ڕێزو دڵسۆزیی پێشاندانو حورمەت گرتنی بەرپرسـانو هـەم پێچەوانەكەشی گەلێك شت دەگرنەوە، كە هەم لە ڕێـی دەقـە شـەرعییەكانو، هـەم

بەپێی عورفو باوی خەڵکیش دەزانرێنو، ئینسان بە سەلیقەی خۆی ئەوە دەزانێو، بەپێی عورفو باوی کۆمەڵگاکانیش دەگۆڕێ، لەوانەیە ئەگەر لە هەندێ شوێن تۆ لەبەر بەرپرسەکەت هەڵنەستیەوە بێڕێزیی بێو، لە هەندێ شوێنی دیکە ڕەنگە بێڕێزیی نەبێ، کەواتە هەندێ شت بەپێی عورف دەگۆڕێ، بۆیە هەمیشە لە هەڵسوکەوتەکاندا دەگەڕێینەوە بۆ عورفو باوی خەڵك و، مەرج نیە هەموو شتێك لە دەقەکانی شەریعەتدا هاتبێ، بەڵکو دەگەڕێینەوە بۆ عورفو باوی خەڵك، لەوانەیە لە هەندێك شوێندا ئەگەر تۆ لەلای بەرپرسەکەت لاق رابکێشی، بە بێڕێزیی و بێ سەلیقەیی دابندرێ، بەڵام ئەگەر لەگەڵ کەسێك زۆر تێکەڵ بوویی و زۆر خۆیی بێ، لەوانەیە بە بێڕێزیی لە قەڵەمی نەدا، بۆ وێنە: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی خۆی ڕاکشاوەو تۆزێ لاقیشی هەڵکراوە، ئەبو بەکر هاتوە ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ خۆی نەجووڵاندوە، عومەر هاتوە ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ خۆی نەجووڵاندوە، بەڵام کە عوسمان هاتوە ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ یەکسەر هەڵساوە دانیشتوەو لاقیشی داپۆشیوە، دوایی عەرزی پێغەمبەر ﷺیان کردوە: تۆ کە ئەبو بەکرو عومەر هاتن خۆت تێکنەدا، بەڵام کە عوسمان هات خۆت گورج کردەوەو دانیشتی؟ فەرمووی: عوسمان پیاوێکی شەرمنەو زۆر شەرم دەکات، ئەگەر دانەنیشتبامەو لاقم دانەپۆشیبا، شەرمی دەکردو هەر نەدەهاتە ژوورێ[1].

---

١) عَنْ يَحْيَى بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ أَخْبَرَهُ: أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ وَ عُثْمَانَ ﷺ حَدَّثَاهُ: {أَنَّ أَبَا بَكْرٍ اسْتَأْذَنَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشِهِ لاَبِسٌ مِرْطَ عَائِشَةَ، فَأَذِنَ لأَبِي بَكْرٍ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَقَضَى إِلَيْهِ حَاجَتَهُ ثُمَّ انْصَرَفَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ ﷺ فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَقَضَى إِلَيْهِ حَاجَتَهُ ثُمَّ انْصَرَفَ، قَالَ عُثْمَانُ ﷺ: ثُمَّ اسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ فَجَلَسَ وَقَالَ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: «اجْمَعِي عَلَيْكِ ثِيَابَكِ». فَقَضَى إِلَيَّ حَاجَتِي ثُمَّ انْصَرَفْتُ. قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لِي لَمْ أَرَكَ فَزِعْتَ لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ كَمَا فَزِعْتَ لِعُثْمَانَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ عُثْمَانَ رَجُلٌ حَيِيٌّ، وَإِنِّي خَشِيتُ إِنْ أَذِنْتُ لَهُ وَأَنَا عَلَى تِلْكَ الْحَالِ أَنْ لاَ يُبَلِّغَ إِلَيَّ حَاجَتَهُ». وَقَالَ اللَّيْثُ: وَقَالَ جَمَاعَةُ النَّاسِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَلا أَسْتَحْيِ مِمَّنْ

كەواتە: بەپێی شەخسو بەپێی عورفو بەپێی حاڵ، ئینسان دەبێ بە سەلیقەی خۆی بزانێ، كە چۆن ڕێز لە بەرپرسانی خۆی دەگرێ و، چۆن خۆی دەپارێزێ لە شتێك كە مایەی بێڕێزیی‌و بێ حورمەتییە و، مەرج نیە هەموو شتێك بەڵگەی ئایەت‌و فەرموودەی بۆ بهێنرێتەوەو، پێویست بە سەرژمێركردنیان ناكا.

**چوارەم: بەڵام بێگومان گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی مسوڵمانان بۆ گەورەو بەرپرسانیان، تەنیا لە بازنەی شەریعەتدایەو دروست نیە هیچ كەس نە شتی ناشەرعیی بە خەڵكی بڵێ‌و، نە ئەگەر شتی ناشەرعییشی بە خەڵكی گوت، بەقسەی بكرێ:**

وەك خوا ﷻ لە باسی بەیعەتدانی ئافرەتان بە پێغەمبەر ﷺدا فەرموویەتی:
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة، واتە: (ئەی پێغەمبەر! كاتێك ئافرەتانی بڕوادار هاتنەلات تاكو پەیمانت پێبدەن، لەسەر ئەوە كە هیچ هاوبەشێك بۆ خوا بڕیارنەدەن‌و، دزیی نەكەن‌و، داوێنپیسیی نەكەن‌و، منداڵەكانی خۆیان نەكوژن‌و زیندەبەچاڵیان نەكەن و، بوختان هەڵنەبەستن لەنێوان دەست‌و پێیەكانیان‌و، لە چاكەدا سەرپێچییت نەكەن، ئەوە

---

يَسْتَحْيِ مِنْهُ الـمَلائِكَةُ؟} رواه أحمد: (٥١٤)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

بەیعەتیان لێوەربگرەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا گوناهپۆشی بەخشندەیە)، لێرەدا بۆچی دەفەرموێ: لە چاکەو شتی پەسنددا سەرپێچییت لێنەکەن؟ خۆ پێغەمبەر ﷺ بێجگە لە شتی پەسند، فەرمان بە هیچ شتێکی دیکە ناکات؟ بۆیە خوای پەروەردگار ﷻ وای فەرمووە، چونکە خۆ هەموو کەس پێغەمبەر ﷺ نیە و، تاکو ئەوانەی کە بە ڕێی پێغەمبەر ﷺدا دێن، لە بەرپرسانو مشوورخۆرانی مسوڵمانان، بزانن کە تەنانەت خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ بەند (قَیْد)ی (معروف: پەسند)ی خستۆتەسەر بەقسەکرانەکەی، کە دەبێ فەرمانەکەی چاكو شەرعیی بێو بەچاك زاندراو بێ، کەواتە: ئەگەر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بەند (قَیْد)ەی لەسەربێ، بۆ خەڵکیدیکە چاکتر دەبێ وابێ، هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ إِلاَّ أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ} رواه البخاري: (٧١٤٤)، ومسلم: (١٨٣٩) واللفظ له، وأبو داود: (٢٦٢٦)، والنسائي: (٤٢٠٦)، ئەویش دیسان وەك پێشتریش باسمانکرد، کاتێك کە فەرمان بکرێت بە سەرپێچیی، ئەوە نەك بەقسەکردن، بەڵکو گوێ بۆ گرتنیش نامێنێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ} رواه البخاري: (٧١٤٥)، و مسلم: (١٨٤٠) واللفظ له. بدون (لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ)، واتە: (بەقسەکردنو فەرمانبەریی کردن نیە لە سەرپێچیی خوادا، بەڵکو فەرمانبەریی کردن تەنیا لە شتی پەسندو چاکدایە)، کە دیارە بەسەرهاتێکی لەسەرەوو پێشتر گێڕاومانەتەوەو پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە.

**پێنجەم: پێویستە وریابین‌و ڕستەی: (فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ)مان باش لەیادبێ‌و پێمان وانەبێ هەرچییەك پێمان ناخۆش بێ‌و لەگەڵ ئارەزووو میزاجمان نەگونجا، ئەوە ناشەرعییە! چونکە بێگومان شەریعەت‌و تەبیعەت یان شەرع‌و طەبع، لەیەك جیان:**

فەرموودەکە دەفەرموێ: {عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ ...}، واتە: (لەسەر ئینسانی مسوڵمان پێویستە گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی، لە شتێکدا کە حەزی لێدەکات‌و پێیخۆشە، وە لە شتێکیشدا کە حەزی لێناکات‌و پێیناخۆشە ...)، کەواتە: نابێ هەر شتێکمان پێخۆش نەبوو بڵێین: ئەوە ناشەرعییە، چونکە پێمناخۆشە! نا شەرت نیە هەرچی ئینسان پێی خۆش نەبوو ناشەرعیی بێ، وە مەرجیش نیە هەرچی پێیخۆشبوو شەرعیی بێ، تەرازووی شەرعیی بوون‌و شەرعیی نەبوونی شتەکان، قورئان‌و سوننەتە و، مەرج نیە هەرچی ئینسان پێیناخۆش بوو ناشەرعیی بێ.

جا لێرەدا حەزدەکەم نوکتەیەکی خۆشتان بۆبگێڕمەوە، کە پەیوەندیی بەم بابەتەی ئێستامانەوە هەیە: برایەکمان هەبوو نەخۆشی شەکرەی هەبووو حەزیشی لە شتی خۆش بوو، شتی خۆشی زۆر پێخۆشبوو، دیارە هەموو کەس شتی خۆشی پێخۆشە، بەڵام هەندێك کەس زیادەڕەویی تێدادەکەن، جا دەیگوت: من پارێزمە (شەکرەی هەبوو پارێزیان بۆ دانابوو)، برایەکیدیکەشمان دەیگوت: کاکە دەزانم ئەو برایەمان دەڵێ پارێزمە، بەڵام دەڵێ لە چی پارێزمە؟ دەڵێ: پارێزمە لە ساوارو گەنمەکوتاو، بۆ ئەو شتانەی پێیناخۆشن، دەڵێ: پارێزمە ناخۆم، بەڵام هەر شتێکی پێخۆش بێ دەڵێ: ئەوە زۆر زۆر باشە، بۆ نموونە گۆشتی برژاو کە حەزی لێیەتی،

دەڵێ: زۆر زۆر باشە بۆ شەكرە، بۆ خواردنە خۆشەكان دەیگوت: ئەوە زۆر زۆر باشە! ئەو شتانەش كە پێیناخۆشبوو دەیگوت: پارێزمە ناخۆم.

بەڵێ ئینسان لە بیستنو گوێڕایەڵییدا نابێ وابێ، هەرچی پێیخۆشبێ، بڵێ: ئەوە شەرعییەو هەرچییش پێیناخۆشبێ، بڵێ: ئەوە ناشەرعییە!

بەڵێ، هی وا هەیە ئارەزووو پێخۆشبوونو پێخۆشنەبوونی خۆی دەكاتە تەرازووو پێوەری جێبەجێكردنو نەكردنی كارەكان و، پێیوایە هەرچی ئەو حەزی پێكرد شەرعییە، ئەگەرنا ناشەرعییە!

**شەشەم: هەروەها گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی تەنیا لە سنووری تواناو بڕستدا فەڕزەو، هەرچییەك لە توانای مرۆڤ بەدەربێ، خواش ﷻ پێویستی نەكردوەو داوای نەكردوە، چ جای بەندەكانی بۆیان هەبێ داوای بكەن:**

شتێك ئینسان لە توانایدا نەبێ لەسەری پێویست نیە گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی بۆی هەبێ، چونكە خوا ﷻ كە پەروەردگارو بەدیهێنەرو پەرستراوی خەڵكە، شتێكی لەسەر بەندەكانی پێویست نەكردوە كە لە توانایاندا نەبێ، وەك فەرموویەتی: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ...﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة. واتە: (خوا لە هیچ كەس داوا ناكات مەگەر ئەوەی لەتوانایدایە ...)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ...﴿١٦﴾﴾ التغابن. واتە: (پارێز لە خوا بكەن ئەوەندەی دەتوانن . . .)، ئەدی ئەگەر نەیتوانی؟ خوای پەروەردگار ﷻ ئەوەی لە توانای بەندەدا نەبێ فەرزی ناكا.

ئینجا وەك (إبن عمر)یش –خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ- بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێشتریش فەرموودەکەمان هێناو لێرەش دووبارەی دەکەینەوە: {كُنَّا إِذَا بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، يَقُولُ لَنَا: فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ} رواه البخاري: (٧٢٠٢) واللفظ له، ومسلم: (١٨٦٧)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی پەیمان لێوەرگرتنی هاوەڵاندا، پێی دەفەرموون: (فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ)، واتە: (لەوەندەدا کە دەتوانن)، شتێك کە نەتتوانی لەسەرت پێویست نیە، بەڵام لێرەشدا دیسان پێویستە وریاو واقیعبین بین و، شەیتانو نەفس فێڵمان لێ نەکەنو، دووچاری تێپەڕاندنو بەزایەدان (إفراطو تفريط)مان نەکەنو، شتی ئاسانمان لەبەرچاو بەزەحمەتو، شتی زەحمەتیشمان لەبەرچاو زۆر قورسو بڕستبڕو تواناپڕووکێن، نەکەن!

واتە: جاری وایە شتێك زۆر ئاسانەو دەکرێ، تۆ بڵێی: ئاخر خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾و منیش لە توانامدا نیە، چونکە جاری وایە شەیتان فێڵت لێدەکات، ئەگەرنا لەتواناتدا هەیە، بۆوێنە: هی وا هەیە مانگی ڕەمەزان هەر لەخۆڕا بەڕۆژوونابێ، دەڵێ: ئەگەر بەڕۆژووبم لەوانەیە بمرم، نانا نامری! تۆ دەبێ تۆزێك هیممەتیشت هەبێ، کەواتە: دەبێ وریابیو شەیتان فێڵت لێنەکات، بەڵکو دەبێ بەڕاستیی کارەکەت لەتوانادا نەبێ، نەك شەیتانو نەفس فێڵت لێبکەن، یان خوازیاری ئیسرٍاحەت بی، کە ئەوەیان کورتهێنانە.

هەروەها بەباری تێپەڕاندنیشدا، بەهۆی زاڵبوونی عاتیفەو سۆزو هەڵچوونەوە، گیرۆدەی خەیاڵپڵاو نەبین و، ملمان پێ لەبەر کارو پڕۆژەی وا ڕانەکەنو هەنگاوی وامان پێ نەهاوێن، کە لە تواناو بڕستمان بەدەر بێو کاری کردن نەبێ! بۆوێنە: بۆ کردەیەکی سەربازیی تەنیا دە (١٠) نەفەرت هەبنو بڵێی: ئەوە هەزار (١٠٠٠)

نەفەر لەوێن بە مەفرەزەیەكەوە دەچم هەموویان لەبەین دەبەم! كە لێرەشدا تۆ زۆر لەخۆت ڕادەبینی.

جا هەم كەم لەخۆ ڕادیتن خراپە و، هەم زۆر لەخۆ ڕادیتنیش، بەڵكو واقیعبینانە خۆ دیتن پێویستە.

دیارە واقیعبینیی و دووربینیی و وردبینییش لەلایەك و، لەپێش ئەوەشدا بەوردیی لێكۆڵینەوە لە ژیان و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەتایبەت و، مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان و، هەڵوێست ڕووداوەكانیان بەگشتی، یارمەتی زۆرمان دەدەن بۆ توانای خۆ ناسین و دووچاری تێنەپەڕاندن و بەزایەدان نەبوون، لە بواری كارو چالاكییە جۆراوجۆرەكانماندا.

# لە کۆتاییدا

بەڕێزان!

ئەم بیستو پێنج خاڵە وەك بنەما شەرعییەکانو هێڵەگشتییەکانی کارو چالاکیی کۆمەڵی ئیسلامیی بە هەفتەیەك بەر لە ڕاگەیاندرانی کۆمەڵی ئیسلامیی، لەلایەن بەندەوە نووسراونو، پاشان دوای قسە لەسەرکردنیان لەلایەن ئەندامانی سەرکردایەتیی ئەوساوە، بەڕەسمیی وەك بەرنامەی فیکریی و سیاسەتی شەرعیی کۆمەڵ، پەسندو تەبەنیی کراونو بلاوکراونەتەوە، وەك بەرچاوڕوونییەك بۆ خوشکانو برایان و، پێناسەیەك بۆ ئەو کۆمەڵی ئیسلامییەی ئەوکاتە بەتەمابووین ڕایبگەیەنین، وە ئەو بنەما شەرعییانەش کە پێیانەوە پابەند دەبێ و، بەپێی ئەوان بەڕێدا دەڕوا بە پشتیوانی خوای بێ هاوتا ﷻ.

شایانی باسە لەکاتی ئەم شەرحو ڕوونکردنەوەیەشدا، چەند وردە دەستکارییەك لە زۆربەی خاڵەکاندا کراوە، بێئەوەی نێوەڕۆکی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکان بگۆڕدرێ، چونکە دەستکارییەکە زیاتر ئەو ئایەتو فەرموودانەی گرتۆتەوە، کە بۆ هەڵهێنجانی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکان پشتیان پێ بەستراوە.

بەهیوای ئەوە کە لەمەودوا کۆمەڵی ئیسلامیی بە سەرو خوارەوە، لە جاران چاکترو زیاتر بەم بیستو پێنج خاڵەوە پابەندبێ، بەتایبەت دوای ئەوەی لەم

ڕوونكردنەوەیەدا، زیاتر ئەو بنەما شەرعیی و هێڵە گشتییانە كە لەسەرەتاوە بڕیاردراوە كۆمەڵی ئیسلامییان لەسەر بەڕێوەبچێ، درەوشێنراونەوەو تەمو مژیان لەسەر نەهێڵراوە.

خوا ﷻ یارمەتیدەری هەموو لایەك بێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

كۆتا پێداچوونەوەی
١٩ی ربيع الثاني ١٤٣٣ی كۆچی
١٢ی مارتی ٢٠١٢ی زایینی
بەغداد/ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق

# سەرچاوەكان

١- التفسير الكبير أو مفاتيح الغيب للإمام فخر الدين محمد بن عمر بن الحسين بن الحسن إبن علي التميمي البكري الرازي الشافعي، قدم له: هاني الحاج، تحقيق: عماد زكي البارودي، الناشر: المكتبة التوفيقية – القاهرة – مصر.

٢- جامع البيان في تأويل القرآن، المؤلف: أبي جعفر محمد بن جرير الطبري، تحقيق: هاني الحاج و عماد زكي البارودي و خيري سعيد، الناشر: المكتبة التوفيقية – القاهرة – مصر، الطبعة الأولى ١٤٢٠هـ – ٢٠٠٠ م.

٣- تفسير (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني)، تأليف: العلامة أبي الفضل شهاب الدين السيد محمود الآلوسي البغدادي، الطبعة: الرابعة ١٤٠٥ هـ – ١٩٨٥م، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت – لبنان.

٤- تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، تأليف: عبد الرحمن بن ناصر السعدي، إعتنى به تحقيقا ومقابلة: عبد الرحمن بن معلا اللويحق، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت – لبنان، الطبعة الأولى ١٤٢٠ هـ – ٢٠٠٠ م.

٥- المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، إعداد: جماعة من العلماء بإشراف الشيخ صفي الرحمن المباركفوري، الطبعة: ثانية محرم ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠ م، الناشر: دار السلام للنشر والتوزيع – جدة – السعودية.

٦- أيسر التفاسير لكلام العلي الكبير، تأليف: أبي بكر الجزائري، الطبعة: الخامسة ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠م، الناشر: مكتبة العلوم والحكم – المدينة المنورة.

٧- مفردات ألفاظ القرآن، تأليف: العلامة الراغب الأصفهاني، تحقيق: صفوان عدنان داوودي، الناشر: دار القلم – دمشق، الطبعة الثالثة ١٤٢٣ هـ – ٢٠٠٢ م.

٨- صحيح البخاري، تصنيف: الإمام الحافظ أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري، إعتنى به وأعده للنشر: الدكتور محمد محمد حجازي، الناشر: مؤسسة المختار للنشر والتوزيع – القاهرة، الطبعة الثانية ١٤٣١ هـ – ٢٠١٠ م.

٩- فتح الباري شرح صحيح البخاري، للإمام الحافظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني، رقَّمَ كتبها وأبوابها وأحاديثها: الأستاذ محمد فؤاد عبدالباقي، الناشر: دار السلام – الرياض و دار الفيحاء – دمشق، الطبعة الثالثة ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠ م.

١٠- صحيح مسلم، للإمام مسلم بن الحجاج بن مسلم القشيري النيسابوري، الناشر: مؤسسة المختار للنشر والتوزيع – القاهرة، الطبعة الثانية ١٤٣١ هـ – ٢٠١٠ م.

١١- موسوعة فتح المُلْهِم بشرح صحيح الإمام مسلم بن الحجاج القشيري، تأليف: الشيخ شبير أحمد العثماني، تعليقات: محمد رفيع العثماني، تخريج: نور البشر بن نور الحق، مراجعة وتدقيق وتكملة: محمود شاكر، الطبعة: الأولى ١٤٢٦ هـ – ٢٠٠٦ م، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت – لبنان.

١٢- مسند الإمام أحمد بن حنبل، المؤلف: أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني، المشرف على تحقيقه: شعيب الأرنؤوط، المشرف على إصداره: الدكتور عبد الله بن عبد المحسن التركي، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت، الطبعة: الثانية ١٤٢٠هـ – ١٩٩٩م.

- مسند أحمد بن حنبل، المؤلف: الإمام الحافظ أبو عبد الله أحمد بن حنبل بن هلال بن أسد بن إدريس الذهلي الشيباني، الناشر: بيت الأفكار الدولية.

١٣- سنن أبي داود، تصنيف: أبي داود سليمان بن الأشعث السجستاني، حكم على أحاديثه وآثاره وعلق عليه: العلامة المحدث محمد ناصرالدين الألباني، إعتنى به: أبو عبيدة مشهور حسن آل سلمان، الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع – الرياض، الطبعة الثانية ١٤٢٧ هـ– ٢٠٠٧ م.

١٤- سنن الترمذي، المؤلف: للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة الترمذي، حكم على أحاديثه وآثاره وعلق عليه: العلامة المحدث محمد ناصرالدين الألباني، إعتنى به:

أبو عبيدة مشهور حسن آل سلمان، الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ـ الرياض، الطبعة الثانية ١٤٢٩ هـ- ٢٠٠٨ م.

١٥- سنن إبن ماجه، تصنيف: أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ(ابن ماجه)، حكم على أحاديثه وآثاره وعلق عليه: العلامة المحدث محمد ناصرالدين الألباني، إعتنى به: أبو عبيدة مشهور حسن آل سلمان، الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ـ الرياض، الطبعة الثانية ١٤٢٩ هـ- ٢٠٠٨ م.

١٦- سنن النسائي، تصنيف: أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النسائي)، حكم على أحاديثه وآثاره وعلق عليه: العلامة المحدث محمد ناصرالدين الألباني، إعتنى به: أبو عبيدة مشهور حسن آل سلمان، الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ـ الرياض، الطبعة الثانية ١٤٢٩ هـ- ٢٠٠٨ م.

١٧- السنن الكبرى، للإمام: أبي بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهقي، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا، الطبعة: الثالثة ٢٠٠٣م – ١٤٢٤هـ، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت – لبنان.

١٨- شعب الإيمان، للإمام أبي بكر أحمد بن الحسين البيهقي، تحقيق: أبي ماهر محمد السعيد بن بسيوني زغلول، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى ١٤١٠هـ – ١٩٩٠ م.

١٩- صحيح بن حبان بترتيب إبن بلبان، تأليف: الأمير علاءالدين علي بن بلبان الفارسي، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، الطبعة: الثالثة ١٤١٨ هـ – ١٩٩٧ م، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت – لبنان.

٢٠- المنتقى شرح موطأ مالك، تأليف: القاضي أبو الوليد سليمان بن خلف بن سعد بن أيوب الباجي، تحقيق: محمود شاكر، الطبعة: الأولى ١٤٢٥ هـ – ٢٠٠٥ م، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت – لبنان.

٢١- شرح موطأ الإمام مالك، لفضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين، تحقيق: صلاح الدين محمود السعيد، الناشر: دار الغد الجديد - القاهرة، الطبعة الأولى ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م

٢٢- المستدرك على الصحيحين، للإمام الحافظ أبي عبد الله محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري، دراسة وتحقيق: مصطفى عبد القادر عطا، الناشر: دار الكتب العلمية - بيروت - لبنان، الطبعة: الثانية ١٤٢٢ هـ - ٢٠٠٢ م.

٢٣- المعجم الكبير، تأليف: الإمام أبي القاسم سليمان بن أحمد الطبراني، ضبط نصه وخرّج أحاديثه: أبو محمد الأسيوطي، الناشر: دار الكتب العلمية - بيروت - لبنان، الطبعة: الأولى ٢٠٠٧ م.

٢٤- المعجم الأوسط، تأليف: الإمام الحافظ أبي القاسم سليمان بن أحمد بن أيوب اللخمي الطبراني، الناشر: دار الفكر - عمان - الأردن، الطبعة: الأولى ١٤٢٠هـ- ١٩٩٩م.

٢٥- رياض الصالحين، المؤلف: الإمام أبي زكريا يحيى بن شرف النووي الدمشقي، حققه وخرج أحاديثه: عبدالعزيز رباح - أحمد يوسف الدقاق، راجعه: الشيخ شعيب الأرنؤوط، الناشر: دار الثقافة العربية - دمشق، الطبعة الثانية ١٤١٢ هـ - ١٩٩٢م.

٢٦- الترغيب والترهيب من الحديث الشريف، تأليف: الإمام الحافظ زكي الدين عبدالعظيم بن عبدالقوي المنذري، حققه وقدم له وعلق عليه: محيي الدين ديب مستو - سمير أحمد العطار - يوسف علي بديوي، الناشر: دار ابن كثير - بيروت، الطبعة الثالثة ١٤١٩هـ - ١٩٩٨م.

٢٧- فيض القدير شرح شرح الجامع الصغير من أحاديث البشير النذير، للعلامة محمد عبد الرؤوف المناوي، ضبطه وصححه: أحمد عبد السلام، الناشر: دار الكتب العلمية - بيروت، الطبعة الثالثة ٢٠٠٦م.

٢٨- مجموع الفتاوى، المؤلف: شيخ الإسلام تقي الدين أحمد بن تيمية الحراني، إعتنى بها وخرج أحاديثها: عامر الجزار – أنور الباز، الناشر: دار الجيل، الطبعة: الأولى ١٤١٨هـ – ١٩٩٧م.

٢٩- القواعد النورانية الفقهية، أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني أبو العباس، تحقيق: محمد حامد الفقي، الناشر: دار المعرفة – بيروت، سنة النشر ١٣٩٩.

٣٠- إعلام الموقعين عن رب العالمين، تأليف: إبن القيم الجوزية، تحقيق: عبدالرحمن الوكيل، الطبعة: الأولى ١٤١٢هـ – ١٩٩٢م، الناشر: دار إحياء التراث العربي و مؤسسة التاريخ العربي – بيروت – لبنان.

٣١- الأحكام السلطانية والولايات الدينية، تأليف: أبي الحسن علي بن محمد بن حبيب البصري البغدادي الماوردي، الناشر: المكتبة العالمية – بغداد ١٤٠٩ هـ – ١٩٨٩ م.

٣٢- السيرة النبوية لإبن هشام، تحقيق: جودة محمد جودة، الناشر: دار ابن الهيثم – القاهرة، الطبعة الأولى ١٤٢٧ هـ – ٢٠٠٦ م.

٣٣- الشفا بتعريف حقوق المصطفى، تأليف: العلامة القاضي أبي الفضل عياض بن موسى بن عياض اليحصبي، تقديم وتحقيق: عامر الجزار، طبع ونشر: دار الحديث – القاهرة، ١٤٢٥ هـ – ٢٠٠٤م.

٣٤- سيرة رسول الله (الرحيق المختوم)، تأليف: فضيلة العلامة الشيخ صفي الرحمن المباركفوري، الناشر: دار الخير (دمشق – بيروت)، الطبعة الأولى ١٤١٩هـ – ١٩٩٨م.

٣٥- أصول الدعوة، تأليف: الدكتور عبدالكريم زيدان، الطبعة: العاشرة ١٤٢٦ هـ – ٢٠٠٥ م، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت – لبنان.

٣٦- البداية والنهاية، تأليف: أبو الفداء الحافظ عماد الدين إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي، تحقيق ومراجعة وفهرسة: دار أبي حيان، الطبعة: الأولى ١٤١٦ هـ – ١٩٩٦ م، الناشر: دار أبي حيان.

٣٧- حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، تأليف: أبي نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني، الطبعة: الثالثة ١٤٠٠هـ - ١٩٨٠م،، الناشر: دار الكتاب العربي - بيروت - لبنان.

٣٨- أخبار القضاة، المؤلف: أَبُوبَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ خَلَفِ بْنِ حَيَّانَ بْنِ صَدَقَةَ الضَّبِّيّ البَغْدَادِيّ، المُلَقَّب بِـ"وَكِيع"، حققه و صححه و علق عليه و خرّج أحاديثه: عبدالعزيز مصطفى المراغي، الناشر: المكتبة التجارية الكبرى، الطبعة، الأولى عام ١٣٦٦هـ - ١٩٤٧م.

٣٩- محض الصواب في فضائل أمير المؤمنين عمر بن الخطاب، تأليف: الإمام العلامة المحدث يوسف بن الحسن بن عبدالهادي الدمشقي الصالحي الحنبلي المعروف ب(إبن المبرد)، دراسة وتحقيق: عبدالعزيز بن محمد بن عبد المحسن الفريح، الطبعة: الأولى ١٤٢٠ هـ - ٢٠٠٠م، الناشر: دار أضواء السلف - الرياض.

٤٠- أخبار أبوحنيفة وأصحابه، تأليف: القاضي أبي عبد الله حسين بن علي الصيمري، الناشر: عالم الكتب - بيروت، سنة النشر ١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م.

٤١- الفقيه والمتفقه، للحافظ المؤرخ أبي بكر أحمد بن علي بن ثابت الخطيب البغدادي، قام بتصحيحه والتعليق عليه: فضيلة الشيخ إسماعيل الأنصاري، الناشر: المكتبة العلمية.

٤٢- فقه الشورى والإستشارة، تأليف: توفيق محمد الشاوي، الطبعة: الأولى ١٤١٢هـ - ١٩٩٢م، الناشر: دار الوفاء - المنصورة - مصر.

٤٣- تاج العروس من جواهر القاموس، تأليف: السيد محمد مرتضى بن محمد الحسيني الزبيدي، إعتنى به ووضع حواشيه: الدكتور عبد المنعم خليل إبراهيم والستاذ كريم سيد محمد محمود، الطبعة: الأولى ٢٠٠٧م - ١٤٢٨ هـ، الناشر: دار الكتب العلمية - بيروت - لبنان.

٤٤- مقدمة ابن خلدون المسمى بكتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر في أيام العرب والعجم والبربر ومن عاصرهم من ذوي السلطان الأكبر، المؤلف : عبدالرحمن بن محمد بن خلدون الحضرمي المغربي، الناشر: دار العودة - بيروت.

٤٥- منهج عمر بن الخطاب في التشريع (دراسة مستوعبة لفقه عمر وتنظيماته)، تأليف: الدكتور محمد بلتاجي، الناشر: دار السلام للطباعة والنشر والترجمة - القاهرة، الطبعة الثانية ١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٣م

٤٦- المقصد الأسنى في شرح أسماء الله الحسنى لأبي حامد الغزالي، دراسة وتحقيق: محمد عثمان الخُشْت، الناشر: مكتبة الفرقان - القاهرة

٤٧- جامع الأصول في أحاديث الرسول، تأليف: الإمام مجد الدين أبي السعادات المبارك بن محمد بن الأثير الجزري، حققه وعلق عليه وخرج أحاديثه: أبو عبد الله عبد السلام محمد عمر علوش، الناشر: دار الفكر - بيروت - لبنان، الطبعة: الأولى ١٤١٧ هـ - ١٩٩٧ م..

٤٨- تاريخ الخلفاء، تأليف: الإمام الحافظ جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي، تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد، الطبعة: الأولى ١٣٧١ هـ - ١٩٥٢م، الناشر: مكتبة الشرق الجديد - بغداد و دار العلوم الحديثة - بيروت.

٤٩- الطبقات الكبرى، تأليف: محمد بن سعد بن منيع الزهري، أعد فهارسها: رياض عبد الله عبد الهادي، الطبعة: الأولى ١٤١٧ هـ - ١٩٩٦ م، الناشر: دار إحياء التراث الإسلامي - بيروت - لبنان.

٥٠- الرسالة للإمام محمد بن إدريس الشافعي، تحقيق: د. عبد اللطيف الهميم، و د. ماهر ياسين الفحل، الطبعة: الثانية ٢٠٠٩م، الناشر: دار الكتب العلمية - بيروت - لبنان.

٥١- جامع بيان العلم وفضله، تأليف: أبي عمر يوسف بن عبد البر، تحقيق: أبي الأشبال الزهيري، الطبعة: التاسعة ١٤٣٢ هـ، الناشر: دار إبن الجوزي - الدمام - المملكة العربية السعودية.

